# دیوانی

# مەولەوی





کۆکردنەوە، لیکۆڵینەوەو
لێکدانەوەو، لە سەرنووسینی:

مەلا عبدالکریمی مُدرّس

معدوم کرد، عبدالرحیم بن سعید ۱۲۲۱ ـ ۱۳۰۰ق.
[دیوان].
دیوانی مەولەوی / [عبدالرحیم بن سعید معدوم کرد].
کۆکردنەوەو، لێکۆڵینەوەو . . . عبدالکریمی مدرس. ـ سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۷۸.
ص، [۵۵۰].

فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
عنوان دیگر: دیوانی مەولەوی
کردی.
چاپ مکرر.
شعر کردی ـ قرن ۱۳ق. الف. مدرس، عبـدالکریـم، ۱۲۸۳ ـ، مصحح.
ب. عنوان. ج. عنوان: دیوانی مەولەوی.
BIR۳۲۵٦م۱۸٤۳الف/٦ ٨فا۹/۲۱
کتابخانه ملی ایران ۱۰۲٦۹ ـ ۷۸م

# دیوانی مەولەوی

کۆکردنەوەو، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە،

لە سەر نووسینی:

مەلا عبدالکریمی مدرس رحمه الله

بلاوکەرەوەی کوردستان

# دیوانی مەولەوی


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | دیوانی مەولەوی |
| ✓ دانراوی (تألیف): | عبدالرحیم بن سعید معدوم کرد |
| ✓ کۆکردنەوەو، لێکۆڵینەوە (شرح و تحقیق): | مەلا عبدالکریمی مدرس |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | چوارەم (چهارم) ۱۳۸٦ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۵۰۰۰ دانە (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و ئەندازە: (تعداد صفحه و قطع): | ۵۵۲ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

سنندج ـ پاساژ عزتی
تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲

شابک: x ـ ۵۴ ـ ۷۶۳۸ ـ ۹۶۴
ISBN: 964 - 7638 - 54 - x

قیمت
۴۴۰۰ تومان

بسم الله الرّحمن الرّحيم

## سەرەتا

لەکۆشی ئەم کوردەواری‌یەی ئێمەدا گەلێ ئەدیبی پایەبەرز پەروەردە بوون کە بە گوێرەی سەردەم‌و رێ‌و شوێنی خۆیان هیچیان لە ئەدیبانی بەناوبانگ‌ی وڵاتانی‌تر کەمتر نەبووە، بەڵام کەمیان بۆیان هەڵ‌کەوتووە لەگەڵ مردنیانا ناویان کوێر نەبێتەوەو نیشانەیەکیان لەپاش بەجێ بمێنێ‌و هەواڵێکی کەم‌و کورتیان بزانرێ.

دۆستی خۆشەویستم، «سیّد علاءالدّين سجّادی» توانیویە بە هەر زەحمەتێک بووە ناوی کۆمەڵێک لە شاعیرەکانی کوردستان کۆ بکاتەوە لە مێژووەکەی‌دا، بەڵام سەرگوزەشتەی تەنها چەند کەسێکیانی دەس‌کەوتوە، ئەوانیش زۆریەیان لەم سەردەمانەی دوایی‌دا ژیاون... ئاخۆ ئەوانەی کە نە ناویان ماوەتەوەو نە نیشانیان، گەیشتبنە چەندسەد کەس؟ مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ!، لە خوالێ‌خۆش بوو «شیخ علاءالدّينﷺ»ی «بیارە»م بیست فەرموی: لە «مەولەوی»م بیست کە وتی: جارێکیان بە سەفەر چووم بۆ «قەڵای جوانرۆ» لەوێ کتێبێکی «شیرین و فەرهاد»ی ناتەواوم دی، لە تاقێکا کەوتبوو، کە تەماشام کرد زۆر لە لام شیرین‌و ناسک بوو، ویستم بە شیعری خۆم تەواوی بکەم، وە دەستم کرد بە نوسین‌و چەند شیعرێکم نووسی، پاشان کە بەراوردم کرد لەگەڵ شیعری ئەسڵی کتێبەکە هینەکانی خۆمم ئەوەندە بە ناتەواو هاتە بەرچاو، شەرمەزار بووم‌و دەستم لە نوسین‌و تەواو کردنی کتێبەکە هەڵگرت.

ئێستایش ئێمە نازانیین ئەو شیرین‌و فەرهادە کام شیرین‌و فەرهادەو دانەرەکەی کێ‌یە کە ئەوەندە هونەرمەند بووە، مەولەوی خۆی لە عاستیا بە هیچ نەزانیوە.

هۆی ون بوونی سامانی ئەدەبیمان بە پێی تێ گەیشتنی من چەند شتە:

یەکەم: هێرشی زۆری لەشکەری بێگانە بۆ سەر وڵاتەکەمان کە بووە بە هۆی فەوتانی زۆر خێزانو وێران بوونی گەلێ شوێنو لەناوچوونی گەلێک کتێبخانەو کتێبی نایاب.

دووهەم: نەخوێندەواری خەڵکی وڵاتو نرخ دانەنانیان بۆ ئەدەبو پاشماوەی دێرینمان.

سێهەم: بێ قیمەتی ئەدەبی خۆماڵی لە بەرچاوی زۆربەی گەورەکانمان کە زمانی کوردی‌یان بە زمانێکی سووکو بێ بایەخ دائەناو لایان وابوو ئەبێ هەر چاویان لە ئەدەبیاتی زمانانی دراوسێ بێ.

ئەمڕۆش کە ئەو هۆیانەی زوو تا رادەیەکی زۆر لە ناو چوون، لام وایە هۆی گەورەی زیندوو نەبوونەوەی سامانی ئەدەبی کۆنمان، بریتی‌یە لە بێ پەیوەندیو لەیەک نەگەیشتنی ئەوکوردانەی کە بە شێوەی جیاجیا قسە ئەکەن، وە لەکەمی چاپخانەو هۆی بڵاوکردنەوەو بازاڕ دەس نەکەوتن بۆ هەموو جۆرە چاپەمەنی‌یەکی کوردی لە هەموو لایەکی کوردستانا.

***

یەکێک لەو ئەدیبە بەرزانەمان کە سەردەمو شوێنی ژیانیان وانەبوە بەزوویی ناوونیشانیان کوێر بکاتەوە، «سیّد عبدالرّحیم»ی «تاوەگۆزی»یە کە زانایەکی بەرزی ئایینیو سۆفی‌یەکی بێ گەردو شاعیرێکی بێ هاوتا بووە، وە هەڵبەستە پڕ شۆرەکانی لە بەشێکی گەورەی کوردستانا بووە بە ویردی سەر زبانی هەموو ئەدەبپەروەرێکو خاوەنی هەستێکی ناسک. وردیو ناسکیو سۆزی غەزەلیاتی مەولەوی لە هەموو کۆڕێکی ئەدەبی‌دا ناوبانگی دەرکردووە. ئەوەی لە شیعری مەولەوی گەیشتبێ بە ناچاری گیرۆدەی دڵگیری مەعنای بووە، بۆیە شیعری مەولەوی خۆی گەیاندوەتە هەر کۆڕێکی ئەدەبی، وە لە دیوەخانی هەر گەورەیەکی ئەدەبپەروەری کوردا لە لای ژوورەوە جێی خۆی کرتوەتەوە، وە ئێستاش ناوی مەولەوی لە هی هەر شاعیرێکی‌تری کورد، زیاتر بەسەر زمانی گەلەوەیەو خۆیشی لە زۆریان زیاتر مافی خۆی وەرگرتووە.

ئەم راستی‌یە بەشێکیشی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندی‌یە بەتینەی کە مەولەوی لەگەڵ خوالێ‌خۆش‌بووان شێخی «سراج‌الدّین»و شێخی «بهاءالدّین»و شێخی «ضیاءالدّین» بوویەتی، کە ئەوانیش خاوەنی گەورەترین خانەقاو خوێندنگای ئایینی بوون لە سەردەمی خۆیانا لەکوردستانا وە مەنسوبیان لە هەموو لایەکی‌دا بووە، وە خوێندنگاو خانەقاکانیان فەقێ‌و سۆفی لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانەوە تیابووە. ئەمەش بووە بە هۆی ئەوە شیعری مەولەوی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بگەڕێ. جگە لەوە کە سەردەمی ژیانیشی پێشکەوتووتر بووە لە سەردەمی یەکێکی وەک «بێسارانی»و «سەیدی» کە لەگەڵ پایەی بەرزی شیعری‌شیانا هێشتا ناوبانگیان لە دەرەتانێکی تەسک دەر نەچووە.

شاعیری خوالێ‌خوش‌بوو حاجی «تۆفێق»ی «پیرەمرد» وەختی خۆی هەنگاوێکی دڵسۆزانەی نا، کە ژمارەیەکی زۆری لە پارچە شیعرەکانی مەولەوی کۆکردەوەو وەری‌گێڕایە سەر شێوەی سلێمانی‌و «ئەسڵ»و «رۆح»ەکەی لە دوو بەرگا بڵاو کردەوە... منیش دەمێکە خەریکی کۆکردنەوەی شیعری مەولەویم‌و ئەیان نوسمەوە تا لەم دوایی‌یەدا توانیم بەری ئەو رەنجی چەند ساڵەیەم بکەم بەم کتێبە. وە بۆ بەجێ هێنانی هەندێک لە واجبی سەرشانم بەرامبەر بە ئەدەبی نەتەوایەتیمان پێشکەشی خوێندەوارانی کوردی بکەم.

لەم کتێبەدا بۆ ئاسانی، هاتووم پارچە هەڵبەستەکانم بە پێی تیپەکانی «ئەلف»و «بێ» رێک خستووە لەسەر بنچینەی تیپی یەکەمی یەکەم شیعری هەر پارچە شیعرێک، وە بە گوێرەی ئەوەی کە دیومە نووسراوە یا لە شارەزایانم بیستووە: هۆی دانانی هەندێکیانم باس کردووە، وە مەعنای ئەو وشانەم لێ داوەتەوەکە بە ئاسانی نازانرێن یا تەنها هەر لە شێوەی شیعری کۆنمانا بەکار هێنراون. وە ئەگەر مەعنای شیعرێک تەنها بە لێکدانەوەی مەعنای وشە گرانەکانی نە زانرێ، پوختەی مەعنای ئەو شێعرەشم لێ داوەتەوە، وە ئەگەر مەعنای چەند شیعرێک بەسرابێ بە یەکەوە، مەعنای هەمویانم لە ئاخر شیعریانا پێکەوە لێ‌داوەتەوە.

لەکوکردنەوەی ئەم شیعرانەی مەولەوی‌دا یارمەتیم لەگەلێ کەس دیوە. وەک جەنابی «سەیید تاهیر هاشمی» لە «دەوڵەت ئاوا»و «حسن فەهمی بەگی جاف»و حاجی «حەیدەر»ی کورەزای «مەحمود یارویس»و شێخ «ئەحمەد»ی شێخ «سدیق»ی «نێرگسەجاڕ»و مەلا «کەریم»ی «دەڵەمەڕی»و مەلا «کەریمی گوڵپ»ی‌و فەقێ «ڕەشید»ی «هەمەوەند»، وە چەند کەسی‌تر کە یا دیوان یا چەند پارچە شیعرێکی مەولەوی‌یان لابوو بۆیان ناردم‌و بەراوردم کرد لەگەڵ ئەوەی لام هەبوو، وە چیم نەبوو نوسیمەوە، یان یارمەتی ئەدەبی ترم لێوە دین لە بارەی مەولەوی‌یەوە، سوپاسێکی گەرمی ئەم زاتانە ئەکەم وە بە تایبەتی جەنابی «سیّد طاهر» کە کەڵکێکی زۆرم وەرگرت لە نامیلکە فارسی‌یەکەی کە لە بابەت مەولەوی‌و شیعری مەولەوی‌یەوە بۆی نوسیبوم، وە جەنابی «حسن فهمی جاف»، کە کەشکۆڵە شیعری‌یەکەی خوالێ‌خۆش‌بوو «مەحمود پاشا»ی باپیری دایە لام. هەروەها ئەبێ سوپاسی ئەدەبیی بەرزی کورد خوالێ‌خۆش‌بوو «ڕەفێق حیلمی»یش بنوسم کە کتێبەکەی خوێندەوە، وە هەندێ سەرنجی وردی پیشان‌دا، وە بڕیار بوو سەرەتای بۆ بنوسێ بەڵام مەرگ موڵەتی نەدا.

«دیوانی مەولەوی» بە دەسنووس، جگە لەو زاتانەی کە وتم یارمەتی‌یان داوم، لای گەلێ کەسی‌تریش هەیە، بەڵام من هەرچەند هەوڵم‌دا نەمتوانی دەسیان خەم.

وەک زانیومە لای بەگزادە جافەکانی «کەلار»و لای منالەکانی شێخ «ڕەسول»ی «گومەتەی قەرەداغ»و لای شێخانی «شاقەڵا» لە «سەرشیو»ی «سەقز»و لای سەییدەکانی «لۆن»یش هەیە. وەک بیستوومە نوسخەی سەییدەکانی «لۆن» هۆی دانانی غەزەلەکانیشی لێ نوسراوە. نامەی زۆرم بۆ هەموو ئەوانە نووسی بۆ داوای شیعری «مەولەوی»، بەڵام وەرامم لەکەسیانەوە دەسگیر نەبوو.

هەروها لام وایەکۆمەڵە شیعری مەولەوی لای سەییدەکانی «باینچۆ»یش هەبێ، بە نیشانەی ئەوەکە لە سەرەتای مامۆستایی‌ما لە خوێندنگای خانەقای «بیارە» خوالێ‌خۆش‌بوو «امین‌السّادات»ی «باینچۆ»یش لەوێ بوو زۆربەی شیعری مەولەوی لەبەر بوو، وە مەعناکانی باش ئەزانین‌و ئەی‌زانی کەی وە لە چ موناسبەتێکا دای‌ناون. داخی گرانم ئەو

رۆژە هەرچەند شیعری مەولەویم ئەنوسی‌یەوە، بەڵام فکری ئەوە نەکەوتبوە کەللەم کە بیکەم بەکتێب تا ئەو شتانەی کە «امین‌السّادات» ئەی‌زانین بیان نوسمەوە. «امین‌السّادات» هەموو جارێ ئەوەندە بە سۆز شیعری مەولەوی ئەخوێندەوە وەک دەروێش حاڵی لێ‌بێت واله حاڵی تەبیعی دەرئەچوو.

هەرچۆن بێ من ئەوەی لە تواناما بوو کردم، وەنەبێ بڵێم کەم‌وکورتی لە ئیشەکەما نیە، چونکە پرۆژەی وا هەرگیز بە تاقەکەسێک بەبێ کەم‌وکورتی ناهێنرێتە دی. لەبەر ئەوە ئەم تکایانەی خوارەوەم بەرەو روی هەموو ئەوانە ئەکەمەوەکە ئەم کتێبەیان بەرچاو ئەکەوێ، بۆ ئەوەی کەڵک لە یارمەتی‌یان وەربگرم، وە ئەگەر عومر وەفای کرد جارێکی‌تر بە شێوەیەکی باشتر لە چاپی بدەمەوە:

١. هەرکەس پارچە هەڵبەستێکی لا هەبێ کە لەم دیوانەدا بڵاو نەکرابێتەوە، یا بڵاو کرابێتەوە بەڵام لە نوسخەکەی ئەودا شیعرێک یا چەند شیعرێکی زیاتر بێ، ئەو پارچە هەڵبەستە، یا شیعرە زیادەکەمان بۆ بنێرێ.

٢. ئەگەر لای ئێمە شیعرێک لە پارچەیەک‌دا بڵاوکرابێتەوە، وە لە نوسخەی کەسێک‌دا لە پارچەیەکی‌ترا بێ، یا چەند پارچەی لای ئێمە لە نوسخەی کەسێک‌دا یەک پارچە بن، یا بە پێچەوانەوە، ئاگادارمان بکات.

٣. ئەگەر وشەیەک لە شیعرێک‌دا، یا جوملەیەکی لای کەسێک بەجۆرێکی‌تر بێ، بۆمان بنوسێ.

۴. هەرکەس لای وابێ ئێمە مەعنای شیعرێکمان خراپ لێ داوەتەوە، یان هۆی دانانی پارچەیەکمان بە ناڕاست نووسیوە، رای خۆیمان بۆ بنێرێ.

ئیتر هیوام وایە هەرکەس لەم روەوە وا هەست بکا ئەوەی لایەتی ئەمانەتی ئەدەبی کوردە لای، وە ئەبێ ئەو ئەمانەتە بگەیەنێ بە جێی خۆی، تا بە هەموو لایەکمانەوە بتوانین میراتی ئەدەبی‌مان بەشێوەیەکی راست‌و دروست بگەیەنین بە نەوەکانی پاشەوەمان.

# مەولەوی لە چەند لاپەڕەیەکدا

ناوی «سیّد عبدالرّحیم»ی کوڕی مەلا «سەعید» وە لە نەوەی مەلا «یـوسـفـجان»ی کوڕی مەلا «ئەبوبەکر، مصنّف»ی «چۆڕ»ی‌یە ﷺ کە ئەگەڕێتەوە سەر خواناسی بەناوبانگ «سەیید موحەممەد زاهید» کە بە «پیر خدر شاهۆ ﷺ» ناوبانگی دەرکردووە، وە لە وەچەی حـەزرەتی «حـوسەین»ی کـوڕی حـەزرەتی «عـەلی» کـوڕی «ئـەبووتالب»ە. نـازناوی شیعری‌یشی «مەعدوومی» وە لە ناو خەڵکو لەکۆڕی ئەدیبانا بە «مەولەوی» نـاوبانگی دەرکردووە.

مەولەوی لە ساڵی ١٢٢١ی کـۆچـی لە دێی «سـەرشاتە» لە نـاوچەی «تـاوەگـۆز»ی ـبەشی «عێراق» ـ لە خێزانێکی ئایینپەروەری بـەحورمەتدا لە دایک بـووە، وە هـەر لە سەردەمی مناڵی‌دا ماڵی باوکی هاتووە بۆ دێی «بێژاوە» لە نزیکی «هەڵەبجە»، لەوێ لای باوکی قورئانی پیرۆزی تەواو کردووەو وردەکتێبە سەرەتایی‌یەکانی فارسی‌و «صـرف»و «نحو»ی خوێندووە. پاشان لەسەر ئوسوڵی فەقێکانی کوردستان چووە بۆ خـوێنـدن بـۆ «پاوە» لە ناوچەی «هەورامان»ی «لهۆن»، وە پاش ماوەیەک لەوێوە چـووە بـۆ «چـۆڕ» لە «مەریوان» وە لەوێ‌یشەوە چووە بۆ «سنە» وە لە مزگەوتی «وەزیر» دامەزراوە، ئەنجا چووە بۆ «بانە» وە لەوێ‌یشەوە چووە بۆ «سلێمانی» وە لە «مزگەوتی گەورە» دامەزراوە کـە لەو کاتەدا هێشتا جەنابی «شێخ مەعروف»ی «نۆدێ» مامۆستا بووە تیایا.

ئەنجا چووە بۆ «هەڵەبجە» وە لە «مزگەوتی جامیعە» لای مەلا «سادق تەوێڵە»یی کە «موستەعید» بووە لە خزمەتی شێخ «عبداللە»ی «خەرپانی»دا خوێندویەتی. ئەنجا چووە

بۆ «قەڵای جوانڕۆ» وە لە خزمەتی مەلا «موحەممەد»ی «قازی»ی‌دا خوێندویە، لەوێشەوە بۆ جاری دووەم لە سەردەمی «رەزاقولی‌خان»ی «والی»دا چووەتەوە بۆ «سنە» وە لە مزگەوتی «دار الاحسان» دامەزراوە، وە ماوەیەکی زیاتر لە جاری پێشوو لەوێ ماوەتەوە، ئەنجا دیسانەوە هاتووەتەوە بۆ «سلێمانی» وە لە خزمەتی مەلا «عبدالرّحمان»ی «نۆدشە»یی‌دا کە موفتی سلێمانی‌و مامۆستای مزگەوتی «مەڵکەندی» بووە خوێندنی تەواو کردووەو ئیجازەی دەرس وتنەوەی وەرگرتووە.

ئەوەی کە مەشهورە گوایە «مەولەوی» لە زەمانی «رەزاقولی‌خان»ی «والی»دا لە مزگەوتی «دار الاحسان»ی «سنە» لە خزمەتی حاجی مەلا «ئەحمەد»ی «نۆدشە»یی‌دا ئیجازەی وەرگرتووە، راست نیە. چونکە حاجی مەلا «ئەحمەد» هەتاوەکو پاش زەمانی «فەرهاد میرزا» کە پاش «غوڵامشاخان»و «رەزاقولی‌خان»ی برای، بووە بە حوکمڕانی «ئەردەڵان». وە پاش سەفەری «حەج»ی لەگەڵ شێخی «بهاءالدّین» کە پاش ساڵی ١٢٩٠ی کۆچی بووە، رۆیشتووە بۆ «سنە»، وە لەو کاتەدا مەولەوی عومری لە ٦٠ ساڵ کەمتر نەبوە، بەڵکوو پاش ئەوە تەنها چەند ساڵ ژیاوە. کەواتە چۆن ئەگونجێ لە عومری وادا ئیجازە وەربگرێ.

هەروەها لە ساڵی ١٢٧١ی‌دا شێخی «سراج‌الدّین» مەولەوی لەگەڵ حاجی شێخ «عبدالرّحمان»ی کوڕی ئەنێرێ بۆ «سنە» بۆ مەسەلەی ناکۆکی بەینی «غوڵامشا خان»و مەلاکانی «سنە». دیارە ئەبێ مەولەوی لەوکاتەدا مەلایەکی پایە بڵەند بووبێ، ئەگینا بۆ ئیشی وا نەئەنێررا. جگە لەوەش رێی تێناچێ مەولەوی ئیجازەی لای حاجی مەلا «ئەحمەد» وەرگرتبێ، چونکە هەشت ساڵ لەو گەورەتر بووە، وەک لەم شیعرە فارسی‌یەوە دەرئەکەوێ کە مێژوی لە دایک بوونی حاجی مەلا «ئەحمەد»ە بە حروفی «ئەبجەد»:

هاتفی از سر الهام بتأریخش گفت: بود احمد خلف امجد عبدالرّحمن

کە ئەکاتە ١٢٢٩ی کۆچی مانگی.

بەڵگەیەکی تریش هەیە بۆ ئیسپاتی ئەوەکە مەولەوی لە سلێمانی ئیجازەی وەرگرتووە، ئەوەش ئەو چیرۆکەیەکە پاشان هەر لەم کورتە مێژووەی ژیان‌دا ئەی‌گێڕینەوە لە بارەی

چوونیەوە بۆ سەیران بۆ «سەرچنار» لەگەڵ هەندێ لە میرەکانی «بابان» پاش تەواو بوونی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی.

مەولەوی لە سەرەتای مەلایەتی‌دا لە دێی «چروستانە» لە نزیکی «هەڵەبجە» دامەزراوە و فەقێی راگرتووەو دەسی کردووە بە دەرس وتنەوە. پاش ماوەیەک هەوای «تصوّف» ئەکەوێتە کەللەی‌و گرفتاری زەوقی «ئەهلی مەعنا» ئەبێ‌و ئەڕوا بۆ «تەوێڵە» بۆ خزمەتی شێخ «عوسمان سراج‌الدّین»ی خەلیفەی «مەولانا خالید»ی «نەقشبەندی» کە یەکەم کەس بووە ئەو تەریقەتەی لەکوردستانا بڵاوکردووەتەوە. مەولەوی لە «تەوێڵە» ئەبێ بە موریدی شێخی «سراج‌الدّین» وە وەختێکی زۆر بە «سلوک»ەوە ئەباتە سەر، وە پاش چەند ساڵێک ئەگوێزێتەوە بۆ «بیاوێڵە» کە دێ‌یێکە لە ژووری «هەڵەبجە»وە. پاش ماوەیەکی‌تریش لەوێوە بار ئەکا بۆ «گونە» کە یەکێکە لە دێ‌یەکانی هۆزی «نەورووڵی». پاش چەند ساڵێک ئەوێ‌یش بەجێ ئەهێڵێ‌و ئەچێ بۆ «شەمێران» کە ئەوکاتە لە ژێر ئیدارەی شێخ «عەلی، عەبابەیلێ»یی‌دا بووە. شێخی ناوبراو زۆر خزمەتی مەولەوی‌و دەس‌و پێوەندەکانی ئەکا، بەڵام پاش ماوەیەک بە تەئسیری «موحەممەد پاشا»ی جاف بەڕێوە بردنی «شەمێران» لە دەستی ئەو شێخ «عەلی»یە ئەسنرێتەوە وە ئەدرێتە دەستی «عوسمان»ی «خاڵە» کە لە پیاو ماقوڵانی هۆزی «یەزدانبەخشی» بووە، لە ئەنجامی ئەم لابردنو دانانەدا مەولەوی ماڵی لە شەمێران بار ئەکاو ئەڕواتەوە بۆ «سەرشاتە» کە تیا لە دایک بووە، وە لەوێ ئەمێنێتەوە تا کۆچی دوایی ئەکا.

«مەولەوی» لە دواساڵەکانی ژیانیا تووشی گەلێ کارەساتی ناخۆش بووە، وە ئەو کارەساتانەی لە چەند پارچە شیعردا بە سۆزەوە هۆنیوەتەوە. کتێبخانەکەی سووتاوە وە لەو کتێبخانەیەی‌دا گەلێک کتێب‌و دانراوەو دیوانی شیعری سووتاوە، وە «عەنبەر» خاتوونی خێزانی مردووە کە جێگایەکی تایبەتی بوو لە دڵی مەولەوی‌دا، وە حەوت ساڵ پێش وەفاتی کوێر بووە، هەر ئەم کوێر بوونەشی بووە بە هۆی مردنی، ئەوە بوو جارێکیان بۆ سەرخۆشی کردن لە دۆستێکی ئەڕوا بۆ «پەریس» کە لەگەڕانەوەدا نزیکی «هانەسوورە» ئەبێتەوە بە جڵەوڕاکێشی وەلاخەکەی ئەڵێ: من چاوم نابینێ، دار توویەک لەسەر ڕێگەمانە

لقێکی لاری هەیەکە گەیشتینە لای پێم بڵێ با سەرم دانەوێنم. وا رێک ئەکەوێ کە ئەگەنە ئەو شوێنە کابرا لە بیری نابێ ئاگاداری بکا مەولەوی سنگی ئەدا بە دارەکەداو بە پشتا ئەکەوێتە خوار لە وڵاخەکەی و پشتی ئەشکێ، وە لە ئەنجامی ئەوەدا لە ١٣٠٠ی هیجری‌دا کۆچی دوایی ئەکا، وە لەگۆڕستانی «ئەسحابە» لە نزیکی «سەرشاتە» ئەی‌سپێرن بە خاک.

مەولەوی پایەیەکی بڵەندی هەیە لە ناو زاناکانی کورد دا، وە بە تایبەتی لە «عیلم»ی «کەلام»دا دەسێکی باڵای بووە. ئەو دانراوانەی کە لە پاشی ماونەتەوە هەموو لەم عیلمەدان، وە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. «اَلْفَضِيلَة» کە ٢٠٣١ شیعری عەرەبی‌یە وە لە ساڵی ١٢٨٥ی هیجری‌دا دای ناوە، وە عەنتیکەیەکی هونەری‌یە جگە لەوەکە مەعنا عیلمی‌یەکەی زۆر وردو بەرزە. یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمٰنِ، الرَّحِيمِ مَـنْ تَـاهَ فِـيهِ نُـهْيَةُ ٱلْحَكِـيمِ

دانەیەکم لەم کتێبە لایە ئاخر پەڕەی نەماوە، لە بەر ئەوە نازانم کێ نوسیویەتەوە، بەڵام ئەبێ فەقیەکەی مەولەوی خۆی نوسیبێتیەوە، چونکە خەتی مەولەوی پێوەیە، هەروەها حاشیەی زۆری مەلا «فەتاح» ناوێکی فەقێی مەولەویشی لەسەر نوسراوەتەوە، شەرحێکی دوورو درێژم لەم کتێبە کردوە لە دوو بەرگی گەورەدا.

٢. «اَلْعَقِيدَةُ ٱلْمَرضِيَّة» کە ٢٤٥٤ شیعری کوردی‌یە، وە لە ١٣٥٢ی هیجری‌دا لەلایەن «محى ٱلدّين صبرى ٱلنّعيمى»یەوە لە «مصر» لە چاپ دراوە. یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

زوبدەی عەقیدەو خوڵاسەی کەلام هەر لە تۆ بۆ تۆس حەمدو سەنای تام

مەولەوی خۆی ئەم عەقیدەیەی کورت کردووەتەوە، وە باسە گرانەکانی لێ لابردووە بۆ ئەوەی قوتابی‌یە تازە پێ گەیشتووەکان لێی حاڵی ببن.

٣. «اَلْفَوائِح» کە ٥٢٧ شیعری فارسی‌یە، وە لەگەڵ عەقیدەکوردی‌یە باس‌کراوەکەدا لەچاپ دراوە. یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

چو در خود بینم از بس روسیاهی نگنجد ای الٰهی یا الٰهی

جگە لەمانەش نامیلکەیەکی بە فارسی هەیە باسی ئوسوڵی تەریقەتی نەقشبەندی ئەکا.

***

وەک وتمان «مەولەوی» موریدی شێخی «سراج‌الدّین» بووە، وە پاش وەفاتی ئەو بووە بە موریدی شێخی «بهاءالدّین» وە عەلاقەی رۆحی لەگەڵ شێخی «ضیاءالدّین»یش بووە. زۆربەی هەڵبەستەکانی پڕن لە هەستی بەسۆزی بەرامبەر بە «پیر»، وە نیشانەی ئەوەن کە موریدێکی چەند راست بووە، وە لە رێگای موریدی‌یەتی‌یەوە دەستێکی گەورەی لە «تصوّف»دا پەیدا کردووە.

جارێکیان لە خانەقای «تەوێڵە» ئەبێ لە «چروستانە»وە دێن بە دوایا کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، چونکە کوڕێکی نەخۆش ئەبێ، ئەمیش سوار ئەبێ‌و ئەگەڕێتەوە، کە ئەگەنە پشت دێی «عەنەب» هەناسەیەکی درێژ هەڵئەکێشێ‌و فرمێسک بە چاوەکانیا دێتە خوار. هاوڕێکەی عەرزی ئەکا بۆچی وا عاجزی؟ ئەمیش ئەڵێ: چۆن عاجز نەبم حەزرەتی «یەعقوب» بۆ دڵخۆش بوون بۆنی کراسی حەزرەتی «یۆسف»ی کوڕی ئەدرا بە لوتیا، کەچی من بۆنی کفنی کوڕەکەم ئەدرێ بە دەماخما. کە ئەگەنە ماڵەوە ئەزانن لەو کاتەدا کە ئەو هەناسەکەی هەڵکێشاوە خەریکی کفن کردنی کوڕەکەی بوون.

بەبۆنەی مردنی ئەم کوڕەیەوە شێخی «بهاءالدّین» ئەچێ بۆ لای بۆ سەرخۆشی لێ کردنی، مەولەوی بە هاتنی شێخ ئەوەندە خۆشحاڵ ئەبێ «وەجد» ئەیگرێ‌و ئەڵێ: حەزم ئەکرد تا ماوم ساڵێ کوڕێکم بووایەو بمردایە بەو شەرتە تۆ هەموو جارێ بهاتی‌تایە بۆ لام و سوودی «ڕۆحی»م لێ وەربگرتی‌تایە.

مەولەوی زۆربەی شەوەکان بێدار بووە، فەرەنجی‌یەکی سووری درێژی بووە لە وەرزی سەرمادا داویە بەسەر خۆیاو رووەو قیبلە دانیشتوەو بیری لە خوا کردوەتەوەو ئادابی تەریقەتی بەجێ هێناوە.

مەولەوی جگە لەوەش کە خۆی موریدی شێخی «سراج‌الدّین»و شێخی «بهاءالدین» بووە، پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ هەندێکی‌تر لە پیاوانی خوادا بووە، وەک شێخ «عبدالرّحمان»ی «خالسی» «تاڵەبانی»و «کاک ئەحمەدی شێخ».

لە شێخ «فەتاح»ی «کربچنەیی»م بیست وتی: جارێکیان مەولەوی ئەچێ بۆ «کەرکوک»، لە دەمەو بەیانا ئەگاتە «تەکیە»ی «تاڵەبانی»، کە ئەچێتە ژورەوە سەیر ئەکا شێخ «عبدالرّحمان» خەبەرە، کە شێخ بە مەولەوی ئەزانێ دێ بە پیری‌یەوە، مەولەویش ئەم شیعرەی «بێسارانی»ی بەسەرا ئە خوێنێتەوەکە لە عەقیدەکەشیا لە باسی «میعراج»دا نوسیوە. وە لە پارچەی ژمارە «۴»ی تیپی «بێ»یش‌دا هەیە:

شەوەن خەڵوەتەن، ماڵ بێ ئەغیارەن　　ئاڵەم گرد وتەن، دۆس خەبەر دارەن

شێخ «عبدالرّحمان»یش گورج بەم شیعرە وەرامی ئەداتەوە:

ئیرادەم ئیدەن وەی کەڵپۆسەوە　　شەو نالین وەشەن وەلای دۆسەوە

شایانی باسە مەولەوی لاواندنەوەیەکی جوانی هەیە بۆ شێخ «عبدالرّحمان»، وە بە حەرفی ئەبجەد مێژوی وەفاتی بۆ داناوە. ئەو لاواندنەوەیەمان لە تیپی «دال»دا بڵاو کردووەتەوە لەژێر ژمارەی «١٨» دا.

هەروەها لە «سەید ئەحمەد»ی کوڕی شێخ «عبدالرّحمان»ی «عازەبانی»م بیست وتی: رۆژێکیان مەولەوی ئەچێ بۆ «سلێمانی» بۆ زیارەتی «کاک ئەحمەدی شێخ»، پاش نوێژی عەسر بە خزمەتی ئەگا. «کاک ئەحمەد»یش زۆر حورمەتی ئەگرێ‌و پێی ئەفەرموێ: مەولەوی حەز ئەکەم نەسیحەتێکم بکەی!، مەولەوی بێ‌دەنگ ئەبێ، «کاک ئەحمەد» داواکەی دووبارە ئەکاتەوە، بەڵام مەولەوی هەر دەنگ ناکا. شێخ بۆ جاری سێهەم داواکەی تازە ئەکاتەوە، ئەمجارە مەولەوی ئەڵێ: یاشێخ نەسیحەت یا ئەمر بە چاکەیە یا نەهی لە خراپە، جاری یەکەم ورد بوومەوە واجبێک‌و سوننەتێکم نەدی تۆ نەیکەیت تا پێت بڵێم بیکە. جاری دووهەمیش ورد بوومەوە حەرامێک‌و مەکروهێکم نەدی تۆ بیکەیت تا پێت بڵێم مەیکە. ئەمجارە پێت ئەڵێم دیارە شەیتان زۆر دڵگرانە لێت، دەخیلتم ئاگات لە خۆت بێ تەفرەت نەداو تووشی خراپەیەکت نەکا...«کاک ئەحمەد» ئەم جوابەی مەولەوی زۆر پێ‌خۆش ئەبێ، وەجد ئەیگرێ‌و دەس ئەکا بە گریان‌و ئەندازەیەکی باش فرمێسک بەخوڕ ئەڕێژێ...

***

باری ژیانی ئابووری مەولەوی زۆر ناخۆش بووە، بەڵام ئەو رازی بووە بەو ژیانە، وە زۆربەی وەختی خۆی بە شێوەی دەروێشی رابواردووە.

لە حاجی شێخ «موستەفا»ی «هەولێری»م بیست وتی: بیستومە جارێکیان لە حاجی مەلا «ئەحمەد»ی «نۆتشە» ئەچێ بۆ دیدەنی مەولەوی، مەولەوی هیچ لە ماڵیا نابێ. ئەو ئێوارە بە قسەی خۆش وەخت ئەبەنە سەر تا خەو ئەیانباتەوە بە لادا. بۆ سبەی نیوەڕۆ هەندێ نانی «جۆ»و «دۆ» دێنن‌و دەس ئەکەن بە «نان‌و دۆ» خواردن. لەکاتی نان خواردنەکەدا حاجی «مەلا ئەحمەد» زۆر تەعریفی خۆراکەکە ئەکاو بە شان‌و باڵیا هەڵ ئەدا...مەولەویش ئەڵێ: میوانی وەک تۆ بە دەگمەن رێ ئەکەوێتە لای ئینسان، لەبەر ئەوە پێویستە بە لەززەت‌ترین خۆراکی بۆ دانرێ!!! دیارە بە نیسبەت کەسێکەوە هیچ شک نەبا «نان‌و دۆ» خۆراکێکی ئێجگار بە لەززەتە.

لەگەڵ ئەوەشا مەولەوی هەمیشە ئەو هەژاری‌یەی پێ باشتر بووە لەوەکە ناوچەو خزم‌و کەس‌وکارەکەی بەجێ بێڵێ‌و بڕواتە شوێنێ وا بە خۆشی تیا بژی.

پیاوی دەسەڵاتداری وەک «فەرهاد میرزای قاجاری» کە مەولەوی زۆر خۆش ویستووە داوای لێ کردووە بچێتە «ئێران»، وە لە پەنای ئەوا دانیشێ‌و خزمەتی زۆری بکا. بەڵام مەولەوی بەگوێی نەکردووە. مەولەوی چاو لەبەری هیچ گەورەیەک نەبووە، لە «حەسەن بەگی عەلی بەگی جاف»م بیست وتی: پاش ئەوەی کە «مەحمودپاشای جاف» روتبەی پاشایەتی لە ئەستەموولەوە بۆ دێ، رۆژێک مەولەوی لە سەر مەسەلەیەک دڵی لێی دێشێ، وە نامەیەکی بۆ ئەنێرێ‌و تیا ئەنوسێ: پاشا ئەگەر تۆ بەوەوە ئەنازی کە لە «مەحمود بەگی»یەوە بووی بە «مەحمودپاشا»، منیش بەوە ئەنازم کە هەر مەولەوی بووم‌و هەر مەولەویم.

مەولەوی هەمیشە لەسەر خزم‌و عەشرەتەکەی هاتووەتە دەنگ، وە بۆ ئەوان دڵی لە دەسەڵاتدارانی ئەو رۆژە ئێشاوە. کاتێک کە ماڵی لە «شەمێران» بووە شێخ «عەلی عەبابەیلێ»یی سەرکاری «شەمێران» بووە، پاش ماوەیەک بە تەئسیری «موحەممەد پاشای جاف» ئەو شێخە لە سەرکاری لائەبرێ‌و «عوسمانی خاڵە» لە شوێنی دائەنرێ کە یەکێک

بووه لە پیاو ماقوڵانی «یەزدان بەخشی»، ئەم ئاڵوگۆڕە لەگەڵ وەزعی مەولەوی نەگونجاوە، لەبەر ئەوە مەولەوی لە «شەمێران» باری کردووەو چوەتەوە بۆ «سەرشاتە» لە «تاوەگۆز». کە «موحەممەد پاشا» بەمە ئەزانێ نامەیەکی بۆ ئەنوسێ وگلەیی لێ ئەکا تیایاکە بۆچی شەمێرانی بەجێ هێشتووە؟ ئەمیش لە وەڵامی نامەکەیدا بۆی ئەنوسێ کە «عوسمانی خاڵە» لەگەڵ خزمەکانی ئەم باش نەبوە، لەبەر ئەوە ناچار بووە بار بکا. لەگەڵ نامەکە ئەم چەند شیعرە فارسی‌یەشی بۆ ئەنوسێ:

وزان سوی وطن هجرت نمودم　　خلافت از علی دانسته بودم
به تاثیر محمّد میر اکمل　　خلافت چون به عثمان شد محوّل
دل خویشان ما را پر ز خون کرد　　به خویشاوند خود نعمت فزون کرد

واتە: بۆیە گواستمەوە بۆ نیشتمان چونکە خەلیفەییم بۆ «عەلی» بە حەق ئەزانی، وە کە بە تەئسیری «موحەممەد پاشا»، درا بە «عوسمان» دڵی خزمەکانی ئێمەی پڕ کرد لە خوێن، وە خەڵاتو بەراتی بۆ خزمەکانی خۆی زیاد کرد. مەبەس لە عەلی شێخ «عەلی» وە لە عوسمان «عوسمانی «خاڵە»یە. مەولەوی لەم شیعرە ناسکانەیدا ئیشارەتی بۆ مەسەلەی خەلافەتی «عوسمان»ی کوڕی «عەففان»و «عەلی»ی کوڕی «ئەبوتالب»یش کردووە، وە ئەو وەزعە رابوردووەی هێناوەتە بەرچاو.

***

وەک وتمان مەولەوی لە سەردەمی فەقێیەتی‌دا زۆر لای «کوردستانی عێراق»و «ئێران» گەڕاوە. پاش ئیجازە وەرگرتنیشی گەڕانی هەربووە، سەفەری «جوانڕۆ»و «کرماشان»و «هەورامان»و «مەریوان»و «سنە»و «بانە»و «سابڵاخ»ی کردووە. هەتاوەکو کە ئەچێتە سابڵاخ لە پێشانا خێڵی «سەیید»ی «نظامی» کە لە نەوەی مەلا «ئەبوبەکر»ی «مصنّف»نو هاوبشتی مەولەوین زۆر گوێی نادەنێ، بەڵام پاشان کە شارەزای «علم»و «فضل»ی ئەبن ناچار ئەبن دەوری بدەنو حورمەتی بگرن.

هەروەها سەفەری «سلێمانی»و «خانەقی»و «کەرکوک»و «بەغدا»یشی بووە. جارێکیان بە نیازی «حەج» ئەکەوێتە رێ، کە ئەگاتە بەغدا هاوڕێکەی پارەی رێگای حەجەکەی لێ

ئەدزێو ئەگەڕێتەوەو بڵاوی ئەکاتەوەکە گوایە مەولەوی مردووە، وەک بڵێی وابزانێ ئیتر مەولەوی ناتوانێ بگەڕێتەوە. کەس و کاری پرسەی بۆ دائەنێن. پاش ماوەیەک هەندێ لە زاناو ئەدەبپەروەرانی بەغدا کە بە مەسەلەکە ئەزانن خەرجی ڕێگای بۆ ئامادە ئەکەنو ئەینێرنەوە. کە ئەگاتە بەرەوە، منداڵو کەس وکارەکانی دەس بەجێ ئەچن کابرای دزی درۆزن ئەگرنو ئەیبەنە لای مەولەوی. «مەولەوی»ش بێ ئەوەی هیچی لێ بکا پێی ئەڵێ ڕۆڵە خوا ڕووی ئەجەل ڕەش کا وا منی خەجاڵەتی لای تۆ کرد... خۆزگا بمردایەمو تۆم وا بە ڕووزەردی نەدیایە.

لە نێوانی مەولەویو گەلێ لە زانایانو پیاوانی خواو پیاو ماقوڵانی ئەو دەمەی کوردو ئێرانی دا پەیوەندی یەکی بەتین بووە. مەولەوی پارچە شیعری بەرزو نامەی ڕازاوەی بۆ شێخ «موحەممەد جەسیمی سنە»و شێخی «سراج‌الدّین»و «بهاءالدّین»و «ضیاءالدّین»و «موحەممەد پاشای جاف»و «مەحمود پاشا»ی کوڕی «معتمدالدّوله = فەرهاد میرزا»و «حسام‌الدّوله»ی برای نوسیوەکە مامی «ناصرالدّین، شای قاجار» بوون. هەروەها هەمیشە هەڵبەستی جوانی ناردووە بۆ دۆستانی وەک شێخ «موئمنی سازانی»و شێخ «حەسەنی سازانی»و شێخ «یۆسفی«نوسمە»یی و شێخ «عەزیزی جانەوەرە»یی و «ئەحمەدبەگی کۆماسی»و شێخ «عبداللەی داخی»و گەلێک لە شاعیرەکانی تر... زۆربەی شیعرەکانی بە «کوردی»و نامەکانی بە «فارسی» بووە. جارجاریش چەند دێڕێکی عەرەبی لەو نامە فارسی یانەدا نوسیوە. ژمارەیەکی زۆرم لەو نامانەی مەولەوی لەلایە. هەندێکیان دۆستی موحتەرەمم «سەیید تاهیر هاشمی» لە «دەوڵەت ئاوا»وە بۆ ناردوم. ئەگەر بۆم ڕێ کەوتایە یەکم ئەخستنو لە شێوەی کتێبێکی ئینشادا بڵاوم ئەکردنەوە.

***

«مەولەوی» زاتێکی قسەخۆشو نوکتە بازیش بووە. جارێکیان میوانی دۆستێکی ئەبێ لە «پاوە»، تا لەوێ ئەبێ خواردنێکی خۆشی دەرخوارد نادا. کە ماڵاوایی لێ ئەکاو ئەگەڕێتەوە دۆستەکەی تا ملەی «کەڵیان» ـکە شوێنێکە لە نزیکی پاوە ـ ڕەوانەی ئەکا. لەویا پێی ئەڵێ: بێ قەزابی پەلەت کردو زوو تەشریفت برد... من بە تایبەتی کاوڕێکم هەڵگرتبوو

ئەمشەو بۆتی سەربڕم و بیکەین بەکەباب و پێکەوە بیخۆین و رای بوێرین... مەولەویش لە وەراما ئەڵێ: مادەم وا بێ وەڵڵا دڵت نایەشێنم و لەگەڵت ئەگەڕێمەوە تا کەبابەکە بخۆین... وە ئەگەڕێتەوە. کابراش ناچار کاوڕەکە سەرئەبڕێ و بۆی ئەبرژێنێ...

رۆژێکیان لەگەڵ شێخ «سەعیدی ناوجاف»دا ئەڕوا بۆ دیدەنی «کاک فەرەجی بەرزنجە» کە سەرگەورەی سەییدەکانی «بەرزنجە» بووە بۆ ئەوەی شەجەرەی سەییدەکانی پێ مۆر بکا. کە نزیکی بەرزنجە ئەبنەوە «کاک فەرەج» بە هاتنی مەولەوی ئەزانێ و تێ ئەگا بۆچی هاتووە. بە دانیشتوانی مەجلیسەکە ئەڵێ: کە مەولەوی باسی مۆر کردنی شەجەرەکەی کرد، من تا بەینێک بۆی مۆر ناکەم و توڕەی ئەکەم تا بزانین ئەڵێ چی. کە مەولەوی ئەگاتە بەرەوەو ئەحەسێتەوە مەسەلەی مۆری شەجەرەکە ئەخاتە ئاراوە. کاک فەرەج ئەڵێ مەولەوی حاشا ئێوە سەیید نین و بەرزنجەیی دان بە ئێوەدا نانێن. مەولەویش ئەڵێ فەرەج... فەرەج ئەگەر بە شەرع رەفتار ئەکەی ئەوە «خاتمەی ابن‌حجر»، وە ئەگەر ئەش‌ڵێیت ئێمە حازرین بۆ «ابن‌خنجر»... بەخوا قەسەم ئارام ئەبی باشە!، ئەگینا لە حەرەکە و جم‌وجوڵت ئەخەم و ساکنت ئەکەم!!... واتە: «فەرەج» ئەکەم بە «فەرج»... ئەویش دەس ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ خۆم بۆ قسەیەکی وا راگرتبوو،... وە شەجەرەکەی بۆ مۆر ئەکا.

***

«مەولەوی» لەگەڵ هەرجۆرە خەڵکێکا بە گوێرەی عەقڵی ئەوانە جوڵاوەتەوە. جارێکیان لە مەجلیسی شێخ «عبدالقادری موهاجر»دا ئەبێ لە «سلێمانی». کابرایەک دێتە ژوورەوەو ئەپرسێ مەلاکان «ئامین» کردن لە نوێژا واجبە یا سونەتە؟ مەولەوی گورج هەڵی ئەداتێ و ئەڵێ: باوکم «ئامین» کردن واجبە!، وە ئەگەر نەیڵێی نوێژەکەت بەتاڵ ئەبێتەوە. کابرا ئەڕوا مەلاکان ئەڵێن: مەولەوی ئەم فتوا غەڵەتە چی بوو دات؟ مەولەویش ئەڵێ: کورە ئێوە عەوام ناناسن، وەڵڵا ئەگەر بزانێ «ئامین» سونەتە «وَلَاالضَّالِّين»یشی پێوە ئەخوا.

رۆژێکی تر هەر لە مزگەوتی شێخی «موهاجر»دا کە ئێستا پێی ئەڵێن مزگەوتی «شێخ لەتیفی دانسار» خەریک ئەبێ خۆی ئامادە ئەکا بۆ نوێژی «مەغریب»و فەرەنجی یەکی درێژی لەبەرا ئەبێ، کابرایەک بانگی ئەکا: کورەکابرا فەرەنجی یەکەت نوێژی پێوە نییە

فرێی دە، ئەویش گورج فرێی ئەداو نوێژ دائەبەستێ... کە لە نوێژ ئەبنەوە یەکێک لێی ئەپرسێ ئەوە لە راستیدا فەرەنجییەکەت نوێژی پێوە نەبوو وافرێت دا؟ مەولەوی ئەڵێ: نەوەڵڵا پاکو نوێژی بوو، بەڵام تا من کابرام حاڵی ئەکرد کە نوێژییە، نەک جەماعەتی «مەغریب» بەڵکو هی «عیشا»یشم لە کیس ئەچوو... وتم چاتر ئەوە فرێی دەمو لەکورتی بیبڕمەوە.

***

«مەولەوی» زاتێکی زیرەکو حازرجوابو قسە بەمەعنا بووە. لە «حسەین بەگی حەسەن بەگی جاف»م بیست، وتی: بیستومە پاش تەواو بوونی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی مەولەوی لە خزمەتی مەلا «عبدالرّحمانی نۆتشە»یی‌داکە موفتی «سلێمانی»و مامۆستای مزگەوتی «مەڵکەندی» بووە، «ئەحمەد پاشای بابان»و پاشازادەکانی‌ترو تاقمێک لە مەلاو فەقێ ئەچن بۆ «سەرچنار» بۆ سەیران. لە رێگەدا فەلاحێک سەر رێگەیان لێ ئەگرێو دەس ئەکا بە سکاڵای حاڵی خۆی لای «ئەحمەد پاشا»و پێی ئەڵێ: پارچە بەراوێکم هەیە هەموو ساڵێ ئەیکەم بە تەرەکاڵو بۆخۆم پێی ئەژیم، ئەمساڵ یەکێک لە پیاوەکانی تۆ لێی داگیر کردومو زۆریشم لێ ئەکا بە جووتی خۆم بیکێڵمو بیکەم بە تەرەکاڵ بۆ ماڵی پاشا. مەولەوی نایەڵێ پاشا وەرامی فەلاحەکە بداتەوە، ئە چێتە پێشەوەو خۆی لە فەلاحەکە توورە ئەکا. کابرای فەلاح سەرسام ئەبێو بە مەولەوی ئەڵێ: مەلا تۆ لای خۆت «مەلا»یت و پیاوی دینی، کە تکایەکم بۆ ناکەیتو چاکەت لە دەم دەرناچێ بۆچی خراپەم لەگەڵ ئەکەی؟ مەولەویش ئەڵێ: مردووت مرێ من لەبەر بێ‌عەقڵی تۆ توورە بووم، ئاخر تۆ نەت بیستووە دنیا مەزرەعەی ئاخیرەتە، ئێستا پاشا ئەگەر بە جووتی بێگاری زەوی داگیرکراو نەکێڵێو نەیکا بە تەرەکاڵ بۆ دیوەخان، «دنیا»ی چۆن ئەبێ بە مەزرەعەی قیامەتی؟. کە پاشا ئەم قسەیەی مەولەوی ئەبیسێ شەرمەزار ئەبێو ئەڵێ: مەولەوی تکا ئەکەم بەسیەتی، کابرا برۆ زەوی خۆت بۆ خۆت، وە هەر پیاوێکی من هات بەلاتا دەریکەو گوێی مەدەرێ.

«مەولەوی» لە ١٢٧١ی هیجری‌دا بە فەرمودەی شێخی «سراج‌الدّین‌ﷺ» لەگەڵ حاجی شێخ «عبدالرّحمان»ی کوڕی شێخا ئەڕوا بۆ «سنە» بۆلای «غوڵام‌شاخانی والی» بۆ مەسەلەیەکی ئایینی. پاش ئەوەی چاویان بە والی ئەکەوێ، ڕۆژێکیان والی بە مەولەوی ئەڵێ: حەزئەکەم بۆم بەیان بفەرموی کە لەگەڵ بوونی «امیرالمؤمنین علی‌ﷺ»دا چۆن قابیلە بێگانە ببێ بە خەلیفەو جێگە نشینی پێغەمبەر؟ «میرزا جەعفەرخانی وەزیر» وە مامەیەکی «والی»یش کە قلیانداری خۆی بووە لەو مەجلیسەدا ئەبن. مەولەویش لە وەراما بە والی ئەڵێ: رجا ئەکەم لەبەر خاتری ریشی سپی مامت ئەم پرسیارە لە جەنابی وەزیر بفەرموی. «والی» تێ ئەگا مەولەوی مەبەستی چیەوا!...سەر دائەخا. مەبەستی مەولەوی ئەوە بووە: ئەگەر خزمایەتی بوایە بە هۆی نزیکی‌و بەڵگەی جێ نشینی، نەئەبوو «والی» مامی خۆی بکا بە قلیاندارو بێگانە بکا بە وەزیر... هەروەها ئیشارەتی بۆ ئەوەش کردووە ئەگەر خەلافەت بەسرابوایە بە خزمایەتی‌یەوە خۆ حەزرەتی «عەباس‌ﷺ» مامی پێغەمبەر بووە، وە حەزرەتی «عەلی‌ﷺ» ئامۆزای بووە. کەواتە ئەبوو «والی» داوای خەلافەتی بۆ «عەباس» بکردایە نەک بۆ «عەلی».

هەر لەو سەفەرەدا ڕۆژێکی‌تر «والی» مەعنای ئایەتی ﴿**كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ**﴾ لە مەولەوی ئەپرسێ، ئەمیش ئەڵێ: خوا لەسەر باسکی «ازل»ەوە روی کردبوە دەشتی «ابد» وە وێنەی جوزئیاتی عالەمی وەک ران لەبەر عیلمی خۆی‌دا ڕاگرتبوو، وە گاڵۆکی قەزای گرتبوو بە دەستی قودرەتیەوە، وە بەو گاڵۆکە هەریەکێکی لەو جوزئیاتە نیشانەکردبوو بۆ شتێ. ئێستا هەموو ڕۆژێ، بەڵکو هەموو تاوێک لەسەر ئەو نیشانانە ئیش‌و کاری خۆی بەرامبەر بە عالەم دەرئەبڕێ‌و جێ‌بەجێی ئەکا.

«مەولەوی» جارێکیان لەگەڵ زانایەکی جەعفەری گفتوگۆ ئەکا، زاناکە لێی ئەپرسێ بۆچی ئەهلی سوننەت بەرامبەر بە حەزرەتی «عەلی‌ﷺ» چاو لە ڕاستی ئەنوقێنن‌و حەقی خۆی نادەنە دەست‌و دان بەوەدا نانێن کە خەلیفەی یەکەم بووە، بەڵکو خۆشیشیان ناوێ؟ مەولەوی لە وەراما ئەڵێ: سوننی‌یەکان لایان وایە «عەلی‌ﷺ» ناو دوو کەسن، یەکەمیان کابرایەک بووە لە ترسی خەڵک فەرمودەی پێغەمبەری خستوەتە پشت گوێی کە لە بارەی

خەلیفەیی ئەوەوە فەرموویەتی، وە دەستی لە حەقی خەلافەت هەڵگرتووە بۆ یەکێکی بێگانەی ناشایان، وە گوێی بە شەرع نەداوەو «جاریە»ی لە خەلیفەیەکی «غصب»کەر وەرگرتووەو کچی خۆیشی داوە بە خەلیفەیەکی تری «غصب»کەر... ئێمە ئەو «عەلی»یەمان خۆش ناوێ. دووهەمیش‌یان کەسێکی خاوەن باوەڕو ئازاو لە ڕێ لانەدەر بووە، وە لە «خوا» بەولاوە لەکەس نەترساوەو «جاریە»ی لە خەلیفەی شەرعی نەبێ لەکەسی‌تر وەرنەگرتووەو کچی خۆی بە خەلیفەی پێغەمبەر داوەو بە جێگەداری ڕاستی ئەوی زانیوە. ئەو «عەلی ﷺ»یەمان خۆش ئەوێ‌و بە شێری خواو خۆشەویستی پێغەمبەر و درگای شاری زانستی ئەزانین. مەبەستی مەولەوی ئەوە بووە: ئەگەر حەزرەتی «عەلی ﷺ» خۆی بە خەلیفە بزانیایەو لای وابوایە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوە ئەو خەلیفە بێ، دەستی لەو خەلافەتە هەڵنەئەگرت، وە «جاریە»ی وەرنەئەگرت لە حەزرەتی «ئەبوبەکر ﷺ»و کچی خۆی نەئەدا بە حەزرەتی «عومەر ﷺ».

جارێکیان «موحەممەد پاشای جاف» لە گەرمیان نەخۆش ئەبێ، مەولەوی ئەچێ بۆلای بۆ هەواڵپرسی. پاشا بە مەولەوی ئەڵێ: دۆعایەکی خێری بۆ بکاو ئامۆژگارییەکیشی بکا. مەولەویش ئەڵێ: بۆ دۆعای خێر درێغێ ناکەم، ئامۆژگارییەکەشم ئەوەیە: تۆ خاوەنی دوو شتی ماڵی دنیاو ئیمان. ماڵەکەت هێشتا خۆت ساغی «مەحمود بەگ»و «عوسمان بەگ»و مناڵەکانی‌تر دابەشیان کردووە لە نێوانی خۆیانا، ئیمانیشت شەیتان خۆی بۆ مەڵاس داوە. ماڵەکەت هەرچی لێ‌دێ قەیدی نیە، چونکە ماڵی باوک هەربۆ ئەولادە، دەخیلتم ئاگات لە ئیمانت بێ شەیتان بە تاڵان نەی‌با.

«مەولەوی» شێوەناسیش بووە. لە شێخ «جافر»ی شێخ «ئەحمەدی ناوجاف»م بیست، کە ئەویش لە نەوەی مەلا «ئەبوبەکر ﷺ»ەوە خزمی مەولەوی‌یە، وتی: ڕۆژێکیان باوکم‌و شێخ «سەعید»ی مامی ئەچن بۆلای مەولەوی، مامم لە مەولەوی ئەپرسێ ئەم کوڕە ئەناسی کە لەگەڵمە؟ مەولەویش لە باوکم ورد ئەبێتەوەو ئەڵێ: بەخوا کاکە شێخ ئەم کوڕە سەری لێ شێواندوم، بە چاوو بڕۆیا لە خۆمانەو بە شێوەی قسەو جل‌و بەرگ‌و سەروپێچی‌شیا لە قەرەداغی ئەچێ. مامم ئەڵێ: ڕاست ئەفەرموی، برازامەو دایکیشی لە سەییدەکانی «بەڵخە»ی «قەرەداغ»ە.

ئێستا ئەم وردە سەرگوزەشتانەی «مەولەوی»م لە یاد بوو، وا نوسیمەوە بەڵکو بۆ ئەوە بشێن لە سەرێکەوە کەڵکێکیان لێ وەربگیرێ. لە «سەید ئەحمەد»ی کوڕی شێخ «عبدالرّحمانی عازەبانی»م بیست وتی: کتێبێکم لای شێخ «نجم‌الدّینی بیارە» دی مەولەوی نوسیبوی وە سەرگوزەشتەی خۆی تیا نوسیبوەوە. داخەکەم من بە درێژایی ماوەی مانەوەم لە «بیارە» نەئەو کتێبەم دی، وە نە هیچم بیست لە بارەیەوە.

[١]

## ئیمشەو تەنیابێ

ئـــیمشەو تـــەنیا بـــێ جـــەستەی زەبـــوونم
دیســـــان ســـــەرواز کـــەرد دڵەی پـڕ هـــوونم(١)

خـــــــەیاڵان خـــــام هـــــاوردم بـــــەردم
هـــاوار جـــە دەمـــەی هـەناسەی سـەردم!(٢)

زوخـــــــاو گـــــێج مـــــەدا دیگ دەروون‌دا
هـــووناو هـورشاناش جـەستەی زەبـوون‌دا(٣)

ڕەنگا ڕەنگ ڕەنگ، ڕەنگ گوڵ گـوون هـوونم
قـــرچـــەی بـرێشـتـەی کـوورەی دەروونـم(٤)

چون دانەی سەر ساج هـور ئـامام جـارجـار
جـــە تـــاو دووکـــەڵ، جـــە شـەرارەی نـار(٥)

سۆزیام هەی سۆزیام، وێنەی شـوعلەی نـوور
بیم سورمەی سوبحان ئاوەردەی کۆی توور(٦)

---

[١]

(١) سەرواز کەرد: سەر ڕێژی کرد. هوون: خوێن.
(٢) خام: خاو. دەمە: کزە بای ساردی سەر کێوان کە زستانان بە بەفرەوە بەرز ئەبێتەوە.
(٣) گێج مەدا: گێژی ئەخوارد. دیگ دەروون‌دا: لە مەنجەڵی سینەدا. هور شاناش: قوڵپی ئەدا. جەستەی زەبوون‌دا: لە لەشی لاوازما.
(٤) ڕەنگا ڕەنگ ڕەنگ: ڕەنگی ڕەنگاو ڕەنگ. گوڵ گوون: گوڵ ڕەنگ. برێشتە: بـرژاو، واتە: گیرۆدەی ئەم حاڵەم.
(٥) هور ئامام: هەڵ‌ئەهاتمەوە. شەرارەی نار: بڵێسەی ئاگر.
(٦) سۆزیام: سووتام. سورمەی سوبحان: کڵەی خوایی. ئاوەردەی کۆی توور: هێنراوی کێوی توور.

مـــن قـــەقنەس نـــەویم، هـا بـیم وە قـەقنەس
یەکجاریچ ئیمشەو، هـا بـەرشیم جـە دەس(١)

ئـــــەوەند خـــــەیاڵان بـــــەردم وە دەروون
پـــەی دووری یـــاران بـــەتەر بـــیم زەبـــوون

رۆ جـــــە شــــــەو فـــێشـــتەر، زارو زەلیـــلم
ســـاقی! ســـا جـــامێ، ئـــەمجار دەخـــیلم(٢)

بـــدەر پـــێم نـــۆش کـەم چـــون هـەردەجاران
وە رەغـــــم گـــــردین گـــــرۆی مـــەیخواران(٣)

شـــــیعر وێم تـــەنخوای ســـەمتوور ســـازێ
لێدەر، ســـا نـەیچی! هـەر تـارێش گـازێ(٤)

چنگ پێکۆ نـە جـەرگ نـەغمەی سـازەکـەت
بـــــەرارۆ تــــۆتـــۆ مـــیقراز گـــازەکـــەت(٥)

---

(١) قەقنەس: پەلەوەرێکە. نەویم: نەبووم. بـەرشیم: دەرچـوم. وەك ئـەڵێن قـەقنەس کـە مردنی نزیك ئەبێتەوە هەندێ پەڵو پووش کۆ ئەکاتەوەو دەس ئەکا بە خوێندن بەسەریا، وە لە خۆشی دڵی خۆیا ئەوەندە باڵ ئەدا بەیەکا تا ئاگـر لە بـاڵەکـانی ئـەبێتـەوەو پـەڵو پووشەکەش ئاگری تێ بەر ئەبێ وە خۆیشی ئەسووتێ. دیسان خۆڵەمێشەکەی ئەبێتەوە بە قەقنەسێکی ترو هەر بەم چەشنە...
واتە: لە گڕی دەروونی خۆما ئاگرم تێبەربوو سووتامو ئەمشەو بـە یـەگـجاری لە دەس دەرچووم.
(٢) فێشتەر: زیاتر، لە «بیشتر»ی فارسیەوە هاتووە.
(٣) بدەر پێم: بمدەرێ. هەردە جاران: جـاری جـاران. وە رەغـم: بـەکـوێرایـی چـاوی. گردین: هەموو. گرۆ: دەستە.
(٤) تەنخوا: لەباتی. لێدەر: لێبدە. تار: تەل. واتە: شیعرەکانی خۆم بە نەی لەباتی سازو سەمتوور لێبدە، با هەر تەلێکی وەکوو گازێ وابێ بۆ دەرکێشانی ریشەی جەرگم.
(٥) بەرارۆ: دەربێنێ. تۆتۆ: چین چین. میقراز: مقەس. واتە با نەغمەی سازەکەت چـنگ گیرکا لە جەرگم، وە چین چین وەکوو گازی مقەس دەریکێشی.

ســـادەروێش! کــەفێ بــدە نــە رووی دەف
گـــیان مــونتەزرەن پــەرێ ڕێزەی دەف(١)

مـــوغەننی! لێدەر یــەك ئــیمشەو ســازان
بــەشقی ئــەو کــەسە تــۆش ئــاوات وازان(٢)

بـــەڵکـــە خـــەمانم تــۆ دەری وە بــاد
هــەی‌های جــوانــم، فــرێم هــەن مــراد(٣)

ســـاقی! ســـا دەخـــیل وە فــریادم ڕەس
بـــە رووی نـــازەوە جــام گــێرە وە دەس

دەور دەرە وە نـــاز چــون هــەردە جــاران
پــێمدەر یــەك مــەنێ ســەباو ئــێواران(٤)

بـــا وەس بـــاڵیـــنم ســێلاو هــوون بــۆ
ئـــامێتـــەی زوخـــاو دیگ دەروون بــۆ(٥)

وەخـــتەن ســـەر تــا پــام بــبۆ وە زوخــاڵ
بــۆی ســفتەکــەم هــور گــێرۆ شــەماڵ(٦)

ســـاقی! ئـــامانەن، نــەشوو جــە ویــرت
وە فـــریادم ڕەس تـــۆ بــەشقی پــیرت(٧)

---

(١) کەف: بەری دەست. ڕێزەی دەف: لەرینەوەی ئەو ئەڵقانەی بەکەللەی دەفەوەن.

(٢) سازان: سازەکان. بەشقی ئەو کەسە: بە عەشقی ئەوکەسەوە. تۆش ئاوات وازان: بە ئاواتی گۆرانی وتنی تۆوەیە.

(٣) دەری: بدەی. فرێم هەن مراد: ئاواتم زۆرە.

(٤) دەور دەرە: سووڕێ بخۆ. یەك مەنێ: پێکێکی یەك مەنی، واتە: گەورە.

(٥) باوەس: بابەس. باڵینم: سەرینم. سێلاو: لافاو. ئامێتە: تێکەڵاو.

(٦) ببۆ: ببێ. بۆی سفتەکەم: بۆ پرووزم. هۆرگێرۆ: هەڵگرێ، بیبا.

(٧) نەشوو جەویرت: لەبیرت نەچم.

بـــەڵ ئـیمشەو خـەمان نـەدەرۆم وە بـاد
سـاقی! گـیان، قـوربان، خـاتر کـەرە شـاد[١]

بـووە وە بـاعس ئـەی نـیم گـیان سـەخت
سا بەڵکە نەمرۆ «مەعدوومی»ی بـەدبەخت[٢]

## [٢]

## ئازیز! دیارەن[٣]

ئـــازیزا دیـــارەن، وادەی لوامـــەن
ئـــەلوەدای ئـــاخر ئـــەوەنامامەن[٤]

دەوڵەتـــەکـــەی وەســڵ پـا نـە زەواڵەن
جـــارێوتـــەر دیـدەن بـالآت مـەحالەن[٥]

ســــا دڵم وەش کــــەر وەئــیلتیفاتێ
بـــدیە وە لاوە، بـــوینووت ســـاتێ[٦]

---

(١) نەدەرۆم وەباد: نەمدا بە با: خاتر کەرە شاد: دڵم خۆشکە.
(٢) واتە: ببە بە هۆی مانەوەی ئەو نیوە گیانە نارەحەتم با نەمرم.

[٢]

(٣)مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی لە سەردەمی فەقێیەتیدا بۆ «شێخ عەزیزی جانەوەرەیی» هاوڕێی نوسیوەکە لێی جوێ بووەتەوەو چووە بۆ «بانە».
(٤) لوامەن: ڕۆیشتنمە. ئەلوەدا: ئەلوەداع، ماڵاوایی. ئەوەنامامەن: نەگەڕانە دوامە. لە هەندێ نوسخەی تردا [illegible]: «ئاماو نامامەن». واتە: هاتنەوەو نە هاتنەوەمە.
(٥) وەسڵ: بە یار گەیشتن. پا نە زەواڵەن: پێ لە لەناو چوونە. جارێوتەر: جارێکی‌کە.
(٦) وەش کەر: خۆش کە. ئیلتیفات: لا لێ کردنەوە. بدیە وەلاوە: بڕوانە بە لادا، لایە بکەرەوە. بوینووت: بتبینم.

با بەیۆ شنۆی شیرین رازەکەت
گۆش دەرۆ لادێ مەینەت گازەکەت[١]

ئاخر سەفەرەن، را خەیلێ دوورەن
مەنزڵ بێ پایان تۆشە زەروورەن[٢]

دینت تۆشەی چەم، مەیلت تۆشەی دڵ
رازت تۆشەی گۆش، مەنزڵ وە مەنزڵ[٣]

کێ زانۆ چۆن بۆ ئەی دنیای فانی؟
یا بۆ نە بەین گەردەن ئازادی!

من شەوێ ناڵەم جۆش ئاوەردەبۆ
سەگی ئاسانەت بێدار کەردە بۆ[٤]

یا ناستەبۆ سەیل دیدەم، نەفەسێ
نەسیم گەرد پات بەرۆ پەی کەسی[٥]

جەمینت زەحمەت نیگام کێشابۆ
کەف پات وە خار دیدەم ئێشابۆ[٦]

---

(١) با بەیۆ: با بێت. شنۆ: شنە. شیرین رازەکەت: قسە خۆشەکەت. گۆش دەرۆ: گوێ شل‌کا. لادێ: تاوێ. مەینەت گازەکەت: ئەو خۆشەویستەت کە مەینەت گازی لێ گرتووە.
(٢) ئاخر سەفەرەن: دووا سەفەرە. را: رێ. تۆشە: توێشوو.
(٣) دینت: دیتنی. چەم: چاو.
(٤) ئاسانەت: بەر قاپیت. لە «ئاستانە» وە هاتووە. واتە: نەوەك شەوێکیان ناڵەی من جۆشی هێنابێ‌و سەگی بەر قاپیتی بێدار کردبێتەوە.
(٥) ناستە بۆ: نەی هێشتبێ. نەفەسێ: هەناسەیێك، تاوێك. بەرۆ: برێ، ببا. واتە: یا خود لافاوی چاوم تاوێك نەی هێشتبێ بای نەسیم تۆزی پێت بەرێ بۆ یەکێك.
(٦) جەمینت: ناوچاوت، تەوێڵت، لە «جبین»ی عەربی‌یەوە هاتووە. نیگام: سەیرکردنی من. کەف پات: بەری پێت. خار: دڕك. واتە: نەوەك ناوچاوت ئازاری پێ گەیشتبێ بە هۆی ئەوەوەکە من بۆ روانیوە، یا خود بەری پێت بە دڕکی برژانگم ئێشابێ کە بەسەریا ئەڕۆیشتی.

یـــا کـــەردەبۆ دڵ دێوانـــەکـەی تـەنگ
وەخت نـــیشانەی دڵان پــەی خــەدەنگ[١]

پـــەلەپەل پـــەی زەوق زامـــێ وە تـیرت
ئـــازار دابـــۆ تـای زوڵف زەنـجیرت[٢]

یـا خــۆ تــۆدابــۆت وە دڵ مـەزەی مـەرگ
تـیر خـەدەنگت دابـۆ نـەتۆی جـەرگ[٣]

یـــا مـــەڕدەبــۆت دڵ دێوانــەی دڵگــیر
جـە تـیر ئـەندازی کـەردەبۆت تـەقسیر[٤]

یـــا نـــەدابــۆت تــۆز گـەرد پـاڵاکــەت
پـەرێ سـورمەی چـەم سـفتەی بـاڵاکـەت[٥]

تـــۆ بــویەر جــە مــن، مــن زوو ویــەردم
هیممەت بـۆ، هـا ژار مـەحروومیت وەردم[٦]

---

(١) خەدەنگ: تیر. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دایە.
(٢) زەوق: زووق، چەشتن. واتە: یا خود دڵە شێتە خەفەتبارەکەم کاتێك کە دڵان ئەبن بە نیشانە بۆ تیری چاوت، پەلە پەلی کردبێ بۆ چەشتنی زامێ لە تیرەکەی تۆوە، وە لە پەلە پەل‌دا ئازاری گەیاندبێ بە تای زوڵفی تۆ کە بووە بە زەنجیر دڵی منی پێ بەسراوەتەوە.
(٣) دابۆت: دابێتت. شاعیر پاش ئەوەی داوای لێبووردنی تاوانەکەی خۆی کرد لە یار، دێتە سەر باسی تاوانەکانی ئەویش تا گەردنی ئازاد بکا. ئەوەتە ئەڵێ یـا خـود تـۆ تـامی مەرگت بە دڵم چشاندبێ‌و بە تیری برژانگەکانت جەرگمت بریندار کـردبێ‌و دڵمت پـێ بەش کردبێ لە پێکران بە تیر.
(٤) مەڕدەبۆت: شکاندبێتت. واتە: ئەگەر دڵیشمت لە تیر بـێ‌بـەش نـەکـردبێ، کـەمت دابێتێ‌و درێغت لێ کردبێ، وە بەوە دڵت شکاندبم.
(٥) پاڵا: کەوش. پەرێ: بۆ. واتە: تۆزی کەوشەکانت نەدابێ بۆ کلەی چاوی ئەو کەسەی سووتاوی عەشقی باڵاتە.
(٦) بویەر: ببورە. ویەردم: بووردم. هیممەتت بۆ: خواحافیز بێ. وەردم: خواردم.

چەپگەرد پەی دووریت شانا مۆرەی نەرد
وە زاهـر «بانە»ش وە بەهانە کەرد[(١)]

تا فەڵەك پەیمان نە بەهانە بۆ
ئەر سەد بانە بۆ، باز شوکرانە بۆ[(٢)]

ئەر فرسەتش‌دا پەی دڵ خەمینت
عومرێ دووبارەن جارێوتەر دینت[(٣)]

وەر ناستش، ئازیز! تۆ وە سڵامەت
دیدەن دیدار کەوت ئەو قیامەت![(٤)]

---

(١) چەپگەرد: گەردوونی چەپگەرد. شانا: وەشاندی. بانە: شارێکە لەکوردستانی ئێران لە سنووری ناوچەی «پێنجوێن»ەوە. واتە: گەردوون کە زاری خۆی هەڵدا دووریی هێنا، ئیتر چون بۆ بانەی کرد بە بیانوو، ئەم شیعرە لە نوسخەکەی مەحمود پاشادا بەم جۆرە نووسراوە:

چەپگەرد جە خاتر وێش هەرگیز نەویەرد    کەی بێ جامی‌مان پڕ جە گەرد نەکەرد

واتە: گەردوون رۆژێ دەستی لە ئارەزوی خۆی هەڵنەگرت، رۆژێ نەبوو جامی مەی‌مان پڕ نەکا لە خاكو خۆڵ.

(٢) پەیمان: بۆمان. ئەر سەد: با سەد جاریش، هەرچەند. واتە: تا گەردوون لە سەر بیانوو بێ پێمان، ئەگەر هەر بۆ بانەش‌مان دوور بخاتەوە هەر شوکرانە بژێرین.

(٣) دڵ خەمینت: دۆستە دڵ پڕ لە خەفەتەکەت.

(٤) ناستش: نەی هێشت. نیوە شیعری دوهەمی ئەم شیعرە لە هەندێ نووسخەدا بەم جورە نووسراوە:

کەوتەن ئەو دیوان سارای قیامەت

واتە: چاو پێ کەوتنەوەت کەوتووە دیوەخانی دەشتی مەحشەر.

## [٣]

## ئەمجار سەخت تەرەن

ئــەمجار ســەخت تــەرەن زامــم جــە جــاران
چــڵ مــدۆ دایــم چــون گــەستەی مــاران(١)

هــەر وە زۆر مــەندەن رای ئــامای نــەفەس
تــای ریشــەی تــاقەت شیەنم جــە دەس(٢)

بــڵێســەی فــیراق ســۆچــنان جــەستەم
نــاسۆرەن زامــان گــاز خــەم بــەستەم(٣)

دووی کــەواو دڵ پــۆشــان ســەر هــەردان
زەرد کــەردەن روخســار پــایز دەردان(٤)

ســەرسامەن عــاڵەم یــەکســەر جــە نــاڵەم
فــەڵەك مــۆرەی بــەد شــانا وە تــاڵەم(٥)

مــەینەت ســەر بــەرزەن، شــادیم زگــارەن
ســاقی! جــامەکــەت ئــەمجار وەکــارەن(٦)

---

**[٣]**

(١) چڵ مدۆ: چڵ ئەدا.
(٢) ئامای نەفەس: هەناسەدان. شیەنم جە دەس: لە دەسم دەرچووە.
(٣) سۆچنان: سووتاندوویە. ناسۆرەن: لێی کردووم بە تیراوی. گاز خەم بەستەم: کە بە گازی مەینەت لێم پەیدا بووە.
(٤) دوو: دووکەڵ. کەواو: کەباب. پۆشان: دای پوشیوە. زەرد کەردەن...تاد: پایزی دەردی روخساری زەرد هەڵگێڕاوم.
(٥) تاڵەم: «طالع»م، بە ختم. واتە: گەردوون زاری خرابی بۆ بەختی من هەڵدا.
(٦) زگار: زویرو خەفەتبار. واتە: ئەمڕۆ کە مەینەت باویەتی شادیم لە دڵا نیە، وەختی ئەوەیە پیاڵەکەم بدەیتێ.

بۆریٚ وە مەجلیس لا بەر پەردەی شەرم
وە دەوریٚ دیسان بەزمیٚ کەرمیٚ گەرم[١]

تا موتریب وە ساز حەنجەرەی بیٚ گەرد
هوردۆ مەقامیٚ دەوا کەرۆ دەرد[٢]

بەڵ ناکا نەیچی بەیۆ جە لاوە
وە مەقامەکەی قەقنەس ئاساوە[٣]

بەزمیٚمان جەم بۆ چون هەردە جاران
بنۆشین جامیٚ وە یاد یاران[٤]

هەر وە زۆر مەندەن نیم نەفەس باقی
پڕ کەر جامەکت، دەخیلم ساقی!

ئەر ئازیز وەی تەور لیٚم کەرۆ ستەم
خەلاسیم نیەن ئەمجار خاتر جەم[٥]
عەرەق چون شەونم نیشتەن نە رووی گوڵ
تەڕ کەردەن تاتای توغراکەی سونبوڵ[٦]

جە قازان خەم، دڵ کەردەن وە ئاو
وە درۆ ماچۆ مەگیٚروو گوڵاو[٧]

---

(١) بۆریٚ: وەرەوە. دەوریٚ: هەڵسوورانیٚکی تر. کەرمیٚ: بکەین.
(٢) حەنجەرە: ئاوازەی بین. هوردۆ مەقامیٚ: هەڵ بداتە لیٚدانی نەقامیٚ.
(٣) بەیۆ: بیٚت. وەمەقامەکەی... تاد: واتە: نەقامەکەی کە وەك ئاوازی قەقنەس خۆش و دڵگیرە.
(٤) بەزمیٚمان جەم بۆ: کۆڕیٚ ببەستین.
(٥) لیٚم کەرۆ ستەم: ستەمم لیٚ بکا. شیعرەکانی دوواوە باسی ستەمی یار ئەکەن.
(٦) گوڵ: مەبەستی کوڵمی یارە. توغراکەی سونبوڵ: زوڵفە لوول خواردووەکەی کە وەك مۆری توغرایی وایە.
(٧) واتە: لە مەنجەڵی خەما دڵمی تواندوەتەوەو کردوویە بە ئاو، کەچی بە درۆی خۆی ئەڵیٚ گوڵاو ئەگرم.

ئـازیزم! گـوڵاو بـۆی خـۆی کـوڵم تـۆن
ئەر بـۆی تـۆ نـەبۆ بـۆی گـوڵاو جـەکـۆن؟(١)

زەڕەی بــۆی زوڵفت کـەفتەن نـە بـەرزان
بـۆی گـوڵان کـەردەن جـە بـەرزان هـەرزان(٢)

ئـازیز، وە مـەرگت گـەر ئـینسافت بـۆ
هـەنی کـافی‌یەن بـۆی زوڵفت پـەی تـۆ(٣)

ئـیتر چ حـاجەت وێت مـەدەی عـەزاو:
قـەبووڵ کـەری جـەور مـەگێری گـوڵاو؟(٤)

[٤]

## ئیحیا نەبوون(٥)

ئـیحیا نـەبوون، سـا نـەشوون مـەردەن:
نـامەکـەش ئـامان، گـلەییش کـەردەن(٦)

---

(١) خۆی: ئارەق. جەکۆن: لەکوێیە. (٢) زەڕەی: تۆزێکی.
(٣) هەنی: ئیتر. کافی‌یەن: بەسە.
(٤) عەزاو: عەزاب، ئازار. قەبووڵ کەری... تاد: خۆت ماندوو ئەکەی گوڵاو ئەگری.
[٤]
(٥) مەولەوی ئەم غەزەلەی لە وەڵامی دۆستێکیا نووسیوە کە نامەی بۆ ناردووە و گلەیی لێ کردووە لەنامەکەی‌دا.
(٦) ئیحیا نەبوون: زیندوو نەبمەوە. نەشوون مەردەن: نەچمەوە مردن. ئەم شیعرە بە پێی هونەری «بدیع» پێی ئەڵێن «لف و نشر». نیوەی شیعری یەکەم دوو بەشە، نیوەی شیعری دووهەمیش هەروەها. بەشی یەکەمی نیوە شیعری دووەم ئەگەڕێتەوە بۆ بەشی یەکەمی شیعری نیوەی شیعری یەکەم، بەشی دووەمی نیوە شیعری دووهەمیش ئەگەڕێتەوە بـۆ بەشی دووهەمی نیوە شیعری یەکەم. واتە: چۆن زندوو نـەبمەوە لە پاش مـردن لە بـەر دووری ئەو کە نامەی هاتووە بۆم؟ وە چۆن نەمرمەوە کە گلەیی لێ کردووم؟

قـــاسد! شـــۆ وە لای ئـەو نـەو نـەمامە
چـون یـاوای، پـێش دەر ئـەی جـواو نـامە(١)

جـەو ئـەسکەنجەبین دەس سـوروشتەکـەت
یـانێ: نـامەکـەی زێـاو زوشـتەکـەت(٢)

بـە بـادەکـەی وێت جـام جـام وەردەوە
تـاڵی سـەفرای دەرد دووریش بـەردەوە(٣)

فـەرمابێت بـەو لەفـز شـەکـەر رازەوە
گـا جـە رووی عـیتاب، گـا وە نـازەوە:(٤)

نـە وەخت هـیجران ویـداعت فـاما،
نـە وە شـەماڵدا پـەیامت ئـاما(٥)

دەیسـا هـورێزە، خـەمیارەکـەی وێم
بـۆ شـاد بـەر وە دیـن دیدارەکـەی وێم(٦)

---

(١) قاسد: نێرراو. شۆ: برۆ. یاوای: گەیشتی. پیش دەر: بیدەرێ.
(٢) ئەسکەنجەبین: جۆرە شەربەتێکی ترش و شیرینە. دەس سروشتەکەت: بە دەستی تۆ دروست کراوەکە. زێباو زوشتەکەت: جوانو ناشیرینەکەت، بەڵام لێرەدا مەبەس «خۆش و ناخۆشەکەت»ە، چونکە نامەکەی هەندێکی خۆشەو هەندێکی ناخۆشە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە مەعنای شیعری دوایی یەوە.
(٣) بادە: مەی. وێت: خۆت. وەردەوە: خواردیەوە. واتە: نێرراو بچۆ پێی بڵێ کەوا نامە پڕ لە قسەی خۆش و ناخۆشەکەتی خوێندەوەکە وەك سکەنجەبینی ترش و شیرین وابووکە بۆ نەهێشتنی سەفرا ئەخورێتەوە، وە بە خوێندنەوەی سەفرای دەردی دووری لابرد. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «بە بادەکەی وێت» نووسراوە: «بیمارەکەی دڵ» واتە: دڵ برینداره‌کە...
(٤) فەرمابێت: فەرمووبووت. بەو لەفز... تاد: بە قسە وەك شەکر شیرینەکانت. گا: گاهێ، جارێ. وتراوەکەی لە شیعری دواوەدایە.
(٥) ویداعت فاما: فامیت خودا حافیزی بکەی. پەیام: پەیغام.
(٦) هورێزە: هەڵسە. خەمیارەکەی وێم: هاورێ کەی کاتی خەمیاریم. لەم شیعرەدا قسەکەی ئەو دوایی دێ کە پێی وتبوو.

تـــۆ تـــیرەکـــەی وێت، وە زامـــداری وێم
تـــۆ بـــێ بـــاکـــی وێت، بـوردە بـاری وێم[١]

ئـــەو وەخت پـــای کـــاو هـــەرد دڵ تـەم بـۆ
ئـــــەساسەی دووری ئـــازیزان جـــەم بـــۆ[٢]

چـــۆن نـــەبڕیـــۆ تـــای رشتەی سـەبووری؟
گـۆش چـۆن وێش مـدۆ وە قسـەی دووری؟

زوان چـــۆن تـــاقەت هـــیممەت وازیشـــەن؟
دیـــدە چـــۆن تـــاقەت شـــۆن دیـایی‌شەن؟[٣]

گـــێج مـــدۆ دەروون چـــەنی نـــێش، ئـامان!
بەڵام هەی سەر خـــێڵ نـەو تـووڵ نـەمامان[٤]

چـــــۆن یـــارای نـــەفەس بـــەراوەردەمـــەن؟
ســـــۆزش وە شـــەماڵ رەوان کـــەردەمەن؟[٥]

---

(١) بوردەباری: سابیری. لەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوەدا وەڵامی ئەداتەوەو بیانووی بۆ دێنێتەوە، ئەڵێ: سوێندت ئەدەم بە تیرەکەی خۆت‌و بە برینداری خۆم... تاد.
(٢) کاو: زەردو ما. ئەساسەی: هۆیەکانی. مـەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شـیعری دوایـی هەموو لە شیعری ژمارە یانزدەدا لێ ئەدرێتەوە.
(٣) هممەت وازی: ماڵاوایی. شۆن دیایی: بـە شـوێنـا روانـین. واتـە: کـاتێ کـە داوێنـی هەردی دڵ تەم دای گرتبێ‌و هەموو هۆیەکی دووری ئازیزان کۆ بوبێتەوە، تـاڵی رشـەی سابیریی من چۆن ناپچڕێ‌و گوێ چۆن ئەتوانێ باسی دووری ببیسێ‌و زوبان چۆن توانای ماڵاوایی ئەبێ‌و چاو چۆن تاقەتی بە شوێنا روانینی ئەمێنێ؟.
(٤) نێش: ئێش. نەو تووڵ: تازە هەڵچوو.
(٥) یارا: توانا. نەفەس بەراوەدەمـەن: هـەناسە دانـمە. سـۆزش: سـۆزی دەروون. رەوان کەردەمەن: رەوانەکردنمە.

مــەتەرسوو جــە حــیفز تــەقریر ئــەحواڵ،
ســـۆچــۆ خــەزانــەی خــەیاڵ شــەماڵ(١)

مــن خــۆ شــەوو رۆ ئــارەزووی تــۆمــەن
پـــەرێ دیـــدەنت نـــەزرو فـتۆمــەن(٢)

بـــەڵام، یـــەن وە یــاد بــاڵاکــەی تــۆوە
دەورم دان وە دەور ســـــاراو ســـــەرکۆوە(٣)

بـــۆی بــاڵات هــەرزان وە دەشتو دەردان
نــمەز رای لای تــۆم وەکــام گــوزەردان(٤)

گـلەی تـۆ وەی تـەور، حـاڵەت وەی نـەسەق
دووریچت وەی رەنگ، خودا تۆ وە حـەق!(٥)

---

(١) مەتەرسوو: ئەترسم. سۆچۆ: بسووتێ. واتە: ترسی ئەوەم هەیە ئەگەر شەماڵ باسی حاڵو ئەحواڵم بێنێ بۆ لاتان گەنجینەی خەیاڵی شەماڵ گڕی تێ بچێ، چونکە ئـەوەندە سۆزم هەیە.

(٢) پەرێ: بۆ. نەزرو فتۆ: «نذر الفتوح»، بەو سەدەقەیە ئەڵێن کـە بـۆ هـاتنەدیی دڵخـواز ئەکرێ.

(٣) یەن: ئەوەندە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٤) نمەز: نازانم. واتە دیارە من هەمیشە خوا خوای ئەوەمە بۆم هەڵکەوێ بت‌بینم، وە بۆ گەیشتن بەم ئەنجامە خێرو حەسەنات ئەکەم، بەڵام ئەوەندە بە یادی باڵای تۆوە گەڕاوم، بۆنی تـاو هـەموو دەشتو دەری گـرتووەتەوە. لە بـەر ئـەوە نـازانـم رێی لای تـۆ لەکـام گوزەرەوەیە. تا بێم بۆ لات. مەولەوی بەم شێوە جوانە وەرامی خۆشەویستەکەی ئەداتەوەو بۆی باس ئەکاکە بۆچی پێی نەکرا ماڵاوایی لێ بکاو ئێستاش نە ئەتوانێ سەرێکی لێ بدا وە نە ئەش‌توانێ نامەیێکی لێ بنووسی.

(٥) تۆ وا گلەییم لێ بکەیتو منیش حاڵەتم وابـێو دووریشت ئـەوەندە نـاخۆش بـێ، مەگەر هەر خوا خۆی بەزەیی پیاما بێتەوە...

## [٥]
## ئارەزوومەندیم

ئـــارەزوومەندیم جـــە حـــەد ویـــەردەن
فـــراوان خـــەیلێ تـــاسەی تـــۆم کـــەردەن(١)

قـــیبلەم بـــەو ئـــەحەد بـــێ هـەمتای فـەردەن
ســـەوگەند یـەکـێوەن چـەنی تـۆم وەردەن(٢)

فکـــــرو خـــــەیاڵان وەســـواســـەی وەفـــات
دایـــم نـــە دڵەن نـــە رووی ســـەر بســـات(٣)

شـــــەوان تـــــا وە رۆ فکـــــرم جـــە لاتـــەن
رۆح رەوانـــــــم نـــــــە خـــــاك پـــــاتەن(٤)

قـــــاڵبـــــم بـــــێ رۆح، ئـــەڕوام نـــەمەندەن
مـــن دان حـــەیات زیـــندەگـــیم کـــەندەن(٥)

نـــــامت چـــــون ئـــەوراد ســـوبحو ئـــێواران
مـــوانـــووش وە گـــەرم نـــە پـای دیـواران(٦)

چـــــەمم چـــــون شـــــاباز وێڵ شکـــار بـــۆ
دایـــم بـــاڵ پـــەرواز نـــە ســـەر دیـــار بـــۆ(٧)

---

**[٥]**

(١) ویەردەن: تێپەڕیوە.

(٢) بەو ئەحەد: بەو تاكو تەنیایە. سەوگەند: سوێن.

(٣) وەفات: وەفای تۆ. نەڕووی... تاد: لەم سەر زەوی‌یەدا.

(٤) رۆح رەوانم...تاد: گیانم لە سەر خاکی بەرپێ‌تایە.

(٥) قاڵبم: لاشەم. ئەڕوام: ئەڕواحم، گیانم. من دان... تاد: من دانی ژیانم کەندووەو تازە بە تەمای ژیانی نەماوم.

(٦) ئەوراد: ویردو دوعا. موانووش: ئەی‌خوێنم. نەپای دیواران: لە پەنای دیوارانا.

(٧) شکار: راو. باڵ پەرواز: باڵی گرتبێتەوە. نە سەر دیار بۆ: بە سەر وڵاتانا. واتـە: ئـەی چاوەکەم من وەکوو شاباز... تاد. قسەکەی لە شیعری پاشەوەدا تەواو ئەبێ.

جــە ســەر قــەڵاوە مــەگــێڵوون پــەی تــۆ
دەك دیدەم هەر دوو سـەد جـار فـدێت بـۆ(١)

ئـــامان، هـــەی ئـــازیز بــینایی چـــاوان!
گـــلەم هـــەن جــە تــۆ خــەیلێ فــراوان

یـانێ چـێش مـەیلت فـەرامـۆش کـەردەن
مەر بادەت نـە جـام بـێ شـەرتی وەردەن؟(٢)

وەرنــە یـانێ چـێش نـە جـاران جـارێ
خـــەبەر نـــەپەرسی جـــە راویـــارێ؟(٣)

ئـــومێدم ئـــێدەن، ئـــامانەن ئـــامان!
جــەی فــێشــتەر نــاسۆر نــەوزی زامـان(٤)

ئــەحوال حــاڵات شــەرتو وەفــاکــەت
بکــیانە پــەرێم تــۆ بــی خــوداکــەت!(٥)

نــە ســاڵو نــە مــاه، نــە هــەفتە نــە شــەو
نـــە ســـاتێ ئـــارام، نـــە دەقــیقە خــەو

نـــمەشۆم نـــە چـــەم، دیــدەم، نـــەدووریت
هەر ئێد موانوون: ئـاخ جـە مـەهجووریت!(٦)

---

(١) سەر قەڵا: هەوارگەیەکە ئەکەوێتە پشتی دێی «سەرشاتە» کە نشینگەی مەولەوی بووە. مەگێڵوون: ئەگەڕێم. فدێت بۆ: بە قوربانت بێ.

(٢) مەر: مەگەر، بۆچی. بادەت... تاد: شەرابت لە پیاڵەی بێ شەرتی یا خواردووەتەوە؟.

(٣) وەرنە: ئەگینا. نەجاران جارێ: جارێ لە جاران. راویار: رێبوار.

(٤) ئێدەن: ئەمەیە. نەوزی: نەخەی. واتە: لەمە زیاتر زامەکانم بە ناسۆر نەخەیتەوەنەیان کولێنیتەوە.

(٥) بکیانە پەرێم: بنێرە بۆم.

(٦) نمەشۆم نە چەم: ناچێتە چاوم. ئەم جوملە مەعنای شیعری پێشوو تەواو ئەکات. هەر ئێد... تاد: واتە: وردی زوبانم ئەوەتە هەمیشە ئەڵێم ئاخ لە دووریت.

ئـــیسه کـــێ تـــاقەت دووری تـــۆ دارۆ؟
دەك بـــەرق غـــەزەب وە جـــەستەم وارۆ![١]

بـــە ســـەرگەردت بـام، ئـەڕواحـەکـەی وێم!
جـــــواب ســـــەریح بکـــــیانه پـــــەرێم...

[٦]

## ئەنیس خەیاڵ

ئـــــەنیس خـــــەیاڵ دەردان پـــــڕ زام!
مـــەرهەم جـەستەی خـەستەکـەی نـاکـام![٢]

خـــەیلێن نـــە گـــێجـــاو بـــەحر مـــەهجووری
نـــــــە دەور دوەی تـــــەنوورەی دووری[٣]

پـــووشەکـــەی جـــەستەم وە پـــەنا کـــەفتەن
ســـــامیعەم خـــــەبەر یـــاران نـــەشنەفتەن[٤]

ئـــینشەڵڵا، چـــەنی خـــۆشـــحاڵی، شـــادی
نـــە شـاخەی شـۆخـی گـەردوون، ئـازادی[٥]

---

(١) دارو: هەیەتی. وارۆ: بباری.

[٦]

(٢) ئەنیس: هۆگر، پێوە گیراو. مەولەوی بەم شیعرە قسە لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆی ئەکا.

(٣) دوە: دووکەڵ. تەنوورە: گێژ. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٤) کەفتەن: کەوتووە. سامیعەم: گوێچکەم. نـەشنەفتەن: نـەی بیستووە. واتـە: دەمێکـە لەشی وەك پووشم لە بەرگێژە لوولی دەلیـای دووریو دووکـەڵی تـەنوورەی لێ جـوێ بوونەوەت کەوتووەتە لاوە. ئەوەتە هیچ باسێکی تۆم بەر گوێم نەکەوتووە.

(٥) چەنی: لەگەڵ. شاخە: پیا هەڵ شاخان. شۆخی: گاڵتە پێ کردن.

چــەنی وەش‌بــەختی دوو دەس نـە گـەردەن
عــومرتان وە عـەیش عـوشرەت ویـەردەن[(١)]

نـەك چـون مـن جـە دەس بـێ مـەیلی دڵبـەر
مــە كـێشـوو هـەر سـات هـەزار دەردسـەر[(٢)]

دایـــم دڵ رەنـــجوور هـــیجران یـــارم
زەنـــــجیر جـــەفای زوڵف نـــیگارم[(٣)]

خــوسووس شـەرارەی دووری زۆر كـەردەن
مەزرەعەی هـەستیم وای سـەبوون بـەردەن[(٤)]

كــەس بــەوێنــەی مــن پــڕ مـەینەت نـەبۆ
گـــورفتار دۆس بـــێ بـــەینەت نـەبۆ[(٥)]

هــیچ كــەس مــوبتەلای دووری یــار نــەبۆ
چــون مــن سـەرگەردان بـێ قـەرار نـەبۆ

كـــەس نــەبۆ چــون مــن یــار بــەدكاران
زامــدار مـــوژەی دیـــدە خـــوماران[(٦)]

جـــە هـــاژەی هــووناو دەروون پــڕ دەرد
نــە گـەردش چـەرخ گـەردوون چـەپ گـەرد

---

(١) وەش بەختی: بەختیاری. عوشرەت: خۆش رابواردن. ویەردەن: بەسەر بردووە.
(٢) مەكێشوو: ئەكێشم.
(٣) دڵ رەنجوور: دڵ شكاو. زەنجیر: بەندی. نیگار: وێنەی جوان. مەبەس لە یاری وەك وێنە جوانە.
(٤) زۆر كەردەن: زۆری هێناوە. هەستیم: بوونم. مەبەس لە لەشیەتی. وا: با.
(٥) بێ بەینەت: بێ وەفاو بێ‌بەین.
(٦) موژە: برژانگ. دیدە خوماران: چاو مەستان.

تــا جــە تــۆ بــڕیــام وە مــەرگت قــەسەم
ســـــاتێ ئـــاسایش نـــەدیەنم وە چـــەم

نــــەکـــــەری خـــــەیاڵ گـــلەیی کــەردەن
نــەواچـــی بــادەی بــێ شــەرتیش وەردەن(١)

ئــــەر زەلیـــل دەس بــێ شـــەرتان نــەبوون
کــەی مــەبۆ مــەیلت فــەرامـۆش کــەروون؟(٢)

••••••━━●━━••••••

[٧]

## ئیمشەو هەم خەمان

ئــیمشەو هــەم خــەمان وەنــەم ســەرداوە
ســـەر تـــا پـــای تــەنم ئـــایر وەرداوە(٣)

جــــەستەی زەعــــیفم، ئــیستیخوان ڕێش
هــەر ئــازای ڕێشــم مــەگــریا پــەی وێش(٤)

گــۆشتو پــۆســتەکــەم نــەفت پــێدا ڕژیــا
مــــەغزو ئــیستیخوان وە هــەمدا پــڕژیا(٥)

کـــەس نـــەبی ئـاوێش بکـــەرۆ ســـەردا
بــلێســـەش بــەرز بــی وە هــەر تــەرەفدا

زاهـــیرەن دڵم هـــەم کــــۆسش کــــەفتەن
داخۆم جــە دۆســان هــەم کــێ دوور کــەفتەن؟

---

(١) نەواچی: نەڵێی. وەردەن: خواردووەتەوە.

(٢) نەبوون: نەبم. کەی مەبۆ: کەی ئەبێ. کەروون: بکەم.

[٧]

(٣) وەنەم سەرداوە: سەری لێ دامەوە. ئایر وەرداوە: ئاگری بەردایەوە.

(٤) ئیستیخوان: ئێسقان. ڕێش: بریندار. هەر: هەموو. مەگریا: ئەکولا.

(٥) وەهەمدا پڕژیا: پڕان بەیەکا.

جە تاو ئایر تەنوورەی دەروون
دیسان سەرواز کەرد زوخاو چەنی هوون(١)

ساقی باوەرە ئەو مەی دووساڵە
پێم دەر یەك جامێ حاڵم بەد حاڵە(٢)

موغەننی! کۆکەر سازانت وە هەم
سەمتوورێ، تارێ، وە هەم کەرە جەم(٣)

نەیچی! سا لێدەر، قەزات وە ماڵم
دەمێ دەر جە نەی، دەروون زوخاڵم(٤)

هۆشێ کەر هام فەرد! سازان بسازە
باڵات وەکاڵای خەمان بوورازە(٥)

باوەرە بسات تەمام تەیار کە
شەو خەفتەن شووم بە ژار مار کە(٦)

قەزای پەنجەکەت دەك لە من کەفێ
خەیلێ عاجزم، سا لێدەر دەفێ(٧)

---

(١) سەرواز کەرد: لێشاوی هێنا.
(٢) باوەرە: بێنە. مەی دوو ساڵە: مەی کۆن. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «پێم دەر یەك جامێ» نووسراوە «پێم دەرە جامێ».
(٣) موغەننی: گۆرانی بێژ. کۆکەر سازانت وە هەم: سازەکانت بخەرە یەك.
(٤) دەمێ دەر جەنەی: دەمێ بنێ بە شمشاڵەوە.
(٥) هۆشێ کەر: هۆشێ بکەرەوە. هام فەرد: هاو دەم. سازان بسازە: سازەکان رێکخە. کاڵا: بەرگ. بوورازە: بدوورە.
(٦) بسات: راخەر، بەڕە. لێرەدا مەبەستی لێی هۆی رابواردنە. تەیار: ئامادە. شەوخەفتەن شووم: خەوی ناخۆشی شووم. واتە: خەوم لێ تاڵ کە با خەوم لێ نەکەوێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «بە ژار مار کە» نووسراوە: «وە ژار مار کە».
(٧) لەمن کەفێ: لە من کەوێ.

بـــاوەرەكـــوورەی دڵ نـــە جـــەهدو جـــەخت
ڕووی تەوبیخ وەلای «مەعدوومی» بەدبەخت(١)

[٨]

## ئیمشەو دیارەن

ئـــــیمشەو دیـــــارەن بـــانگم بـــیٚ شـــەرمەن
زایـــەڵەی ســـەمتوور كـــەللەم وە گـــەرمەن(٢)

ســـەدای زیـــلو بـــەم مـــەینەت ســـەد تـــەرزەن
خـــەفەت شـــادیشەن، خـــەم دەمـــاخ بـــەرزەن(٣)

هـــۆشـــم بـــیٚ هـــوشەن، فـــامم قـــامەت قـــاخ
بـــۆی دووری ئـــازیز مـــەیۆم نـــە دەمـــاخ(٤)

نـــەیچیا درەنگـــەن ســـا مـــەكـــەر درەنگ
فیدای پەنجەت بـــام، نـــەی بـــاوەر وە دەنگ(٥)

هـــــەر تـــــەرزیٚ پـــــەی ویٚش بكـــــەرۆ رازیٚ
گـــیٚرۆ نـــە دەروون هـــەر ســـازیٚ گـــازیٚ(٦)

---

(١) جەهدو جەخت: جۆشو خرۆش. تەوبیخ: سەرزەنشت. واتە: كاكـەی دەف لیٚدەر بە ئاوازی دەفـەكـەت دڵ بیٚنـە جـۆشو ڕووی سـەرزەنشتت بكـەرە «مـەعدوومی»ی چارەڕەش با بیر بكاتەوە.

[٨]

(٢) زایەڵە: ئاوازە. واتە: ئاوازەی كەللەی وەك سەمتوور گەرمی كردووەو دەنگ ئەداتەوە.
(٣) زیلو بەم: دوو ئالەتی مۆسیقان. تەرز: جۆر.
(٤) فام: تیٚگەیشتن. قامەت: باڵا. قاخ: وشەیەكی توركییە واتە هەستە، ئەبیٚ لە «قالق»ەوە هاتبیٚ. دەماخ: لووت. مەبەس ئەوەتە باڵای تیٚگەیشتنم هەستەی لیٚ كراوەرۆیشتووە.
(٥) مەكەر درەنگ: درەنگی مەكە. بام: بم. باوەر وە دەنگ: بیٚنە دەنگ.
(٦) واتە: هەر رەنگەی قسەیێ بۆ خۆی بكاو هەر سازیٚكی گازیٚ لە دڵ بگریٚ.

بجۆشۆ هەر کەس وە قەد ناڵەی وێش
بنۆشۆ هەر کەس وە پیاڵەی وێش(١)

جەلای هەر گەردێ وە سەدایێوەن
دەوای هەر دەردێ وە نەوایێوەن(٢)

هەر مەقامێوەت جگەر تاون بۆ
تفڵی بێچارەی دڵان لاون بۆ(٣)

ئەو سەدای دەردە خەیلێ دڵکەش بۆ
دڵ تفڵان ئاسا بەڵکم دڵوەش بۆ(٤)

هەی پەشێوی هۆش، هەی شێویان فام
هەی عەقڵ عەبەس، هەی خەیاڵ خام(٥)

من و دڵ وەشی و سەفایی کەردەن
هوونی یەکتەرین تا وەرۆی مەردەن(٦)

سا دەی، ساحیب نەی! ریشەی دڵ کەر پەی
تالیم دەر، ئەی فەرد وە نەزمەکەی نەی:(٧)

---

(١) بجۆشۆ: بجۆشێ، بکوڵێ. بنۆشۆ: بنۆشێ، بخواتەوە.
(٢) جەلا: پاك بوونەوە. گەرد: تۆز. وە سدایێوەن: بە ئاوازێکەوە. وە نەوایێوەن: بە لێدانی نەقامێکەوەیە.
(٣) تاون: توێنەرەوە. لاون. لاوێنەرەوە. واتە: دڵەی بەسەزمانی وەك مناڵم بلاوێنێتەوە.
(٤) واتە: ئەو دەنگەت هەرچەند ئاوازی دەردیش بێ، با خۆش و دڵگیر بێ بەڵکو دڵم وەك مناڵ پێی شاد بێ.
(٥) شێویا: شێوا. عەبەس: هیچ و پووچ. واتە: هاوار لە پەشێوی هۆش و تێکچوونی فامم... تاد هۆی ئەم هاوارەش لە شیعری دوایی‌دا دێ.
(٦) هوونی یەکتەرین: دوژمنی خوێنە خۆری یەکترین.
(٧) ریشەی دڵ پەی کەر پەی: ریشەی دڵ ببڕە. تالیم دەر: تەعلیم دادە. ئەی فەرد: ئەم تاقە شیعرە. نەزمەکەی: بەزم و ئاوازەی.

ئــیمشەو وە هــەر حــاڵ شــەو وە رۆ بــەروون
ئەی خوا سا مەرگێ، سەحەر چێش کەروون[١]

[٩]

## ئەیاز هەمراز[٢]

ئـــــەیاز هـــــەمڕاز نـــــاڵەو ئـــــاخ و دوود
عەرزش هەن وە خاك ئـاسانەی مـەحموود[٣]

یـــــاوا، وات، نـــــامەی شـــیرین ئـــینشادت:
نـــەی رەمـــەزاندا نـــەشوون جـــە یـــادت[٤]

نـــەکـــەردەن ئـــیفتار، دۆســـەکـــەی کـــامڵ!
ســیوای وە مــەیکووس خــەیاڵەکــەت، دڵ[٥]

---

(١) وەهەر حاڵ: هەر چۆن بێ. شەو وە رۆ بەروون: شەو رۆژ ئەکەمەوە. ئەم شیعرە ئەوەبوو کە داوای لە شمشاڵژەن کرد بە شمشاڵەکەی لێی دا.

[٩]

(٢) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەڵامی مەحموود پاشای جافا نووسیوەکە لە مانگی رەمەزانا بۆی نووسیبوو دوعای خێری بۆ بکاو بۆی بپاڕێتە وە لە بارەگای خوا.
(٣) ئەیاز: وەزیرە بەناوبانگەکەی سوڵتان مەحموودی کوڕی سوبوکتەگینی غەزنەوی‌یە. مەبەس لە ئەیاز مەولەوی خۆیەتی. دود: دووکەڵ. ئاسانە: بەردەرگا. ئەم هێنانێ ناوی ئەیازو مەحمووده بە هونەری بەدیع «توریە»ی پێ ئەڵێن. توریە ئەوەیە وشەیەك دوو مەعنای هەبێ، یەکێکی نزیك و یەکێکی دوور، وە بۆ مەعنا دوورەکەی بەکار بهێنرێ نەك بۆ مەعنا نزیکەکەی. ئەوەتە لێرەدا مەبەس لە ئەیاز مەولەوی‌یە، نەك ئەیازی وەزیری، وە مەبەس لە مەحموود مەحموود پاشای جافە، نەك سوڵتان مەحموود.
(٤) وات: وتی. شیرین ئینشادت: خوێندنەوە خۆشەکەت. نەشوون: نەچم. وشەی «یاوا»و «وات» هەردووکیان دێنەوە بە سەر جوملەی «نامەی شیرین ئینشادت» دا.
(٥) سیوای: بێجگە. مەی کووس: کاسەی مەی. واتە: ئەی دۆستی کامڵ دڵ بێجگە لەکاسەی شەرابی خەیاڵی تۆ بە هیچی‌تر بەربانگی نەکردووەتەوە.

فـــاتحەی کـــتاب دۆعـــام، شـــەو ئـــەر رۆن
ئـــیلتیماس حـــوسن خـــاتمەکـــەی تـــۆن[١]

حـــــەق وە لوتـــف وێش بـــاوەرۆ ئـــەوڕێت
ســـوود ســـەرمایەی عـــەقیدەکـــەی وێت[٢]

وەر نـــــە مـــــن لافـــاو تـــاوانـــان بـــەردەم
دۆعـــا رای دەرگـــای قـــەبووڵ گـــوم کـــەردەم[٣]

نـــەیچیا مـــن پـــەنجەی پـــای نـــاڵەم سفتەن
تـــۆ دەی چـــون تـــەئسیر وە نـــاڵەت جـفتەن[٤]

چـــەند فـــەرد «مـــەعدووم» دەروون نـــە وەیدا
بـــاوەر جـــە تـــەنخوای نـــاڵە وە نـــەیدا:[٥]

مـــــن وێم مـــزانـــوو کـــام تـــۆمـــم کـــاڵان
یـــاران پـــەی هـــیممەت وەنـــەم مـــەلاڵان[٦]

کـــــەرەم دەر نـــــە دەس رجـــای ئـــەوگاران
بـــۆ بـــەخشەم وە عـــەشق «مـظنە»ی یـاران[٧]

---

(١) فاتحەی کتاب: ئەوەڵی کتێبێ. ئیلتیماس: داوا. حوسن خـاتمە: ئـاخر خـێری. یـەك خستنی «فاتحە»و «خاتمە» بە هونەری بەدیع «تقابل»ی پێ ئەڵێن.
(٢) باوەرۆ ئەو ڕێت: بێنێتە ڕێت.. واتە: خـوا، بـە مـیهرەبانی خـۆی قـازانـجی بـاوەڕی خۆتت دەسگیر کا.
(٣) واتە: ئەگینا من لافاوی گوناح بردوومی‌و دوعام ڕێگای قبووڵ بوونی ون کردووە.
(٤) تۆ دەی: تۆ فەرموو شمشاڵێ لێدە. واتە: من پەنجەی پێی ناڵەم سووتاوە لە بەر ئەوە ناڵەم ناڕوا، بەڵام ناڵەی تۆ لە گەڵ کارکردنا جووتە، دەسا شمشاڵ لێ بدە.
(٥) دەروون نە وەیدا: دەروون لە نارەحەتیدا. باوەر: بێنە.
(٦) تۆم: توو. کاڵان: چاندووە. وەنەم مەلاڵان: لێم ئەلاڵێنەوە.
(٧) ئەوگاران: گورفتاران. «مظنە»: مەزننە، گومان. واتـە: ئـەی خـوایـەکـە تـۆ بـەخشیش

وەختێ گۆشەی شار خامۆشان بۆ جێم
نەبوون وە تەسدیع هامسایان وێم[١]

## [١٠]

## ئازیزم! ئاهیر

ئازیزم! ئاهیر دووری باڵای تۆ
جەستەم کەرد وە بووڵ، شەماڵ بەرد پەی کۆ[٢]

وریشەی پرشەی تاو کوورەکەی جەستەم
شەرارەی لولەی پێشەی شکەستەم[٣]

گرمەو پزیسکەی چەخماخەی پارە
بەرق بریسکەی شوعلەی شەرارە[٤]

شاخەی شریخەی برووسکەی دەروون
نە چەم شەتاوان جاری کەرد چون هوون[٥]

---

☞

ئەخەیتە دەستی تکای ئەوانەوەکە زۆر گیرۆدەن، بم بەخشە بە عەشقی گومانی چاکی دۆستان پێم. مەبەسیش لە بەخشینەکە لە شیعری دوایی‌دا باس ئەکا. لە هەندێ نووسخەدا لە جیاتی «کەرەم دەر نە دەس» نووسراوە «کەرەم دامنەی دەس» واتە: ئەی خوایەکە بەخشەندەگیت ئەوەندە زۆرە وەك داوێنەی پیاوی پەنادار وایە خەڵك دەستی پیا ئەپێچێنن.

(١) نەبوون: نەبم. تەسدیع: مایەی سەرئێشە. واتە: کە مردم نەبم بە هۆی ناڕەحەت بوونی دراوسێ گەورەکانم.

[١٠]

(٢) ئاهیر: ئاگر. بووڵ: خۆڵە مێش. بەرد پەی کۆ: بردی بۆ کێوان.

(٣) ورشە: شەوق. پرشە: پزیسك. تاو: جۆش. پێشە: ئیسقان. شکستە: شکاو.

(٤) پارە: پارچەی دڵ.

(٥) بەشی دووەمی ئەم شیعرە مەعنای شیعرەکانی پێشوو تەواو ئەکات. واتە: شەتاو لە

☜

مـــەوج مـــدۆ لافـــاو هـــوون دەجـــلەی دڵ
نـــە فـــوارەی چـــەم هـــۆر مشـــانۆ گـــڵ[١]

کـــای دڵم نـــە گـــێج مـــەوج فـــەنادا
مـــۆڵەقـــەن نـــە بـــەین خـــۆف و رجـــادا[٢]

تـــۆیـــچ ئـــینسافت بـــۆ هـــەنی وەســـەن وەس
«بـــاللە» جـــە دووریت، هـــا بـــیم وە قـــەقنەس[٣]

تـــاکـــەی چـــون مـــەجنوون ویـــڵ هـــەردان بـــم؟
تـــاکـــەی خـــەم زەدەی بـــار هـــیجران بـــم؟[٤]

هـــەر ســـاتێ دووریت ســـەد ساڵەن جـــە لام
دەردم کـــاریـیەن وە ســـەرگەردت بـــام!

بـــەزەییت بـــەیۆ وە جـــەستەو حـــاڵم
ریشـــەم بـــەراما، هـــەرەس وە مـــاڵم[٥]

---

☞

چاومەوە دێنیتە خوار وەك خوێن. مەولەوی ئەبوو بێوتایە: خوێن لە چاوەکانم دێنی وەك شەتاو، بەڵام چونکە ئەیەوێ ئەوە بگەیەنێ کە خوێنێکی زۆر لە چاوەکانیەوە هێناوە، هاتووە شەتاوی کردووە بە «مشبە»و خوێنی کردووە بە «مشبە بە».

(١) مەوج مدۆ: شەپۆل ئەدا. هور مشانۆ: هەڵ ئەدا. واتە: لافاوی خوێنی دڵی وەك دجلەم شەپۆل ئەدا وە لە فوارەی چاوەکانمەوە گڵ فڕێ ئەداتە سەر. مەبەسیشی لە گڵ زوخاوی دڵیەتی.

(٢) مەوج فەنادا: لە گێژی لە ناو چوونا. مۆڵەق: «معلّق»، وەستاو. واتە: دڵەی وەك پووشم لە گێژی شەپۆلی لە ناو چوونا وەستاوە لە بەینی ترسی لە ناو چوون و هیوای مانەوەدا.

(٣) تۆیچ: تۆش. هەنی: ئیتر. وەسەن: بەسە.

(٤) خەم زەدە: خەم لێ داو.

(٥) بەیۆ: بێت. بەراما: دەرهات.

## [١١]
## ئازیزم، ئامای

ئــــازیزم، ئـــامای ئـــای بـــێ قـــەرار وێم!
ئـــای ئـــای چـــەمەڕا ئـــای ئـینتیزار وێم!(١)

مـــەوتەنەکـــەی چـــەم دیـــدەش هـــانەرێت
غـــەریبی تـــاکـــەی، بـــۆ وە مـاوای وێت(٢)

هـــــای ســـــاقی! بـــازاڕ جـــیلوەی دڵدارەن
ســـەودای خـــرِیـــدار، دانـــەی دیـــدارەن(٣)

یـــەکـــێ وە مـــایەی گـــەنج «کـــەی»ەوە
چـــون مـــنیچ وە تـــای فـــەرتووت نـــەیەوە(٤)

ئـــەر سـەد هـەر کـەسێ پـەی وێش وە راوەن
وە قـــیمەت نـــیەن، ئـــیخلاس حـــەساون(٥)

---

[١١]

(١) ئامای: هاتی. وێم: خۆم. چەمەڕا: چاوەڕێ.
(٢) مەوتەن: «موطن»، شوێن. هانەڕێت: لەڕێتە. واتە: نیشتمانەکەت کە چاومە چاوی لە ڕێتە، سا بەس بێ غەریبی وەرەوە بۆ جێگای خۆت. ئـەش گـونجێ مـەبەسی ئـەوەبێ: سەرچاوەی چەمی فرمێسکم کە چاومە چاوەڕێتە....تاد.
(٣) سەودا: مامەڵە. خڕیدار:کڕیار. دانە:گەوهەر. واتە: ئەی ساقی ئێستا بازار دەرکەوتنی دڵدار گەرمە. وەکاتی سەوداکردنی کڕیارانە بۆ گەوهەری رووی یار.
(٤) مایە: سەرمایە. کەی: کەیخەسرەو، ئەڵێن پادشایەکی دەوڵە مەند بووە. منیچ: منیش. تا: تاڵ. فەرتووت نەی: دەزووی رزیـو. واتـە: هـەندێ کـەس لەم سـەودا دا سـەرمایەی دەسیان گـەمجی کـەیخەسرەووە. مـنیش دەسـمایەم تـاڵە دەزووی رزیـوە. ئـەم شـیعرە ئیشارەتە بۆ چیرۆکەکەی فرۆشتنی حەزرەتی یوسف کە پیرەژنێکیش هاتبوو کـڵافـەیێ دەزووی پێ بوو ئەیویست یوسفی پێ بکڕێ!.
(٥) ئەر سەد: هەر چەند. وە راوەن: بەڕێوەیە.

مـــایل کـــەر بـــاڵا وەی لادا چـــون نـــەی
دەسـێوت دەف بـۆ، ئـەو دەس جـام مـەی(١)

بـــا بـــێدار کـــەرۆ تـــاکـــەی بـــۆ غـــافڵ
دەف وە سەدا گیان، جـام وە رەشـحەی دڵ(٢)

بـــا کـــڵافـــە بـــۆ، ئـــاخر لەوانـــم
خـــاك پـــای حـــەزرەت پـــیر مـــوغانم(٣)

چـــون دەف، بـەرگ پـۆس ئـیرادەت پـۆشـم
غـــوڵام بـــەر دەس حـــەڵقـــە نـــە گـۆشـم(٤)

خـــوم ئـــاسا خـــەیلێن وەتـــەن مـــەیخانەم
چـــون پـــیاڵەی واق شـــیشەی پـــەیمانەم(٥)

---

(١) مایل کەر: لار کەرەوە. نەی: قامیش. دەسێوت: دەسێکت.
(٢) رەشحە: تەڕی، نم. واتە: با دەف بـە ئـاوازی خـۆی گـیانم بـێدار بکـاتەوەو پـیاڵەی شەرابیش بە تەڕی دڵم پاراو بکا.
(٣) پیر موغان: گەورەی ئاگر پەرستەکان. لێرەدا مەبەس لە خۆشەویستەکەیە. واتـە: بـا دەسمایەکەشم کڵافە دەزوویەك بێ، قەی ناکا منیش لەکڕیارەکانمو خاکی بەری پێی ئەو خۆشەویستەم کە هەموان روویان تێ کردووە.
(٤) پۆس: پێس. واتە: وەکوو دەف پێستی خۆشەویستیم بۆ ئەو لە بەر کـردووەئەڵقـەی بەندەگیم کردووەتە گوێم.
(٥) خوم ئاسا: وەك کووپەی مەی. وەتەن مەیخانەم: مەیخانە جێمـە. واق: خـاڵی بۆش. واتە: شیشەی دڵم وەکوو پیاڵەی خاڵی وایە هیچی تیا نیە.

[١٢]

## ئازیز تەن وەنیش

ئـــازیزا! تــەن وە نــێش زامــانت خــەستەن
مــەینەت پــای ئـامام وە زەنـجیر بـەستەن(١)

قــاسدێــچ واچــوون پــەی سـەفەر خـاسەن
رەوان بــۆ تــێز رەو، هــەرس‌و هــەناسەن(٢)

هـــێز پـــای رەفت‌و ئـــاماشان نـــیەن
ئەو سـەرچـەمەش وشك، ئـێد کـۆتـا بـیەن(٣)

سـا تـۆ بـۆ وە رەغـم بـەخت بـەرگەشتەم
جـاگـێر نـە دیـدەی وە هـووناو رەشـتەم(٤)

بـــا ســـاتێچ رەقـیب دووریت بکـێشـۆ
شـــەوێ وێنـــەی مـــن وەی رۆوە نـــیشۆ(٥)

---

[١٢]

(١) تەن: لەش. نێش: ئێش. زامانت: ئەو زامانەی لێت کرووم. ئامام: هاتنم.

(٢) قاسدێچ: قاسدێکیش. واچوون: بڵێم. رەوان بۆ: خۆش بڕوا. تیز رەو: تیژ رەو. هەرس: فرمێسك. واتە: ئەو نیرراوەی کە من پیا بپەرمووەوەو بڵێم بۆ ناردن دەس ئەداتیژ ئەڕوا، هەر فرمێسك‌و هەناسەمە.

(٣) رەفت‌و ئاماشان: هات‌و چوویان. سەر چەمەش: سەرچاوەی. ئێد: ئەم. بیەن: بووە. واتە: فرمێسك‌و هەناسەشم کە بەتەما بوون ببن بە قاسد، ئەوانیش کەڵکی ئەوەیان پێوە نەماوە: یەکیان کە چاوەتی سەرچاوەکەی وشك بووەو فرمێسکی پیا نایەت، ئەویشیان کە هەناسەیەتی کورت بووەو ناگاتە بەرەوە.

(٤) بۆ: وەرە، بێ. وە رەغم: لە رقی. بەرگەشتە: وەرگەڕاوە. جا گیر: جێ بگرە. نە: لە. ڕشتە: رێژراو. واتە: کە من نەمتوانی بێم بۆ لات‌و کەسیشم نەبوو بینێرم، خۆت وەرە لە ناو چاوما جێگا بگرە.

(٥) ساتێچ: ساعەتێکیش. رەقیب: بەدکار. بکێشۆ: بکێشێ. وەی رۆوە: بەم رۆ رۆهاوار هاوارە، یا بەم رۆژە رەشەوە. نیشۆ: دانیشێ.

وەرنـــــە، ســـا چـــونکە ئـــاسانەت دوورەن
را نـــــــمەزانــــــو، بـــــەڵەد زەروورەن[١]

دڵ وەلاتـــــەوەن، ئــــامان ســـــەد ئـــامان
ئـــامۆشـــۆش کـــەردەن، فـــرە جـــار ئـــامان[٢]

چـــــون وە تـــام زام دووری ســـەر شـــارەن
ویــــــانە مـــــارۆ، بـــــەدەن بـــــێزارەن[٣]

هـــــیچ مـــــەوەر وە تـــــەنگ ویــــانەشەوە
پـــــــەرێ بـــــەڵەدیـــــم، بکـــــیانەشەوە[٤]

## [١٣]

### ئەی گرد مەوجوودێ

ئـــەی گـــرد مـــەوجوودێ جـــە تـــۆ گـــرت مـــایە
مـــەوجوود هـــەر تـــۆنـــی، مـــاسیوا ســـایە[٥]

پـــەنهان بـــی تـــەنها، وەحـــدەتت مـــەوج وەرد
پـــــەی شـــــناسنایی زوهـــووریۆەت کـــەرد[٦]

---

(١) وەرنە: ئەگینا ئەگەر نایەی بۆ لام. نمەزانو: نازانم. مەبەسی ئەم شیعرەی لە شیعری داهاتوودا دەر ئەکەوێ (٢) وە لاتەوەن: بە لاتەوەیە.

(٣) سەرشار: بە تەواوی سەرخۆش بوو. ویانە: بیانوو. مارۆ: دێنێتەوە. واتە: بەڵەدەکەیشم کە دڵمە بە تامی زامی دووری لە من سەرخۆش بووە، ئیستا لای تۆیەو بیانوو دێنیتەوە، بێزار بووە لە لەشی من نایەتەوە بۆ لام.

(٤) مەوەر وە تەنگ: مەبە بە تەنگی. پەرێ: بۆ. بکیانەشەوە: بینێرەوە. واتـە: گـوێ بـە بیانووەکانی مەدەو بینێرەوە بۆ لام تا بێ بە بەڵەدمو لەگەڵی بێم بۆ لات.

[١٣]

(٥) گرد: گشت. ماسیوا: غیرە. سایە: سێبەر. واتە: ئەی خوایەکە هەرچی هەیە بوونی لە تووەیە، ئەوەی بە راستی هەبێ هەر تۆی و لە تۆ بەولاوە وەك سێبەر وایە.

(٦) پەنهان بی: پەنهان بوویت. وەحدەتت: یەکیەتی و تـەنهاییت. مـەوج وەرد: شـەپۆلی

بە وێت، جەی عالەم بێ بەقای ناسووت
ئەر وەی گرد جیلوەی وەرین نەشناسووت(١)

بە سەد جیلوەی تەر بێ چوونو چەنی
شناسایی تۆم نەمەبۆ، هەنی(٢)

سەروەشم بەی وەسف جەمالیتەوە
باز هەم بەی جیلوەی جەلالیتەوە(٣)

باز هەر بەو عادەت سەروەش نیگاران
پەی فەنای یەکسەر خاتر پڕ خاران(٤)

---

☞

دایەوە. شناسایی: ناسران. زوهورێوەت کەرد: دەرکەوتنێکت کرد. مەعنای ئەم شیعرە لە گەڵ نیو شیعری دوایی‌دا دێ.

(١) بە وێت: بە خۆت. ئەم وشەیە بەسراوە بە شیعری پێشووەوە. ناسووت ئینسان، ئادەمیزاد. واتە: تۆ بۆ خۆت بە تەنیا بوویت، دەرکەوتنێکت بە خۆت کرد لەم دنیای بێ بەقای ئینسانیەدا تا بناسرێیت. ئەر: ئەگەر وەی: بەم. وەرین: لەمەوپێش مەعنای ئەم نیوە شیعرە لەگەڵ شیعرەکانی پاشەوەدا دێ.

(٢) بێ چوونو چەنی: ئەی خودایەکە بێ چۆنیەتیو چەندی‌تیت. نمەبۆ: نابێ. هەنی: هێشتا. واتە: ئەگەر ئەم هەموو دەرکەوتنەی پێشینتەوە نەت ناسم، بە سەد دەرکەوتنی تریشەوە نات ناسمو تێت ناگەم ئەی خوای بێ چونیەتی‌و چەندیەتی.

(٣) سەروەشم: سەرخۆشم. بەی وەسف: بەم وەسفە. باز هەم: دیسانەوە. جیلوە: دەرکەوتن. سیفاتی خوا دوو جۆرن، سیفاتی جەمال کە مەعنای ئیجابی ئەگەیەنن، وەکوو «منعم، کریم، معطی»، وە سیفاتی جەلالی کە مەعنای سەلبی ئەگەیەنن وەکوو «قدیم، واحد» واتە: ئەوەڵی نیەو هاوڕێی نیە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعرەکانی دوایی‌دا دێ. لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە: «بازەم» لە جیاتی «باز هەم»،و «وە» لە جیاتی «بەی» بەڵام مەعنای هەردوو وشەکە هەر وەك یەکە.

(٤) بەو عادەت: بە عادەتی. سەروەش نیگاران: جوان چاکە سەرخۆشەکان. پەی فەنا یەکسەر: بۆ لە ناو چوونی یەکجاری. خاتر پڕ خاران: دڵدارە دەروون پڕ لە دڕکەکان.

چـــار نـــیەن جـــە دەس جـــیلوە نـەکـەردەن
«بسـم الله» ئـەو تـێخ، ئـێد کـەچی گـەردەن(١)

یـــــا گـــــێوتـــــەر نـــیەن داد وێم کـــەروون
جـــە دەس تـۆ بـێداد وە لای کـێ بـەروون(٢)

واوەیـــلام بـــێ حـــەد، زاریـــم بـێ شـۆمـەن
جـــە لای تـــۆ فـەریاد، جـە دەس تـۆمـەن(٣)

[١٤]

## ئای کێ بێ هەواڵ(٤)

ئـــای کـــێ بـــی هـــەواڵ لوای تـــۆ ئـاوەرد؟
بەختش بەرگەشت بۆ، هۆشم وەحشی کەرد(٥)

---

(١) چار نیەن... تاد: واتە: هەر ئەبێ خۆت دەرنەخەی. بسم الله... تاد: واتە: فەرموو ئەوە تیغو ئەمە گەردنی کەچ! مەعنای ئەم چەند شیعرە ئەوەیە: کاتێ کە تۆ خۆتم بۆ دەر بخەی بە نیشانەکانی سیفاتی جەمالیو جەلالیت من لە خۆشییا سەرخۆش ئەبم. جا ئـەگـەر دەوام بەو خۆ دەر خستنە بدەی زۆرم پێ خۆش ئەبێ، بەڵام ئەگەر بەعادەتی یارانی بێ باکو جوانو سەرمەست گوێم نەدەیتێ، وە وەك ئەوان بۆ لە ناو چوونی یەگجاری دڵدارە دڵ پڕ لە دڕکەکان کە خۆیان ئەشارنەوەو ناچارن خۆیـان دەرنـەخەن، تـۆش خـۆتـم لێ بشاریتەوە، ئەوە مەعنای وایە ئەتەوێ بمکوژی. جاکە واتە فەرموو «بسم الله» ئەوە تێغی تۆو ئەمە گەردنی کەجی من چی ئەکەی بیکە.
(٢) یاگێو تەر: جێگایەکی تر. نیەن: نیە. داد وێم کـەروون: هـاواری خـۆم بکـەم. بـێداد: شکات. بەروون: بەرم، ببەم.
(٣) بێ شۆ: لە ئەندازە بەدەر. جەلای تۆ... تاد: واتە: لای خۆت هاوارت لە دەس ئەکەم.

[١٤]

(٤) مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی بۆ حاجی مەحمودی کوڕی یاروەیسی پیاو مـاقووڵی مەحمورد پاشای جاف نوسیوە لە لاواندنەوە «مرثیە»ی «عبدالرّحمان»ی کوڕیدا.
(٥) کێ بێ: کێ بوو. لوای: ڕۆیشتنی، مردنی بەرگەشت بۆ: وەرگـەڕێ. هـۆشـم... تـاد: هۆشمی وێڵی کێوان کرد.

مــــدیا ئـــەو شـــۆنت دڵ نــە پــەنهاندا
چون ئـیسم «رحـیم» وە شـۆن «رحـمان»دا[١]

کـــۆتـــرەکـــەی ئـازاد حـــەریم دڵ بـیت
دانەی مۆبـەتچین پـەی ویٚت غـافڵ بـیت[٢]

ســـەیاد چـــەپ گـەرد ئـاخر فـرسەت سـەند
ناکـاو دوور ئـەنداز دووریت وە دڵ شـەند[٣]

هـــاڵای کـــزەی زام جگـــەر گـــۆشـــەی ویٚم
مـــوو ئــاساو ئـــایر هـــەر پیٚچ مـەدا پیٚم[٤]

ئـیٚش زام ســـەخت تـــۆیـــچ ئـاما پـیٚشدا
هـــەر ئـیٚشـەن مـدیەی کـەفتەن وە ئـیٚشدا[٥]

---

(١) مدیا: ئەیڕوانی. ئەو شۆنت: بە دواتا. نە پەنهاندا: بە نهێنی. چون اسم... تاد: واتە: وەك چۆن ناوی «رحیم» لە «بسم الله الرّحمن الرّحیم»دا ئەڕوانێ بە دوای «رحمان»دا. ئەم شیعرە نەزاکەتێکی جوانی تێدایە چونکە مەولەوی خۆی ناوی «عبدالرّحیم» بووە، وە ئەو کەسەش کە ئەم پارچە شیعرەی بە سەردا هەڵداوە ناوی «عبدالرّحمن» بووە.

(٢) حەریم: ئەرزی حەرام. دانە: دەنکە گەنمو دانەوێڵەو شتی وا. مۆبـەت: «محبت»، خۆشەویستی. واتە: تۆ کۆترێکی سەربەست بووی لە ئەرزی حەرامی دڵدا کە کەسێ‌تر ناتوانێ پێی تێ بنێ، بۆ خۆت چینەت ئەکرد لە دانەی خۆشەویستیداو ئاگات لە هیچ نەبوو. مەولەوی تەشبیهی دڵی خۆی کردووە بە ئەرزی حەرام کە مەککەو دەوروپشتیەتی، چون لە وێ باڵدارو پەلەوەر بە ئازادی ئەسوڕێنەوە چینە ئەکەن، وەکەس ناتوانێ دەسیان بۆ بەرێ، دڵیشی وەك ئەرزی حەرام وایە لە یار بەولاوە ڕێگای کەسی تیا نابێتەوە، وە هەر ئەو ئەتوانێ بە سەربەستی چینەی دانەی خۆشەویستی تیا بکا.

(٣) دوور ئەنداز: لە دوورەوە وەشێن. شەند: وەشاندی. واتە: گەردوون لە ناکاو فرسەتی هێناو لە دوورەوە تیری دوور خستنەوەی دا لە دڵت.

(٤) هەڵای: هێشتا. موو ئاسا: وەك موو. واتە: هێشتا کزەی ئێشی مردنی مناڵەکەی خۆم وەك مووی هەڵقرچاو پێچی پێ ئەخواردم. قسەکە لە شیعری دواییدا تەواو ئەبێ. وا دیارە مەولەوی خۆیشی لەو ڕۆژانەدا مناڵێکی مردبێ.

(٥) پێشدا: بە سەریا. مدیەی: ئەبینی. کەفتەن: کەوتووە.

وێت تــــەنیا ئــــەیاز مــــەحموود نــــەزانـــی
مــــن شــــەیداتــــەر بــــیم پــــەرێت پــەنهانی(١)

بــــەڵام بــــا جــــە تــــیر بــەڵای قــەزاوە
پــــاڵ دەیــــم وە قــــوللەی قــەڵای رەزاوە(٢)

تــــا بــــدۆ ســــەفای بــــێگــــانەو خــــوێشــــەن
هــەر وەخــتێ بــەرۆ بــاز مــاڵ وێشــەن(٣)

[١٥]

## ئەی دڵ مزگانی

ئــــەی دڵ، مــــزگانی، ئــــاما کــۆچ یــار
شای شــادی ســەر دا، خــەمان کــەرد فــیرار(٤)

هــــا گــــەردو غــوبار مــــەحمەل دیــــارەن
دەك لێڵاویت بــــۆ چــــۆنت قــــەرارەن؟(٥)

---

(١) واتە: ئەی پیاو ماقووڵی مەحموود پاشا کە وەك ئەیازیت بۆ سوڵتان مەحموود، خۆت بە تەنها نەزانی لەم بەڵادا کە هاتووە بە سەرتا، من دووراو دوور لە خۆت نارەحەتتر بووم بۆت.
(٢) پاڵ دەیم: پاڵ بدەین. واتە: با لە باتی تیری بەڵای قەزاو قەدەری خواوە پاڵ بدەین بە لووتکەی قەڵای رازی بوون بە قەزاو قەدەرەوەو ملی بۆ کەچ کەین.
(٣) تا بدۆ: تا بدا. بەرۆ: بیباتەوە. باز: دیسان. واتە: تا بیدا مایەی خۆشی دۆستبێگانەیە، کە بردیشیەوە ماڵی خۆیەتی و کەس دەسەڵاتی هیچی نیە.

[١٥]

(٤) مزگانی: مژدانە. سەر دا: دەرکەوت. واتە: ئەی دڵ مژدانەم بدەرێ وا بارو بنەی یار گەیشتە بەرەوە... تاد.
(٥) مەحمەل: کەژاوە. لێڵاویت بۆ: لێڵاییت دایەت. چۆنت قەرارەن: چۆن قەرار ئەگری.

چــون بــەدەن جــە تــاو هــیجران بــاڵاش
ئــەسڵەن هــازو هـێز نـەمەندەن جـە لاش[١]

فــــیراقش بــــەو تــەور تــەوانــا ســەندەن
پـــا قــوەی رەفــتار جــەلاش نــەمەدەن[٢]

فـــرسەتەن ئـــەڕواح بشـــۆ وە پـــێشـــواز
پــــەردەی بــینایی تــۆ پــەی پــایەنداز[٣]

دیــــدە فـــەرش بـــوورزۆ وە ســـەتح رێش‌دا
تـــاکـــە ســـەمەندش پـــا بـــنیۆ پـــێش‌دا[٤]

عــەینەین! وە ئـەسرین ئـاو پـاشی راش کـەر
نــەك گــەرد بــنیشۆ وە گــۆنــای دڵبــەر[٥]

با شـای خـاڵ خـاسان جـەمین پـەڕەی گـوڵ
وەی ئـــــەساسەوە یـــاوۆ وە مــــەنزڵ[٦]

(١) چون: چونکە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی بەسراوە بە شیعرەکەی پاشترەوە.
(٢) بەو تەور: بە رەنگێ. تەوانا سەندەن: هێزی لێ بڕیوە. رەفتار: بە رێدا چوون.
(٣) ئەڕواح: ئەی گیان. بشۆ: بچۆ. پایەنداز: رایـەخی ژێر پـێ. مـەعنای ئـەم شـیعرەو شیعرەکانی پاشەوە لە شیعری ژمارە (٨)دا لێ ئەدرێتەوە.
(٤) بوورزۆ: بخات. سەمەندش: ئەسپەکەی.
(٥) عەینەین: ئەی دوو چاو. ئەسرین: فرمێسك. ئاو پاشی: ئاو رشێن. بنیشۆ: بنیشێتەوە.
(٦) جەمین: جەبین، ناو چاو. یاوۆ: بگات. واتە: ئەی گیان هەل لەکیس مـەدە، بـچۆ بـە پیری‌یەوە. تۆیش ئەی پەردەی چاو ببە بە رایەخی بەر پێی با چاو رات بخاو ئەسپەکەی بە سەرتا بێ. جووتە چاوەکانم! ئێوەش بە فرمێسك رێگاکەی بۆ ئاو رشێن بکەن نەوەك تۆز بنیشێ لە گۆنای وەك پەڕەی گوڵی... تا شای خاڵ خاسان بەم بەزمو رەزمەوە بگاتە جێ.

[١٦]

## ئیمشەو مەینەتان

ئـــیمشەو مـــەینەتان نــە دەروون جــەمەن
خـــێڵ‌خـــانەی کـــەیفم پـــڕ جـە مـاتەمەن[١]

دیـــــــارەن دوەی دووری زۆر کـــەردەن
ســـوپای خـــەم هـــەم هـــجووم ئـاوەردەن[٢]

شـــنۆی ئـارەزووی وەســڵت زوهـوور کـەرد
لافـــاو مـــەینەت کـــۆگـــای شـــادی بـــەرد

هـــووناو دەروون ریشـــەی گـــیان کـــەندەن
ســـەرمایەی تـــاقەت نــە دەسـم ســەندەن[٣]

مـــەحاڵەن ئـــیمشەو گـــیان وە رۆ بـــەردەن
جـــارێو تـــەر تـــەواف ئـاسانەش کـەردەن[٤]

یـــا خـــوا ســـەبووری وە دڵ بـــاوەری
خـــەزانـــەی ئـــارام پـــێم عـــەتا کـــەری[٥]

بـــەڵ وە رۆ بـــەروون وە هـــەر حـــاڵ ئـیمشەو
کـــەروون زیـــارەت دەرگـــانەکـــەی ئـــەو[٦]

ســـەر بـــنیەو وە خـــاك ئـــاسانەی دڵبـــەر
بـــەو ئـــارەزووی دڵ گـیان بـەرشۆ وە بـەر[٧]

---

[١٦]

(١) خێڵ خانەی کەیفم: خۆشی خانەم.
(٢) دوە: دووکەڵ. زۆر کەردەن: زۆری هێناوە.
(٣) وەك چۆن لافاو درەخت لە ریشە دێنێ.
(٤) وە رۆ بەردەن: بگەیەنمە رۆژ. جارێو تەر: جارێکی‌تر.
(٥) باوەری: بێنی. خەزانەی... تاد: واتە: هێمنم بکەیتەوە.
(٦) بەڵ: بەڵکوو. کەروون: بکەم. (٧) بنیەو: بنێم. بەرشۆ وە بەر: دەرچێ.

## [١٧]
## ئاماوە وەهار

ئـــــاماوە وەهـــــار، وەهـــــار شـــادی
بـــۆی عـــەتر نـــەسیم غـــۆنـچەی ئـازادی[١]

خـــێڵ‌خـانەی خـەفەت بـار بـەنیش کـەردەن
مـــەینەت روو نـــیان وە مـــاوای مـــەردەن[٢]

خـــەم وێنـــەی کـــەمان قـــامەت خـــەم بـیەن
هـــەوارگـــەی قـــەدیم نـــە دەسش شـــیەن[٣]

بـــەزم شـــەوق‌و عـــەیش نـــە دەروون جـەمەن
ئـــانە هـــیچ نـــەبۆ نـــە دەروون، خـــەمەن[٤]

ئـــینە نـــەتیجەی دیـــای بـــاڵای تـــۆن
نـــیشانەی ویســـاڵ خـــاڵ ئـــاڵای تـــۆن[٥]

ســـروور نـــەشئەی بـــادەی وەســـڵ تـــۆن
تـــەئسیر بـــۆی عـــەتر مـــوشك زوڵف تـــۆن[٦]

---

[١٧]

(١) ئاماوە: هاتەوە. وەهار: بەهار.

(٢) بار بەنی‌یش کەردەن: باری پێچاوەتە. روو نیان: رووی ناوە. وە مـاوای... تـاد: واتـە: مەینەت رووی کردووەتە جیگای مردن‌و ئەمرێ.

(٣) کـەمان: کـەوان. خـەم: چـەمیوە. شـیەن: دەرچـووە. واتـە: بـاڵای خـەم وەك کـەوان چەمیوەتەوەو هەوارگەی کۆنی کە دڵی منە لە دەس دەرچووە.

(٤) جەمەن: جەمعەن، کۆمەڵە. واتە: بەزمی کەیف‌و رابواردن لە دڵا کۆبووەتەوە، ئەوەی کە بە هیچ جۆرێ لە دڵا نەبێ یا بە هیچ نەژمێرری تیایا خەم‌و خەفەتە.

(٥) ئینە: ئەمە، ئەم هەموو بەزم‌و خۆشـی‌یە. دیـای: دیـتنی. ئـاڵا: رەنگـاو رەنگ. لێرەدا مەبەس جوانە.

(٦) سروور: خۆشی. نەشئە: نەشە. مـوشك زوڵف: زوڵفـی رەشـی بـۆن خـۆشـی وەك موشکی خوتەن.

سا پێم دەر، دەی‌دەی پەی‌پەی، نەو مەی‌مەی
لەتایف مەردەم یەکسەر بکەر حەی(١)

تا پەی یارانیچ وە ئیتمینان بۆ
سەرمایەی نیشات دڵ حەزینان بۆ(٢)

**[١٨]**

### ئیمشەو هەر خەمەن

ئیمشەو هەر خەمەن ها نە کەمین‌دا
هەر دەردەن مدۆم وە رووی زەمین‌دا(٣)

دڵ نە گەردەلوول بێ پەرداخی‌یەن
دەماخم نە گێج بێ دەماخی‌یەن(٤)

سا، دەروێش! وە عیشق مەلاوی دەروێشان
وە یا هووی وە سۆز ریازەت کێشان(٥)

---

(١) نەو مەی، مەی: لەو شەرابە شەرابم بدەرێ. لەتایف: لە عورفی «صوفیە»دا بە پێنج شوێن ئەڵێن کە لە سنگی ئادەمیزاد دا نووری خوایان بە سەرا دێ. ئەو پێنج شوێنە: «قلب» و «روح»و «سر»و «خفی»و «اخفیٰ»ن جا مەولەوی لێرەدا ئەڵێ: ئەو پێنج لەتیفەی منە لە ئەنجامی دووری‌و بێ مەیلی یارا مردوون، سادەی پەی دەر پەی لەو مەیەم بدەرێ، با ئەو پینج لەتیفەیەم زیندوو بینەوە.
(٢) واتە: تا ببی بە هۆی متمانەکردنی دڵی یاران تریش، وە ببی بە سەرمایەی خۆشی بۆ دڵی خەفەتباران.

**[١٨]**

(٣) ها نەکەمین‌دا: لە پەنادا خۆی داگرتووە. مدۆم: ئەم‌دا. وە رووی زەمین‌دا: بە عەرزا.
(٤) گەردەلوول: گێژەڵووکە. بێ پەرداخی: بێ‌زەوقی.
(٥) واتە: سوێند بێ بە عەشقی پیری دەروێشان‌و بە دەواری «یاهو»ی ئەو خوا پەرەستانەی کە ریازە ئەکێشن. سوێند لە سەر خوراوەکە لە شیعری دوایی‌دا دێ. «ریازەت

هـــەر پـــاسە مـــەبۆ زەلیـــلی، دەخـــیل
چـــینەی زیـــاتەر مـــازەم وە زەلیـــل[١]

پـــەی دیگ دەروون جـــۆش کـــوڵو کـــەف
تـــەسکین نـــمەك کـــزەی کـــەفو دەف[٢]

بـــا بـــەیۆ وەش وەش ســـۆزەی ســـەداکـــەت
لەرەی نـــەوای تـــەرز شـــیرین ئـــەداکـــەت[٣]

بـــــەو نـــــائیرەوە، بـــــەو دائـــــیرەوە
خـــاس بـــنیەر هـــەستیم وە ئـــایرەوە[٤]

بـــەڵ ئـــیمشەو خـــەمان شـــێونـــان کـــەڵەك
تـــا ســـەحەر چـــۆن بـــۆ گـــەردش فـــەڵەك[٥]

---

☞

کێشان»ی دەروێشان ئەوەیەکە دەروێش ماوەی چل ڕۆژ لەکونجێکی تەکیەخانەقا، یا لە ژوورێکا بە تەنیا دائەنیشن وە لەو ماوەدا ڕۆژێ دەنکە خورمایەك زیاتر ناخۆنو قسە لەگەڵ کەس ناکەن بە نیازی ئەوەی نەفسیان بشکێو دڵیان ڕووناك ببێتەوە.

(١) پاسە مەبۆ: وا ئەبێ. چینە: لە مە. مازەم: مەمهێڵە.

(٢) نمەك: خوێ. تەسکین: ئارام بوونەوە. واتە: بۆ نیشاندنەوەی جۆشی کەفو کوڵی مەنجەڵی دەرونم خوێ‌یەك پێویستە کە بریتیە لەوکزەیەی کە پەیدا ئەبێ لە لێدانی دەفەوە بە لەپی دەس، چونکە مەنجەڵی چێشت کە دێتە کوڵەکوڵ خوێی ئەکەن بەسەراو ئەنیشێتەوە.

(٣) بابەیۆ: بابێت. وەش وەش: خۆش خۆش. لەرە: لەرینەوە. نەوا: ئاوازە. تەرز: شێوە. شیرین ئەدا: خۆش لێدان.

(٤) نائیرە: ئاگر. مەبەس ئاگری سۆزی دەنگی خۆشەویستی‌یە. دائیرە: مەبەس کەللەی دەفەکەیە. بنیەر: بنێ. هەستیم: بوونم. واتە: چاك بوونم بنێ بە ئاگرەوە.

(٥) شێونان: بشێوێنێ. واتە: بەڵکو ئەمشەو خەمو خەفەت کەڵەکی فڕو فێڵی خۆی تێکدا، بۆ سبەینێ‌یش خوا کەریمە دنیا چۆن وەرئەگەڕێ!.

## [١٩]

### ئەی ڕۆشنی چەم!(١)

ئەی ڕۆشنی چەم! تاکەی؟ تەشریف بەر
لێلاوی، سا دەی! هووناوەی هوون کەر(٢)

پەی چێش، قیبلەکەم عەزم سەفەر کەرد؟
سێلاو دووریش ریشەی هەستیم بەرد(٣)

بینایی وە ڕاست دڵەی پڕ دەردم!
ئای چەند سەر سەخت بیم لوای نەمەردم!(٤)

بڵێسەی کوورەی هیجران باڵات
گەرمی مەحروومی تۆزەکەی پاڵات(٥)

ئایر دان بەی تەور مۆبەت سەرای دڵ
یادەکەت مەندەن پەی مەسکەن خەجڵ(٦)

---

[١٩]

(١) ئەم قەسیدەیە یەکێکە لەو قەسیدانەکە مەولەوی لە لاواندنەوی عەنبەر خاتوونی خێزانیا وتوونی.

(٢) هووناوەی هون کەر: لافاوی خوێن بکە. واتە: ئەی ڕۆشنایی چاوم تاکەی ئەمێنیتەوە، بڕۆ. تۆیش ئەی ئاوی لێڵی چاوم لافاوی خوێن بکە.

(٣) پەی چێش: واتە: بۆچی ڕووناکی چاوم بڕواو لێڵایی دابێ، چونکە قبلەکەم... تاد.

(٤) مەولەوی بەم شیعرە قسە لەگەڵ خێزانەکوچ کردووەکەی ئەکاو ئەڵێ: ئەی بینایی ڕاستەقینەی دڵەی پڕ دەردم، چەند سەرسەخت بووم کە تۆ ڕۆیشتی نەمردم.

(٥) پاڵا: کەوش. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٦) خەجڵ: داماو. واتە: بڵێسەی کوورەی دووری لە باڵات و گەرمی بێ بەشی لە تۆزی کەوشەکانت بە ڕەنگێ ئاگری بەرداوەتە خۆشەویستی خانەی دڵم، یادت داماوە بۆ جێگایەك کە تێی بچێ.

دڵە! وە بـــادەی وەســـڵش بـــادی بــی
دەمــاخت نــە ئــەوج بــرج شــادی بــی(١)

هــــیجران بـــاڵاش وە هـــیچ مــەزانــای
وێت وە سـاحیب سـەبر تـاقەت مـەوانـای(٢)

سا ئیسە، هـا دەرد دووریش ئـاوەرد جـۆش
ســـەبرت ئـــەر ئـــازان بـمانۆ شـنۆش(٣)

[٢٠]

## ئارەزووی ئازیز

ئـــارەزووی ئـــازیز وەنـــەم ســـەر داوە
نـــە هـــەردەی دەروون ئـایر وەر داوە(٤)

تــاقەت بـــی وە هـــوون جـە سـەختی زامـان
تك‌تك چـــەنی هـــەرس رێزا وە دامـــان(٥)

---

(١) بادی: بایی. ئەوج: لووتکە. واتە: ئەی دڵ ئەوسا بە بادەی گەیشتن بە ئەو لە خۆت بایی بوویبووی‌و دەماخت لە قەلەپۆپەی قەڵای خۆشی‌دا بوو.

(٢) وە هیچ مەزانای: بە هیچت نەئەزانی. مەوانای: ئەخوێندەوە. مـەعنای ئـەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٣) ئەر ئازان: ئەگەر ئازایە. بمانۆ: بمێنێ. شنۆش: شنەی. واتە: ئەوسا دوور کەوتنەوەی باڵای ئەوت بە هیچ ئەزانی‌و خۆت بەخاوەن تواناو بـوردەباری دائـەنا، جـا ئیسەکـەوا دەردی دووری ئەو جۆشی هێناوە، بوردەباریت ئەگەر ئازایـەو راست ئـەکا بـا شـنەی بمێنێ!.

[٢٠]

(٤) هەردە: هەرد. وەرداوە: بەردایەوە.

(٥) رێزا: رژا. واتە: لە بـەر دووری یـار هـێزی لەشـم تـوایـەوە بـوو بـە خـوێن‌و لەگـەڵ فرمێسکما رژایە داوێنەم.

**خەم نە سەر جۆی هوون سارای دڵ جەم جەم**
**بارچـنی چـون فـەوج قـافڵەکـەی عـەجەم(١)**

**هــەر وە زۆر مـــەندەن نــیم نــەفەس بــاقی**
**وادەی دەورتـــــەن، هــانا هـــەی ســاقی!(٢)**

**دەورێ دەر وە نـــــــاز وە پــــــــیاڵەوە**
**ژەنگ دڵ وە جـــــام مــــەی بـــماڵەوە(٣)**

**بـــــۆی گــــوڵاڵەی دەرد دڵبـــەر عـــەزیزەن**
**مـــەزەی تـــام خـــەم یـــاران لەزیــزەن(٤)**

**فــەریادرەسیم کـەر، نـە جـای گشت کـەسم!**
**مـــازە ئــەو لەزەت بــەرشۆ نــە دەســم(٥)**

**ئـیحیام کــەر وە جــام ســاف یــەك مـەنی**
**بــەڵکــوو بــمانوون، پــەی غـەمێ هـەنی(٦)**

---

(١) سەر جۆ: بنەوانی جۆگە. جەم جەم: جەمع جەمع، کۆمەڵکۆمـەڵ. بـارچـنی: بـاری کرد. واتە: خەمو خەفەت لە بنەوانی جۆگای خوێنی دەشتی دڵماکۆمەڵکۆمەڵ وەك ریزی کاروانی عەجەم باری ڕێکخست.
(٢) مەندەن: ماوە. دەورتەن: گەڕانتە. هانا: هاوار. مـەعنای ئـەم شـیعرەلەگـەڵ شـیعری دوایی دا دێ.
(٣) واتە: بە هەزار حاڵ نیوە هەناسەیەکم تیا ماوە، سا مەیگێڕ هاوار وادەی گەڕانتە بـە سەرمانا، نازەنینانە بە پیاڵەی مەیەوە خولێ بخۆ بە دەورماناو بە جامی مەی ژەنگی دڵمان بسڕەوە.
(٤) مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی دواوە لە دوای شیعری ئەم قەسیدەدا دێ.
(٥) مازە: مەیەڵە. بەرشۆ: دەرچێ.
(٦) ئیحیام کەر: زیندووم کەرەوە. پەی غەمێ هەنی: بۆ خەمێکی‌تر. واتـە: بـۆن کـردنی گوڵی دەردی دولبەر زۆر خۆشە، وە بە چەشنێ تامی خەمی یاران بەلەزەتە. کەواتە بـێ بەهانامەوەو مەیەڵە بمرم، بە جامێ شەرابی سافی یەك‌مەنی زیندووم بکـەرەوە. بـەڵکـو بمێنم بۆ هەندێ خەمو خەفەتی تر لە پاشە ڕۆژا.

## [٢١]

## ئیمشەو هەم دیسان

ئیمشەو هەم دیسان دەروون پڕ خەمەن
ئەساسەی ماتەم جە لامان جەمەن[١]

نە تاو دووری دڵ بێ قەرارەن
بینایی دیدەم جە خەفەت تارەن[٢]

شریخەو گرمەی هەور دووری دۆس
وە فەنا بەردەن مەغزو رەگو پۆس[٣]

شەرارەی گڕپەی نار مەهجووری
کەردەن وە غوبار کۆگای سەبووری[٤]

نە تاقەت مەندەن نە تۆی دەروون‌دا
نە «لەیلی» مدیۆ وە لای «مەجنوون»دا[٥]

یاخوا مەردەنی بۆ وە میهمانم
ئیتر نەوینوون دووری یارانم[٦]

بەڵکم خەلاسیم نەدەس دووریم بۆ
بەو زووخ زامان نەشوون وە گڵکۆ[٧]

---

**[٢١]**

(١) ئەساسە: هۆیەکان. (٢) تار: تاریك.

(٣) دۆس: دۆست. مەغز: مێشك. پۆس: پێست.

(٤) واتە: بڵیسەی ئاگری دووری یار، خەرمانی بوردەباریمی سووتاندووەو کردوویە بە خۆڵەمێش.

(٥) تۆی: توێی. مدیۆ: ئەڕوانێ. واتە: نەمن ئیتر خۆمم پێ ڕائەگیرێ، وە نە دۆستیش لایەکم بە لادا ئەکاتەوە.

(٦) مەردەنی: مردن. نەوینوون: نەبینم. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٧) خەلاسیم: ڕزگاریم. نەشوون: نەچمە. گڵکۆ: گۆڕ. واتە: یاخوا مەرگ بێ بە میوانم،

## [٢٢]
## ئیمساڵ نەو وەهار[١]

ئـیمساڵ نـەو وەهـار چـون خـەزان سـەرد
بەرگ وەرد باغ «مەعدووم» بەرد پەی هەرد[٢]

مشـیۆ تـاڵەی مـن خـیلاف ئـەنگیز بـۆ
وەرنە، کەی؟ کێ دی؟ وەهار گۆڵ رێز بۆ[٣]

دڵ وە گـێج بـازی چـەپگەرد بـازیش وەرد
جفت ئارەزوو کەرد، چەپگەرد تاق ئـاوەرد[٤]

بۆی «عـەنبەر» نـە تـۆی دەمـاخم دوور کـەرد
فـرسەتش ئـاوەرد هـەوای وەبـای دەرد[٥]

---

☞

تا جارێکی‌تر دووری یاران نەبینم‌و رزگار ببم لە دەس دووری‌و بە زامی پڕ لە زووخی دووریەوە نەچمە گۆڕ.

[٢٢]

(١) ئەم قەسیدەیەش یەکێکە لەو قەسیدانەی کە مەولەوی لە لاواندنەوەی عەنبەر خاتوونی خێزانیا وتوونی.
(٢) بەرگ: پەڕە. وەرد: گوڵ. بەرد: بردی. واتە: ئەمساڵ بەهاری نوێ وەك پایزی سارد پەڕەی گوڵی باخی مەعدوومی وەراندو بردی بۆ کێو.
(٣) مشیو: ئەشێ. تاڵە: «طالع»، بەخت. خیلاف ئەنگێز: پێچەوانە هێن. واتە: ئەشێ بەختی من بە پێچەوانەی بێنێ، ئەگینا کەس هەرگیز دیویە بەهار گوڵ بوەرێنێ؟.
(٤) گێج بازی: تاقمانە جووتە. بازیش وەرد: هەڵخەڵەتا. جفت: جووت. واتە: دڵم بە تاقمانە جووتی گەردوون هەڵخەڵەتا، ئەم دووانی ئەویست کەچی ئەو یەکی ئەهێنا. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «گێج بازی» نووسراوە: «کەچ بازی». واتە: کاری چەوت...
(٥) عەنبەر: مەبەسی عەنبەر خاتوونی خێزانیەتی. ئەمە «توریە»ی تیایە، چونکە مەعنای عەنبەری گیای بۆن خۆش‌و عەنبەری خێزانیشی ئەگەیەنێ. وەبا: تاعوون. واتە: بای تاعوونی نەخۆشی بە هەڵی زانی، هات‌و بۆنی «عەنبەر»ی لە تۆی دەماخم دوور خستەوە.

نـــەی چـــی! وە بـــێ بـــەزم یـــاران جـــانی
کـــام ســـەفا مـــەندەن پـەی زینـدەگـانی؟(١)

چـــــون مـــــەزاق تـــاڵەن جـــە گــــردین لاوە
بـــــۆ وە شـــــیرینی یـــــەك دوو نـــەواوە(٢)

یـــــەکـــــێ یـــــەکـــــجاری تـــاونۆمـــەوە
ئـــەو یـــــەك لاونـــــۆم، یـــــاونۆمـــەوە(٣)

••••••━━●━━••••••

**[٢٣]**

## ئایینەی کامڵ!(٤)

ئـــــایینەی کـــــامڵ! ئـــــازیزەکـــەی فـــەردا
فـــیدای ئـــامات بـــم، ســـەفاییت ئـــاوەرد(٥)

---

(١) مـــەندەن: مـاوە. واتـە: کـاکـی شـمشاڵ ژەن بـە بـێ رابـواردن لەگـەڵ یـارانـا ژیـان چخۆشی‌یەکی تیایە؟.

(٢) مەزاق تاڵەن: تامی دەمم تاڵە، واتە: لە وەزعێکی ناخۆشم. گردین: هەموو. مـەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٣) تاونۆمەوە: بم‌توێنێتەوە. ئەو یەك: ئەوی تریان. لاونـۆم: بـم‌لاوێنـێتـەوە. یـاونۆمـەوە: پێم‌بگەیەنێتەوە. واتە: لە وەزعێکی تاڵو ناخۆشا ئەژیم، بە دوو ئاوازی شیرینەوە وەرە بۆ لام، ئاوازەیەکیان یەگجاری بم‌توێنێتەوە، ئەوی تریان بم‌لاوێنێتەوەو زیـندووم بکـاتەوە، هەروەك چۆن لە قیامەتا بە فوویەك هەرچی زیندوو هەیە ئەمرێو بە فوویەکی‌تر هەرچی مردووە راست ئەبێتەوە.

**[٢٣]**

(٤) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە پێشوازی شـێخ «بـهاءالدیـن»ی کـوڕی شـێخ «عـثمان سراج‌الدین»ی تەوێڵەدا وتووەکە «پیر»ی بووەو هاتووە بو سەر لێ دانی.

(٥) ئامات: هاتنت. واتە: ئەی کەسێ کـە وەك ئـاوێنـەی بـێ گـەرد وایت بـۆ وەرگـرتنی شێوەو خۆو رەوشتی باوکە پێ گەیشتووەکەت، ئەی تاقە خۆشەویستەکـەم! بـەقوربانی هاتنت بم خۆشیت لەگەڵ خۆت هێنا.

خــەیلێن گــەرد پــات نــە دیـدەم دوور بــێ
یــانەی چــەم وێران تــەمام خــاپوور بــێ(١)

خــــاس بــی تــەشریفت هــەم ئــاوەردەوە
گــــەرد پــــات، وەتــەن ئــاوا کــەردەوە(٢)

ســــاقی، ئــــینە بــەزم وەســـڵ یــارانــەن
چەرخیچ هەر ئەو چەرخ هــەردە جــارانــەن(٣)

دەورێ دەر وە بـــــــەزم وە پـــــــیاڵەوە
ژەنگ دڵ وە زاخ مـــــــەی بـــــماڵەوە(٤)

جــامێمــان جــە دەس تــۆ هــەم ســەندەبۆ
فــــرسەتەن، نســــیو نـــەك نــەماندەبۆ(٥)

---

(١) واتە: دەمێکە تۆزی کەوشەکانت دوورە لە چاوەکانم‌و ماڵی چاوم بە تەواوی وێران بووە. گوایە وەك بانی خانوو کە خۆڵی بە سەرەوە نەمێنێ دڵۆپە ئەکاو وێران ئەبێ، چاوی ئەمیش ئەگەر تۆزی کەوشەکانی شێخی بەسەرەوە نەبێ فرمێسکی لێ ئەرژێ‌کوێر ئەبێ.
(٢) خاس بی: چاك بوو. وەتەن: نیشتمان. واتە: چاك بوو دیسان تەشریفت هێناوەتۆزی پێت وەتەنی خۆی ـکە چاوەکانی منە ـ ئاوا کردەوە.
(٣) هەردە جاران: جاری جاران. مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوە لە دوا شیعرا دێ.
(٤) ئە م شیعرە لە قەسیدەی ژمارە (٢٠) یش‌دا هەبوو، بەڵام لەوێ لە جیاتی وشـەی «بەزم» وشەی «ناز» وە لە جیاتی وشەی «زاخ» وشەی «جام»ی دانابوو. مەولەوی ئەوەی هەیە جارو بار شیعرێك لە چەند قەسیدەدا دووبارە ئەکاتەوە.
(٥) سەندەبۆ: سەندبێ. نسیو: «نصیب»، بەش. واتە: کاکەی پیاڵە گێڕ ئەم کاتەکاتی بەزم‌رابواردنی گەیشتن بە یارە، چەرخیش هەروەك جاران وایە، سا خولێ بدە بە دەورمانا و بە زاخاوی مەی ژەنگی دڵمان پاك کەرەوە، با تا فرسەتە پیاڵەیەك مـەیمان لە دەستی تۆیش وەرگرتبێ، نەوەك بەشمان لەمە زیاتر نەمابێ بە دنیاوە.

[٢٤]

## ئازارم جە وێم(١)

ئـــازارم جـــە وێم، بـــێزارم کـــەردەن
رەویـــەی رەمـــەزان جـــە یـــادم بـــەردەن(٢)

جـــــەوساوە نـــیەت رۆزەم ئـــاوەردەن
هـــیچ ئـازارم جـە هـیچ زۆرش نـەوەردەن(٣)

نـــە چـــەم نـــە دیـــدەن ئـــازیز بـــێ گـــەرد
نـــە گـــۆش نـــە سـەدای یـاران هـام فـەرد(٤)

شـــــــیرینی ئـــیفتار دڵم تـــاڵی‌یـــەن
جـام نـــە جـەماعەت دۆسـان خـاڵی‌یەن(٥)

---

[٢٤]

(١) مەولەوی لە مانگێکی رەمەزانا بە تەنیا بووەو بەم قەسیدەیە سکاڵای حاڵی خۆی بۆ یەکێ لە دۆستانی کردووە.

(٢) وێم: خۆم. رەویە: ئاداب‌و ئوسووڵ. واتە: ئازارو نارەحەتیم بێزاری کرددوم لەگیانی خۆم‌و ئوسووڵی رەمـەزانـی لەبیر بـردومەتەوە، چـونکە ئـەبێ روژووەوان لە رەمـەزانـا خەریکی خواپەرەستی بێ، بەڵام لەبەر نارەحەتی خۆم هیچم پێ ناکرێ.

(٣) جەوساوە: لەوکاتەوە. روزە: رۆژوو. نەوەردەن: نەخواردووە.

مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعرەکانی ترەوە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «زۆرش نەوەردەن» نووسراوە «روزەش نەمەردەن» واتە: رۆژووی نەشکاندووە.

(٤) وشـەی «نە»ی یەکەم‌و سێ‌هەم هەر مەعنای «نە»ی سۆرانی‌یە لە هەورامی‌دا، بەڵام «نە»ی دووەم‌و چوارەم بە مەعنای «لە»یە. واتە: لەوکاتەوەکە نیەتی رۆژووم لێ هێناوە هیچ ئەندامێکی لەشم لە هیچ تێر نەبوە، نە چاوم تێر سەیری یـاری کـردووەو نـە گـوێم تـێر راگرتووە لەدەنگی دۆستان.

(٥) ئیفتار: بەربانگ کردنەوە. جام: جێگام. واتە: دڵم لە باتی شیرینی، بە تاڵی بـەربانگ ئەکاتەوە، جێگاشم لە ناو تاقمی بـرادەرانـا خـاڵی‌یـە چـونکە لێ‌یـان دوورم. لە هـەندێ نوسخەدا لە جیاتی «دڵم» نووسراوە: «جەلام» واتە: لە لام.

نـــەوای مـــەرحـــەبا نـــامان نـــە گـــۆشـــم
چـــەنی ئـــەلوەداش هـــەر نـــە خـــرۆشـــم(١)

زایـــفیم هـــەر یـــەند جـــە حـــەد بـــەرشیەن
نـــەسیم ئـــەر بـــارۆم عـــەجایب نـــیەن(٢)

[٢٥]

## ئازیز! تای رشتەی

ئـــازیز! تـــای رشـــتەی دڵەی خـــەم بـــێ شـــۆ
ئـــەزەڵیـــا نـــە بـــەند تـــای رشـتەکـــەی تـــۆ(٣)

هـــەر دوو چـــەنی هـــەم پـــێچ وەردەن وە هـــەم
جـــیایی نـــــە بـــەین مـــەحاڵەن ســـتەم(٤)

ســەر مــەودای نــاخوون یــەکســەر تــێدا شــی
هــەرچــەند ســەعیم کــەرد جــیایی نــەوی

(١) نەوا: ئاوازە. ئەلوەدا: «الوداع»، ماڵاوایی. واتە: لەم مانگەدا گوێم لە مەرحبای هیچ دۆستێکەوە نەبوە، بەڵام هەمیشە لە بەزمی ماڵاوایی‌و دوورکەوتنەوەی یارانا بووم. بەکار هێنانی وشەی مەرحەبا «مرحبا» وە ئەلوەدا «الوداع» لەم شوێنەدا کە باسی خۆی ئەکا لە مانگی رەمەزاناو ئەو دوو وشەش پەیوەندی‌یان بە مانگی رەمەزانەوە هەیە، شتێکی جوانە.

(٢) زایفیم: زەعیفیم، لاوازیم. یەند: ئەوەندە. باروم: بمهێنێ. واتە: ئەوەندە لەرو لاوازم هیچ سەیر نیە ئەگەر با هەڵم گرێ‌و بمهێنێ بۆ لای تێوە.

[٢٥]

(٣) تا: تاڵ. رشتە: هۆنراوە. بێ شۆ: بێ ئەندازە. ئەزەڵیا: ئاڵا. واتە: تاڵی رشتەی دڵەی خەفەت لە رادە بەدەرەکەم ئاڵاوە لە رشتەی زوڵفەکانی تۆوە.

(٤) چەنی هەم: پێکەوە. واتە: هەردووکیان پێچیان خواردووە بە یەکەوەو بوون بە گرێ کوێرە، وە زۆر زەحمەتە لە یەك بکرێنەوە.

ئـیسه خــاس پــاسەن تــۆ نـەی سـەردەمدا
هـەر دوو چـەنی هـەم پـێچ دەی وە هـەمدا[١]

تـــا یـــاران زانـــان ریشـــەی جـــەرگمەن
پـــاچیان، ئـــاوێزان وە رووی بـــەرگمەن[٢]

هـــــەنی مـــــداران دەم وە ســـــەناوە
ئـــافەرین واچـــان جـــە گـــردین لاوە[٣]

[٢٦]

## ئەو جا بەزمگەی

ئـــەو جـــا بـــەزمگەی کـــەس جـــێ نـــە رەســـتە
مـــەنزڵگـــەی ســـەیاد هـــەزاران خـــەستە[٤]

مـــن نـــەچیرەکـــەی هـــەزار زام وەردە
هەر زامێ پـەی وێش زوخـاو سـەر کـەردە[٥]

---

(١) پاسەن: وایە. نەی: لەم. مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوە هـەمووی پیکەوە دێ.

(٢) زانان: بزانن. پاچیان: هەڵ پاچراوە. ئاوێزان: بەرەو بووەتەوە، هەڵواسراوە.

(٣) مداران: بدەن. واتە: مادەم وا تاڵی رشتەی دڵم پێچراوە بە تاڵی زوڵفی تـووە، بـاشتر ئەوەیە تۆش باشتر پێچیان بدەی بە یەکا، تا دۆستان بزانن ئەمەی کە بـەرۆ بـووتەوە بـە رووی جلەکانما تاڵی رشتەی دڵمە ئاڵوزاوە لەگەڵ تای زوڵفی تۆدا، وە لە هەموو لایەکەوە دەس کەن بە سەنا کردنو ئافەرین کردنم.

[٢٦]

(٤) جا: شوێن. بەزمگە: جێگای بەزمو رابواردن. جێ نە رەست: لێ رزگار نەبوو. واتـە: ئەو شوێنەی یاران بەزمگایەکەکەس لێی رزگار نـەبووە. جێگـای راوچـی‌یانی هـەزاران نەچیر بریندار کردووە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «ئەو جا بەزمگەی» نووسراوە: «ئەو نە جاسوسگەی» واتە: ئەو لە جێگای خۆ مات دانی... تاد.

(٥) وەردە: خواردوو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعرەکانی ترەوە.

تـــرسیای سـەدای مـاردم هـۆش بـەردە
رەمـــیای بـۆی بـاروت هـەردە وە هـەردە[١]

کــەی تـــەوانـای سـەبر دیـارانـمەن،
یـــا پـەروای تـاقەت بـێ یـارانـمەن؟[٢]

رووم کـــەرد وە سـارای هــەردو بـەردەوە
وە سـەد تـرس و لەرز جـەستەم شـەردەوە

چ داوایــێوەن مــەکــەردێم چـــەنی؟
بـازدێم، نـیم رەمـەق پـەی جـارێ و هـەنی[٣]

[٢٧]

## ئێمە گشت فانی[٤]

ئــێمــە گشت فـانی، هـەر ئـەوەن بـاقی
نــازوون وە بـازووی پڕ نـەیرووی سـاقی[٥]

---

(١) ترسیا: ترساو. ماردم: چەشنە تفەنگێکی کۆنی راوی‌یە. رەمیا: راکردوو.

(٢) دیاران: وڵاتان. واتـە: مـنی نـەچیری هـەزار زام پێوە بـووی، زام زوخـاو سـەر لێوە کردوو، منی ترساوی دەنگی «ماردم» لە هۆش بردووی، لە تاوی بۆنی باروت هەردەهەرد هەڵاتوو، کەی تواناو دەسەڵاتی سەیر کردنم هەیە لە وڵاتانی غەریبی‌دا بێ دۆست و بێ برادەر؟.

(٣) چ داواییوەن: چ دەعواێکە، چ شەڕێکە. بازدێم: لێم گەڕێن. واتـە: کـونەکـون خـۆم شاردووەتەوەو بۆ خۆم لێرە لە گەڵ هاوڕێکانم ئەژیم، لە کۆڵم بنەوە...

[٢٧]

(٤) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ لاواندنەوەی «عبدالرّحمان»ی کوڕی حاجی مەحموودی یارەویس وتووەکە لە تەوێڵەدا بە گوللەیەکی لە دەس دەرچووی شێخ هیدایەتی کـوڕی حاجی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عوسمان کوژراوە. قەبرەکەی لەپاڵ خانەقای تەوێڵەدایە.

(٥) نازوون: بنازم. پڕ نەیروو: بە هێز. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

خــــەڵاســــیش دا پــێت وە یــەك پــەیمانە
ئــازاد بــیت جــە بــەند بــەستەی پــەیمانە(١)

عــارفان چ خــاس پــەی وە حــەق بــەردەن
وەســـــیەت «حــافظ» وە جــا ئــاوەردەن(٢)

دەفــنت نــە پــەهلووی مــەیخانە کــەردەن
وە سەر خــاکتدا سـەبووی مـەی مـەڕدەن(٣)

قــەڵەم یــــاد کــــردار یــــارو ئــەغیاردا
رەقــەم کــەرد تـەئریخ وە رووی مـەزاردا:(٤)

جــامێش نــۆشــاوە چــون مــەردان ویــەرد
«گــۆشــەی مــەیخانە وە زاویــەکــەرد»(٥)

---

(١) پەیمانە: پیاڵەی شەرابی مەرگ. بەستەی پەیمانە: پەیمانی لەگەڵ خـوادا بـەسراو. واتە: ئێمە هەمومان ئەمرین‌و مانەوە هەر بۆ خوا خۆیەتی، سا با بنازم بە شان‌و قۆڵی بە هێزی ساقی «مەبەس قودرەتی خوایە» کە بە پیاڵەی شەرابی مەرگ رزگاری کـردی‌و لە بەندی پەیمانی لەگەڵ خوادا بەسراوی ئازاد کردی کە ئەبوو بە پێی ئـەمرو نـەهی ئـەو بجوڵێتەوە.

(٢) عارفان: خوا ناسەکانی خانەقای تەوێڵە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شعیری دوایی‌دا دێ.

(٣) پەهلوو: تەنشت. سەبوو: کووپە. مەڕدەن: شکاندووە. واتە: پیاوەچاکەکانی خانەقای تەوێڵە چەند باش بۆی چوون کە وەسیەتەکەی «حـافظی شـیرازی»یـان لە تـۆدا بـەجێ هێناوە، گوایە وەك چۆن ئەو وەسیەتی کردبوو کە لە پاڵ مەیخانەدا بینێژن‌کووپەێی شەراب بە سەر قەبرەکەیا بشکێنن، هاتن تۆشیان لە پاڵ مەیخانەی عەشقا «وەك خانەقای تەوێڵە بێ» نایە قەبرەوە.

(٤) یاد کردار: بیر خەرەوە. رەقەم کەرد: نووسی. مەزار: گوڕ. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٥) نۆشاوە: خواردەوە. ویەرد: بەسەر چوو. زاویە: کـونجی عـیبادەت. واتـە: قـەڵەم کـە ☜

## [٢٨]

### ئازیزا وە مەرگت

ئـــازیزا وە مـــەرگت دڵ نــە خـــرۆشــەن
ئارەزووی خـەدەنگ پـەنجەکـەی تـۆشـەن(١)

خــــەیلێوەن نـــامان تـــیرەکــەت، ئـــامان
نـــامان وە ســـەر وەخت بـــیمار زامـــان(٢)

وەخـــتەن ســـاکـــن بـــۆ، قـوربان ســا تـیرێ
دەمـــاخش بـــەرزەن، دەخـــیل زەنـــجیرێ(٣)

نـــەوا جـــە حـــیکمەت بـــەر بشـــۆ وە بـــەر
جـــارجـــار وە تـــیرێ دڵ نـەوایـیش کـەر(٤)

---

☞

ئیشی ئەوەیە شت ئەخاتەوە یادی دۆستو بێگانە، مێژوی مەرگی وا لە رووی قەبرەکەی نوسی کە جامی شەرابی مەرگی نوشیو وەك پیاوان بۆی دەرچوو، کونجی مـەیخانەی عەشقی «وەك خانەقای تەوێڵە بێ» کرد بە عیبادەت خانەی خۆی.
جوملەی «گۆشەی مەیخانە وە زاویەکەرد» بە بێ ژمـاردنی «ی»ی «گـۆشـەی»و «ھ»ی یەکەمی «مەیخانە» وە هی «وە»و «کەرد» بە پێی پیتی ئەبجەد ئەکاتە ١٢٩٦. بۆیە ئەم پیتانە ناخوێنینەوە چونکە لەو شێوە نووسینەدا نە ئەنووسران کـە مـەولەوی شـیعرەکـانی پـێ نووسیوە، وە چونکە بە ژماردنیان ژمارەکە زۆری زیاد ئەبێ. واتە: ئەو نیوە شیعرە بە پێی ئـیملای فـارسی ئـامێزی کـۆنـی کـوردی بـنووسرێت، بـەم جـۆرە: «گـوشە مـیخانە و زاویەکەرد».

**[٢٨]**

(١) خەدەنگ: تیر. واتە: چاوەڕوانی نامەیەکم بە پەنجەی تۆ بنووسرێ.
(٢) نامان: نەهاتووە. سەروەخت: بەدەمیەوە.
(٣) ساکن بۆ: دامرێتەوە، بمرێ. دەماخش بەرزەن: لووتی بەرزە، فیزی زلە.
(٤) نەوا: نەوەکوو. بەر بشۆ: دەرچێ.

وەش‌وەش تـــای تـوغرای وێت بـنمانه پـێش
بــا هــەر نـــاسۆر بـۆ، زوو نـەبۆ سـاڕێش[١]

[٢٩]

## ئاخ، چراغ! چ ئاخ؟[٢]

ئــاخ، چـراغ! چ ئـاخ؟ ئـاخ پـەی ئـاخ داریٚ
چـون مـن خــاتر خــار، خـەمبار داخ داریٚ[٣]

بشــیامیٚ وه ســەیر ســەر ســەراو چــەمەن
چ ئــەو چــراغـم نــەو چـەمەن، چ مـەن[٤]

نـــاڵەمـــان کـــەردا چـــەنی بــولبــوڵان
چـــەنی نـــاڵەیـــیٚ؟ چــون ســفته دڵان[٥]

تــــا نــــه قــــەفەس‌دا مــــانمان نــەفەسیٚ
ئــەوان پــەی گــوڵان، ئـێمـه پـەی کـەسیٚ[٦]

---

(١) وەش وەش: خۆش خۆش. توغرا: زوڵفی لوول. بنمانه پێش. پێی بنوێنه. واته: جارو بار تای زوڵفی لوولی خۆتی پیشان ده، با برینی ساڕێژ نەبێ، چونکه زوڵفت وەك مار وایەو ماران گازیش به دیتنی مار برینەکەی دێتەوه سۆ!.

[٢٩]

(٢) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ «مه لا چراغ» ناویٚ دۆستی نووسیوه.
(٣) چ ئاخ: چۆن ئاخێ. پەی ئاخ‌داریٚ: بۆ برادەرێکی ئاخ هەڵکێش‌و داخ له دڵی وەك خۆم. خاتر خار: دڵ بریندار.
(٤) بشیامیٚ: بچووینایه. سەر سەراو چەمەن: مێرگ‌و کانیاو. مەن: من. مەعنای نیوه شیعری دوایی ئەم شیعره لەگەڵ شیعرەکانی ترا دێ.
(٥) چەنی: چۆن. سفته دڵان. دڵ سووتاوان.
(٦) واته: چ من‌و چ چراخی برادەرم لەو مێرگ‌و کانیاوەدا لەگەڵ بولبولان دەسمان بکردایه به ناڵەو خوێندن وەك دڵ سووتاوان، تا قەفەزی سینەمان هەناسەیەکی لێ دێ، ئەمان بۆ گوڵان‌و ئێمەیش بۆ یار...

[٣٠]

## ئەدای پەشێوی(١)

ئــــەدای پـــەشێوی حـــاڵات جـــەستەم
دوورەن جــە تــەحریر خـامەی شکستەم(٢)

بەڵام «مەعدووم» هەرس دیدەش جۆش وەردەن
نـــاعیلاج خـــامەش وە دەسگـــیر کـەردەن(٣)

پـــەلەپەل پــــێکـــــان پـــەل وە خـــامەدا
یـەك فـەرد رەقـەم کـەرد وە رووی نـامەدا:(٤)

ئـــیسە دیـــدەی دڵ دێوانـــەکـەی وێت
نـــە بـــێخ ئـــاودا مــە گـێڵۆ پـەرێت(٥)

---

[٣٠]

(١) ئەم قەسیدەیەش یەکێکە لەو قەسیدانەکە مەولەوی لە لاواندنەوەی عەنبەر خاتوونی خێزانیا وتوویە.

(٢) ئەدا: باس کردن. واتە: باسی پەشێوی حاڵەتم بەم قەڵەمە شکاوەم نانووسرێ، پێویستی بەوەیە خۆم بێم بۆ لات بۆت باس کەم.

(٣) هەرس: فرمێسك. واتە: بەڵام من فرمێسك چاوم لێشاوی کردووەو کوێر بووم، لە بەر ئەوەی پێم ناکرێ بێم بۆ لات، وا ناچار پەنام بردووەتە بەر قەڵەم تا چەندی پێ بکرێ بۆتی بنووسێ. لە هەندێ نوسخەدا نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە بەم جۆرە نووسراوە:
بەڵام مەعدووم، غەرق هەرەس جۆش وەردەن.
واتە: بەڵام مەعدووم خنکاوە لە فرمێسکی کوڵاوو هاتووە جۆشدا.

(٤) پێکان پەل: دەسی، قایم کردووە. رەقەم کەرد: نووسی.

(٥) مەگێڵۆ: ئەگەرێ. پەرێت: بۆت. واتە: ئێستا.

## [٣١]

### ئازیزم، گەردەن...

ئـــازیزم، گـــەردەن بـــلوور بـــێ گـــەردا!
ئـــەمانەتی تـــۆو دڵەی پـــڕ جـــە دەرد

چـــون جـــە زێد وێش بـــیەن ئـــاوارە
غـــەریبەن، قـــەدرش نـــیگا بـــدارە[١]

فـــەرامـــۆش نـــەبۆ لادێ، درەنگـــێ
ســـوبحێ وە تـــیرێ، شـــامێ خـــەدەنگێ[٢]

## [٣٢]

### ئارەزووی[٣]

ئـــارەزووی ئـــامای مـــەرگ وێت کـــەردەن
گـــۆیـــا خـــەڵاسـیت وە دڵ ئـــاوەردەن[۴]

ئـــەی پـــەی تـــۆ نـــەبۆ دۆســـەکـەی گـیانی
چـــەند بـــۆ پـــڕووز بـــۆ تـــۆ هـــەر بـمانی[۵]

---

[٣١]

(١) زێد: جیگای زایین، لە دایك بوون. نیگا بدارە: راگرە.
(٢) لادێ: کەم. ئەم دالە بە «ی» منگن ئەخوێنرێتـەوە. درەنگـێ: زۆر. واتـە: کـەم و زۆر فەرامۆش و بەرەڵلای مەکە، بەیانی و ئێوارە بە تیر پێوەنانێك ئاگاداری بکە.

[٣٢]

(۴) ئامای: هاتنی. گۆیا: گوایە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی دا دێ.
(۵) بمانی: بمێنی. واتە: خۆزگەی مردنی خۆتت خواستووە، گوایە بە تەمای ئەوە بوویی کە رزگار ببی لە مەینەتی دنیا، بەڵام خوا نەکا ئـەم ئـاواتـەت بـێتـە دی، بـۆ ئـەوەی تـا دڵدارەکانت مابن و ئاگریان تێ بەر ببێ، تۆیش هەر بمێنی و بۆ سۆی لەشی سووتاویان بێ بە لووتتا.

## [٣٣]

## ئاخ پەی خەڵوەتێ

ئـاخ پـەی خـەڵوەتـێ بـدیام وە بـێ خـەم
سیوای تـۆ دیـدەم، کـەس نـەدیام وەچـەم(١)

دڵ پـەی دیـدەنت کـام خـەڵوەت سـازۆ
تـۆی دیـدەیچم بـی، مـەردم نـمازۆ(٢)

## [٣٤]

## ئازیز! وەس بووزەم

ئـازیز! وەس بـووزەم نـە گـێجـاو خـەم
وەس چـون بـینایی پـەنهانبەر نـە چـەم(٣)

وەخـتێ جـە وەسـڵێـچ هـەر دڵم ڕێش بـۆ
مشیۆ وەسڵ و فەسڵ فـەرقشان چـێش بـۆ؟(٤)

---

**[٣٣]**

(١) بدیام: بمڕوانیایە. کەس نەدیام: کەسم نەدیایە.
(٢) سازۆ: دروست بکا. تۆی: لە تۆی، لە ناوی. مەردم: بیبیلەی چاو. نمازۆ: نایەڵێ.
واتە: خۆزگا جێگایەکی چۆڵم دەس ئەکەوت بەبێ خەم لێیەوە بمڕوانییایە بۆت و لە تۆ بەولاوەکەسم بە چاوی خۆم نەدیبایە. بەڵام، داخی گرانم دڵم شوێنێکی چۆڵی بۆ ساز ناکرێ کە لێیەوە بڕوانێ بۆت بە تەنیا خۆی، چونکە باشترین شوێن کە بۆ ئـەوە دەس بدات گلێنەی چاومە، کەچی لە وێیشا بیبیلەی چاوم ئەبێ بە مڵۆزمم وە لەگەڵما سەیرت ئەکا...
ئەوەش دەس ئەدا کە «مەردم» بە خەڵکی مـەعنا لێ بـدەینەوە بـڵێین: بـەڵام ئـەگـەر لە چاویشما دات نێم خەڵکی هەر سەیرت ئەکەن و ئاواتەکەی من نایەتە دی.

**[٣٤]**

(٣) وەس: بەس. بووزەم: بمخە. بەر: بە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.
(٤) مشیۆ: ئەشێ. واتە: ئازیز بەس بە هۆی نەدیتنەوە نوقمی گێژاوی خـەفەتم بکـە، وە

### ئازیزا جە دووریت

ئـــازیزا جــە دووریت تــەن بــی کــڵافــە
رۆح بــــی وە تـــەنوین حـــاڵ ئــیزافــە(١)

[٣٦]

### ئای چەنە سەرچەنگ

ئای چەنە سـەرچـەنگ چـەرخ چـەپ وەردم!
چەرخ چەنی چەرخـاو مـن مـام نـەمەردم!(٢)

[٣٧]

### ئەو ساتە زانام

ئــەو ســاتە زانــام بــەختەکــەم شــەڕ بـی
عــێلــەکـەم هـامڕای عـێل سـەگوەڕ بـی(٣)

---

☞

بەس خۆتم لێ ون کە، وەك چۆن بینایی چاو لە ناو چاوا بۆ کەس نابینرێ، چونکە ئەگەر بشێ لەکاتی بە یەك گەیشتنیشا هەر نەتبینم ئیتر ئەبێ جیاوازی بەینی بە یەك گەیشتن‌دووری لە یەك چی بی؟.

[٣٥]

(١) واتە: لە بەر دووری تۆ لەشم لوولی خواردووە وەك کڵافەی دەزوو وە گیانم لە لەشا نەماوە، وەك چۆن لە زوبانی عەرەبیدا «تنوین» ـکە دوو سەرە، یا دوو ژێرە، یا دوو بۆرە لە ئاخری وشەوە ـ بە سەر هەر وشەیەکەوە بوو، وە ئەو وشەیە «اضافە» کرا بۆ لای وشەی دواوەی، ئەو تەنوینە نامێنێ، هەروەها گیانی منیش بە هۆی پەیوەندی خۆشەویستی تۆوە لەناو چووەو فەوتاوە.

[٣٦]

(٢) سەرچەنگ: چەپۆك. وەردم: خواردم. واتە: ئای چەند چەپۆکی چەرخی چەپگەردم خواردو چەند جار چەرخ هەڵسووڕا، کەچی من هەر مامەوە بۆ مەینەتی دنیاو نەمردم.

[٣٧]

(٣) واتە: ئەو سەعاتە زانیم بەختم شەڕەکە هۆزو گەلەکەم بوون بە هاوڕێی ئەو هۆزەکە سەگوەڕی تیایە.

[٣]

## پزیسکەی چەخماخ(١)

پـــزیسکەی چـــەخماخ کـــافی کـــارمەن
چ وەختو وادەی ئـــــەی گـــوفتارمەن(٢)

دڵەی کـــۆس کـــەفتەم هـــەم تـــەم کـــەردەوە
پـــەردەی ســـەبووریش تـــەمام دڕدەوە(٣)

نـــاڵاو گـــــرەواو خـــولیاوەو خـــول وەرد
جـەو بـوولْ دەردا وێش سـامان سـا کـەرد(٤)

ئـــیسە بـــوولْ دەرد کـــەرۆ وە ســـەردا
دەك ســـڵامـەت بـی چـیت ئـی خـەبەر دا(٥)

---

☞

گەورەی «سید طاهری هاشمی»یەکە تەدارەکی بە خاك سپاردنی «شێخ عبدالصمد»ی کردوەکە لە نزیکی دەوڵەتئاوا مار پێوەی داوە وە مردووە. واتە: مادەم ئەم فرستادەیە ئەمرۆ شەوق خستیە سەر باڵی فڕینو هات بە نازو شکۆوەکاری تۆی ساز کردو وە لە ئەسپەردەکردنی تۆ حازر بوو وە خستیتیە رێ بۆ سەفەری ئەو دنیا، تکام وایە لە گەردە لوولی رۆژی مەحشەریشا ئەو فروستادەکەی‌تر کە حەزرەتی پیغەمبەرە بە فریات بگاو لە ژێر سێبەری ئەودا تێپەڕی.

[٣]

(١) مەولەوی ئەم قسیدە درێژەی کە وەك چەند پارچە هەڵبەست وایە، بە زوبانی حاجی مەحوودی یاروەیسەوە وتووە لە لاواندنەوەی کوڕێکی مردوویا.

(٢) کافیی کارمەن: بەسمە. چ: کەی. واتە: ئێشی پرشنگی چەخماخەی تفەنگەکەکە «عبدالرّحمان»ی کوڕمی کوشت بەسە بۆ ئێشی دڵم کە خۆمی پێوە خەریك بکەم، ئیتر کەی وەختی ئەوەیە قسە بکەمو بی‌لاوێنمەوە. وە چی ئەتوانم بڵێم؟.

(٣) دڕدەوە: دڕی‌یەوە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.

(٤) گرەوا:گریا. خول وەرد: خولی خوارد. بوولْ: خۆڵەمێش. دەردا: دەرەوەدا. سامان‌سا: وێران.

(٥) کەرۆ: ئەکا. چیت: بۆ چیت. ئی: ئەم. واتە: دڵەکۆس کەوتووەکەم دووبارە تەم

☜

دڵە پـــۆشـــابێ پــــەردەی ســــەبووری
ســـــازابـــێ چـــەنی دەردەکـــەی دووری(١)

پـــــەردەی ســــەبووریم دڕیـــــا، ڕۆڵە ڕۆ
ریشـــــەی جـــــەرگەکـــەم بــڕیــا، ڕۆڵە ڕۆ

وە نــــاکـــــاه هــيجرەت کـــەردەم، ڕۆڵە ڕۆ
داخـــان گشت وە خـــاك بـەردەم، ڕۆڵە ڕۆ(٢)

خــــانو مـــان خـــامۆش بـــێ تـــۆ، ڕۆڵە ڕۆ
ئـــــەتفالان مــــەدهۆش بــێ تــۆ، ڕۆڵە ڕۆ(٣)

تــــەڵمـيت سـيا پـــۆش بـــێ تـــۆ، ڕۆڵە ڕۆ
خـــاتوونان بـــێ هـــۆش بـــێ تـــۆ، ڕۆڵە ڕۆ(٤)

کام وەسفت خـەیاڵ، کـام شێوەت یـاد کـەم
پـەی کـــام خـــەسڵەتت دادو فــەریاد کـــەم!

پـــەی عـــەقیدەو دیـــن مــوسڵمـــانیت، داد
پـــەی شـــێوی شـــيرين نـــەوجوانـــيت، داد

---

☞

دایگرتەوەو پەردەی خۆ ڕاگرتنی دادڕیو ناڵاندیو گریاو سووڕایەوەو گێژی خوارد، وە لە ناو خۆڵەمێشی بەر ماڵاندا خۆی تلاند، ئێستەش خۆڵەمێشـی دەردو مـەینەت ئـەکـا بەسەر خۆیا، بێ بەڵابی، بۆچی ئەم خەبەرە ناخۆشەت پێدا تا وا لە خۆی بکا. وادیارە حاجی مەحموود پاش کوژرانی «عبدالرّحمان»ی کوڕی، کوڕێکی تری مردووە، وە زامی پێشووی کولاوەتەوە.

(١) پۆشابێ: پۆشی بووی. سازابێ: گونجابوو.

(٢) واتە: ڕۆڵە ناوادەکۆچ کردووەکەم! ڕۆڵە ئاوات نەهاتووە دی یەکەم!.

(٣) واتە: ڕۆڵەکەم ماڵو دیوەخان بێ تۆ کشو ماتە.

(٤) تەڵمیت: ئەو بارگەو بنەیەیەکە کۆچەری یەکان ئـەیبەن بـۆ کـوێستان. واتـە: لەبـەر نەبوونی تۆ بارو بارگەی کوێستانمان ڕەش پۆشە.

پــەی ئــەو عــەقڵو فـەهم هـۆشـیاریت، داد
پەی خۆش نـیگاریو خـۆش رەفـتاریت، داد

فــەریاد پــەی ئـیخلاس، ئـاخ پـەی ئـایینت
پــەی ئــاغەی دنـیاو پـەی ئـاغەی دیـنت[١]

هەر کەس دیـم، دیـدەم، مـەیل تـۆ پـێش بـی
کێ بی؟ کـێ جـە تـۆ خـاترش رێش بـی؟[٢]

فـــەڵەك جــەرگش دەن وە مـــەودای چـــڵدا
کـــام خـــاتر رێشــیش بـی نـە تـۆی دڵدا[٣]

دەورش وەی تــەورە، ئــەی جـەورە ئـاوەرد
من حەسرەتمەند کەرد، تۆ بەو دەردە بەرد[٤]

---

(١) واتە: ئای بۆ گەورەییت لەکارو باری دینو دنیادا.

(٢) رێش: بریندار. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) دەن: بدەن. مەودا: تیژی.

(٤) دەورش: سوورڕخواردنەوەی. واتە: گیانەکەم من هەر کەسم دیوە خۆشەویستی تۆی لە دڵا بووە، ئەبێ کێبێ دڵی لە تۆ ئێشابێ. نازانم فەلەك، یاخوا جگەری بدەن بـە سـەر چڵی تیژا، چ کینەیەکی لە دڵا بوو لە تۆ، وا وای لێ کردی، وە بەم جۆرە ئەم ستەمەی منی مەینەتبار کردو تۆیشی بەو دەردە برد؟.

## [٤]

### پۆی خەیاتەی فەرد(١)

پـــۆی خـــەیاتەی فـــەرد بـــۆ عـــەنبەرینت
دەس ڕێســـەکـــەی فـــیکر بـیکر شـیرینت(٢)

چون ئارەزووی وەسڵ نـە تـۆی مـەحروومی
تـــەندەبێت وە تـــان فـــەرد مـــەعدوومی(٣)

چـــون شـــەبەندە ڕۆژ ســـەد تـــەرزە ڕەنگدا
تـــەوەن دان وە تـــاڵ دیبـــای فـــەرەنگدا(٤)

---

[٤]

(١) مەولەوی ئەم پارچە هەڵبەستەی لە وەرامی «شێخ عبداللّٰی داخی»یا نووسیوەکە شاعیریکی بەرز بووە، وە زۆر جار نامەی بە هەڵبەست بۆ مەولەوی ناردووەو ئەویش وەرامی داوەتەوە. جارێکیان مەولەوی لە وەرام دانەوەدا دوائەکەوێ، داخی‌یش غەزەلێکی بۆ ئەنێری ئەنێرێ، وە لە غەزەلەکەیا گلەیی لێ ئەکا بەرامبەر بە دواکەوتنەکەی، وە تاقە شیعرێکی مەولەوی ئەخاتە ناو شیعرەکانی، مەولەویش لە وەراما ئەم غەزەلەی بۆ ئەنووسێ.

(٢) پۆ: هەر پارچەیەکی تەنراو دوو جۆرە تاڵی تیایە: تاڵی ڕاکێشراو کە پێی ئەڵێن «تان» یا «ڕایەڵ»، وە ئەو تاڵانەکخ ئەبرین بە ناو تاڵە ڕاکێشراوەکانا پێی ئەڵێن «پۆ». فەرد: شیعر. دەس ڕێس: ڕێسراوی دەس. فکر بیکر: فکری تازەی بە خەیاڵی کەسا نەهاتوو. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٣) نەتۆی: لە ناو. تەندەبێت: تەنی بووت. واتە: پۆی خەیاتەی ئاوریشمی شیعرە بۆن خۆشەکەت ـکە بە دەستی فکری تازەی جوانی خۆت ڕستبووت ـ تەنی بوو لەگەڵ تانی شیعری ناپەسەندی من. ئەمەش وەك ئەوە وابوو کە ئارەزووی بە یار گەیشتن ـبەو جوانی‌یەکە هەیە ـ بیخەیتە ناو خەیاڵی نائومێدی‌یەوە. لێرەدا مەولەوی بە نەزاکەت خۆی ئەشکێنێ کە شیعری داخی بە ئارەزووی بە یار گەیشتن، وە شیعری خۆی بە خەیاڵی نائومێدی دائەنێ.

(٤) شەبەندە ڕۆژ: شەبەنگە بە ڕۆژ، پارچەیەکە بە چەندڕەگ ئەنوێنێ. تەوەن بەرد. دیبا: جۆرە قوماشێکە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

پــــەی دەفـــع ســـەودای دەرد نــەمامان
بــەرگێ بــی پــەی دڵ ســەرتا وە دامـان(١)

دڵ ئـــەو بـــەرگ‌و بـــۆی جـــارانش نــەبی
رووی لوای مـــەجلیس یـــارانش نــەبی(٢)

پـــۆشـــتەت کـــەردەوە ئـــیحسانت یـاوا
دەك هـــەی دەوڵەمـــەند یـــانەت هـەر ئـاوا(٣)

بــێ بــاکــیم عــیللەت دڵ ســەردی نــیەن
بێ مـەیلیم جـە تـەرك هـام فـەردی نـیەن(٤)

بـــەڵام مـــەسئلەی فــتوای قــەزای حــەق
نــە مــەحکەمەی شـەرع حـاکـم مـوتڵەق(٥)

نـــەو عـــەرووس ســـۆز وە دڵ پــەروەردە
خـــەرج گـــیان وە گـیان وە کـابین کـەردوە(٦)

---

(١) پەی: بۆ. نەمامان: ئەو دولبەرانەی وەك تووڵی نەمام ساف‌و بەرزن، یان ئەو کەسانەی کە بەین تێك ئەدن. واتە: ئەو پارچە شیعرەی تۆ کە وەك شەبەنگەبەرۆژ بە چەند رەنگ ئەنوێنێ، وە لە جوانی‌یا بەردی دابوو بە تاڵی پارچەی فەرەنگیدا، بۆ چار کردنی سەوداو عەشق‌و دەردی دولبەرەکان بەرگێکی رەساو سەر تا پێ داپۆش بوو، یا خود: بۆ دەفعی سەودای فیتنەی نەمامەکان بەرگێکی دڵ پارێز بوو، وە هەموو دڵی ئەپاراست.
(٢) نەبی: نەبوو. لوای: رۆیشتنی. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.
(٣) یاوا: گەیشت. یانە: ماڵ. واتە: بەر لە هاتنی پارچەکەی تۆ دڵم بەرگ‌و بۆکەی جارانی جارانی نەبوو، وە رووی نەبوو بچێتە ناو کۆڕی یارانەوە، بەڵام کە پارچەکەی تۆ گەیشت، دڵمت پۆشتەکردەوە، زۆر خێرت گەیشت، سا یاخوا دەوڵەمەند هەر ماڵت ئاوابێ.
(٤) عیللەت: بە هۆی. واتە: نامە نەنووسینم بەهۆی دڵ ساردی‌یەوە نیە، وە لە بەر ئەوە بێ مەیل نەبووم کە دەستم لە دۆستایەتیت هەڵگرتووە.
(٥) مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی بەسراوە بە یەکەوە.
(٦) عەرووس: بووك. سۆز: شەوق. خەرج: پارەی نەخت. کابین: مارەیی.

وەهــــەر ســــێ تــــەڵاق بــاینە کــەردەن
یـــــاد رجـــعەتش وە دڵ نـــاوەردەن(۱)

کــەم بــی شــنۆی وەش ئــاە سـوب دەمـی
وشکــاوش ئــاما جـۆی چـەمەی چـەمی(۲)

بـــێ ســۆزی مــەنزڵ دڵ کــەرد وە یــاتاخ
پــەی ئــاوو هــەواش ئـاو ئـاەو ئـەو داخ(۳)

وەبــێ مــن تـۆ وێت زیــهنت پــێ یــاوان
خـــاست فــەرماوان دانــەت شکــاوان:(۴)

---

(۱) باینە: ئەو تەڵاقەیەکە چاك ناکرێتەوە. رجعەت: گێڕانەوە، ئەو تـەڵاقـەیەکـە چـاك ئەکرێتەوە. واتە: بۆیە نامەم بۆ نەناردووی‌و شیعرم بـۆ نـەنووسیوی چـونکە مـەسەلەی فتوای قەزاو قەدەر خوا لە دادگای شەرعی حاکمی موتڵەق‌دا کە خـوایـە وای پێویست کردووە ئەو تازە بووکە خۆشەویستەم کە بیرتیە لە شەوق‌و سۆزی دڵم، وە بە دڵ بەخێوم ئەکرد، وە گیانی خۆم دابوو لە مارەیی‌یدا، فتوای هەر سێ تاژەڵاقەی خۆی وەرگرێ وە دەرفەتی هێنانەوەی بۆ نەهێشتووم. بەکورتی بە هیچ کلۆجێك سۆز لە دڵما نەماوە، ئیتر چون نامەت بۆ بنووسم.

(۲) کەم بی: کەم بووە. وەش: خۆش. سوب دەمی: بەیانیان. جۆی: جۆگـەی. چـەمەی: سەرچاوەی. چەمی: چاو. واتە: بە هۆی ئەوەوەکە سۆزی دڵم نـەماوە، شـنۆی هـەناسە هەڵکێشانی سبەینیانم کەم بووەتەوە، وە ئاوی سەرچاوەی چاوم کە جاران لەبەر سۆزو عەشق دام ئەڕژاند، ئێستا وشکاوی هاتووە.

(۳) یاتاخ: مەبەس جێ‌و ماوایە. ئەو: ئەگەڕێتەوە بۆ هەوا. واتە: لەو کاتەوەکە سۆزی دڵم نەماوە، بێ سۆزی کە دوژمنیەتی هاتووە دڵی داگیر کردووك وەکردوویە بە مەنزڵی خۆی وە لە بریتی ئاوو هەوای خۆش لە دڵما ئاە وە هەناسەی سارد بووە بە ئاو، وە ئاخ‌و داخ بووە بە هەواکەی.

(۴) وێت: خـۆت. یـاوان: گـەیشتووە. دانـەت شکـاوان: دوڕت قـڵاشتووە، کینایەیە لە قسەی جوان‌و بە جێ کردن. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەدایە.

بـــێ بـــەدەڵەن عـــومر خـــاسش هـــەر پـــاسەن
باختش پەی مەعشووق بێ بـەدەڵ خـاسەن(١)

[٥]

## پێشانیم(٢)

پـــــێشـــــانیم هـــەوەس زانـــووش جـــازمەن
تـــــەعزیم جـــــەناب پـــــیری لازمـــــەن(٣)

بـــــاڵا کـــــەردەوە مـــەیل ئـــەو لای پـــەستی
وردیکـــــــڵانــــــەن دەروازەی هـــــەستی(٤)

مـــەعدوومی! کـــردەی بـــەدی هـــەزار تـــەرز
زانـــــووی ئـــــومێدت نـــاوەرۆ ئـــەو لەرز(٥)

---

(١) پاسەن: وایە. باخت: خەرج کردن. واتە: گیانە تاو بەبێ مـن بـاشی تـێ گـەیشتووی‌و چاکت فەرمووەکە وتووتە هیچ شتی نابێ بە هاوتاو بەرامبەری عومر وە بـە هـیچ شـتێ ناگۆڕرێتەوە، کەواتە وا چاکە ئینسان بە خۆڕایی بێ‌بەخشی بە دڵدار، وە بە تەمای ئەوە نەبێ کە ئەو لە بریتی ئەو بەخشینەدا پاداشی بداتەوە، بۆیە تۆیش کە ئەوەندە بـە وەفـاو دۆستی من بووی نابێ بە تەمای هیچ بی لێمەوە.

[٥]

(٢) مەولەوی لەم پارچە شیعرەی‌دا سکاڵا لە دەس پیری ئەکاو لەگەڵ خۆی ئەدوێ.
(٣) پێشانی: ناوچاو، تەوێڵ. هەوەس: ئارەزوو. زانوو: ئەژنۆ. واتە: ناو چەوانم دانەوێتەوە ئارەزووی ئەوەی هەیە بگا بە ئەژنۆم، چونکە پیری وادەی هاتووەو ڕێز لێ گرتنی پێویستە.
(٤) ئەو لای: بۆ لای. پەستی: دانەوینەوە. وردیکڵانەن: بچکۆلەیە. هەستی: بوون مـەبەس لە ژیانی ئەو دنیایە. واتە: باڵام ئـارەزووی دانـەوینەوەی کـردووەتەوە، چـونکە گـۆڕ کـە دەرگای ژیانی ئەو دنیایە بچکۆلەیە، وە ئەگەر مرۆڤ خۆی دانەنەوێنێتەوە ناتوانێ پیابڕوا. مەولەوی کە وشەی «کەردەوە» بەکار دێنی واتە «کردووەتەوە»، ئەیەوێ ئەوە بگەیەنێ کە مرۆڤ لەکاتی لە دایك بوونیشا خۆی دائەنەوێنێ. ئەم شیعرە ئیشارەتە بە ئایەتی پیروزی ﴿وَ مَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ﴾. واتە: ئەوەی زۆری بژێنین لە ئەنجاما ئەی چەمێنینەوە.
(٥) کردە: کردەوە. ناوەرۆ: نـەیەنێت. واتـە: ئـەی مـەعدوومی کـرداری خـراپـی هـەزار ڕەنگت، ئەژنۆی هیوات نەیەنێتە لەرزە، وە ئومێدت بە لوتفی خوا کەم نەبێ.

ئـــەو كـــەس مـــزانـــوو ســـتارەن ئـــارۆ
جەو بوزورگ تەرەن شـەو ئـەو رۆت نـارۆ(١)

ســفيديت قــەڵغــان پــەی رووی سيات بـۆ
كـــەمانيت شـــەفيع تـــير ديـــات بـــۆ(٢)

نـــمەبۆ پـــيریو تـــەن نـــاتەوانـــيت
وەی دوو فـــەردەوۆ ئـــاو دەس جـوانـيت:(٣)

عـــەزابـــم ئـــەر ســـەد جـــە حـەد بـەرشيەن
جـــە روو ســـيايم گـــرانـــتەر نـــيەن

(١) سەتارەن: گوناه پۆشە. ئارۆ: ئەمڕۆ. نارۆ: نەیەنێ. واتە: ئەو خوایەکە ئەزانم ئەمڕۆ لە دنیادا گوناه پۆشە لەوە گەورەترەکە شەو نەیەنێتە رۆژت وە رۆژی قیامەتت لێ نەکـا بـە شەو، وە گوناهەکانت ببەخشێ.

(٢) سفيديت: ريش سـپيەتيت. کـەمانيت: چـەمينەوەت وەك کـەوان. شـەفيع: تکـاکـار. ديات: روانينی حەرامت بۆ خەڵك. واتە: ئومێدم وایە سپیەتی مووی سەرو ریشت ببێ بە قەڵغان نەیەڵێ لە رۆژی قیامەتا روو رەش ببی، وە پیریو چەمینەوەی باڵات وەك کەوان ببێ بە تکاکار بۆ ئەوەی نەیەڵێ گرفتاری سزای روانینی حەرام ببی. مەولەوی لەم شیعرەدا بەپێی عیلمی بەدیع هونەری «طباق»ی بەکار هێناوەکە بریتییە لەکۆ کـردنەوەی چـەند وشەیەکی پەیوەند دار بە یەکەوە، وەك سپیو رەشیو تیرو کـەوانو قـەڵغان. هـەروەها ئیشارەتی کردووە بۆ فەرمودەی پێغەمبەر کەفەرموویەتی:
«النَّظَرَةُ سَهْمَةٌ مَسْمُومَةٌ مِنْ سِهامِ إبْلِيس».
واتە: سەیر کردنی حەرامی ئافرەت تیرێکی زەهراوییە لە تیرەکانی شەیتان.

(٣) تەن ناتەوانی: بێهێزیی لەش. ئاو دەس: هاو تا. واتە: پیریو لاوازیی لەشت لەگەڵ ئەم دوو شیعرەی پاشەوەدا نابن بە هاوتای خوا پەرستی سەردەمی لاوینیت، چونکە دوو شیعرەکەکە سکاڵای حاڵتن لە پیریدا، لە بارەگای خوادا باشترن لە خواپەرستیو خۆ بە باش زانینی دەوری لاویت لەبەر ئەوەکە لای خوا گناەکـردنو پـاڕانـەوە بـە نـرختره لە پەرستنو خۆ لێبایی بوون بە هۆی پەرستنەوە.

مــــن کــه خـــەجاڵەت خـــزمت ئـــاما پـێم
جـــەهەننم سـەد سـاڵ دۆزەخ بـۆ وە جـێم[(١)]

مـــــــوتریب، بـــــۆ وە داد دڵگــــیریمەوە
پـــــــیری هـــــا ئـــــاما وە پــــیریمەوە[(٢)]

نـــــــەوات وێرانـــــەی دڵ کـــــەرۆ ئـــــاوا
چـــەنی بـــەستەی فـــەرد بـێساران مـاوا:[(٣)]

«ئــــینە گـــرد جـــە وە خت نـــادانـیم بـــیەن
فـــــەسڵ ســــەرمەستی جـــوانـــیم بـــیەن»[(٤)]

«ئــــیسە هـــا جـــە گشت پـــەشیمانیم بـــەرد
وادەی پــــــیریمەن جــــــوانــــیم ویـــەرد»[(٥)]

«کـــــۆچ دوایــــیمەن، یـــــاوانـــم نـــۆبـــە
نـــۆبـــەی تـــۆبـــەمەن، کـــەرەمدار، تـــۆبـــە!»[(٦)]

---

(١) ئەم شیعرەو شیعری پێشوو ئەو دوو شیعرەن کە لە شیعری پێشووتردا ئشارەتی بـۆ کردن. واتە: هەرچەند عەزاب دانم لە رادە بە دەربێ لام گرانتر نیە لە روو رەش بوونم لە خزمەتتا وە ئەوم پێ باشترە، چونکە من لە ئەنجامی تاوانباریی خۆما بە شەرمەساریەوە بگەمە خزمەتت ئیتر مەبەسم نابێ هەرچەند سەدساڵیش لە دۆزەخا سزا بدرێم، لەبەر ئەوە سزا چەشتنم پێ باشترە بۆ ئەوەی بە رووبەکی سپیەوە بێمە خزمەت.

(٢) بۆ: بێ. داد: هاوار. دڵگیری: زویری. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دواییدا دێ.

(٣) نەوات: ئاوازەی خۆشت. چەنی: لەگەڵ. بێساران ماوا: ئەوەی خەڵکی بێسارانـە، مەبەس مەلا موستەفای بێسارانییەکە شاعیرێکی بەرز بووە. واتە: کاکی گۆرانی بێژ بێ بە هاواری عاجزیمەوە، چونکە پیری وا هات بـە پیریمەوە، وە بـا ئـاوازەی خـۆشت دڵی وێرانەم ئاوا کاتەوە بەم شیعرانەی خوارەوەی مەلای بێسارانی.

(٤) گرد: گشت. فەسڵ: سەردەم. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٥) ویەرد: بەسەرچوو.

(٦) یاوانم نۆبە: سەرەم هاتووە. واتە: خوایە هەرچیم کرد لە سەردەمی نەزانیو لاوینیما ☜

## [٦]

## پەژارەت شادیم

پـــەژارەت شـــادیم جـــە بـێخ ئـــاوەردەن
دووریت ریشەی دڵ خـەیمەکـەن کـەردەن(١)

فـــــیراقت فـــەرقم وە تـــووتیاکـــەرد
جـــیاییت ئـــازام جـــە هـــەم جـــیا کـــەرد(٢)

وەسواسەت وەی تـەور ئـێش دان وە جـەرگم
وە مـــــەرگت قـــەسەم رازیـــم وە مـــەرگم(٣)

وێت بـــدەر ئـــینساف نـــەو نـــەمام نـــۆ
مـــەردەن خـاستەرەن یـا خـۆ دووری تـۆ؟(٤)

مـــەردەن یـــەك ســـاتەن ئـەڕواحـەکـەی وێم
دووریت هەر سـاتێ سـەد مـەرگەن پـەرێم(٥)

---

☞

کردم، وا ئێستا پەشیمان بوومەوە لە هەمووی چونکە جوانیم بەسەر چوو، وە وادەی پیریم هاتەو ئەجەلم نزیك بووەتەوە، وە وەختی ئەوەیەکە تۆبە بکەم، ساخوای بـەخشندە لێم ببوورە.

[٦]

(١) خەیمە: خێوەت. واتە: خەفەتی دووریت شادیو خۆشی لە دڵما نـەهێشتووە، وە ریشەی دڵمی وەك خێوەتی هەڵکەنراو لێ کردووە.

(٢) فەرقم: کەللە سـەرم. تـووتیا: دەرمـانێکـی زۆر وردە. ئـازام: ئـەعزام. واتـە: فـیراقت کەللەی سرمی وەك تووتیا هاڕیوە، وە جیاییت ئەندامەکانی لەشمی لە یەك کردووەتەوە.

(٣) وەسواسەت: خەیاڵ لێ کردنەوەت. وەی تەور: بە جۆرێ.

(٤) وێت بدەر ئینساف: واتە: خۆت بە ئینسافی خۆت حوکم بدە.

(٥) پەرێم: بـۆم. واتـە: مـردنم چاکـترە لە چـەشتنی دووریت چـونکە ئـەو جارێکـەو ئەبڕێتەوە، بەڵام دووریت هەر سەعاتێکی مردنێکە.

مـــەر جـەستەی خـەستەی مـن جـە فـۆلادەن
یـــەند دووریت ویـــنۆ هـێـمـان دڵ شـادەن[١]

دەك رەحـــمەت ئـــەو قـەبر گشت وەفـا داران
خـــوسوسەن ئـەو كـەس شـای وەفـا داران[٢]

[٧]

**پەشێوی**[٣]

پـــــەشێوی وە نــــەزم لوولووی ئــەسرین‌دا
پـــەروین دائـــیرەی خــورشید تــەزیین‌دا[٤]

جای ناخوون وە خوون ئەو گۆنای بــێ گــەرد
ئــیشارەت وە مـــانگ مـــەینەت دڵ كـەرد[٥]

---

(١) فولاد: پۆڵا. وینۆ: ببینێ. واتە: بۆچی لاشەی نەخۆشی من لە پۆڵا دارێژراوە تـا ئـەم هەموو دووری‌یەت ببینێ و هێشتا هەر دڵشاد بێ.

(٢) ئەو: لە. واتە: دەك رەحمەتی خوا لە گۆڕی هـەموو خـاوەن وەفـایەك، بـەتایبەتی لە گۆڕی ئەوانەكە وەفاكەیان ئەوەندە بێ گەردە شای هەموو وەفایەكە.

[٧]

(٣) مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی لە لاواندنەوەی پەریزاد خان ناوێكا وتووەكە یەكێك بووە لە ژنە بەگزادەكانی جاف.

(٤) لوو لوو: لوء لوء، مرواری. ئەسرین: فرمێسك. پەروین: ئـەستێرە. خـورشید: خـۆر. واتە: ئەم ماتەمە رشتەی مرواریی فرمێسكی هۆنراوەی ئافرەتانی تێك دا، وە ئەو دەنكە فرمێسكانەكە وەك ئەستێرە وان تۆپی رووی ئەو ئافرەتانەیان رازاندەوەكە وەك رۆژ وایە. مەبەسی ئەویە نازاران ئەوەندە بەسۆز ئەگرین فرمێسكیان كە ئەوسا وەك رشتەی مرواری وابوو ئێستە بە ناڕێكی ئەڕژێتە خوارەوە، وە ئەو دەنكە فرمێسكانەكە بە دەوری رووبانا ئەڕژێتە خوارەوە دائێرەی رووبان ئەرازێنێتەوە.

مەولەوی لەم هەڵبەسە بەرزەیا لە لایەكەوە تەشبیهی رووی ئافرەتەكانی كردووە بە رۆژ، وە لە لایەكی ترەوە ئیشارەتی كردووە بۆ ئەوەكە لە خەفەتا رۆژی روویان زەرد بووە، ئەگینا ئەستێرە بە دەوری رۆژا دەرناكەوێ.

(٥) ناخوون: نینۆك: خوون: خوێن. واتە: جێ نینۆكـی ئـەو نـازارانـەكـە روو خـۆیـانیان

شـــیرینی قـــامەت قـــیامەت نـــەوەرد
سـەڵای فـەرز بـەرگ ئـازیەتی ئـاوەرد(١)

هـەنی فـتوای شـەرع بـادە نـۆشـان بـۆ
حـــەڵاڵی کـاڵای مـاتەم پـۆشـان بـۆ(٢)

وەشــــەن ئـــەو بـاڵا چـون بـەو کـاڵاوە
بـــازش ئـــەو کـاڵا هـەر بـەو بـاڵاوە(٣)

حـــەیات جـــە زوڵمـــات جـیا نـمەبۆ
کـــاوە وە بـــێ بــەرگ سـیا نـمەبۆ(٤)

---

☜
هەڵکەندووە، وەك مانگی یەك شەوە وایە بە ړوویانەوەکە نیشانە ماتەمو مەینەتی پێوە بێ. ئەمە ئیشارەتە بەوەکە ئەستێرە ژمێرەکان ئەڵێن هەر مانگێکی یەك شەوە ڕەنگی سـوور بنوێنێ نیشانەی شەڕو شۆڕە.

(١) قامەت: باڵا. قیامەت نەوەرد: بیابانی قیامەت تەی کـەر. ئـازیەتی: تـەعزیە. ئـاوەرد: هێنا. واتە: جوانیی باڵای ئەو خاتوونەکۆچ کردووەکە بیابانی قیامەتی تەی ئەکرد بانگی هەڵدا بۆ فەرز بوونی پۆشینی بەرگی ماتەم. مەولەوی لێرەدا بە وشەی «قامەت» ئیشارەت بۆ «قامت»ی نوێژ ئەکا کە وردێکی تایبەتی‌یە بەر لە نوێژ بە دەنگی بەرز ئەخوێنرێ بـۆ ڕاست بوونەوەی نوێژکەران. وە بە وشەی «سەلا» ئیشارە بۆ «صلاة» ئەکا بە مەعنای نوێژ. واتە: وەك چۆن بە دوای «قامت» کردنا نوێژی فەرز دێ، بە دوای قامەتی ئەو نازارەکۆچ کردووەشا پۆشینی بەرگی ماتەم فەرز بووە. لێرەدا بە پێی عیلمی بەدیع لە بەینی وشەی «قـامەت»و «قـیامەت»دا هـونەری «جـناسی نـاقص» هــەیە، وەك چـۆن لە بــەینی «قامەت»«سەلا»دا هونەری «طباق» هەیە.

(٢) هەنی: ئیتر. کاڵا: پارچە، قوماش. واتە: مادەم کە ئەو مرد ئیتر با شەرع فتوای حەڵاڵ بوونی شەراب خواردنەوە بدا، چونکە قوڕگی خەڵك پڕ بووە لە گـریان وە لە شـەراب بەولاوە بە هیچی‌تر چاك نابێتەوە، کەواتە شەراب خواردنەوە دورستە، وە با شەرع فتوای حەڵاڵی پۆشینی بەرگی ئازەیەتی بدا.

(٣) وەشەن: جوانە. بازش: لێی گەڕێ. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٤) حەیات: ئاوی حەیات. زوڵمات: تاریکی. کاوە: میسکی بۆن خـۆش. سـیا: ڕەش.
☜

[٨]

## پەیغام(١)

پــــەیغام بـــاڵای خــــەمبارەکـــەی تــۆ
خـــەمیای حـــەڵقـەی گـۆشـوارەکـەی تـۆ(٢)

چـــەند وە ســـەرگۆشـــی وە گـۆشت ئـاوەرد
چون بەد بەخت بیم تـۆ گـۆشت نـەکـەرد(٣)

[٩]

## پەی کەسێ

پــەی کــەسێ خـــاسەن هـــەوای سـەیر بـاخ
مـاسیوای مـەعشووق نـە بـۆش ئـاخو داخ(٤)

---

☞

واتە: باڵای ئەو ئازەیەتی بارانە زۆر جوانە بەو بەرگە رەشەی بەریانەوە، کـەواتـە لێ‌یـان گەڕێ با هەر ئەو بەرگەیان لەبەرا بێ، چونکە ئەوانە وەك ئاوی حەیات وان، هەروەك ئەو لە تاریکی دایە ـ بە پێی ئەفسانەی کۆن ـ ئەمانیش ئەبێ لە بەرگی رەشا بن، وە ئەوانە وەك میسکی بۆن خۆش وانە، ئەبێ بەرگی رەشیان لە بەرا بێ وەك ئەم پێستێکی رەشی هەیە.

[٨]

(١) مەولەوی لەم دوو شیعرەیا لومەی دۆستێکی ئەکا کە چەند جار راسپێری‌یەکی ناردبوە لای، بەڵام ئەو گوێی نەدابوویە.

(٢) پەیغام: راسپێری. خەمیا: چەمیوە. گوشوارە: گوارە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بـە شیعری پاشەوە.

(٣) سەرگۆشی: چپە. واتە: راسپێریـەکـەی مـنی خـەفەتباری تـۆو چـەماوەی ئـەڵقـەی گوارەکەت، چەندجار بە چپە درا بە گوێتا، بەڵام چونکە من بەدبەخت بووم تـۆ گـوێت نەدایە.

[٩]

(٤) هەوا: ئارەزوو. سەیر: تەماشا کردن. نەبۆش: نەی‌بێ. مـەعنای ئـەم شـیعرە لەگـەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

مــن جــفت مــەعشووق دەرد هــەمڕازمــەن
چـــون بــاز ســەرچــڵ وادەی بــازمەن(١)

••••••

**[١٠]**

### پەنج بیەن وە شەش(٢)

پەنج بیەن وە شەش، شەش روو کەرد نە پـەنج
حــەریر نــە مـابەین بـیەن گـەوهەر سـەنج(٣)

••••••

**[١١]**

### پیری

پـــیری‌و فــەقیری‌و کــەسیفی، هــەر ســێ
نـــەبۆ وە هـــیجران بــار هــیچ کــەسێ(٤)

••••••

---

(١) جفت: لەگەڵ. هەمڕاز: هاوڕێ. واتە: ئارەزوو کـردنی سـەیری نـاو بـاخ بـۆ کـەسێ باشەکە جگە لە یار خەفەتێکی لە دڵا نەبێ، بەڵام من سەرەڕای یـار دەردیش بـووە بـە هاوڕێم، وە وەك بازی سەر چڵان، یان وەك بازی ئوقرە نەگرتوو، وادەی بازدانمە وە خۆم پێ ڕاگیر ناکرێ لە باخا بۆ سەیر کردن.

**[١٠]**

(٢) مەولەوی لەم شیعرەیا شێوەی نووسین روون ئەکاتەوە.

(٣) حەریر: ئاوریشم، مەبەس قاقەزە. گەوهەر سەنج: گـەوهەر رێك خـەر. واتـە: پێنج پەنجەکەم لەگەڵ قەڵەمەکەی دەسما بوون بە شەش، وە ئەم شەشە روویان کردووەتە پێنج پەنجەکەی ترم، قاقەزەکەیش لە بەینی ئەم دوو دەسـتەما بـووە بـە گـەوهەر رێك خـەر. مەبەسیش لەگەوهەرەکە تیپە نووسراوەکانە.

**[١١]**

(٤) کەسیفی: پیس‌و پۆخڵی. هیجران بار: باری مەینەت. واتە: یـاخوا پـیری‌و هـەژاری‌و پیس‌و پۆخڵی نەبن بە باری مەینەتی سەرشانی هیچ کەس.

[١]

## تەژنەی گیان(١)

تـــەژنەی گـــیان وە لەب سـەودای سـەبووری
کـــەفتەبێم نـــە گـــێج دەریـــاکـەی دووری(٢)

دیـــم نـــەشئەی فـــێنك سـێراوی سـەردا
شـــنۆی زیـــندەگـــیم ئـاما وە بــەردا(٣)

چـێش «خـــضر» نـــامەی تـــۆش ئاوەردەوە
دەك رســـتگار بـــۆ ئـــیحیام کـــەردەوە(٤)

یـــــاوا پـــێم پـــەرێم زایـــەڵەی زاریت
زگـــــاری زامــــەت بـــێ دەوای کـــاریت(٥)

---

[١]

(١) مەولەوی ئەم پارچـە هـەڵبـەستەی لە وەرامـی بـرادرێکیا نـووسیوەکـە ئـەو ئـیزنی دۆستێکی خۆیو مەولەویی دابوو بڕوا بۆ سەفەرێك، ئەو برادەرەی زوری پێ نـاخۆش بووەکە ئەو دۆستە بڕوا بۆ سەفەر، مەولەویش هەروا پێی ناخۆش بووە، جا برادەرەکەی مەولەوی بۆ مەولەوی ئەنووسێ من زۆر عاجزم لەبەر خەفەتباریی تۆ بە هۆی سەفەری دۆستەکەمانەوە، وە بۆ ئەو خەفەتباریی تۆیـە عـاجزترم لە عـاجزی‌یەکـەی خـۆم لەبـەر سەفەری ئەو، وە بانگی مەولەوی ئەکا بڕوا بۆ لای تا هەندێك پێکەوە رابوێرن. مەولەویش لە وەرامی ئەو برادەرەیا ئەم پارچە هەڵبەستە ئەنووسێ:

(٢) تەژنە: تینوو. گیان وە لەب: گیان هاتووە سەر لێو. کەفتەبێم: کەوتبووم. مەعنای ئـەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «تەژنە» نووسراوە «خەستەی» واتە ماندوو بووم... بەم پێ‌یە ئەم پارچە هەڵبەستە یەکـێك ئـەبێ لە پـارچـە هەڵبەستەکانی تیپی خێ.

(٣) سێراوی: تێراوی. سەردا: دەرکەوت. شنۆ: شنە. ئاما وە بەردا: هاتەوە بە بەرا.

(٤) چێش: چونکە. رستگار: رزگار. واتە: تینوو بووم، لە تاو خۆڕاگـرتنم لە بـەر دەردی دووریی دۆست، گیانم گەیشتبوە کونە لووتم، وەکەوتبوومە گێژاوی دەلیای دووری‌یەوە، لە ناکاو دیم نەشئەی فێنکی تێراو بوون سەری داو شنۆی ژیانم هاتەوە بـە بـەرا، چـونکە خدری فروستادەت نامەی تۆی هێنا. دەك سا خوا رزگاری کا وا زیندووی کردمەوە.

(٥) یاوا: گەیشت. پەرێم: بۆ من. زگاری: زوبری. زامـەت: زەحـمەت. کـاری: کـاریگەر.

مــزانــوو، هــام فــەرد، پڕ شــەرتو شــۆنــی
یـــــارم، دڵدارم، غـــــەم خـــوارم تــۆنـــی[١]

بـــەڵام تــۆیـــچ ئـــاخر ڕەنـــجت بـــەردەبێ
چـــەند جـــار ژار مـــار دووریت وەردەبـێ[٢]

پەی چێش وستانێت ئەی مەهلەکەی سەخت
فـــــــتوای لوات دا، لواوە بــــێ وەخت[٣]

زوانت، وەخـــــتێ ئـــیزنش تـــەڵەب کـــەرد
لاڵ کـــەی نـــمەبۆ چـــەنی «ئـا»ش ئـاوەرد[٤]

چـــەم بـــێ پـــەی دیـــنش بـیناییش کـەم بـی
گـــۆش بـێ شـنەفتش سـەداش مـاتەم بـی[٥]

تـــەن بـــێ کـێشیش خـەستەی هـیجران بـی
دڵ بـــێ مـــەنزڵگـــەی مـــەیلش وێران بـی[٦]

---

☞

مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.

(١) مزانوو: ئەزانم. پڕ شەرتو شۆنی: بە وەفاو شەرتی. تۆنی: تۆی.

(٢) تۆیچ: تۆیش. بەردەبێ: بردبوو، کێشابوو. وەردەبێ: خواردبوو.

(٣) وستانێت: منت خستە. ئەی: ئەم. لوا: ڕۆیشتن. واتە: نامەکەتم خوێندەوە، وە حتاڵی بووم لە هاوارو گریانت بۆ من، وە زوریت بە هۆی زەحمەتی کاریگەری بێ دەرمانتەوە. من ئەزانم تۆ دۆستێکی بە وەفای وە یارو دڵدارو خەمخۆری منی، بەڵام خۆ تۆیش چەند جار ژاری ماری دووریت چەشتبوو وە ئەتزانی چەند ناخۆشە، ئەی بۆچی منت خستە ئەم مەینەتەوەو ڕێگای ڕۆیشتنی یارت داو ئەویش بە ناوەخت ڕۆیشتو بەجێی هێشتین.

(٤) واتە: وەختێ کە ئەو دۆستە داوای ئیزن دانی لێ کـردی بـۆ ڕۆیشـتن، زمـانت، لاڵ کەیەکە بێ، چۆن «ئا»ی پیاهاتو ڕێگای بڕوا؟.

(٥) پەی دینش: بۆ روانینی. شنەفتش: گوێ لێبوونی. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٦) بارکێشیش: بارکێشانی. ئەم زەمیری «شین»انە هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆ دۆستەکەی.

چ دادێ مـــدۆ خــاکـــم وە ســەر بـۆ
ئـــیسه تـــەمای مـــن یـــا زایـەڵەی تـۆ(١)

مــەعلووم بــی وەنــەم حـەسرەتت کـێشـان
پەی سەیرو سـوحبەت سـەفای دڵ ڕێشـان(٢)

هــام ڕەفــێقـم دەرد، هـام سـوحبەتم کـۆس
وێم جە وێم خاڵی، مەوج مـدەو جـە دۆس(٣)

(١) مدۆ: ئەدا. واتە: بینایی چاوم کز بووە بە هۆی نەڕوانینەوە بۆ ئەو، وە گوێم پڕ بووە لە هاواری خەفەتی دوورکەوتنەوەی بە هۆی نەبیستنی قسەیەوە تا ببێ بە مایەی خۆشی، وە لەشم ماندوو بووە لە بەر دیار نەبوونی ئەو تا باری بکێشێ، وە دڵم وێران بووە چونکە جاران مەنزڵگەی مەیلی ئەو بوو، وەکە ئێستا ئەو نەماوە چۆڵ بووەو کەسی تیا نیە، ئیتر سا خاك بە سەرم چ سوودێکی هەیە تەماو ئومێدی منو هاوارو گریانی تۆ.
وەئەگەر «ی»ی «بی» بە درێژی بخوێنینەوە، بە مـەعنا «بـوو» وەك ئـەوەش دەس ئـەدا، مەعنای وا لێ دێتەوە: چاوم هەبوو بۆ دیتنی ئەو، بە ڕۆیشتنیو نـەدیتنەوەی، بـینایی کـز بووە، وە گوێم هەبوو ئەی بیست، ئێستا کە ئەو نەماوە سەدای خەمو خەفەتی تـیایە، وە لەشم هەبوو باری ئەوی ئەکێشا، ئێستا بە هۆی نەمانی ئەوەوە ماندوو بووە، وە دڵم هەبوو مەنزڵگەی مەیلی ئەو بوو، کە ئەو ڕۆیی وێران بوو. بە پێی ئەم مەعنایە ئەوە ڕاستەکە لە هــەندی نــوسخەدا لە جــیاتی «شــنەفتش» نــووسراوە «مــەشنەفتش»، وە لە جــیاتی «بارکێشیش» نووسراوە «بارکێشش».
وە ئەگەر لە جیاتی «بی» بخوێنینەوە «پەی» وەك لە هەندێ نوسخەدا نووسراوە، مەعنای وای لێ دێتەوە: چاو کە بۆ دیتنی ئەوم دانابوو بە هۆی دوور کـەوتنەوەیەوە بـینایی کـەم بووە، وە گوێ کە بۆ بیستنی قسەی خۆشی ئەوم ئەویست، ئێستا کە دەنگی ئەوی تیاپڕ بووە لە سەدای خەمو خەفەت، وە لەشم هەبوو بۆ بارکێشانی ئـەو، ئـێستا لەبـەر دوور کەوتنەوەی ئەو مانوو بووە، وە دڵم هەبوو کردبووم بە مەنزڵگەی مەیلی ئەو، ئێستا وێران بووە چونکە ئەوی تیا نەماوە. بە پـێی ئـەم مـەعنایەش هـەر «بـارکێشیش» ڕاسـتە نـەك بارکێشش. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «شین»ە زەمیرەکان لە هەموو نیوەی شیعرەکاندا، زەمیری «تی» هەیە. بەم پێیە مەولەوی ڕاستەو خۆ قسە لەگەڵ برادەرەکەی ئەکا، بەڵام گۆڕانی مەعنای شیعرەکان لە سنووری گۆڕینی زەمیر لە «غایب»ەوە بۆ «مخاطب» دەرناچێ.
(٢) وەنەم: لێم. کێشان: کێشاوە. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٣) هام سوحبەتم کۆس: کۆس کەتن بووە بە هاوڕێم. مەوج مەدەو: شەپۆل ئەدەم.

تـــا ئـــەو بـــەو جـــەماڵ دڵ دەســـە پـــاڵەن
مـــن ســـەیرم مـــەحاڵ، ســـەفام بـــەتاڵەن[١]

جـــەو بـــۆ نـــۆ فـــەردم ئـــیستیفا بـــێزەن
دامـــەنەش لایـــق ئـــەی پـــەراوێزەن:[٢]

شـــێوە ئـــەر ئـــێدەن مـــن کـــەردەنم ســـەیر
فـام، خـودا حـافز! دیـن، بـنیش وە خـەیرا[٣]

تـــۆ ســـەرووەش وەی ســـەیر ســـەفاو بـەختەوە
مـــن وێڵ وێڵ وەی زام ســـزای ســـەختەوە

تـــۆ هـــەر ســـات شـــادیت بـــێ ئـەندازە بـــۆ
مـــن هـــەر لاد دەردێ پـــەرێم تـــازە بـــۆ[٤]

تـــۆ وێنـــەی بـــولـبـولْ مـەست هـەوای گـوڵ
مـــن چـــون بـــایەقوش چـــوڵ نـەوای دڵ[٥]

---

(١) دەستە پاڵ: کەسێکەکەوتبێ لەسەر شان.
(٢) جەو بۆنۆ: بەو بۆنەوە. فەردم: شیعرم. ئیستیفا: پارچە قوماشێکی جوانە وەك تاقە. دامەنەش: داوێنەی. ئەی: ئەم. واتە: زانیومەکە زەحمەتت کێشاوەو خۆت ماندوو کردووە بۆ ئامادەکردنی سەیرانو رابواردن بۆ هاوڕێ دڵ برینداره‌کانت، بەڵام من ئەم رابواردنەم پێ ناکرێ چونکە دەردو کۆس کەوتن بووە بە هـاوڕێم، وە خـاڵی بـوومەتەوە لە خـۆمو فکری خۆمم پێ نەماوەو شەپۆل ئەدەم لە خەیاڵی دۆستا، چونکە تا ئەو بەو جوانی‌یەو شۆخو شەنگی‌یە بێ کە دڵ ئەکوتێ بە عەرزاو لە سەر لا ئەی خا، من سەیرو خۆشیم پێ ناکرێ، بۆیە شیعری من وا ئەوەندە جوانو رازاوەیەو پارچەی ئیستیفا لە بەر چاو ئەخا، وە داوێنەی شیعرم شایانی ئەوەیەکە ئەم شیعرانەی پاشەوەی بۆ بکرێ بە پەراوێز.
(٣) ئێدەن: ئەمەیە. دین: ئایین. بنیش: دانیشە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوە پێکەوە دێن.
(٤) هەر لاد: هەر کاتێ. پەرێم: بۆم.
(٥) بایەقوش: باڵندەیەکە بە نەگبەتی ناوبانگی دەرکردووە.

پــەرێ تــۆ راحــەت، پــەرێ مــن زامــەت
هــەردوو ســڵامــەت، تــا رۆی قیامەت(١)

[٢]

## تەدریس و تەقدیس(٢)

تــەدریس و تــەقدیس، تــەمجید بــێ دەنگــەن
حــەسارەی تــەقریر تــەوحید بــێ رەنگــەن(٣)

پــــارچــــەی تــــەئلیفات شــێخ «مــهاجر»
گـــــرانـــــەن، نـــیەن مشــتەری و تــاجر(٤)

---

(١) پەرێ: بۆ. واتە: شێوەی دۆست ئەگەر ئەو شێوەیە بێ کە جاران من دیومە، نەفامم لا ئەمێنێ و نە ئایین وە ئەبێ ماڵاوایی‌یان لێ بکەم، کەواتە تۆ بۆ خۆت بەکامەرانی رابوێرەو سەرخۆشی بەختیاریی خۆت بە، منیش بە زامی سەختی خۆمەوە سەری خۆم هەڵئەگرم، ئیتر خوا بکا تۆ هەر تاوێ لە خۆشی و شادمانی‌یەکی بێ ئەندازەدا بی و منیش هەموو وەختێ دەردم بۆ تازە ببێتەوە، تۆ وەك بولبول بە بۆنی گوڵ مەست بی و منیش وەك بایەقوش لە چۆڵی‌یەکدا بم کە جگە لە ئاوازەی دڵی خۆم هیچی تیا نەبیسم، هەردووکمان بە سەلامەتی بژین تا رۆژی قیامەت بەڵام تۆ بە رەحەتی و من بە دەردو مەینەتەوە.

[٢]

(٢) مەولەوی ئەم غەزەلەی بۆ خزمەتی شێخ محمد جەسیمی برای شێخ قادری دانەری شەرحی «تهذیب الکلام» نووسیوەکە یەکێ بووە لە زانا گەورەکانی سنە بە بۆنەی کوێر بوونی خۆیەوە. ئەم غەزەلە لە هەندێ نوسخەدا بەشێکە لە غەزەلی «بینایی دیدەم تۆ وە سڵامەت» کە لە تیپی «بێ»دا بڵاومان کردەوە.

(٣) تەدریس: دەرس وتنەوە. تەقدیس: بە بێگەرد زانینی خوا. تەمجید: شانو شکۆ بۆ خوا دانان. حەسارە: شوورە. تەقریر: روون کردنەوەی دەرس. تەوحید: خوا بە یەك دانان، مەبەس عیلمی کەلامە. واتە: دەنگی دەرس وتنەوەو تەقدیس و تەمجید کردنی خوا نایەت لە خوێندنگاکەمەوە بە هۆی کوێر بوونمەوە، وە شوورەی خوێندنگای عیلمی تەوحیدم رەنگ و رووی نیە.

(٤) شێخ مهاجر: مەبەس زانای بەناوبانگ شێخ «عبدالقادری مهاجر»ە. ئەم زاتە کوڕی

**«کشف الغطا»ی سەدر موحەممەد جەسیم**
**غونچەی نەشکەفتەن بێ شنۆی نەسیم(١)**

☞

زانای گەورە «شێخ محمد سعیدی تەختەیی» مدرسی مزگەوتی «دار الاحسان» بووە لە سنە، وە سێ برای وەك خۆی زانا بووە «شێخ جەسیم»و «شێخ نسیم»و «وسیم»، وە لە پاش وەفاتی باوکی لە جێگەی ئەو بووە بە مدرسی «دارالاحسان»، تا ساڵی ١٢٧١ی هیجری‌دا لە سەردەمی والیی کوردستان «غوڵام شاە خان»ی مەشهوور بە «امان الله خان»ی دووهەمدا لە ئەنجامی کارەساتەکەی «کاروانسەرا»دا کە لە نێوان شێعەو سوننی‌دا قەوما، لەگەڵ شێخ نەسیمی برایا سنەیان بەجێ‌هێشت‌و هاتن بۆ سلێمانی وە لەوێ دامەزران. بەڵام شێخ جەسیم‌و شێخ وەسیمی برای هەر لە سنە مانەوە، هەرچەند والی لەسە مزگەوتی «دارالاحسان» لای‌بردن‌و شێخ یوسفی مەردۆخیی خزمیانی کرد بە مدرس تیایا چونکە لایەنگری خۆی بووە. موشتەری: کڕیار. تاجر: بازرگان. واتە: کتێبە عیلمی‌یەکان کە شێخ «عبدالقادری مهاجر» دای‌ناون کەس نەماوە بی‌یانڵێتەوە بە فەقێ، چونکە لەو ناوچەیەدا تاقە مامۆستایەك کە ئەو کتێبانەی زانیبێ هەر مەولەوی بووە. ئەو کتێبانەی شێخی مهاجر بریتین لەمانە: سێ شەرح لە سەر کتێبی «تهذیب الکلام» وە نامیلکەی «اثبات الواجب» وە حاشیەی «الزوراء»و «الحوراء» کە «جلال‌الدینی دوانی» دای‌ناون لە عیلمی کەلاما، وە حاشیە لەسەر حاشیەی «مصلح الدینی لاری» لە سەر شەرحی «قاضی» لە بەشی «طبیعیات»و «الهیات» لەکتێبی «الهدایە»ی «اثیر الدینی ابهری» وە گەلێ کتێبی‌تر. مەولەوی لەم شیعرەیا کتێبەکانی شێخی مهاجری شوبهاندووە بە پارچە قوماشی گرانبەها کە نە بازرگانێك هەبێ توانای فرۆشتنی ببێ وە نەکەسیش بتوانێ بیکڕێ. بەڕاستی مەولەوی لە زانایدا شایانی ئەم پیاهەڵدانەی خۆیەتی کەکردوویەتی، بەڵگەش دانراوە بە نرخەکانیەتی لە عیلمی کەلامدا بە عەرەبی‌و فارسی‌و کوردی.

(١) نەشکەفتەن: نە پشکووتوو. واتە: کتێبی «کشف الغطاء» کە زانای گەورە «صدر العلماء شێخ محمد جسیم» دای‌ناوە، وەك چۆن خونچە بە بێ شنۆی نەسیم ناپشکوێ، ئەویش بە بێ نەسیمی زانستی ئێمە دەم ناکاتەوەو نازانرێ. مەولەوی لەم شیعرەی‌دا دوو هونەری «بدیع»ی بەکار هێناوە، یەکەم یەك‌خستنی «خونچە»و «نەسیم» کە پێی ئەڵێن «طباق»، دووهەم کۆکردنەوەی «جسیم»و «نسیم» کە پێی ئەڵێن «جناسی ناقص».

بـــێ نـــازەن کـــیتاب «عـــطا»ی «دولتـــین»
یەند رێزان قەترەی خوم جە عـەین عـەین(١)

تـــەفاوت نـــیەن تـــێش‌دا جـــە مـــابەین
شوبهەی شین‌و سین مـیسل عـەین‌و غـەین(٢)

بـــاڵ نـــمەدۆ تـــەیر تـەحریر وە هـــەم‌دا
گـــا وە رووی رۆم‌دا، گـــاوە عـــەجەم‌دا(٣)

ئـــومەنای دەوڵەت جـــە گـــردین لاوە
نـــە ئـــینتیزارەن چـەم نـــە رووی راوە(٤)

تـــەوانـــای وانـــای فـــەرمان نـــەمەندەن
چـــەپەر بـــێ جـــواو، خـــەبەر پـا بـەندەن(٥)

(١) عەطای دەوڵەتەین: «عطاء الدولتین» کتێبێکە، هەرچەند نەم‌دیوە بەڵام بـە هـەندێك نیشانەدا وا دیارە باسی مەزهەبی شێعەو سونتی ئەکا، وە بە نیازی نەهێشتنی ناکۆکی‌و لە یەك نزیك کردنەوەی دەولەتی عوسمانیی سوننی مـەزهەب‌و دەولەتـی ئـێرانـی شـێعـە مەزهەب نووسراوە. عەین: سەرچاوە. عەین: چاو. واتە: ئەوەندە فرمێسکی شـینی وەك خوم لە سەرچاوەی چاوم هاتووەتە خوارەوەکتێبی «عطاء الدولتین» بێ نازکەوتووە.
(٢) تەفاوت: جیاوازی. تێش‌دا: تیایا. شین: ئیشارەتە بۆ شێعە. سین ئیشارەتە بۆ سوننی. عەین مەبەس لە قسەی راست‌و رۆشنە. غەین: مەبەست قسەی غەڵەت‌و تاریکە. هەڵیش ئەگرێ هەر مەبەس ناوی تیپەکان بێ. واتە: بە هۆی کوێر بوونمەوە فەرق نەماوە لەکتێبی «عطاء الدولتین»دا لە نێوانی شوبهەی شیعەکـان‌و دەلیـلی راسـتی سـوونی‌یەکـاندا، وە جیاوازی نەماوە لە نێوانی رۆشن‌و تاریکا، یان جیاوازی نـەماوە لە بـەینی تـیپی شـین‌و سین‌و، عەین‌و غەین دا، چونکە فەرق بە چاو ئەکرێ، وە منیش چاوم نەماوە.
(٣) باڵ نمەدۆ: باڵ لێ نادا.واتە: باڵداری نووسینم بە هۆی کوێر بوونمەوە، وەك جـاری جاران ناداتە شەقەی باڵ، جـارێك بـەرەو وڵاتـی رۆم‌و جـارێك بـەرەو وڵاتـی عـەجەم. مەولەوی لێرەدا توانای نووسینی خۆی شوبهاندووە بە باڵدار.
(٤) ئومەنا: امناء. گردین: هەموو. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.
(٥) وانا: خـوێنـدنەوە. چـەپەر: مـەئمووری پۆسـتە. جـواو: جـواب، وەرام. واتـە: پـیاو

سەهلەن بینایی دیدەی مەعدووم سەند
داخم هەر ئیدەن ئاخ پەی یاران مەند(١)

بەڵام کێن بدۆ نەی راگوزەردا
شان وە شان شێر قەزاو قەدەردا(٢)

مەحبووبەن هەرچی موقتەزای قەزان
مەغووبەن جەلای هەر کەس پێش رەزان(٣)

هەر شێرێ جە شیر شێران شیر وەردەن
گەردەن پەی زەنجیر تەقدیر کەچ کەردەن(٤)

بارێ ئەگەر هەور ئەلتاف باری
پەی مەدەدکاری وە دڵدا باری(٥)

---

☞

ماقوڵانی رۆم و عەجەم چاویان لە رێیەو بە تەمان منیان پێبگات، بەڵام من توانای خوێندنەوەی نامەی ئەوانم نەماوە تا وەرامیان بدەمەوە، لە بەر ئەوە مەئمووری پۆستە ماتڵەو خەبەر پێی بەسراوە.

(١) مەند: مایەوە: واتە: کوێر کردنی مەولەوی وەنەبێ لە خۆیا شتێکی گران بێ، وە من بۆ چاوم خەفەتبار نیم، وە بۆ ئەوە خەفەتبارم کەکوێر بوونەکەم بووە بە مایەی خەم خەفەت بۆ دۆست و برادەرانم.

(٢) کێن: کێیە. بدۆ: بدا. نەی: لەم. واتە: بەڵام چار چیەو کێ هەیە لەم رێگوزەرەدا بتوانێ شان بدا لە شانی شێری قەزاو قەدەر؟.

(٣) پێش: پێی. رەزان: رازیە. واتە: هەرچی قەزاو قەدەری خوا پێویستی بکا خۆشە، وە هەرکەس بە قەزاو قەدەر رازی بێ پێی ناخۆش نابێ.

(٤) وەردەن: خواردووە. واتە: هەر شێرێ شیری شێری خواردبێ گەردەن کەچ ئەکا بۆ قەزاو قەدەری خوا. مەبەس شێر ئینسانی مەردە.

(٥) بارێ: بە هەر حاڵ، هەر چۆن بێ. باری: خوای گەورە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی دا دێ.

دیـدەی سـەر ئـەر شـی دیـدەی سڕ کـافین
ئـێد دای مـونافین ئـەو دەوای شـافین(١)

ئـێد وەزیـفەی گـڵ، ئـەو لەتـیفەی دڵ
ئەو چون مـەنزڵەن، ئـێد بـێ چـون مـەنزڵ(٢)

ئـەو بـەقاش نـیەن، فـەناش تـاقی‌یەن
ئـێد عـەتای تـاقی‌و بـاقی‌و لاقـی‌یەن(٣)

---

(١) ئەر: ئەگەر. شی: لەکیس چوو. دیدەی سڕ: چاوی دڵ. واتە: بە هەر حاڵ ئێستەش کەکوێر بووم، ئەگەر هەوری لوتفی خوا بۆ کۆمەکی بارانێکی ڕەحمەت بە سەر دڵما بارێنێ من زەرەر ناکەم چونکە هەرچند چاوی سەرم نەماوە خۆ چاوی دڵم ماوە، وە بەسمە، بە تایبەتی کە چاوی دڵ گەلێ قازانجی زۆرترە لە چاوی سەر، بەڵکو موناسەبەیان بە یەکەوە نیە بە هۆی ئەوەوەکە چاو تەماشای حەرامی پێ ئەکرێ، وە سەیری شتی وا ئەکا کە ئینسان مەشغوولْ ئەکا لە یادی خوا، وە وەکو دەردێك وایەکە لەگەڵ تەندروستی دا یەك نەکەوێ، بەڵام چاوی دڵ لە بەر بیر کردنەوەی لە شتی بە سوود وەك دەرمانێی شیفا هێنەر وایە. مەولەوی لەم سێ شیعرەی پیشوویدا هونەری «جناس»ی بەکار هێنا وەك کۆ کردنەوەی وشەی «شێر»ی بە مەعنا پیاوی ئازاو «شیر»ی بە مەعنای خواردەمەنی، وە «باری»ی بە مەعنای خوای گەورەو «باری»ی لە بارانەوە وەرگیراو، وە «سەر»و «سڕ».

(٢) بێ چون: ئەوەی کەکەسی لە وێنە نیەکە خوایە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) تاقی‌یەن: تەحقیقە، ڕاستە. لاقی: بە ئینسان گەیشتوو. واتە: ئیشی چاوی سەر ئەوەتە سەیری شتی مادی بکا، بەڵام ئەرکی سەرشانی چاوی دڵ ئەوەتە خەریکی کارو باری مەعنەوی بێ، وە چاوی سەر جێگای شتی مادیی تیا ئەبێتەوەکە وێنەی بێ، بەڵام چاوی دڵ ماواو مەنزڵی خوای بێ وێنەیە وەك لە حەدیسا هەیە:
«قَلْبُ الْمُؤْمِنِ عَرْشُ الرَّحْمٰنِ».
واتە: دڵی پیاوی موسوڵمان بارەگای خوایە، هەروەها چاوی سەر مانەوەی بۆ نیەو گومانی تیا نیەکە ئەفەوتێ، بەڵام چاوی دڵ بەخششێکی ڕاستو دەوام دارو بە خوا گەیشتووە. لێرەدا مەبەسی مەولەوی ئەوە نیەکە چاوی سەر لە هەموو ڕوویەکەوە خراپو بێ سوودە، وە چاوی دڵ لە هەموو سەرێکەوە باشو بەکەڵکە، چونکە ئاشکرایەکە هەردووکیان شتی

[٣]

## تەختەی مۆبەت تاش(١)

تــەختەی مـۆبـەت تـاش، نـەجار دڵ تـەنگ
گـــیر گـێچ دام کـــڵافــەی شـــەوڕەنگ!(٢)

نـــامەی ئـــایرین گـــەرمی ئـــەنگێزت
دووی پووش جـەستەی دەردیـنان خـێزت(٣)

یـــاواو حـــاڵیـــم بـــی یـــەك یـــەك ئـــیشاران
خەندەم کەرد، هەی‌های، دەردەکـەن یـاران(٤)

---

☞

چاكو خراپیان پێ ئەکرێ. بەڵکو مەبەسی ئەوەیە ئەو چاکەیەی بە چـاوی دڵ ئـەکـرێ بەکەڵك ترە لەوەی کە بە چاوی سەر ئـەکـرێ. لە راسـتی‌دا سـەعاتێك بـیر کـردنەوە لە عیبادەتی حەفتا ساڵ بەکەڵك‌ترە، وەك لە حەدیسا هەیە.

[٣]

(١) مەولەوی ئەم پارچە هەڵبەستەی لە وەڵامی نامەی دۆستێکیا نووسیوەکە ناوی «مەلا عبدالرّحیمی نجاری» بووەکە لە نامەکەیا باسی سۆزی دڵی خۆی کردووە بۆ مەولەوی بە هۆی تەئسیری مورشیدیەوە لە سەرەتای تەریقەت وەرگرتنیا.

(٢) موبەت: محبەت، خۆشەویستی. نەجار: دارتاش. گیر: گیر خواردوو. گێچ: پێچ. دام: داو. شەوڕەنگ: تاریك وەك شەو. واتە: ئەی ئەو دۆستەی کـە تـەختەی خـۆشـەویستی ئەتاشی، وە ئەی دارتاشی دڵ تەنگ‌وگرفتاری پێچی داوی کڵافەی رەشی خۆشەویستی. مەولەوی کە لەم شیعرەدا بە «نەجار» بانگی کردووەتە مەلا «عبدالرّحیم» کە ئەم پـارچـە شیعرەی بۆ ناردووە، وە مەلا «عـبدالرّحـیم»یش خـەڵکـی دێی «نـجار» بـووە لەویـەری سیروانەوە لە نزیکی «پاوە»، نەزاکەتێکی جوانی بەکار هێناوە.

(٣) ئەنگێز: بەرپا کەر. دوو: دووکـەڵ. جـەستە: لاشـە. دەردیـنان: دەرداوی. خـێز: بـرز کەرەوە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا تەواو ئەبێ.

(٤) خەندەم کەرد: پێکەنیم. واتە: نامە ئاگراوی‌یەکەت کە گەرمای بەرپا ئەکردو دووکەڵی هەڵئەساند لە لەشی برینداری وەك پووشمان، پێم گەیشتو لە هـەموو ئـیشارەتەکـانی گەیشتمو دام لە قاقای پێکەنین‌و وتم ئەرێ وەڵلا دەردەکەیە ئەویش گرفتار بووە!.

ئـەر راسـەن دۆسـیت دۆسـەکـەی گیانی
مـن وە دار کـۆڵەك خـەمان مـزانـی[١]

هـوون بـێ پـایان دەردم وەردەبـۆ
تـەجرەبەی تـۆڕدام عـەشقم کـەردەبۆ[٢]

هـاڵای گـرپەی دەرد ئـەو بـاڵای ئـاڵا
نـەکـوورەی دەروون نـە گـرتەن بـاڵا[٣]

دام دوو بـادەی سـەیاد قـاتڵ
نـەپێچـیان نـەدەور پـای شکستەی دڵ[٤]

فـرسەت نـەکـەوتەن بـەو رەنگ قـادر بـۆ
جـەفاش فـراوان، وەفـاش نـادر بـۆ[٥]

دەخـیل زووتـەر کـێش پـات ئـەو دمـاوە
نـەگـنی نـەی تـۆڕدام وە هـەردوو پـاوە[٦]

---

(١) ئەر: ئەگەر. کۆڵەك: کۆڵەکە. خـەمان: داری چـەمیوە. مـەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٢) هوون: خوێن. وەردەبۆ: خواردبێ. تۆڕدام: تۆڕ داو.

(٣) هاڵای: هێشتا. ئاڵا: جوانو بەرز. نەگرتەن باڵا: بەرز نەبووەتەوە. واتە: برای شیرینم ئەگەر بە راستی دۆستمیو من بەکۆڵەکەی راگیرکەری داری خەمو مەینەتی خۆشەویستی ئەزانیو لات وایە من خوێنی دەردو ئازارم خواردووەو تۆڕ داوی خـۆشـەویستیم تـاقی کردووەتەوە، باوەڕم پێبکەکە پێت بڵێم هێشتا بڵێسەی دەرد لەکوورەی دەروونتەوە بەرز نەبوەتەوەو زۆرت ماوە...

(٤) دووبادە: دوولۆ. سەیاد: راوچی. مەعنای ئەم شیعرە بە شیعری دوایی‌یەوە بەسراوە.

(٥) قادر بۆ: بتوانێ. واتە: داوی دوو لۆی راوچـیی کـوشندە هـێشتا نـەئاڵاوە لە قـاچی شکاوی دڵت، وە هێشتا بۆی هەڵنەکەوتووەکە بتوانێ وەفای کەم بێ لەگـەڵتـاو سـزای زۆرت بدا.

(٦) کێش: بکێشەرەوە. نەگنی: نەکەوی. واتە: دەخیلتم زووتر پێت بکێشەرە دواوە پێش ئەوەی بە هەردوو پێ بکەویتە ئەو تۆڕداوەوە.

جــــەو دمــــا وە دەس پــــای ئــیستیغناوە
لەرزی وە ســــــەر تــــەل دار فــــەناوە(١)

ســــەر وەنــــەت بــــبۆ وە بــار گــەردەن
بــوازی هــەر ســات ئــاوات وە مــەردەن(٢)

نــە پــەی ئــەو رەویــەی بـەینەت داری بـۆ
نــە پــەی تــۆیــچ مــەرگ رستگاری بـۆ(٣)

ئەو سـەبر، ئـەو تـاقەت، ئـەو تـەوانـای دەرد
نەدیت خەرجـم کـەرد فـائێدەش نـەکـەرد(٤)

ئــیسە ســۆچــیای گــەرمی دڵ ســەردیم
ســەودایــی ســارای دەرد بــێ دەردیــم(٥)

ئــــەر مــژنەوی خــاس، وەرنــە مــزانــو
مــەرگ پــەرێ تــۆیــچ مــدۆ نــەزانــو(٦)

(١) جەو دما: لەوەوپاش. واتە: ئەگینا لەوەوپاش بە سەر تەڵی داری لە ناو چوونەوە بە دەم بای بێموبالاتی دۆستەوە ئەلەرزی.

(٢) وەنەت: لێت. ببۆ: ئەبێ. بوازی: ئەخوازی.

(٣) واتە: ئەو وەختە نە ئەو ئاگای وەفاو بەین ئەزانێ، وە نە تۆیش بە مردن رزگار ئەبی.

(٤) تەوانەی دەرد: دەرەقەتی دەردو مەینەت هاتن. نەدیت: نەت دی. واتە: نەت دی من چەند خۆم راگرت کەچی کەڵکی هیچی نە بوو؟.

(٥) سۆچیا: سووتاو. واتە: ئێستا من سووتاوی گەرمای دڵ ساردیی یارم، وە گرفتاری دەردێکم کە لەکەسەوە دیار نیەو بە جۆرێکە کەکەس بە دەردەدارم نازانێ.

(٦) مژنەوی: ئەبیسی. پەرێ: بۆ. زانوو: ئەژنۆ. واتە: جا ئەگەر گوێم بۆ شل ئەکەی باشە، ئەگینا خۆم ئەزانم کە مەرگ بۆ تۆیش دێتە سەر ئەژنۆو خۆی ئامادە ئەکا.

[٤]

## تەئسیر خەیاڵ(١)

تــــەئسیر خــــەیاڵ کــردەی مــن ســەردا
ســســـــتی شــەرمندەن ســەرشی وە وەردا(٢)

ســەنگی ســەنگی بــار تــاوان زۆر کــەردەن
پــیری بــەدنامەن قــامەت خــەم کــەردەن(٣)

تــــەن خــــەمیاوە، یــــانێ دەســـــتوورەن
وادەی هــۆرێزنــای گــیان ئــەو حــوزوورەن(٤)

تـــاوان رای نــــەفەس رجـــا گــرتەن لێم
کــردە یــاگــەی دەس تــەما نــاستەن پێم(٥)

---

[٤]

(١) مەولەوی لەم پارچە شیعرەیا باسی وەزعی پیری‌و چەمینەوەو فەلسەفەی چەمینەوەی باڵای خۆی ئەکا.

(٢) شی: چوو. واتە: ئەنجامی بیر کردنەوەم لەکردەوەی بەدم دەرکەوت، لەبەر ئەوەی سستی‌و تەمەڵیم لەکردنی ئیشی باش شەرمەزار بوو، وە سەرم دانەوی‌یەوە.

(٣) سەنگی: قورسی. سەنگی بار: باری قورس. خەم چەمیوە. واتە: قورسی باری قورسی گوناحە زۆری هێناوەو باڵامی چەماندوەتەوە، کەچی پیری بەدناو بووەو خەڵك ئەڵێن ئەوە چەماندوویەتەوە.

(٤) خەمیاوە: چەمیاوە. هۆرێزنا: هەستاندن. واتە: ئەم لەش چەمینەوەیە ئیشارەتە بۆ ئەوەکەکاتی ئەوە هاتووە گیان راست ببێتەوە بچێ بۆ حوزووری خوا، چونکە هەرکەس کە هەڵسێتەوە سەر پێ ئەبێ جووڵەیەکی بۆ بکاو لەو جوڵەیەدا سەری دانەوێنێ. مەبەس لە چوون بۆ حوزووری خوا، مردنە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «خەمیاوە» نووسراوە «نامیاوە» ئەمیش هەر بە مەعنای ئەوە.

(٥) را: رێگا. نەفەس: هەناسە. یاگە: جێگا. ناستەن: نەهێشتووە. واتە: گوناح رێگای لێ گرتووم کە هەناسە بدەم‌و تکات لابکەم، وەکردەوەی خراپ جێگەی دەسی هیوای پێ نەهێشتووم.

پــای هــەوەس تــەزان، ئــارەزوو مــۆڵەق
مــەندەن وە رەحـــمەت بـــێ پـایان حـەق[(١)]

دامـــــنەکـــــەی ئـــایێر دەروونــم تــۆنــی
وەی دوو فـــەردەوە مـــوغەننی کـــۆنـــی؟[(٢)]

یـــــارەبی نــــەو شــــەو تــاریکەی فــانی
هــــەر تــۆ وەکــردەی بــەدیم مــزانـــی[(٣)]

ئـــای ســوبح مـەحشەر سـەر ئـەفگەندە وێم
شـەرمەندەی حـوزوور خـوداو بـەندە وێم[(٤)]

(١) تەزان: تـەزیوە. مـولەق: مـعلّق، سـەرگەردان. واتـە: پـێی هـیواو هـەوەسم تـەزیوەو جوڵەی پێ ناکـرێ، ئارەزوویشم سـەرگەردان بـووە، بـەس مـاوەتەوە سـەر رەحـمەتی نەبڕاوەی خوای گەورە.
(٢) دامنەکەی: داوێنەکەی. کۆنی: لەکوێی. واتە: لەم کاتەدا کە مـن دامـاوم و دڵم سـارد بووەتەوە، تۆی بووی بە داوێنە بۆ خۆش کردنی گڕی ئاگری دەروونم، ئەی گۆرانی بێژ، دەسا لەکوێی بێی بە ئاوازە خۆشەکەت ئەم دوو شیعرەم بۆ بڵێیت و گڕ بەر بدەیتە دەروونم. دوو شیعرەکەش ئەمانەی دواوەن.
(٣) واتە: خوایە لەم شەوی تـاریکی دنـیای فـانی‌یەدا، هـەر تـۆی شـارەزای کـردەوەی بەدمی و چاوت لێ‌یەتی، دەسا بەزییتپیاما بێتەوە.
(٤) سەرئەفگەندە: سەر داخستوو. وێم: خۆم. واتە: ئەگـینا ئـەبێ لە بـەرەبەیانی رۆژی مەحشەرا سەری خۆم داخەم و خەجاڵەت باری حوزووری خواو بەندە بیم.

## [٥]

## تەرك ئینتیزار(١)

تـــەرك ئـــینتیزار حـــەیات كـــەردەنم
یـــانێ ژار مـــار دووری وەردەنـــم(٢)

شـــنۆی رەشـــەبای زووســـان هـــیجران
ســەرچـــڵەی عـەیشم كـەردەن وە بـوریان(٣)

كـــڵێڵەی خـــەفەت نـــەسەر كـاوەی دڵ
مـــەزرەعەی شـــادیم كـەردەن بـێ حـاسڵ(٤)

مـــن جـــە خـــێڵخـانەی مـــەینەت پـامالم
كـــۆن بـــەینەت دارێ پـــەرسۆ ئـەحوالم؟(٥)

مـــەر ئـــازیز وە خـــەیر تـــەشریف بـــاوەرۆ
نـــەی گـــێجـاو خـــەم دەسگـــیریم كـەرۆ(٦)

---

[٥]

(١) مەولەوی لەم پارچە شیعرەیا سكاڵای حاڵی خۆیو باسی خەمو مەینەتو دووریی دۆستان ئەكاو داوای لوتفی دۆستان ئەكا.

(٢) كەردەنم: كردوومە. وەردەنم: خواردوومە. واتە: دەسم لە چاوەڕێیی كردنی ژیان هەڵگرتووە، چونكە ژەهری ماری دووریی یارانم خواردووە.

(٣) زووسان: زستان. بوریان: بوریانی. واتە: شنەی رەشەبای زستانی دووریی یاران ئەوەندە ساردە، سەرەتای ژیانمی،كە وەرزی لاویمە،كردووە بە بوریانیو دای رزاندووە. مەولەوی لێرەدا سەردەمی لاوێتیی خۆی شوبهاندووە بە سەر چڵی درەخت كە سەرما بیباو دایڕزێنێ.

(٤) كڵێڵە: بەو بەفرە ئەڵێن كە لەلا شانی شاخە بەرزەكانا گرد ئەبێتەوەو ریچكە ئەبەستێ. كاو: بەرزی. واتە: كڵێڵەی مەینەت لەسەر بەرزایی دڵم بە جۆرێ زۆری هێناوەكێڵگەی شادیو خۆشی دڵمی فەوتاندووەو كارێكی لێ كردووە هیچی لێ نەیەتە بەرهەم.

(٥) كۆن: كوا. پەرسۆ: بپرسێ. واتە: من لە ناو هۆزی مەینەتو خەما گوم بوومو شوێنەوارم كوێر بووەتەوە، دەسا كوا دۆستێكی بە وەفا لێم بپرسێتەوەو بە دواما بگەڕێ؟.

(٦) باوەرۆ: بێنێ. نەی: لەم. واتە: مەگەر ئازیزەكەم بە خێریەت تەشریف بێنێ بۆ لامو لەم گێژاوی مەینەتەدا دەسم بگرێو رزگارم بكا.

بـــــنۆشـــــنۆ وە دڵ ســـەهبای مـــەیل وێش
پەی وەخت مەردەن حەسرەت نـەبۆ پـێش[١]

## [٦]
## تا جە داخی تاق[٢]

تــا جــە «داخـــی» تــاق، جــفت خــەمەنان
راس بــــاڵا چـــون چـــەوگان چـــەمەنان[٣]

شـــەماڵ وە خـــزمەت ئـــەو زامــان خـــەتەر
بشـــۆ، ئــەر پــەرساش ئـێدش جـواو دەر:[٤]

گــــیرۆدەی ئـــازار ســــەخت فـــیراقــەن
هــەر چـــەند مـوشتاقی ئـێنـدە مـوشتاقەن[٥]

بـــــەڵام تــاو ســـەیل دەردەکـــەی دووریت
لافـــاو هــــووناو رەنــج مــەهجووریت[٦]

---

(١) بنۆشنۆ: بنۆشێ. سەهبا: «صهباء»، مەی. واتە: پیاڵەی شەرابی خۆشەویستی خۆی دەرخواردی دڵم بدا، بەڵکو لەکاتی مردنا داخو خەفەتی تیا نەبێ.

[٦]

(٢) مەولەوی بەم پارچە هەڵبەستەی قسە لەگەڵ شاعیری بەرز «شێخ عبداللّٰهی داخی» ئەکا کە دۆستی بووە، وە ویستویە سەری لێ بدا بـەڵام بـە هـۆی لافـاوکـردنی ئـاوی سیروانەوە نەی توانیوە بڕوا بۆ لای.

(٣) جفت: جووت. چۆ: دار. چەوگان چەم: گۆچان چەمینەوە. واتە: تا بە تەنها بمو شێخ عبداللّٰهی داخیم لەگەڵ نەبێ، هاو جووتی خەمو خەفەت ئەبم، وە باڵای راستم وەکـو داری گۆچان چەمینەوە وا ئەبێ. لە دێهاتی کوردەواری‌دا کـە گـۆچـان دروست ئـەکـەن سەرێکی ئەچەمێننەوە وە بە تووڵی باریك ئەی‌بەستن تا وشك ئەبێتەوەو دەق ئەگرێ. لە بەینی وشەی «تاق»و «جفت»ا بە پێی عیلمی «بدیع» هونەری «طباق» هەیە.

(٤) بشۆ: بچۆ. پەرساش: پرسی. واتە: شەماڵ بڕۆ بۆ خزمەتی ئەو دۆستەم کە گیرۆدەی برینی خەتەرناکە، وە ئەگەر پرسیاری لێ کردی لە وەراما بڵێ... واتەکەی دواوەدا بـاس کراوە.

(٥) ئێندە: ئەمەندە.

(٦) سەیل: لافاو. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

**تــانجەرۆی ئـەی چـەم، سـیروان ئـەو چـەم**
**جۆشاوێ وە هەم ئەی چـەم تـا ئـەو چـەم(١)**

**کـــــەڵەك هـــۆر مـــدا نـــمازا دەو لێش**
**رای ئــامام نـــەوی پــا بــنیەو ئـەو پـێش(٢)**

---

(١) تانجەرۆ: چەمێکە سەرچاوەکەی ئەکەوێتە رۆژاوای سەرووی سـولەیمانی‌یەوە، وە بە بەردەمی «جیشانە» و «هەزار مێرد»ا تێ‌پەڕ ئەبێ وە لە «شارەزوور» لە نزیکی «بیسەلمێن» ئەڕژێتە ئاوی «زەڵم»ەوە، پاشان هەردووکیان لە نـزیکی «شـەكمەیدان» تـێکـەڵی ئـاوی «سیروان» ئەبن. سیروان: رووبارێکی گەورەیە، سەرچاوەکەی ئەکەوێتە ژووررووی شاری «سنە»وە لەکوردستانی ئێران. ئەم رووبارە لە سێ بەشی گەورە پێك دێ، یـەکـەم ئـاوی ناوچەی «کۆماسی»، دووهەم ئاوی «مەریوان»، ئەم دوو بەشە لە نزیکی دێی «دوورۆ»وە تێکەڵ یەك ئەبن وە پێکەوە ئەڕۆن تا لای دێی «رووار» لە ژووررووی «هەجیج»ەوە تێکەڵی ئاوی «گاوەرۆ» ئـەبن، ئـیتر لەوێوە پـێی ئـەوترێ «سـیروان». کـەواتـە سـیروان لە «سـێ روودان»وە گیرواە واتە سێ چەم. جۆشاوە وە هەم: تێکەڵی یەك بووبوون... مەولەوی لەم شیعرەدا چاوێکی خۆی شوبهاندووە بە تانجەرۆو ئەو چاوەکەی شوبهاندووە بە سیروان.
(٢) کەڵەك: چەند پارچە تەختەیەك بە یەکا ئەکوترێ‌و لە ژێریەوە چەند پێستە گای فوو دراوی پێوە ئەبەسرێ‌و ئەخرێتە سەر ئاو بۆ پـەڕانـدنەوەی خـەڵك، ئـەوە پـێی ئـەوترێ کەڵەك. نمازا: نایەڵن. دەولێش: لێی بـدەم. واتـە: بـەڵام ئـاوی لافـاوو خـوێنـاوی دەردی دووریت، وەك ئاوی سیروانو تانجەرۆ لە چاوەکانمەوە ئەڕژانە خوارەوەو تێکەڵی یـەك بووبوون، وە ئەوەندە زۆر بوون کەڵەکیان فڕێ ئەداو نەیان ئەهێشت پێ بنێمە بـەر پـێ‌و بپەڕێمەوە بێم بۆ لات.
شێخ عبداللە‌ی داخی کـە پـارچـە شیعرەکـەی مـەولەوی ئـەگـاتە دەستی، بـە پـارچـە هەڵبەستێکی جوان وەرامی ئەداتەوە. وا لێرەدا بۆ زیندوو کردنەوەی یادی داخی‌و پیشان دانی پایەی بەرزی لە جیهانی ئەدەبدا، ئەو پارچە هەڵبەستە ئەنووسینەوە:

تەسکین بەخشی دەرد «داخی» داخ نە دڵ          دامـان وە هـووناو ریشـەی دڵ گـوڵ گـوڵ
یـەك رۆ چـەم نـەچەم گـرەو بـەردە بـێ          سـەیل خـەم یـانەم وێران کـەردە بـێ
نیشتەبێم چون تەیر دوور وامەندەی گـوڵ          پەشێو حاڵ، خەمناك، چون سازەدەی دڵ
نــاگـا دەوای دەرد دەروون پـڕ خـاران          نـۆش داررووی زامـان زامـەت ئـەوگاران
یـانی نـامەکـەی خـامەی خـەم رەقـەم          مەنزومەی مەعدووم چەنی خەم هـەمدەم

## [٧]

## تۆنەی کۆچدا(١)

تـۆنـەی کـۆچدا کـار ویّت مـەحکەم کـەردەن
بـەڵام ریشـــەی مـــن جـە بـیّخ ئـاوەردەن(٢)

تـــۆ مـــەردەی شـــەهید زیـندەی بـیّ بـاکـی
مـن زیـندەی مـەردەی دەشت خـەمناکـی(٣)

تـــۆ ئـــازاد پـــەی ســـەیر جـای جـاویدانـی
مـــن پـا بـەستەی بـەند ئـەی دنـیای فـانی(٤)

---

☞

یـــاوا وە ســـەر دار دەروون پـــڕ داخـــان    پـەروانـــەی پـــای شـەم سـەلار ئـوتاخان
ئـــەر ســـەد شـــەرارەی نـــائیرەی دووری    تـــاو دابـیّ وە تـاو کـوورەی مـەهجووری
گـــــــەمیی تـــــەوەن‌تاو دەرد تـــــەنیاییم    بـــەردە بـــیّ یـــەك‌سەر ســـۆمـــای بیناییم
ســـانام جـــە قـــاسید ســـاکـــن بـی دەردم    وە دیـــدەی بـــیّ نـــوور مـــوتاڵاش کـــەردم
نمەز چەرخ چەپ چەواشەی چـەپ‌گەرد    پـەی کـام دەردی سـەر نیگاداریـم کـەرد
وەرنـــە مـــەویا وەخت وانـــای نـامەکـەت    گیان کەردام فیدای رەشحەی خامەکـەت
رووی ئەجەل چون بەخت سـیام سیا بـۆ    نـاما گـیان جـەو دەم جـەتەن جـیا بـۆ

[٧]

(١) مەولەوی ئـەم قـەسیدەشی لە لاوانـدنەوەی «عـبدالرّحـمان»ی کـوڕی مـەحمودی یاروەیسی پیاوماقووڵی مەحموودپاشای جاف وتووە.

(٢) نـەی کـۆچـدا: لەم کـۆچ کـردنەتا. واتـە: تـۆ لەم کـۆچـی دوایـی‌یەتا ئـیشی خـۆتت رێك‌خستووە چونکە بە شەهیدی رۆیشتووی، بەڵام ریشەی منت لە بێخ هەڵکێشاوە.

(٣) مەردە: مردوو. زیندە: زیندوو. واتە: تۆ مردوویەکی شەهیدی لەبەر ئەوە زیندوویو ترست نیە، بەڵام منیش کە ماوم‌و بە سەر زیندووم، مردووی دەشتی خەمباری‌و داماویم.

(٤) جاویدانی: نەبڕاوە. واتە: تۆ ئازادی بۆ سەیر کردنی بەهەشت، منیش پێ بەندی ئەم جیهانە لەناو چووەم.

تـــۆ لوای بـــەو ئـــەجر ســـەختی زامـــەوە
مـــن پـــەرێ حـــەسرەت دووریت مـــامەوە[(1)]

پـــەی تـــۆ راحـــەت بـــۆ، پـــەرێ مـــن زامـــەت
هـــەر شـــەو رۆرۆ بـــۆ تـــا رۆی قـــیامەت[(2)]

[۸]

## تۆپڵاخەی دووکەڵ[(3)]

تـــۆپـــڵاخـــەی دووکـــەڵ هـــیجران دڵبـــەر
جەم بووگە وەك هەور نە رووی سەقف سەر[(4)]

حـــاشا خـــۆ رەنگـــم هـــیچ نـــەماگـــە پـــێ
ســـەرم وەكـــوو تـــاس دەنگـــی لێوە تـــێ[(5)]

کەی کەم ئیستەکەم خـوێنـاو ئـەکـا شـەست
لە دوو پلووسکەی چاو شۆڕاو گەی بەست[(6)]

---

(۱) لوای: رۆیشتی. پەرێ: بۆ. واتە: تۆ بە ئەجری زامە سەختەکەتەوە رۆیشـتی، مـنیش مامەوە بۆ خەفەت خواردن بە بۆنەی دوورکەوتنەوەتەوە.

(۲) زامەت: زەحمەت. واتە: تۆ بۆ خۆت بـحسییتەوەو مـنیش بـۆ خـۆم بـە زەحـمەت و دەردو مەینەتەوە بتلێمەوە تا رۆژی قیامەت، وە هەموو شەوێ لە رۆ رۆو هاوارو گریانا بم.

[۸]

(۳) مەولەوی ئەم پارچە هەڵبەستەی لە سـەر شـێوەی قسـەکـردنی خـەڵکـی نـاوچەی «تاوەگۆزی» وتووەکە نیشتمانی خۆی بووە.

(٤) تۆپڵاخە: تۆپەڵ. بووگە: بووە. واتە: تۆپەڵە دووکەڵی دووریی یار وەك پارچەی هەور کۆبووەتەوە بە سەربانی سەرمەوە. (٥) نەماگە: نەماوە. تێ: دێت.

(٦) کەی کەم ئێستەکەم: جوملەیەکی خەڵکی ناوچەی تاوەگۆزی بەکـاری ئـەهێنـن بـە مەعنای «هەمیشەو بە زۆری». واتە: خوێناو بەردەوام لە چاوەکانمەوە وەك باران شەست ئەکاو چۆڕاوگەی بەستووە.

لافـــاو کـــووچەی جـــەستەی زوخـــاڵی
هـــەرگـــاو هـــەستی هـــەرچـی بـــوو مـــاڵی[(١)]

[٩]

**تەن وە ئێش دەرد**

تـــەن وە ئـــێش دەرد زامـــەتان خـــەستەن
فـــەڵەك پـــای ئـــامام وە زەنـــجیر بـــەستەن[(٢)]

خـــەم زەدەی خـــەم کـــێش خـــەفەت بـــارەنان
بـــەری جـــە یـــاوەر، دوور جـــە یـــارەنان[(٣)]

چـــەپ گـــەرد هـــەر ساتێ دەردێ مـــدۆ پـێم
رای ئـــامای قـــاسید ئـــازیز بـــەستەن لێم[(٤)]

وەشـــڵە هـــەر پـــەی تـــۆن هـــەی شـــادمانی
پـــــەیك لەیـــــل ئـــــاما وە تـــۆ مـــزگانی[(٥)]

(١) کووچە: کۆڵان. زوخاڵی: رەش بووەوە وەك خەڵووز. هەرگاو: قوڕاو. واتـە: لافـاوی فرمێسکە خوێنینەکەم کە بە چاوما دێتە خوارەوە، بەکـۆڵانـی لەشـی سـووتاوی ڕەش بووەوەما ڕۆیی و هەرچی نیشانەیەکی بوونم پێوە مابوو ڕاماڵی و لەگەڵ خۆیا بردی.

[٩]

(٢) ئامام: هاتنم. بەستەن: بەستووە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوە پێکەوە دێن.
(٣) خەم زەدە: خەم لێ داو. خەفەت بارەنان: خەفەتبارم. یاوەر: یارمەتی دەر.
(٤) مدۆ: دەدا. ئامای: هاتنی. قاسد ئازیز: فروستادەی یار.
(٥) وەشڵە: خۆشی: پەیك: شاتر، پەیام هێنەر. مزگانی: مژدە. مەولەوی لە گەڵێ شوێنا وا پیشان ئەدا ئەوو شادمانی پەیوەندیان بە یەکەوە نیە وە هەرگیز یەك ناکەون، چـونکە دوژمنی خوێنە خۆری یەکترین و خێری هەر کامیان شەڕی ئەویانە. لێرەشـا ئـەڵێ: مـن لەشم گرفتاری دەردی زەحمەتە، وە گەردوون پێی بەستووم ناتوانم بچم بۆ لای یار، وە بەمەش دەس بەردارم نەبوە، ڕێی هاتنی فروستادەی ئەویشی لێ گرتووم کە بێت بۆ لام.

[١٠]

## تا تەوانام بێ

تـا تـەوانـام بـێ شـەو بـێداریـم کـەرد
پـەرێ نـۆشـای جـام بـێ قـەراریـم کـەرد(١)

وێت واتـەن هـەر کـەس شـەوان بـێداربـۆ
مشیۆ مـەست زەوق بـادەی مـەی خـار بـۆ(٢)

[١١]

## تەرسوون

تـەرسوون ئـەر بـەدەن رەقـیب دڵ سـەرد
بکـەرۆش وە خـاك گـەردش چـەپ گـەرد(٣)

---

☞

کەواتە ئەی شادمانی، هاتنی فروستادەی لەیل بۆ لای تۆیە، چونکە ئەگەر بۆ لای من بهاتایە ئەبوو بە مایەی دڵخۆشیم، خۆ دیارە منو دڵ خۆشیش بەینمان رێك نیە... دەسا مژدە بێ لێتو خۆشی لە خۆت.

[١٠]

(١) تا تەوانم بێ: تا توانام بوو. نۆشا: نۆشین. مەعنای ئەم شیعرە بـەسراوە بـە شـیعری دووهەمەوە.

(٢) وێت: خۆت. واتەن: وتووتە. مشیۆ: ئەبێ. خار: پڕ. واتە: تاجوان بوومو هێزم تیابوو شەو نوخونیم کێشا، وە پەلەم بوو بۆ نۆش کردنی پیاڵەی پڕ لە شەرابی بـە تـۆ گـەیشتن. ئێستە ئیتر هێزم تیا نەماوەو چاوەڕێی پاداشـی ئـەو شـەو نـوخونییەم، چـونکە خـۆت فەرمووتە هەرکەس شەو بە بێداری رۆژ بکاتەوە، ئەبێ لە ئەنجاما وە لە پاداشی ئەو شەو بێدارییەیا سەرخۆشی چەشتنی پیاڵەی پڕ لە مەی ببێ.

[١١]

(٣) تەرسوون: ئەترسم. بکەرۆش: بیکا. گەردش: گۆڕان. مـەعنای ئـەم شـیعرە لەگـەڵ شیعری دواییدا دێ.

وەخت تـــەماشای ئـــەو بـــەر گـــوزیدەم
شـــەماڵ بشـــانۆ گـــەردش ئـــەو دیـــدەم[١]

••••••━━━●━━━••••••

**[١٢]**

## تا دڵ

تـــا دڵ وە تـــەمای ئـــەو تـــرفە تـــرفەن
«نحو»م هەر مەحوەن «صرف»م بێ سەرفەن[٢]

••••••━━━●━━━••••••

**[١٣]**

## تا وە زوڵفو...

تـــا وە زوڵفو رووی تـــۆ تـــەماشامەن
ئـــەدای نـــمای فـــەرز ســـوبحو عـــیشامەن[٣]

••••••━━━●━━━••••••

---

(١) بەر گوزیدە: هەڵبژاردە. بشانۆ: بوەشێنێ. گەردش: تۆزی. واتە: ئەترسم ئەگەر هەڵسوورانی چەرخ لەشی بەدکارە دڵ ساردەکەم بکا بە تۆز، هێشتا ئەو هەر دەس بەردارم نەبێ، وە لەکاتی سەیر کردنی یارە ئازیزەکەما شەماڵ هەڵکاو ئەو تۆزی لەشی ئەوە بکا بە چڕو چاوما بۆ ئەوەی نەتوانم بڕوانم بۆ یارەکەم!.

**[١٢]**

(٢) ترفە ترف: بریسکە دانەوە. نەحو: عیلمی نەحو. سەرف: عیلمی سەرف. واتە: تا دڵ بە تەمای شەوقو بریسکەی روخساری یار بێ، نەکەڵك لە خوێندنی عیلمی نەحو وەرئەگرم، وە نە خوێندنی عیلمی سەرفمم قازانجێکی ئەبێ.

**[١٣]**

(٣) ئەدا: بە جێ هێنان. نما: نوێژ. واتە: تا من خەریکی تەماشای ئەو زوڵفە رەشەی تۆو ئەو روخسارە رووناکەت بم، ئەبێ هەر خەریکی کردنی نوێژی عیشاو بەیانی بم، چونکەکە سەیری زوڵفت ئەکەم وا ئەزانم شەوەو ئەبێ نوێژی عیشا بکەم، وەکە سەیری رووت ئەکەم وا ئەزانم رۆژ بووەتەوەو ئەبێ نوێژی بەیانی بکەم، وە ئیتر نە نوێژێکیترو نە ئیشێکی ترم هیچ پێ ناکرێ.

## [١]

## جەرگت لەت لەت بۆ[١]

جەرگت لەت‌لەت بۆ چەواشەی چەپ گەرد
خالۆت جیا کەرد، یەکار بێ تۆ کەرد[٢]

دیدە، وادەی سەیل هۆنەی هووناوەن
دڵە، وەخت بەزم نۆشای زوخاوەن[٣]

وەش رەنگی بازەم، سادەی بێ رەنگی
شادی با وەس بۆ، وەختەن دڵ تەنگی[٤]

وەشی، وادەت شی وەش ئامای وە خەیر
شەوقە، وە تەوق بای تاکەی هەوای سەیر[٥]

مانیای مەینەت سەرەو کۆی ستەم
«مەعدوومی»ی بەرکۆی سەرەو چێرەی خەم[٦]

---

[١]

(١) مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی بە بۆنەی دوورکەوتنەوەی ئەحمەد بەگی کۆماسی‌یەوە وتووەکە وا دیارە دوور خرابێتەوە بۆ ناوچەی «رەشت»و «گێلان».

(٢) چەواشە: سەر لێ‌شێواو. خالۆ: مەبەس ئەحمەد بەگە. یەکار بێ... تاد: ئەمەکار بوو تۆ کردت. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «جەرگت لەت لەت بۆ» نووسراوە «خۆ هوونیت نەویم» واتە: خۆ دوژمنی خوێنە خۆرت نەبووم. بەم پێ‌یە جێگای ئەم پارچە هەڵبەستە تیپی «خێ» ئەبێت.

(٣) هۆنە: دارژان. نۆشا: نۆش کردن. واتە: ئەی چاو ئێستا وادەی ئەوەیە لافاوی خوێن بڕێژی، وە ئەی دڵ ئێستا وەختی ئەوەیە ئاهەنگی زوخاو خواردنەوە بگێڕی.

(٤) وەش رەنگی: رەنگی خۆشی. بازەم لێم گەڕێ. با وەس بۆ: با بەس بێ.

(٥) وەشی: خۆشی. شی: بەسەر چوو. وەش ئامای: خۆش هاتی. وە تەوق بای: بە تەوقەوە بیت. واتە: ئەی شادمانی وادەت بەسەر چووە، خوا حافیزت بێ بەخێر هاتی، تۆیش ئەی شەوق یاخوا تەوق بچێتە ملت تاکەی ئارەزووی تەماشاکردنت لەکەللە دەر ناچێ.

(٦) مانیا: ماندوو. سەرەوکۆ: سەرەو ژوورە. بەرکۆ: ئەوەی لە پێشەوە سوار ئەبێ. سەرەو چێرە: سەرەو ژێر. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

چ وەختـــەن دڵەت جـــە شـــادی کـــەیلەن
دەك لێڵاویت بـــۆ یـــە وەفـــاو مـــەیلەن[(١)]

ئـەو چـەم بـە سـورمەی خـەمناکـی رەشـتە
چەنی گەشت دەشت پای رەشت سەرگەشتە[(٢)]

هـــام راز ئـــاخ و داخ، نـــاڵە نـــەوای نـــەی
دڵ کەباب، چەم جام، خەم ساقی، هوون مەی[(٣)]

تـــۆ ئـــالوودەی بـەزم جـەرگەی هـام فـەردان
کەیف مەی، سوحبەت گـرۆی هـام دەردان[(٤)]

ئـــەو ســـەبوون سـفتەی پـڕ داخ بـێ پـەرداخ
تـــۆ بـــۆی شـنۆی بـای ئـێلاخ نـە دەمـاخ[(٥)]

---

(١) یە: ئەمە. واتە: هەی ماندوو بووی ئیش و مـەینەتی سـەرەو ژوورەی دەردو بـەڵای ڕۆژگار، وە هەی لە بەرەو ژێرەی خەم و خەفەتا لە پێشەوە سوار بوو، ئێستا کەی وەختی ئەوەیە دڵت پڕ بێ لە شادی و خۆشـی، دەك لێڵاییت دابێت ئـەمەکـەی وەفـاو مـەیلی پێ ئەڵێن. شایانی باسە ئەوەی لە بەرەو خوارەدا لە پێشـەوە سـوار ببێ زۆر ئـازاری پـێ ئەگات وە هەمیشە ترسی کەوتنە خوارەوەی ئەبێت.

(٢) چەم: چاو. سورمە: کڵە. رەشتە: رەشتوو. چەنی: لەگەڵ. رەشت: شارێکە لە شیمالی ئێران لە نزیکی دەلیای خـەزەرەوە. سـەرگەشتە: سـەر لێ شـێواو. واتـە: ئـەحمەد بـەگ چاوەکانی بە سورمەی مەینەت رەشتووە وە سەرگەردانی گەڕانی دەشتی رەشتە.

(٣) واتە: ئاخ و داخ هاودەنگی یەتی، هاوارو ناڵە ئاوازەی شمشاڵ یەتی، دڵی کەبابیەتی، چاوی پیاڵەی شەرابیەتی، خەم مەی گێڕیەتی، شەرابەکەشی خوێنی دڵیەتی.

(٤) ئالوودە: تێکەڵ. واتە: تۆ تێکەڵ بەزم و ئاهەنگی کۆمەڵی هاوڕێکـانتی و وەختـت بـە خواردنەوەوە لەگەڵ هاو دەردەکانت ئەبیتە سەر.

(٥) سەبوون: بایەکی سووزندەیە لە هاوینانا دێ. سفتە: سووتاو. ئێلاخ کوێستان. واتـە: ئەو سووتاوی بای سەبوونەو دڵی پڕە لە خەفەت و هیچ خۆشی یەکی لە دڵا نیە، بەڵام تۆ شنۆی نەسیمی کوێستان داویە لە دەماخت.

ئەو تەشنەی رای چۆڵ سای گەردەن پڕ گــەرد
تــۆ ســێراو نــە پــای وەفــراوان ســەرد[١]

مــلان، ســەربەرزان، کــۆســاران، هــەردان
بــێ شــەرتان، جــە داخ وەفــاتان مــەردان[٢]

چـــێشــەن ئــارایش ســەر تــا وە دامــان
مــەر خــاڵۆم وە عــەزم ســەیرتان ئــامان[٣]

مـــەشنیە چـــین‌چین چـــنوور نــەکــاوان
تـــوخوا مـــاتەم بـــە، هـــاژەی وەفـــراوان[٤]

چـــنوور نـــەکـــاوان ئـــەو نـــەبۆ پـــەی چـــێش
هـــاژەی وە فـــراوان ئـــەو نـــەبۆ پـــەی چـــێش[٥]

نـــەسیم وەس بـــویەر وە کـــۆســاراندا
وەســـەن شـــانای وەڵگ وە دیـــاراندا[٦]

---

(١) تەشنە: تینوو. سا: تەخت. سێراو: تێراو. واتە: ئەو لە ڕێگای چۆڵ‌و هۆڵا تینوو بووەو تەختی گەردەنی تۆز دای گرتووە،کەچی تۆ لە داوێنی بەفراوی ساردا دانیشتووی‌و تێراوی.
(٢) ملان: ئەی سەر ملەکان. مەردان: مردم.
(٣) ئارایش: خۆڕازاندنەوە. مەر: مەگەر. ئامان: هاتووە. واتە: چیە خۆتان لە سەرتانەوە تا داوێنتان رازاندووەتەوە، ناشێ خاڵۆ ئەحمەد بەگ هاتبێ بۆ لاتان بە نیازی سەیرکردنتان.
(٤) مەشنیە: شنە شن مەکە. چنوور: گیایەکی بۆن خۆشە بە زۆری لە شاخەکانی هەورامانا هەیە. کاوان: بەرزایی شاخەکان. واتە: تۆ خوا چنووری بەرزاییەکان چین‌چین شنە شن مەکەن، تۆیش ئەی هاژەی بەفراوان تۆ خوا کش‌و مات‌بەو هاژەت نەیەت.
(٥) واتە: ئەگەر ئەحمەد بەگ دیار نەبێ، چنووری سەرکاوان‌و هاژەی بەفراوان کەڵکیان چی ئەبێ‌و بۆچی ئەشێن.
(٦) وەس: بەس. بویەر: تێپەڕە. شانا: هەڵوەراندن‌و وەشاندن. وەڵگ: گەڵا. دیاران: وڵاتان. واتە: ئەی نەسیم بەس تێپەڕە بەکوێستانەکاناو بەس گەڵای درەخت داوەرێنە بە سەر وڵاتا.

شــنۆی ئــەو بــەرزە ئــەو نــەبۆ پــەی چــێش
لەرزەی سەد تەرزە ئـەو نـەبۆ پـەی چـێش(١)

وە ســەدای ســەروەش دڵ وەش مــەزاقــان
هـــەنی نـــەلەرزۆ کــەڵڕەم نــە تــاقان(٢)

ســەدای مــاردومان ئــەو نـەبۆ پـەی چـێش
سەفای کـەڵڕەمـان ئـەو نـەبۆ پـەی چـێش(٣)

خــاڵخـاسان بــێ ئـان هـەر بـار وە لێو بـان
هــێلانــەی دڵان بــا هــەر پــەشێو بــان(٤)

ئــەو ئــانە پــەی دڵ ئــەو نـەبۆ پـەی چـێش
ئـەو لانـە پـەی دڵ ئـەو نـەبۆ پـەی چـێش(٥)

---

(١) واتە: چونکە ئەگەر ئەحمەد بەگ دیار نەبێ شنەی بەرزایی‌یەکـان بـۆچـی بـاشەو لەرینەوەی هەزار جۆرەی داری کوێستانەکان کەڵکی چیە.

(٢) سەروەش: سەرخۆش. دڵ وەش مەزاقان: ئەوانە لە ئاهەنگو رابوادنان. هەنی: ئیتر. نەلەرزۆ: نەترسێ. واتە: ئیتر کەڵەکێوی لە تاقی ئەشکەوتەکانا نەترسن لە دەنگی راچی‌یە بە زەوقە سەرخۆشەکان.

(٣) ماردم: تفەنگێکی راوی‌یە. واتە: کە ئەو دیار نـەبێ دەنگـی تـفەنگ سـوودی چـیە، چونکە هەر ئەو راوچی بوو، وە لەو بەو لاوە لە تفەنگی کەس مەترسی ناکرێ، وەکە ئەو دیار نەبێ ئیتر سەیری رانەکەڵەکێوی سوودی چیە، چونکەکەس نیە لێ‌یان بپێکێ...

(٤) بێ ئان: هەمیشە، بێ ئۆقرە گرتن. بان: بن. هێلانەی دڵان: مەبەس یارانی نازارە. واتە: با یارە دولبەرەکان هەر لێو بەباربن، وە ئەو نازارانەکە هێلانەی دڵن، با هەر پەشێو بن.

(٥) واتە: چونکە ئەگەر ئەو یارانە تاوێك لێو بەبار نەبن ئەبێ دڵشـاد بـن، وە مـادەم کـە خاڵۆی کۆماسی دیاری نیە ئیتر سوودی ئەو تاوە دڵشادی‌یەیان چیەو بۆچـی بـاشە؟ وە ئەگەر یاران، کە هێلانەی دڵی دڵدارانـن، پـەشێو تـێکـچوو نـەبن، ئـەبێ جـێگـای دڵی دڵدارێك بن، وە مادەم دڵی ئەو دیار نەبوو تا تیایانا بنیشێتەوە، ئیتر ئەبێ سوودیان چـی بێ و بۆچی بشێن؟...

دەخـيل هـەی دەخـيل خـاڵۆکـەی گـيانی
وێت نـەی سـەفەردا تـەنها نـەزانـی[١]

مـەرگ تـۆم هـەرچـەند تـەشريف بـەردەنی
تـەرك خـەڵتـەو خـاك جـەستەم کـەردەنی[٢]

گـيان، دۆس گـيانی، رەفـيق راتـەن
سـورمەی بـينايش تـۆزەکـەی پـاتەن[٣]

هـەی رۆ نـەواچـی خـودا نـەکـەردە
خـەم وەفـاو بـەينەت نـە ويـرم بـەردە[٤]

بـادەی بـێ وادەی فـەنام وەردەبـۆ
شەرت بۆ، کـامين شـەرت، يـاران کـەردەبۆ[٥]

تـا دڵ جـە لەزەت ديـنت نـاکـام بـۆ
ئـەو زەوقـە تـۆ ديت وەنـەم حـەرام بـۆ[٦]

---

(١) لێرەوە مەولەوی رووی گفتگۆی ئەکاتە خاڵۆی کۆماسیو قسەی لەگەڵ ئەکا. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٢) مەرگ تۆم: قەسەم بە مەرگت.
(٣) دۆسی گیانی: ئەی دۆستی گیانی بە گیانی.
(٤) نەواچی: نەڵێی. ویرم: بیرم، یادم. واتە: دەخیل خاڵۆ گیان خۆت لەم سەفەرەدا بە تەنیا نەزانی، چونکە، قەسەم بە مەرگت، هەرچند تۆ تەشریفت بردووەو خاكو خۆڵی لەشی منت بەجێ هێشتووە، بەڵام ئەی دۆستە گیانی بە گیانی یەکەم گیانم هەمیشە هاورێتەو تۆزی بەری پێی تۆ دێنێ بە چاویا بۆ بینایی لە جیاتی کلە. کەواتە خوا نەکردە نە فەرمووی خەمو مەینەت وەفاو خۆشەویستی تۆی لە بیر بردوومەتەوە.
(٥) وەردە بۆ: خواردبێتەوە. کامین: کام. کەردە بۆ: کردبێتیان. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٦) دینت: دیتنت، چاو پێ کەوتنت. وەنەم: لێم. واتە: یاخوا شەرابی بێ وادەی مەرگم خواردبێتەوە، وە شەرتی یاران بێ، تا دڵم بێبەش بێ لە لەزەتی چاو پێ کەوتنت ئەو کەیفو خۆشی یەم لێ حەرام بێ کە جاران ئەم کردو تۆ ئەتدێ.

جەستەی خەستەی خـار سـەودایـی خـەجڵ
با بەس بۆ، تـاکـەی، ئـەی دڵ وەشـی دڵ؟(١)

چەپ گەرد بـێ فـرسەت شـانا مـۆرەی نـەرد
عـــومرێ بـــی ئـاما، ویـەرد، گـوزەر کـەرد(٢)

زەحـــــمەتەن خـــەلاس جـــە دووری وەردە
بـــــە هـــــووناو بــــەیۆ عـــومر ویـــەردە(٣)

[٢]

## جە گیان سێر وەردەی(٤)

جە گـیان سـێر وەردەی، جـە تـەن هـەراسـان
خاڵوی خەمیای خەم خـاڵ خـاڵ خـاسان(٥)

---

(١) خار: درِك. مەولەوی لێرەوە لا ئەکاتەوە بە لای لەشیاو رووی قسەی تێ ئەکاو ئەڵێ: ئەی لەشی نەخۆشی دەردی درِكو داڵی مەینەتو شەرمەساری، ئەم شادمانی‌یەی دڵت بەسە تا کەی؟

(٢) نەرد: یاری‌یەکە لە چەشنی تاوڵەو شتی وا.. مەعنای ئـەم شـیعرەو شـیعری دوایـی پێکەوە دێ.

(٣) وەردە: خواردن. بەیۆ: بگەڕێتەوە. واتە: گەردوونی چەپ گەرد بێ مـوڵەت مـۆرەی نەردی هەڵداو شادیو خۆشی‌یەکەی جارانی لێ وەرگرتینەوە، ئەوەی تۆ دیت عـومرێ بوو هات بەسەر چوو، تازە ئیتر زەحمەتە رزگار ببین لە خواردنی دەردی دووریی دۆستان وە بە خوێناو هەڵڕشتنی چاومان رۆژانی رابردوومانو بۆ بگەڕێتەوە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «بە هووناو بەیۆ» نووسراوە «ئەی هوو تا بەیۆ» واتە: ئەی هوو تا عومری بە سەر چوو ئەگەڕێتەوە.

[٢]

(٤) مەولەوی ئەم غەزەلەی بۆ یەکی لەدووکەس نووسیوە: یان شێخ یوسفی خەڵکی دێی «نوسمە» لە نزیکی «پاوە» یان ئەحمەد بەگی کۆماسی، چونکە تەنها لەگەڵ ئەم دووکەسە بە وشەی «خاڵۆ» قسە ئەکا.

(٥) سێر وەردە: تێر خواردوو. خەمیا: چەمیوە. واتە: ئەی خاڵۆی لە گیان تێر خواردووی لە لەش هەراسان بوو، وە ئەی بە هۆی خاڵی خاڵ خاسانەوە پیر بووی پشت کۆماوە...

نـــامەی چـــون یـــاوا مـــولاحەزەت کـــەرد
بشۆ وە پا بۆس عەرز کەر جـە رووی دەرد(١)

واچە هەی سـەد جـار «مـەعدوومی» تـوفەیل
پەرسابێت جە رووی گەرمی کوورەی مەیل(٢)

کـۆ جــە دووری مــن چ تــەورەن حــاڵش
کـێ بــەر مــەکــەرۆ خـەم نـە خـەیاڵش(٣)

چون ئەوێ جـە دیـن چـون تـۆیـێ دوور بـۆ
چەم لێڵاو، دڵ تەنگ، تەن سفتەی توور بۆ(٤)

هــەر ســات وە نـەوعێ دەردش خـەتەر بـۆ
حــاڵش چ تــەورەن خــاکش وە سـەر بـۆ(٥)

هــام فــەرد نــاڵەی دڵ، سـەیرانگـە ستەم
هام دەرد دووی دەروون، خەم بەرکەرکۆی خەم(٦)

---

(١) چون یاوا: کە گەیشت. بشۆ: برۆ. پابۆس: قاچ ماچ کردن. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ. لە هەندێ نوسخەدا ئەم شیعرە بەم جۆرە نووسراوە:
نـــامە مکـــیانوون مـــوانـــان پـــەرێت گۆش‌دەر وە نامەی دێوانەی سـەرشێت.
واتە: نامە ئەنێرم بۆت ئەخوێننەوە، گوێ شل‌کە بۆ نامەی دێوانەی سەر شێت.
(٢) واچە: بڵێ. توفەیل: خزمەتکار. پەرسابێت: پرسیبووت.
(٣) کۆ: کە ئەو. چ تەورەن: چۆنە. بەرمەکەرۆ: دەرئەما. واتە: کە نامەکەمت پێ گەیشت برۆ بۆ خزمەتی ئەو دۆستە نازارە، قاچی زیارەت کەو بە دەردو ناڵەوە عەرزی بکە بڵێ هەی مەعدوومی سەدجار بە خزمەتکارت بێ، بە هۆی گەرمیی مەیل‌و خۆشەویستیەوە ئەحواڵی منت پرسیبوو، وە فەرمووبووت ئاخۆ لە چی‌یایەو کێ خەم‌و خەفەت لە خەیاڵی دەرئەکا... جوابی منیش لە شیعرە داهاتووەکانا دێت.
(٤) چون: وەك. دین: دیتن، بینین. چەم: چاو. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٥) سات: سەعات. خاکش وەسەر بوو: قوڕ بە سەری.
(٦) واتە یەکێکی وەك ئەو کە لە چاو پێ کەوتنی یەکێکی وەك تۆ دوور بێ‌و لێڵایی چاوی

تـــۆ خـــاسەن نـــەوتوولْ ســـەرو ســـەراوان
خـــەم مـــدەی وە بـــاد شـــنۆی ســـەرکاوان(١)

گـــا چـــون بـــۆی نـــەسیم وە رووی شـــەتاودا
گـــا چـــون گـــولْ نـــەپای چۆڕەی وەفـراودا(٢)

ســـەیر لەرزەی نـــەرم ســـەوزەی ســـەر بـــەرزان
ســـــەفای گـــــوڵاڵان ســـــەد تـــــەرزان لەرزان

ســـوب نـــە ســـەر مـــلان ســـەیادان هـــام دەم
شـــریخەی مـــاردم کـــلافـــەی کـــەڵڕەم(٣)

نـــەك چـــون ئـــەو پـابەند قـەڵای شـار دەرد
جەی وەهار چون وەڵگ پایزان رەنگ زەرد(٤)

---

☜

داهاتبی‌و دڵ تەنگی بێ‌و لەشی سووتاوی خۆشەویست بێ وەك کێوی توور، وە هەر تاوی بە جۆرێ گرفتاری دەردی مەترسی لێ کراو بێ، ئەبێ حاڵی چۆن بێ، خاك بە سەری... حاڵی ئەمەیە: هاوارو ناڵەی دڵ هاوڕێیەتی، ستەم‌و جەوری رۆژگای سەیرانگایەتی، دووکەڵی دەروون هاو دەردیەتی، کۆگای خەم‌و مەینەت خەفەت دەرکەری دڵیەتی.

(١) مدەی: ئەدەی. شنۆ: شنەی. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.

(٢) گا: گاهێ، دەمێك. پای: داوێنی.

(٣) واتە: پێی بڵێ ئەمە بوو حاڵی مەعدوومی کە عەرزم کردی، بەڵام تۆ وەعزت زۆر باشە ئەی نەونەمامی دار سەرو ی سەراو، غەمی خۆت ئەدەی بە بای سەر کێوەکان، وە جار جار وەك نەسیم کە بۆنی گوڵی وەرگرتبێ‌و بە سەر شەتاوانا بڕوا، تۆیش بە گوێ ئاوەکانا گوزەر ئەکەی، جار جاریش وەك گوڵ کە لە داوێنی بەفراوی چۆڕاوگە بەستوودا روا بێ بۆ خۆت گەشە ئەکەیت‌و تەماشای نەرمە لەرینەوەی سەوزە گیای سەر بەرزان ئەکەیت‌و لە سەفای گوڵاڵەی کوێستانەکان ورد ئەبیتەوەکە بە سەدان جۆر دێنە لەرزە، وە بەیانی‌یان بە سەر شاخەکانەوە لەگەڵ راوچی‌یاندای‌و گوێ لە شریخەی تفەنگی ماردم ئەگری‌و سەیری خول‌خواردنەوەی کەوتنی کەڵەکێوی‌یە کوژراوەکان ئەکەی.

(٤) پابەند: پێ بەسراو، گیرۆدە. جەی: لەم. وەڵگ: گەڵای دار. واتە: وەك ئەو لە قەڵای

☜

ئاخ نە جەهدو جـەخت داخ زامـەت سـەخت
بـەرگ مـاتەم رەخت نـاڕەسـایی بـەخت(١)

کزەی خەم چـون مـوو خـەم پـەنەش وەردەن
دووریت خـۆ یـەکـجار تـەمامش کـەردەن(٢)

وەخت جـۆش دەرد کـزەی نـاڵەی سـەرد
گـوم بـۆ نـە گـێجـاو گـەردەلوول دەرد(٣)

ئـەو خـەندەی بـێ وەخت مـەیۆش وە دەمدا
مـەگـێڵۆ مـاچۆ نـەو گـێج و تـەمدا(٤)

ئـەر هـەر ئـەو بـەختەن، هـەر ئـەو تـاڵەمـەن
دیـدەم دیـدەنیت ئـەڵڵاو ئـاڵەمـەن(٥)

---

☞
شاری دەردو مەینەتا گرفتار نیت و بەم بەهارە وەك گەڵای درەختی پایزان رەنگت زەرد هەڵنەگەڕاوە.

(١) جەهدو جەخت: هەوڵ دان و رەنج کێشان. زامەت: زەحمەت. رەخت: پۆشاك. نا رەسایی: ناتەواوی. واتە: ئاخ و داخیەتی لەبەر هەوڵ دان و رەنج کێشانی زۆری، وە پۆشاکی بریتی یە لە بەرگی خەفەتەکە لە ناتەواوی بەختی یەوە پەیدا بووە.

(٢) خەم: چەمینەوە. واتە: کزەکزی خەفەت وەك موو بە ئاگر هەڵقرچێ بەو جۆرە چەماندوویەتیەوە.

(٣) گێجاو: گێژاو. واتە: لەکاتی جۆشی دەردو کزەی هەناسەی ساردیا لە ناو گێژاوو گەردەلوولی دەردا گوم ئەبێ.

(٤) خەندە: پێکەنین. مەیۆش: دێت. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێت.

(٥) تاڵە: «طالع»، بەخت. ئەڵڵاو ئاڵەم: الله اعلم. واتە: ئەو زەردەخەنە ناوەختەکە بەسەر لێویەوەیە لە راستیدا لەبەر شادی نیە، بەڵکو دێت و ئەچێ و لە ناو گێژو تەمی هەناسە ساردەکەیا بە زمانی حاڵ ئەڵێ ئەگەر بەخت و تالعم هەر بەخت و تالعە پێشووەکەم بێ، ئیتر ئازیم مەگەر خوا خۆی بزانی ئاخۆ جارێکی تر ئەت بینمەوە یا نە...

**[٣]**

## جە سەردی مۆبەت

جــە ســەردی مــۆبــەت ئــازیز بــێ گــەرد
جـۆی هـووناو دڵ جـە دیـدەم یـەخ کـەرد(١)

دەست بــێ رەحــمیش دانـە سینەی شـەوق
گڕ وەردان نە جەرگ جەستەی هەستی زەوق(٢)

زەهـــــر خـــــەم شـــیەن نـــە کـام شـادیم
هــــەر دەردەن مـــــەیۆ مــوبارەك بـادیم(٣)

هــــەناسەم رێزەی دڵ مـــارۆ ئـــەو بـەر
ســـەر کـــەردەن زوخــاو جــە زام خـەتەر(٤)

مەینەت چـون تـوجار وە مـەتای سـەد تـەرز
کـــەردەن نـە دەروون نـەوای شـادی بـەرز(٥)

---

**[٣]**

(١) موبەت: محبت، خۆشەویستی. جۆ: جۆگە. یەخ: سەهۆڵ. واتە: لەبەر ساردیی مەیلی خۆشەویستە بێ گەردەکەم جۆگەی خوێناوی گەرمی دڵم لە ناو چاوەکانما مەیی و بوو بە سەهۆڵ.

(٢) وەردان: بەرداوە. واتە: دەستی بێ رەحمیی دا بە سەر سنگی شەوق و خۆشیما، وە بەو دەستە گڕی بەردا لە جگەری جەستەی قەوارەی زەوق و شادیم.

(٣) شیەن: رۆیشتووە. کام: دەم. مەیۆ: دێت. واتە: لەبەر بێ مەیلیی یارەکەم ژاری خەم و مەینەت چووەتە ناو دەمی شەوق و شادیم وەکارەساتێکم بە سەر هاتووە هەر دەردو بەڵایەو دێت بۆ پیرۆزبایی لێ کردنم.

(٤) رێزە: وردە. مارۆ: دێنێ. ئەو بەر: بۆ دەرەوە. واتە: بە هۆی دڵ ساردیی یارەوە دڵم دافرەقاوەو کە هەناسە ئەدەم وردە پارچەکانی بە دەم هەناسە دانەوە دێتە دەر، وە زوخاوی زامی مەترسی لێ کراوم هێرشی هێناوەو لە رادە دەرچووە.

(٥) توجار: بازرگان. مەتا: مەتاع، شت و مەك. نەوا: ئاوازە. واتە: مەینەت وەك بازرگان بە شت و مەکی رەنگاو رەنگیەوە لە ناو دڵما ئاوازەی شادی بەرز کردووەتەوە.

دڵ وڵوڵ کـــــەردەن خـــەدەنگ دووری
سـۆچـــنان جــەستەم دەرد مــەهجووری(١)

هـــانا هـــامدەردان تـــاقەت نـــەمەندەن
جــەورەکـەی ئـازیز ریشـەی دڵ کـەندەن(٢)

بـــەیدێ وە لای مـــن حـــاڵم بــەدحاڵەن
جــە دووری ئـــازیز تـەن کـۆی زوخـاڵەن(٣)

بـــزانـــدێ خـــەم چـــۆن کـــەردەنم پـــاماڵ
دەخـــیلم ســـاقی گـــەردەن سـیم قـــاڵ(٤)

جـــامێ جـــە مـــەعجوون دەرد ئـــەو گـــاران
دورد وامـــــەندەی بـــەزمەکـــەی یـــاران(٥)

پـــێمدەر تـــا ریشـــەی هـــەستی کـــەرۆ پـــەی
قوربان تۆیچ، نەیچی، دەستێ بەر پەی نەی(٦)

(١) وڵ وڵ: کون کون. خەندەنگ: تیر. سۆچنان: سووتاندوویەتی. واتە: تیری دووری یار دڵی کون کون کردووم و دەردی فیراق لەشی سووتاندووم.
(٢) هانا: هاوار. نەمەندەن: نەماوە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٣) بەیدێ: بێن. زوخاڵ: خەڵووز. واتە: هاوار ئەی هاوار دەردەکانم تاقەتم لا نـەماوەو ستەمی دۆست ریشەی دڵی هەڵکەندووم، وەزعم ناڕەحەتە بێن بە لامەوە، لە دووریـی دۆست سووتاوم و لەشم بووە بەکۆگای خەڵوز.
(٤) بزاندێ: بزانن. کەردەنم پاماڵ: ریشەکێشی کردووم. سیم قاڵ: زیوی پوختە. نیوەی شیعری دووهەمی ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعرەکانی پاشەوەو مەعنای لەگەڵ ئەوانا دێت.
(٥) مەعجوون: شێلراو. ئەوگاران: گرفتارەکان. دورد: خـەڵتـەی بـنی قـاپی شـەراب. وامەندە: پاشماوە.
(٦) کەرۆ پەی: بکا پەی، لە بن ببڕێ. نیوەی شیعری یـەکـەمی ئـەم شـیعرە مـەعنای پێشەوەی تەواو ئەکا، واتە: دەخیلتم ئەی مەی گێڕ کـە گـەردنت وەك زیـوی پـاك وایـە، پیاڵەیەکم لە پاشماوەی شەرابی ئاهەنگی یـاران بـدەرێ کـە وەك دەرمـانی دەردەداران

وه تـــەرزەكـــەی وێت مـــن لاونـــەوە
وه مــــــەقامێ وەش خـــەم تـــاونەوە(١)

بـا خـاس خـاس هـۆشـم هیچ نـەمەنۆ پـێم
بـەڵ ئـازیز وه خـەیر رەحـمێ كـەرۆ پـێم(٢)

••••••••

[٤]

## جه من تا دووری(٣)

جـەمن تـا دووری ئـەر سـەد فـرسەنگ بـۆ
ئـــەر بـــۆ رازی بـــوو زوانـــم لەنگ بــۆ(٤)

بـــەڵام چـێش كـــەروو بـــەڵام هـــەم رازەن
فـــەڵەك كـــەڵەك چـین چـەنیم كـەچ بـازەن(٥)

---

☞

خەستو شێلراوە، تا بیخۆمەوەو ریشەی بوونم لە بنەدا ببڕێ. مەعنای نیوەی شیعری دووهەمی ئەم شیعرە بە سراوە بە دوو شیعری پاشەوە.

(١) لاونە: بلاوێنەرەوە. تاونەوە: بتوێنەرەوە.

(٢) نەمەنۆ: نەمێنێ. بـەڵ: بـەڵكو. واتـە: كـاكـەی بـلوێر ژەن تـۆیش دەس درێژ كـە بـۆ بلوێرەكەتو خۆت ئـاسایی بـمڵاوێنـەرەوە، وە بـە نـەقامێكـی خـۆش خـەمو خـەفەتم بتاوێنەرەوە، با هیچ بیرو هۆشم لانەمێنێ بەڵكو ئازیز بە خێری خۆی رەحمم پێ بكا.

[٤]

(٣) مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی بۆ جەنابی شێخ عومەری بیارەﷺ نووسیوە لە وەڵامی گلەیی كردنی ئەواكە بۆ مەولەویی نووسیوە بۆچی ناچێ سەرێ لێ بدا.

(٤) فەرسەنگ: فرسەق، فەرسەخ. واتـە: مـن لەگـەڵ دووریـی دۆسـتانا ئـاشنایيم نـیە، هەتاوەكو ئەگەر ماوەی بەینی منو دووری بیشگاتە سەد فرسەق، یاخوا ئەگەر رازی بم بەو ماوەیە زمانم لاڵ بێ، بەڵكو حەز ئەكەم بەینمان زۆرتر بێ، یانی ئەوەندە موشتاقی نزیكیم.

(٥) چەنیم: لەگەڵ. واتە: بەڵام چی بكەم بەڵاو مەینەت هاوڕێمە، وە گەردوونی فێڵ بازو كەڵەك نەرەوە لەگەڵما رێك نیە، بۆیە نەم توانیوە بە خزمەت بگەم. لە نێوانی دوو وشەی «بەڵام»دا «جناسی تام» هەیە بە پێی عیلمی بەدیع.

کـــارد مـــەینەتش ئـــیستیخوان کـــاوان
«ضـــیا»ی دیـــدەو دڵ مـــەگـــێرەم تـــاوان[١]

قـــەڵای ویـــرم ســـەیل هـــووناو بـــەردەبێ
بـــورج ئـــاگـــاییم وێران کـــەردەبێ[٢]

کـــێشکچـــی خـــەیاڵ خـــەم فـــام ســـەندەبێ
دووکـــانچەی بـــەدەن بـــێ کـــەس مـــەندەبێ[٣]

فـــرسەت زانـــابێ تـــەریدەی قـــاتڵ
یـــەکسەر بـــەردەبێ کـــاڵای گـــیانو دڵ[٤]

خـــەبەر بـــیم هـــۆشـــم ئـــاما وە بـــەردا
ئـــەم لا گـــیان، ئـــەو لا دڵ دام وە ســـەردا[٥]

---

(١) کارد: کێرد، چەقوی گەورە. ئیستخوان: ئێسقان. کاوان: قڵەشـاندووە. مـەگـێرەم: لێم مەگرە. واتە: کێردی دەردو مەینەت ئێسقانەکانی لەشمی قڵەشاندووە بۆیە ناتوانم جووڵە بکەم، کەواتە تۆیش تاوانبارم مەکە ئەی رووناکی چاوی دڵم. لە بەکار هێنانی وشە «ضیا»دا ئیشارەتێکی جوان هەیە، چونکە لەقەبی شێخ عومەر «ضیاءالدین» بووە.

(٢) ویر: بیر. بورج ئاگاییم: بورجی ئاگادار کردنەوەم. لە گوێ دەلیاکانا برجێکـی بـەرز دروست ئەکەن، وە لە قەلەپۆپەکەیدا چرا دائەنێن بۆ ئەوەی کەشتییەوانەکان لە دوورەوە ببینن وە رێ ون نەکەن، ئەوە پێی ئەڵێن بورجی ئاگادار کردنەوە. واتە: لافاوی خوێناوی قەڵای بیری بردووم و بورجی ئاگادار کردنەوەمی وێران کردبوو.

(٣) کێشکچی: ئێشکچی. واتە: خەم ئەقڵو فامی لە ئێشکچی وجوودم ـکە خـەیاڵە- سەندبوو، وە دووکانچەی لەشم بێ کەس مابووەوە.

(٤) تەریدە: «طریدە»، دەربەدەر. واتە: جەردەی دەربەدەرو پیاو کوژ بە هـەلی زانـیبوو سەرمایەی بوونمی دزیبوو کە دڵو گیانمە.

(٥) واتە: کە خەبەرم بووەوەو هۆشم هاتەوە بە بەرما روانیم بەم لاو بەو لاما سەیرم کرد نەگیانم ماوەو نە دڵم، لە داخانا دام بە سەرما.

لادێ ئـێش سـەخت، سـاتێ وەی رۆ وەی
واتـم چـار نـیەن مـەر بشـوون وە پـەی[١]

دیـم نـاڵچـەکـەی داخ دڵەی پڕ جـە هـوون
شـەقڵش هـانە رووی گـەرد رای دەروون[٢]

رەوانتـەر جـە هـەرس وە سـەد قـەترەو دەو
تـا وە مـەکـۆگـەی ئـاسەنەکـەی ئـەو[٣]

لاڵام و نـاڵام حـاشات مـوشکوڵەن
گـیان فـیدای تـۆ بـۆ یـە بـەڵگـەی دڵەن[٤]

سـیوای تـۆ ئـازیز نـەی زەمـانەدا
کـێن گـوزەر کـەرۆ بـەی وێرانـەدا؟[٥]

نـە نـیم نـیگایێ، نـەکـەرد تـەماشا
چـێدیش وێنـەی مـاڵ یـاران کـەرد حـاشا[٦]

---

(١) لادێ: تاوێك. بشوون: بڕۆم. وەپەی: بە دوایا. واتە: تاوێك ئێشو ئازارم چەشت بە دەست ئەم کارەساتەوە، تاوێکی تریش هاوارو رۆ رۆم کرد، بەڵام ئاخری وتم کەڵکی نیە ئەبێ بڕۆم بە دوایانا بزانم بۆ کوێ براون.
(٢) شەقڵ: نیشانە. را: رێ. واتە: سەیرم کرد داخو خەفەتی دڵەی خوێناویم کە وەك ناڵ بە قاچیا داکوتراوە، نیشانەی بەجێ هێشتووە بە تۆزی رێگای دەروونمەوە.
(٣) رەوانتەر: سافتر. هەرس: فرمێسك. قەترە: بازرەقە. دەو: راکردنی توند. مەکۆگە: جێگای مەکۆ، پێ‌چاڵ. مەبەس شوێنی شاردنەوەی ماڵی دزی‌یە. ئاسانە بەردەرگا. واتە: منیش بە پەلە بە شوێن پێ‌کەیا هاتم و رێگام هەڵگرت تاگەیاندمیە مەکۆگای ئاستانەکەی ئازیزم.
(٤) لاڵام: لاڵامەوە. ناڵام: ناڵاندم. یە: ئەم. واتە: لێی پاڕامەوەو ناڵاندم لایاو پێم وت دڵ و گیانم لای تۆیە، وە ناتوانی حاشای لێ بکەی، چش لە گیانم، بەڵام ئەم شوێن پێ‌یەکە گەیشتووەتە بەر دەرگاکەی تۆ نیشانەی ئەوەیەکە دڵم لە لای تۆیە، بمدەرەوە.
(٥) نەی: لەم. کێن: کێ‌یە. بەی: بەم. واتە: ئازیز، کێ بێ جگە لە تۆ لەم زەمانەدا روو بکاتە ماڵی وێرانی من. ئەمەش بەڵگەیەکی‌ترە لەسەر ئەوەکەوا دڵ و گیانم لای تۆیە.
(٦) چێدیش: لە مێش. واتە: نە سەیری کردم، نە لایەکی لێ کردمەوە، حاشای لە دڵ و

## [٥]

## جیلوەی جەلای جام(١)

جـیلوەی جـەلای جـام دڵەی پـڕ جـە گـەرد
فـەرمات پـەی تـەزبێح هـا رەوانـەم کـەرد(٢)

پـەرێ تـۆ خـاسەن هـەر شـام تـا سـەحەر
هـەر ژمـارەی وەسـڵ بـاڵای دڵبـەر کـەر(٣)

نـەك چـون مـن «وضـو» وە هـووناو ئـەستە
خـەم سـیواك، نـمای مـەینەتان بـەستە(٤)

نـیشتەی گـۆشـەی تـار نـمازخـانەی دەرد
روو نـە پـای مـیحراو هـەناسان سـەرد(٥)

---

☜

گیانی منیش کرد وەك حاشای لە ماڵی یاران کردووە. بۆیە وا منیش هۆش‌و دڵم نەماوە، وە ئەگەر نەیەم بۆ خزمەتی تۆو یارانی‌تر عوزرم پەسەندە. مەولەوی لەم شیعرەیا بە شێوەیەکی وردو جوان ئیشارەت ئەکا بۆ ئەوەکە خۆی دڵ‌و گیان بەخت ئەکا لە پێناوی یارا، بەڵام خەڵکی ماڵ بەخت ئەکەن.

**[٥]**

(١) جارێکیان شێخ «عثمان سراج‌الدین» تەوێڵەﷺ داوای تەزبێحێك لە مەولەوی ئەکا، ئەویش تەزبێحەکەی بۆ ئەنێرێ‌و ئەم شیعرانەی بۆ ئەنووسی.

(٢) جیلوە: خۆ دەرخستن. جەلا: ڕووناکی. فەرمات: فەرمووت. واتە: ئەی ئەو دۆستەی کە هۆی پاك بوونەوەو ڕووناکی جامی دڵە پڕ لە تۆزەکەی منی، فەرمووبووت بۆ تەزبێح وا بۆم ڕەوانەکردی. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «گەرد» نووسراوە «دەرد».

(٣) پەرێ: بۆ. شام: ئێوارە. واتە: تەزبێح بۆ تۆ باشە هەر لە ئێوارەوە تا سبەینێ ژمارەی گەیشتن بە باڵای یاری پێ بکە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «هەر شام‌و سەحەر» نووسراوە «هەر شام، هەر سەحەر».

(٤) وضوو: دەس‌نوێژ. ئەستە: سەندوو، گرتوو. نما: نوێژ. بەستە: دابەستوو. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٥) واتە: نەك وەك من کە دەس‌نوێژ بە خوێناو گرتووەو خەم‌و مەینەت سیواکمەو نوێژی

☞

وەی «وضـــو»و نـــماو وەی سـیواکـــەوە
جــەی گـۆشـەی مـیحراو مـزگی پـاکـەوە[١]

دانـــەی مـــەرجـــانی هـــەرس مـــەهجووری
هـۆنـــیای تـــای کـرژ رشتەکـەی دووری[٢]

پـــەی ژمـــارەی زیکـــر کـزەی ئـێش‌و نـێش
کافی‌یەن دەیـدەم تـەزبێحـم پـەی چـێش؟[٣]

[۶]

### جە دووریت[۴]

جـە دووریت دەروون مـەوج دەریـای هـوون
مـــدۆ وە جـــەمدا، بـــەڵام چـێش کـەروون[٥]

---

☞

مـەینەتم دابـەستووەو لە سـووچی تـاریك مـزگەوتی دەردا دانیشتووم رووم کـردووەتە میحرابی هەناسەی سارد.

(١) وەی: بەم. جەی: لەم. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێت.

(٢) مەرجانی: وەك مەرجان. مەرجان رەگێکی سووری دەلیـایی‌یە وەك پـەنجەی دەس. هۆنیا: هۆنراوە. تا: تاڵ.

(٣) واتە: من بەم جۆرە دەس‌نوێژو سیواك‌و نوێژەوە، وە لەم سووچە پاکـەی مـیحرابـی مزگەوتا، دەنکە دەنکەی فرمێسکی مەرجان رەنگی دووریم کە بە تاڵی کـرژی دەزووی هیجران هۆنیومەتەوە، بەسمە بۆ ژمارەکردنی کزەی ئێش‌و دەردی خۆم، ئیتر تەزبێحم بۆ چیە گیانەکەم.

[۶]

(۴) مەولەوی لە ١٢٩١ی هـ ئەم پارچە هەڵبەستەی نووسیوە بۆ مەحموود پاشای جاف کاتێك کە پاشا ماڵی لە بەغدا بووە.

(٥) واتە: لە دووریی تۆ ئـەوەندە دەروونم پڕ بووە لە خوێناو، شەپۆلی دەلیای خوێن ئەدا بە چاوەکانما وە لەوانەیە خوێن لە چاوەکانمەوە بێتە خوارەوە، بەڵام من ئەبێ چی بکەم تا لەم لافاوە بەغدا نەبا؟ لە شیعرەکانی پاشەوەدا باسی ئەو چارەیە ئەکاکەکردوویەتی لە رووەوە.

پــــاتەخت مـــەحموود «دارالسّـــلام»ەن
مـــنیچ کـــەمێ فـام ئـەیاز جـەلامەن[1]

ئـــەیازت فـــاماش تـــەفاءول کـــەردەن
ســـڵامـەتی تـۆش وە یـاد ئـاوەردەن[2]

وە خـــارو خـــاشاك مـوژەی چـەسپیدە
سەد بـەستەن نـە دەور سـەرچـەمەی دیـدە[3]

وەرنـە دەجـلەی غـەم تـوغیان کـەردەبێ
تـا ئیسە چـەند جـار بـەغداش بـەردەبێ[4]

---

(١) «دار السلام»: لەقەبی شاری بەغدایە. منیچ: منیش. ئەیاز: وەزیرەکەی سوڵتان مەحموودی غەزنەوییە، لێرەدا مەبەس لێی مەولەوی خۆیەتی. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٢) فاماش: فامی. تفاءول: جاران عادەت بوو دیوانی خواجە حافیزی شیرازی یا هەر کتێبێکی فاڵ گرتنەوەیان ئەکردەوە بە نیازی ئەوەی دێڕی یەکەمی ئەو لاپەڕەیەی کە دەرئەکەوت شیعرێك یا وشەیەکی وابێ لەگەڵ ئامانجەکەیانا بگونجێ، ئەوە پێی ئەوترا تەفاءول. هەروەها ئەم تەفاءولە ئەوەشی گرتووەتەوە کە چاو پێ کەوتنی دۆستێك یا شتێکی جوان یا بیستنی وشەیەکی خۆش نیشانەی خێر بێ. واتە: بەغدا کە نشینگەو پایتەختی مەحموود پاشایە، منیش کەمێکم لە عەقڵی ئەیاز هەیە، ئەوەم بە خەیاڵا هاتووەکە ناو برانی بەغدا بە «دارالسلام» بکەم بە نیشانەی خێر کەوا تۆ هیچت لێ نابێ و سەلامەت ئەبیت.
(٣) خار: دڕك. موژە: برژانگ. چەسپیدە: بە یەکەوە نووساو. سەد بەستەن: بەستێکی دروست کردووە. سەرچەم: سەرچاوە. واتە: بە دڕك و داڵی برژانگەکانم کە لە تاوی زۆریی گریان نووساون بە یەکا، بەری سەرچاوەی چاومم گرتووە، بۆ ئەوەی شەپۆلی خوێنی دەروونم بە دەشتی گەرمیانا نەیەتە خوارەوە بەغدا ببا.
(٤) وەر نە: ئەگینا. واتە: ئەگینا بە هۆی خوێناوی چاوەکانمەوە دجلەی خەم و مەینەت لێشاوی ئەکرد، وە تا ئێستا چەند جار بەغدا ئاو ئەی برد.

[٧]

## جۆراب چون من زامان(١)

جـــۆراب چـــون مـــن زامــان نــەسرەفتە
وە سـەر پــەنجەی پـای ئیستیغنا کـەفتە(٢)

بــەدبەختێ چــون مـن تـەن کـەفتەی کـۆیـێ
یـا خـەیاڵ خـامێ ئـەبلەە چـون تـۆیـێ(٣)

ئـەو روتـبەی نـازك تـۆ وە دەروون بــەرد
جـە رووی گـوستاخی تـۆ ئـارەزووت کـەرد

لەب وە تـەمای دڵ چـەند حـەسرەتش بـەرد
پـێش ئـاوڵە کـەرد فـرسەتش نـاوەرد(٤)

---

[٧]

(١) وا دەر ئەکەوێ مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی بۆ ئەوە وتبێ کە گـۆرەوی‌یـەکی بێ کەڵکی بووبێ‌و بە تەما بووبێ لەگەڵ برادەرێکی بێ گۆڕێتەوە بە گۆرەوی‌یەکی باش، بەڵام ئەم داوایەی لێ نەکردبێ بە هیوای ئەوەکە ئەو خۆی بۆی بگۆڕێتەوە، کـەچی ئـەویش هیچی نەوتبێ‌و مەولەوی هەلەکەی لەکیس چووبێ. ئەمجا بەم شیعرانە قسـەی لەگـەڵ گۆرەوی‌یەکەی کردبێ‌و سکاڵای دڵی خۆی هەڵ رشتبێ.

(٢) جۆراب: گۆرەوی. ئیستیغنا: ئیش پێ نەبوون. کەفتە: کەوتوو. مەعنای ئـەم شـیعرەو شیعرەکانی پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٣) تەن کەفتە: لەش داکەوتوو. ئەبلەە: نەفام.

(٤) پێش: پێی، قاچی. ئاوڵە: تولۆق. واتە: ئەی گۆرەویی کەسێکی زام نەسرەوتووی وەك من، کە لەبەر پێویست پێ نەبوونو کەڵك پێوە نەمان کەوتوویتە سـەر لووتـی پـێم، مـنی بەدبەختی لەش سووتاوی سەر کێوان بە هیوای ئەوە بووم تۆ ئەو پایە بڵندەت دەسکیر ببێ کە ئەو دۆستە بکاتە پێی، وە تۆی نەفامی خەیاڵ خاویش هەر ئەو ئارەزووەت ئەکرد. بەڵام من بە هیوای رەزا بوونی برادەرەکەم وە بە هیوای ئەوەکە ئەو خۆی داوا بکا، ئەوەندە لێوم جووڵاندەوەو هیچم نەوت تا پێی لێوم بوو بە تلۆق، وە هەلەکەم لەکیس چـوو، وە جگە لە خەفەت خواردن هیچم بۆ نەمایەوە.

## [٨]

## جەبێ کەسی[1]

جــە بــێ کــەسی وێم تــۆم کــەردەن وەکــەس
نــە بــەکــەس شــیای، نــە بــە نــیمەکــەس[2]

ســـــەر جـــــە راســـــتی کــەردەنم تــوفەیل
من مەجنوون تــۆم، تــۆم کــەردەن وە لەیــل[3]

---

[٨]

(١) مەولەوی لەم دوو شیعرەی‌داگلەیی لەدۆستێکی هیچ لێ نەهاتووی ئەکا.

(٢) واتە: لەبەر بێ کەسیی خۆم تۆم کرد بەکەسی خۆم، کەچی تۆ نە بەکەس بووی بۆم وە نە بە نیوەکەس وە رەنجم بێ هوودە بوو.

(٣) توفەیل: «طفیل»، خزمەتکارو شوێن کەوتوو. واتە: من بە راستیو دڵ پاکی سەری خۆم کردووە بە خزمەتکارو شوێن کەوتووی تۆ وە خۆم کردووە بە مەجنوونی تۆو تۆم کردووە بە لەیلی خۆم.

## [١]

## چون وەڵگ شادی(١)

چــون وەڵگ شــادی مــن وای دووری لەیـل
وەیشووم بەرد ئەو هەرد نەو رشتەی سوەیل(٢)

گــێج سـەر کـاوان جـە سـەردەی بـین کـەیل
بــۆ مـەدان چـون بـۆی بـێ وەفـایی لەیـل(٣)

بــێ دەس بـــی چــنار زیــز خــاتر رێش
بەڵ خـاکـێش کـەرۆ وە سـەردا پـەی وێش(٤)

وی‌کـــۆڵ وەی وەکــۆڵ پــەی زەردان دەرد
مــاساو نــە ســەراو رێزان هــەرزان کـەرد(٥)

---

[١]

(١) مەولەوی ئەم غەزەلەی بۆ دۆستێکی جافی ناردووەکە لەکوێستان ماوەتەوە لەگـەڵ عیلا نەگەڕاوەتەوە بۆ گەرمەسێر، داوای لێ ئەکاکە بگەڕێتەوەو پیێ ئەڵێ درەنگە.

(٢) وەڵگ: گەڵا. وا: با. وەیشووم: وای شووم، بای نەگبەت، مەبەس بـای سـاردە. نـەو رشتە: تازە رەنگ کراو. سوەیل: سهیل، ئەستێرەیەکە پایزان ئەکەوێ. واتە: وەك چۆن بای دووریی لەیل گەڵای درەختی شادیی منی وەراندووە، سارده بای پـایزیش گـەڵای دارە زەرد هەڵگەڕاوەکانی بردووە بەکێوانا، مەبەسی ئەویە گەڵا بە دارەوە نـەماوەو زسـتانی نزیك بووتەوە.

(٣) گێج: پێچ‌و نەسرم. کاوان: بەرزاییەکان. کـەیل: پـڕ. بـۆ: بـوون. واتـە: پـێچ‌و لوفـەی شاخەکان پڕ بوون لە سەرما، وە بۆنی سەرمایان لێ دێت وەك بۆنی بێ وەفایی یار.

(٤) واتە: دار چنارەکان لە بەر ئەوەکە گەڵایـان داوەریـوە، بـێ دەس کـەوتوون‌و زویـرو بریندار بوون، ئیتر مەگەر گڵ بکەن بە سەری خۆیانا لەبەر دارزانی بەرگەکەیان.

(٥) وی‌کۆڵ: بی‌یەکۆڵە. زەردان دەرد: ئەوانە تووشی زەردوویی هاتوون. ماساو: ماسی. رێزان: کەوتن. واتە: دار بی‌یەکۆڵەکان لە بەر سرمای پایز دەردو بەڵا چووەتەکۆڵیان، وە ئەوەندە وردە گەڵای تاڵیان داوەراندووە بۆ ناو رووبارەکان، ماسی‌یەکان هەموو مردوون. کەوتوونەتە سەر ئاو، وە مـاسی زۆر بـووە بـۆ ئـەوانـەی گـرفتاری دەردی زەردوویـن‌و

کـۆچ کـەردەن خـاسان، چـیهرەی ئـێڵاخـان
داوۆ وە هـــەمدا دیســـان نـــە داخـــان[(١)]

رۆی حـــەشر دووری گـــەردەن بـــێ گـەردان
بـــێواده پـــیر کـەرد کـاوان سـەر هـەردان[(٢)]

هـــەور نـــەو زار زار کـــڵاو ئـــەو کـــڵاو
مـــە گـــێڵۆ ئـــەسرین مـــەرێزۆ وە تـــاو[(٣)]

مـــاچی ئـــەویش دەرد هـــیجرانش وەردەن
یـــا چـون مـن بـاڵای ئـازیز گـوم کـەردەن[(٤)]

وێنـــەی عـــوقدەی پـێچ ریشـــەی ئـەرواو دڵ
بەستە بۆ جە نـم خـووی مـۆبـەت زەنگـڵ[(٥)]

---

☞

پێویستیان بە ماسی‌یە تەماشای بکـەن تـا چـاك ببنەوە. وە لەکـوردەواریـدا مـەشهوورە زەردووی دار سەیری ماسی بکا چاك ئەبێتەوەو دەردەکەی تووشی ماسی‌یەکە ئەبێت.

(١) خاسان: جوان خاسەکان. چیهرە: روو. ئێلاخ: کوێستان. داوۆ وە هەمدا: داویانە بە یەکا. واتە: هەموو رۆخسار جوانەکان لەکوێستان کۆچیان کردووەو هاتوونەتە خوار لە بەر سەرما، وە ئەوکوێستانانە دیسانەوە لە داخی کۆچ کردنی کچە شۆخەکان روویان گرژ کردووەتەوە.

(٢) رۆ: رۆژ. واتە: دووریی ئازیزە گەردن بێ گـەردەکـان کـە ئـەوەندەی رۆژی حـەشر نارەحەتە لای شاخە بەرزەکان، ئەو شاخانەی بێ وادە پیر کردووەو سەریان سپی کردووە. مەولەوی لە م شیعرەیا تەشبیهێکی زۆر ناسکی کـردووە: شـاخەکـانی شـوبهاندووە بـە ئینسانی دڵدار، وە بەفری قەلەپۆپەکانیانی شوبهاندووە بە مووی سەری دڵدارەکـان کـە لەبەر خەم خەفەت بێ‌وادە سپی بووبێ

(٣) نەو: نوێ، تازە. زار زار: بە عاجزیو زویری‌یەوە. کڵاو: بەرزی. مەگێڵۆ: ئـەگـەرێ. مەرێزۆ: ئەرژێ. واتە: هەوری تازە بە عاجزی‌یەوە بە سەر بەرزایی‌یەکاندا ئەگەرێو بە تاو فرمێسك لە چاوەکانیەوە ئەرژێ.

(٤) ماچی: ئەڵێی. وەردەن: خواردووە. واتە: ئەڵێی ئەویش دەردی دووریی چـەشتووە، یان وەك من باڵای ئازیزی گوم کردووە وا ئەگەرێو ئەگری.

(٥) عوقدە: گرێ. ئـەروا: ئـەرواح، گـیان. بـەستەبۆ: بـەستێتـی. خـوو: ئـارەق. زەنگـڵ: زەنگڵە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

ســـيلسيلەی پـــێچ پـــێچ زوڵف نـــازاران
زەنگـــــڵە بـــــەستەوە جـــە دانـــەی واران(١)

قـــازان چـــــون يـــاران ئـــاواتــــە خـــوازان
قـــــەتارە بــــەستەن مـــــەكـــــەران رازان(٢)

بـــێ لەيـــل، ئـــاخ، ئـــامێ، جــــە ئـێڵاخــەوە
پـەی ئـاخ داخ تـەك دان بـە «ئـاخ داخ»ەوە(٣)

جــــەيرانـــان گـــەل گـــەل تـــازە كـــەردەن مـــەيل
فەڕ وستەن ئەو زێد پای هەردەی دوجـەيل(٤)

---

(١) سيلسيلە: زەنجير. واران: باران. واتە: هەر وەكـو چـۆن ريشـەی گـيانو دڵ بـە نـمی ئارەقی خۆشەويستیو مـەيلی ئـازيزان گـرێ ئـەبەستێو ئـەپێچرێ بـەيەكـا، هـەروەها زەنجيرەی زوڵفی يارانيش قەترەی بارانـی وەك زنگـڵە پـيا شـۆڕ بـووەتەوە. چـۆنيەتیو جوانيی ئەم شوبهاندنە بە بير كردنەوەيەكی ورد نەبێ ديـار نـادا، چـونكە لە لايـەكـەوە تەشبيهی «محسوس»ە بە «معقول» وە لە لايەكی ترەوە تەشبيهی «مركب»ە چونكە چ لە لای «مشبه» وە چ لە لای «مشبه به» يەوە هەر ديمەن سەرنج ئەدرێت.

(٢) قازان: قازەكان. مەكەران رازان: قسە ئەكەن. مەعنای ئـەم شـيعرەو شـيعری دوايـی پێكەوە دێ.

(٣) ئامێ: هاتن. تەك دان: پاڵيان داوە. ئاخ داخ: كێوێكە لە نزيكی قەسری شيرين. واتە: قازەكانی كوێستان لەبەر سەرمای زستان هاتنەوە بۆ گەرمەسێر، وە وەكـو هـاوڕێـيانی موشتاق ريزيان بەستووەو قسە ئەكەن، بەڵام داخی گرانم لەيليان لەگەڵ نەبوو، بە داخو حەسرەتەوە بە تەنيا هاتنەوە، وە داخی بێ لەيليدا پاڵيان داوە بـەكـێوی ئـاخداخـەوە. لە هـەندێ نـوسخەدا لە جياتی «جـە ئـێڵاخـەوە» نـووسراوە «جـە لەيـلاخەوە». لەيـلاخ ناوچەيەكی كوێستانیيە لەكوردستانی ئێران.

(٤) جەيرانان: ئاسكەكان. فەڕ وستەن: فەڕيان خستووەتە. زێد: نـيشتيمان، جـێگـای لە دايك بوون. دوجەيل: شوێنەكەی مەجنوونی لەيلا، مەبەس لێرەگەرمە سێرە. مەعنای ئەم شيعرەو دوو شيعری دوايی پێكەوە دێ.

چــــەم ســــیاوەکــەی وە نــاز دیــاکــەم
ســەر رەوێڵەکــەی جــە رەم جــیا کــەم(١)

هـــاڵای ســـەرمەستەن وە شـــنۆی لەیـــلاخ
بـــۆی نـــەو پـــایزش نـــامان وە دەمـــاخ(٢)

شـــەماڵ شـــۆ هـــۆر کـــەر بـدەر بـێ درەنگ
ســـەیل و تـــەم زەردی دیـــدەو دڵ و رەنگ(٣)

هـــوونەی ســـەیل چـــەم وە شـــەتاوان‌دا
تـــەم دڵ وە رووی زاخـــان کـــاوان‌دا(٤)

زەردی رەنگ نـــە وەڵگ نـــەوتووڵ نـــەمامان
تـــا لێش مـــالووم بـــۆ نـــەوپایز ئـــامان(٥)

---

(١) وە ناز دیاکەم: بە نازەوە روانیوەکەم. سەر رەوێڵ: سەر گەلە. رەم: گـەلە. لە هـەندێ هوسخەدا لە جیاتی «دیاکەم»و «جیاکەم» نووسراوە «دیاکە»و «جیاکە» وە لە جیاتی «سەر رەوێڵەکەی» نووسراوە «سەر دەلیلەکەی» واتە: پێشەنگی رێگا پیشان دەرەکان.
(٢) هاڵای: هێشتا. شنۆ: شنە. واتە: ئاسکەکان کۆمەڵ‌کۆمەڵ مەیلیان تازەکردووەتەوەو هاتوونەتەوە بۆ گەرمیان‌و فەڕو بەرەکەتیان خستووەتە مەنزڵگەی یاران، کەچی لەگەڵ ئەم سەرماو سۆڵەدا کەکۆچی بە هەموو هاوینە خۆرەکان کردووەتەوە بۆ گەرمەسێر، هێشتا ئاسکە چاو رەشەکەی من سەرمەستی شنەی کوێستانەو بۆنی پایز نەی‌داوە لەکەللەی. مەبەسی مەولەوی لە ئاسکەکان دەستەی نازاران، وە مـەبەسی لە ئـاسکەکـەی خـۆی خۆشەویستەکەی خۆیەتی.
(٣) شۆ: بڕۆ. بدەر: بدە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٤) هوونە: بە خوڕ رۆیشتن.
(٥) لێش: لێی. مالووم: مەعلووم، ئاشکرا. واتە: مادەم ئازیز هێشتا ئاگای لە سەرمای پایز نیە، شەماڵ تۆ بە بێ تەفرە پێ‌دان هەڵسە بڕۆ لافاوی چاوەکـانم‌و تـەمی دڵم‌و زەردیـی رەنگم لەگەڵ خۆت ببە، لافاوی بە خوڕی چاوەکانم هەڵکە بە چەمەکاندا، تەمی دڵەکەم بنێرە بۆ شاخەکان، زەردی رەنگیشم بدە لە گەڵای تووڵە نەمامە تازەکان تا ئازیز سەیری

مـــەپەرسۆ بـــەو مـــەیل بـێ سـامانەوە
هـــای چ خـــەبەرەن جـــە دامـانەوە(١)

واچـە پـڕ جـە تـۆ جـە وێ فـەرامۆش
مـن دیـم، تـۆ حـاڵش نـەژنەوی وە گـۆش(٢)

دیـدەش یـەند خـەیاڵ بـاڵات بـی تێش‌دا
راگـــەی خـاو نـەبی بـویەرۆ پـێش‌دا(٣)

یـەند گـێڵان بـەو دەرد شـەر نـە دەروون‌دا
بـا بـۆی دەرد مـارۆ وە رووی هـامون‌دا(٤)

زایـــفیش گـــرەو جـــە کـــا بـەردەبێ
بای هەناسەی سـەرد گـێج پـێش وەردەبێ(٥)

---

☞

ئەم لافاوو تەم‌و گەڵا زەردانە بکاو بۆی دەرکەوێ کە وەرزی پایز هاتووە، بەڵکو ئیتر ماتڵ نەبێ لەکوێستان‌و بگەڕێتەوە بۆ لامان.

(١) های: ئەمە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٢) واچە: بڵێ. وێ: خۆ. نەژنەوی: نەبیسی. واتە: ئەی شەماڵ کە تۆ لافـاوی چـاومت هەڵکرد بە چەمەکاناو تەمی دڵمت بەرز کردەوە بە شاخەکاناو گەڵای نەونەمامەکانت بە رەنگی زەردم رەگ کرد، ئەو دۆستە مـەیل بێ‌ئـەندازەیـە لێت ئـەپرسێ دەنگ‌و بـاسی دەشت چیە، تۆیش پێی بڵێ عاشقەکەت کە پڕە لە خۆشەویستی تۆو لە خۆی خاڵی‌و بێ ئاگایە، من بە چاوی خۆم دیم حاڵی ئەوەندە ناخۆش بوو یاخوا تۆ بە بیستن نەی بیسی.

(٣) یەند: ئەوەندە. راگە: رێگا. خاو: خەو. بویەرۆ: تێپەڕێ. واتە ٪ چاوەکانی ئـەوەندە وێنەی باڵای تۆیان تیابوو رێگەی خەویان تیا نەئەبووەوە پیایانا تێپەڕ ببێ، وە خەوی لێ نەئەکەوت.

(٤) گێڵان: گەڕاوە. مارۆ: دێنێ. هـامون: دەشت‌و دەر. واتـە: بـە دەردێ لە دەروونـەوە سەر کردوویەوە ئەوەندە گەڕاوە، با بۆنی دەردەکەی دێنێ بە وڵاتا.

(٥) زایفیش: زەعیفی. گێج: خول. واتە: ئەوەندە لاواز بووبوو لاوازیەکەی گـرەوی لەکـا بردبووەوەو بای هەناسەی سارد خولی پێ خوارد بوو.

گـــێج مــەوەرد پــووشش بــەو هــەناسەوە
سروەی پووش مەوات جـەرووی تـاسەوە:(١)

ئــــازیز شـــۆخ شـــەنگ شـــیرین تـــارەنی
ئــاهووی بـــێ ئـــاهووی وەش رەفـتارەنی(٢)

جـــەڵەو جـــەڵەو گـــەل سـپی تــەتاران
دیـــن دیــــدەکـەت وە چــەم مــداران(٣)

ئـــێلاخــــان ســـەردەن بـــازشان، ئـــامان
گـــەرمەسێر وەشـــەن بــۆرێ وە دامــان(٤)

تــــا گـــێران یـــاران ئـــاهون رەم رەم
بــاجت وە گــەردن، خــەراجت وە چــەم(٥)

---

(١) گێج مەوەرد: خولی ئەخوارد. سروە: ئەو دەنگەی لە پوشەوە دێت بە دەم باوە. مەوات: ئەی‌وت. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.
(٢) تار: تاق کەوتن. ئاهوو: ئاسك. بێ ئاهوو: بێ عەیب. واتە: پووشی لەشی عاشقە داماوەکەت خولی ئەخوارد بە دەم بای هەناسەی ساردەوە، وە بە سۆزو ئیشتیاقەوە ئەی‌وت ئازیزەکەم تۆ ئاسکێکی جوانی شۆخو شەنگی بێ‌عەیبی، وە زۆر جوان تار ئەکەوی لە ئاسکەکانی‌تر.
(٣) جەڵەو جەڵەو: جەڵەب جەڵەب، کۆمەڵ کۆمەڵ. سپی تەتاران: ئاسکە تاتاری‌یە سپی‌یەکان. دین: دیتن. وە چەم مداران: چاوەڕێنی. واتە: گەلە ئاسکە سپی‌یە تاتاری‌یەکان چاوەڕێی چاو پێ کەوتنی چاوتن.
(٤) بازشان: بەجێ‌یان بێڵە. وەشەن: خۆشە. بۆرێ. وەرەوە. واتە: کوێستانەکان ساردن، دەخیلتم دەسیان لێ هەڵگرە، گەرمیان خۆشە وەرەوە بۆ داوێنی چیا.
(٥) گێران: بگرن. رەم رەم: رەوگ رەوگ. چەم: چاو. واتە: وەرەوە بۆ گەرمیان تا کۆمەڵی ئاسکەکان ـ کە یارەکانتن ـ باجت بگرنە ئەستۆی خۆیانو خەراجت لە سەر چاو بۆ دانێن و بۆت بهێنن. مەولەوی کە باسی گەردنو چاو ئەکا ئەیەوی ئیشارەت بۆ ئەوە بکا کە جوانی گەردنو چاوی ئاسك بەناوبانگە.

## [۲]

### چەرخە یە تۆنی(۱)

چـەرخـە یـە تـۆنـی ئـەی مـەیلە کـەردی
بـەختە یـە تـۆنـی شـادی ئـاوەردی(۲)

خـەمە فـرسەتێ، ئـامانەن زامـان
دەردە مـۆڵەتـێ نـامەی لەیـل ئـامان(۳)

تـەحریر خـوردەی ڕێحـان بـێزەکـەت
تـەقریر شـیرین شـەکـەر ڕێزەکـەت(۴)

یـاوا وە سـەروەخت خـەستەی دەردەکـەت
مـەڵهـەم دا نـە زام دووری کـەردەکـەت(۵)

---

**[۲]**

(۱) مەولەوی جارێکیان ئەڕوا بۆ «تەوێڵە» بۆ زیارەتی شێخی «بهاالدین»ﷺ چەند ڕۆژێ لەوێ ئەمێنێتەوە، بەڵام چونکە شێخ نەخۆش ئەبێ ناتوانێ چاوی پێ بکەوێ، لەو بەینەدا شێخ نامەیەکی بۆ ئەنێرێ‌و هەواڵی ئەپرسێ، ئەمیش بەم شیعرانە وەڵامی ئەداتەوە.

(۲) چەرخە: ئەی فەڵەك. یە تۆنی: ئەمە تۆی. کەردی: کردت. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(۳) خەمە: ئەی خەم. دەردە: ئەی دەرد. ئامان: هاتووە. واتە: ئەی فەڵەك ئەمە تۆ بووی ئەم مەیلەت لەگەڵ کردم، وە ئەی بەخت ئەمە تۆ بووی شادی‌و خۆشیت هێنا، توخوا سا ئەی دەردو خەم مۆڵەتم بدەن نامەی لەیلم بۆ هاتووە با بیخوێنمەوە.

(۴) تەحریر: نامەی نووسراو. خوردە: ورد. ڕێحان بێز: ئەو خەتەی کە خەتیرێحانی لە بەر چاو ئەخا. «ریحانی» جۆرە خەتێکە. تەقریر: قسە. شەکەر ڕێز: ئەوەی شەکری لێ ئەوەرێ.

(۵) دووری کەردە: ئەو زامەی کە دووری کردوویە. واتە: ئەی خۆشەویستەکەم نامە خەت وردەکەت گەیشت کە ئەوەندە جوان بوو خەتی ڕێحانی لە بەر چاو ئەخست، وە قسە جوانەکانت هاتن کە شەکریان لێ ئەوەری وەکەوتنە فریای دۆستەکەت کە گرفتاری دەردتە، وە بوون بە مەڵهەم بۆ ئەو برینانەی کە بە هۆی دووریی تووە پەیدا بوون.

مـــن کـــێنـــان خـــامەت وە یـــادم کـــەردەن
حـــوسنت زیـــاد بـــۆ پـــەی دڵان بـــەردەن[۱]

جـــەمینت هـــەر ســـات نـــە جـــەلایێ بـــۆ
هـــەر جـــەلا پـــەی مـــن وە بـــەلایـــێ بـــۆ[۲]

نـــیم نـــیگات رەفـــێق تـــیر ئـــەندازی بـــۆ
دڵەی مـــن نـــیشان نـــە جـــان بـــازی بـــۆ[۳]

واتـــم مـــەیل دڵ، پـــەی کـــەسێ کـــەسەن
جە تەن خوای سوحبەت زاهـیری وەسـەن[۴]

خـــەیاڵم کـــەفتەی ئـــاسانەکـــەی تـــۆن
چ حـــاجەت زاهـــیر ئـــاماو ئـــامۆشـــۆن[۵]

دیـــام خـــەیر دووریت زۆرش ئـــاوەردەن
ئـــامانێ بـــەڵکـــم ئـــینە چـــەپ گـــەردەن[۶]

هـــەر پـــاسە شـــادیش نـــیەن بـــەینەتش
بـــەڵ بـــێ بـــەقا بـــۆ ســـزاو مـــەینەتش[۷]

---

(۱) کێنان: کێم. خامەت: قەڵەمەکەت. واتە: من کێم قەڵەمەکەی تۆ هێناومیەتەوە یاد، یاخوا جوانیت هەمیشە روو لە زیادی بێ بۆ فڕاندنی دڵی دڵداران.
(۲) جەمین: جەبین، روخسار. سات: سەعات. واتە: یاخوا روخسارت هەر تاوێ تیشکێك بداتەوە، وە هەر تێشكدانەوەیەکی بەلایەك بێ بۆ من.
(۳) جانبازی: گیان بەخت کردن. واتە: یاخوا هەمیشە روانینت بە لاچاو وەك تیر تەقاندن وابێ بۆ کوشتنی یاران، وە دڵی منیش ببێ بە نیشانەی و لە گیان بەخت کردنا بێ.
(۴) تەنخوا: جیاتی. وەسەن: بەسە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(۵) کەفتەن: کەوتووە. واتە: وتم بۆ کەسێ کەس بێ خۆشەویستی دڵ بەسەو پێویست بە هاتنی خۆی ناکا، منیش خەیاڵم هەمیشە لەبەر دەرگای تۆدا کەوتووە، ئیتر چ ئیحتیاجی یەکم هەیە بۆ هات و چ‌ۆی ئاشکرا.
(۶) دیام: سەیرم کرد. ئامانێ هاتم. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(۷) هەر پاسە. هەروەك. بەینەت: وەفاو بەین.

سێر ساوون وە چەم ئەو پاڵای بێ گەرد
چێش هەر زیاد کەرد دەرد وە بان دەرد(١)

وەشڵە وە مەینەت وەخت مەهجووری
سەد رەحمەت ئەو قەبر دووریو رەنجووری(٢)

ئەر سەد تۆی دەروون پەرێت قەقنەس بی،
یانەی دڵ وە یاد ئاوا بی بەس بی(٣)

ئیسە حەسرەتان، بیم بەد ئەندێش
هەر یەك جە لایێ مەکێشۆم پەی وێش(٤)

خوسووس تۆ وەی رەنگ مەوینوون دڵگیر
چمان دەروونم مەپێکان وە تیر(٥)

(١) سێر: تێر. ساوون: بسووم. پاڵا: کەوش. چێش: کەچی. واتە: بەڵام دیتم سوودی نیە، دووریت زۆری هێناوە بۆم، وتم با برۆم، ئەمە خوایە گەردوون وەك خۆشی‌یەکەی زۆر دەوام ناکا، بەڵکو سزاو مەینەتیشی زۆر درێژە نەکێشێ وە چاوم بە یار بکەوێو تێر تێر کەوشە بێ گەردەکانی بێنم بە چاوەکانما، کەچی دەردی زیادکردمو چاوم بە یار نەکەوت.
(٢) وەشڵە: خۆزگە. ئەو: لە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٣) ئەر سەد: هەرچەند. تۆی دەروون: تۆیی ناو سك. پەرێت: بۆت. واتە: خۆزگە بە دەردو مەینەتەکەی زەمانی دووری، وە رەحمەت لەو گۆڕە تاریکەی فیراق کە ئەوسا تییا ئەژیام، هەرچەند ناوسکم بۆت سووتابوو، وە بووبوو بە قەقنەس، بەس‌نەبووماڵی دڵم بە یادکردنەوەت ئاوەدان بوو.
(٤) بیم: ترس . بەد ئەندیش: رەقیبی نیاز خراپ. مەکێشۆم: رام‌ئەکێشێ. واتە: ئێستە داخو خەفەتو ترسی بەدکار هەریەکە لە لایەکەوە رام‌ئەکێشن بۆ لای خۆیان.
(٥) وەی رەنگ: بە رەنگی. مەوینوون: ئەبینم. چمان: وائەزانم. مەپێکان: ئەپێکن. واتە: بە تایبەتی تۆ بە رەنگی خەفەتبار ئەبینم وائەزانم دڵیان بە تیر پێکاوم. ئەش گونجێ شیعرەکە بەم جۆرە بێ: «چەمان دەروونم... تاد» چونکە لە نووسینی کۆنی کوردی‌دا لە جیاتی جووڵە «حرکە» تیپ «حرف» دانەئەنرا وەك ئێستا، «چمان»و «چەمان» وەك یەك ئەنووسران. بەم پێیە مەعنای شیعرەکە بەم جۆرەی لێ دێتەوە: بە تایبەت هەر کە تۆ بەم

دڵ خــــەریك مـــــەوج گــــێجــاو دەردەن
زوانـــم دایـــم ویـــردش ئـــەی فـــەردەن:[۱]

مـــن نـــە بـــوون ئـــازیز گـــەردەن بـــلووری
کێن رەحــمەت کــەرۆ وەســڵش نــە دووری[۲]

خاس بی ئــەر ســەد جــار شــادی وە بــاد بــیم
دووراو دوور وە دیــن ئــاسانەش شــاد بــیم[۳]

ئـــــیسە هـــــا فـــــەڵەك کـــــەڵەك بـــەستەوە
تـــــۆڕداو دووریش هـــــا وە دەســــــتەوە[۴]

خـــــەفەت وادەتـــــەن، مـــەینەتان ســـا دەی
وەخت بــارانــەن ئــەسرین دەی پــەی کــەی[۵]

---

☞

رەنگە ئەبینم، چاوەکانم دڵم بە تیر بریندار ئەکەن، چونکە ئەو چاو پێ کەوتنە ئەبێ بە هۆی خەمبار بوونی دڵ.

(۱) ویرد: دوعای سەرزمان. مەبەس قسەیەکەکە هەمیشە بووترێتەوە. مە عنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(۲) نەبوون: نەبم. کێن: کێ یە. کەرۆ: بکا. واتە: دڵم گرفتاری شەپۆلی دەلیای دەردەو هەمیشە ویردی سەرزمانم ئەوەیە ئەڵێم: ئازیزە گردەن وەك بلووری بێ گەردەکەم، من نەبێ چ عاشقێکی تر ئەوەندە چارە رەشەکە بە یارگەیشتنەکەی خۆزگە بە دووری بخوازێ لە بەر ئەوەکە هیچ کەڵکێکی لە خۆی دەسگیر نەبووبێ.

(۳) باد: با. بێم: بووم. واتە: باش بوو جاران هەرچەند شادیو خۆشیم درابوو بە با، بەڵام خۆ هیچ نەبێ دووراو دوور دڵم بە دیتنی بەر دەرگاکەی خۆش بوو...

(۴) واتە: کەچی وا ئێستە گەردوونی چەپ گەرد کـەڵەکی بـۆ نـامەوەو تـۆڕداوی دوور خستنەوەی گرتووە بە دەستیەوە. مەبەسی مەولەوی ئەوەیەکە تەوێڵە بەجێ ئەهێڵێ و ئەگەڕێتەوە. کۆکردنەوەی «کەڵەك» کە پێی ئەپەڕنەوە لە ئاو، لەگەڵ «تۆڕ داو» کە هی ماسی گرتنە، تەعبیرێکی ناسکە لەم شوێنەدا چونکە گەلێ جار ماسی گر سواری کەڵەك ئەبێ و ئەچێ بۆ ماسی گرتن.

(۵) پەی کەی: بۆ کەیت هەڵ گرتووە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

ئـــــازیزت ئـــاستەن هـــا وە دمـــاوە
تـــەنە بـــۆ بـــێ گـــیان ســـا شـــۆ وە راوە(١)

## [٣]

## چێشەن پەشێویم(٢)

چـــێشـــــەن پـــــەشێویـــم: مـــاتەمی دڵەن
یـــا کـــزەی ئـــامای نـــامەی بـــولبـــوڵەن(٣)

---

(١) ئاستەن: بەجێ هێشتووە. دما: دوا. تەنە: ئەی لەش. بۆ: بێ. واتە: ئەی خەفەت ئیتر وادەتەو ئەی مەینەت داباریێ بە سەرما، ئەی فرمێسك نۆش سەرەتە خۆت بۆ کەی هەڵگرتووە، وەك باران دارژێ، چونکە ئازیزتان ـکە گیانمە ـلای یار بە جێماوەو لەشم بە تەنیاگەڕاوەتەوە. مەولەوی ئەنجا روو ئەکاتە لەشیو پێی ئەڵێ ئەی لەش تۆش بە بێ گیان بێ بە ڕێوە. لە شیعرەکانی لەمەوپاشیدا رووی قسەی ئەکاتە گیانو لەگەڵ ئەو ئەدوێ.

[٣]

(٢) بولبول شاعرێکی بەرزی هاوچەرخی مەولەوی بووە حەزی لەکچێکی مەولەوی کردووە، بەڵام حەزەکەی دەرنەبڕیوە تا مەولەوی کچەکەی ئەدا بە شوو، جا هاتووە قەسیدەیەکی پڕ لە عاجزیو دوعای شەڕی بۆ مەولەوی نووسیوە، مەولەویش لە وەراما ئەم قەسیدەیەی بۆ ئەنێرێ. وا لێرەدا بەر لەوەی کە لە قەسیدەکەی مەولەوی بکۆڵینەوە قەسیدەکەی بولبول ئەنووسینەوە:

نـــیشانەی نـــاوك نـــیگای نـــازاران
یـــانی ســـەر دەفـــتەر ســـوپای خـەمباران

وەغـــەڵەت مـــەشهوور حـــاڵ زان دەردان
پەی وێت وەرپا کەرد هـەناسەی سـەردان

نـەتیجەی قیاس «قـضیە»ی «قـضا»ی تـۆ
تـــەدبیر چـــەند دڵ پـــێ نـارەزای تـۆ

بـزیسکەی نـاسۆر دەرد جـەستەی مـن
کـــزەی کـــولیای زام تـۆ زار بـەستەی مـن

گـــەردەلوول گـــێج هـــەناسانی ســەرد
دوور نـــیەن بـــوزۆت نـە ســەد گـێج دەرد

فەڵەك وەکوورەی مۆرەی ساختەی دەرد
پەی تـەفرەقەی وەسـڵ بشـانۆ یـەك نـەرد

وزۆت نـــــەگـــــێجـــاو مـــەینەتان خـــەم
رۆی شادی، رووی وەسڵ نەوینی وە چەم

تـا ئـاوخانەی دڵ نـەکـەللەی ســەر بـۆ
ئـــانە شـــیرینەن ئـــەوەڵ چـــەمەر بـــۆ

پـەی گـەرمی کـوورەی مـەیل دەروونت
هـــەناسەی ســەردم ئـاما ئـەو شـۆنت

(٣) چێشەن: چیە. ماتەمی: خەفەتباری. ئاما: هاتن. واتە: هی چیە وا پەشێوم، هەر خۆم خەفەتبارم، یاکزەی هەناسەی ساردی بولبوڵە لە نامەکەیەوە سەری داوە؟

شـــاهید دانـــای گـــردین ئـــەحواڵان
وەســەن پــەی راســی عــەرزەی مــەلاڵان[١]

ئـــێش هـــام فـــەردم، ئـێش وێم زانـان
دەرد هـــــام دەردم، دەرد وێم زانـــان[٢]

بـــەڵام تـــۆ قـــەزاو بـێ تـــەدبیری وێت
کەردەن پێت ئـانا هـەرچـی کـەردەن پـێت[٣]

کـــەی تـــۆ خـــەیاڵێت وە دەروون ئـاوەرد
هانات کەرد ئەو من، من بـێ مـەیلیم کـەرد[٤]

تـــا تـــەئسیرێ بـــۆ پـــەرێ شـــەو نـــاڵەت
یــا پـەی هـەناسەی ســوب دۆعـاو لاڵەت[٥]

گـــۆیـــا جـــە لاوێت دەروونت ئـێشـان
بــەد دۆعـاییت کـەرد تـەسدیعت کـێشـان[٦]

(١) دانا: زانا. گردین: هەموو. وەسەن: بەسە. واتە: ئەو خوایـەی کـە ئـاگـاداری هـەموو شتێکە، بەسە بۆ ئیسپات کردنی راستی ئەم قسانەم کە بە عاجری‌یەوە بۆتی ئەکەم.

(٢) وێم: خۆم. زانان: زانیوە.

(٣) وێت: خۆت. ئانا: ئەوەتە. هەر چێو: هەرچی. واتە: بەڵام تۆ یەکـەم قـەزاو قـەدەری خواو دووهەم بێ سەرو بەربی خۆت ئەوەیان پێ کردی کە پێ‌یان کردی.

(٤) هانات کەرد ئەو من: هاوارت هێنا بـۆ مـن. مـەعنای ئـەم شـیعرەو شـیعری دوایـی پێکەوە دێ.

(٥) پەرێ: بۆ. واتە: کەی تۆ خەیاڵێکی وات بە دڵا هاتو دەسەو دامێنی من بوویتو من بە گوێم نەکردی، تا لاڵانەوەو هاوارو ناڵەی شەوت کـار بکـا لە حـوزووری خـوادا، یـا هەناسە ساردی تەك دوعای بەیانی‌یانت ئەنجامێکی ببێ.

(٦) لاوێت: لای خۆت. ئێشان: ئێشاوە. تەسدیع: زەحمەت. کێشان: کـێشـاوە. مـەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

مــن رۆی مــامەڵەی گــردین خــاس و کــەس
جــەو راســە بــازاڕ شــارەکــەی ئــەلەس[١]

جە سەر دووکـانچەی شـای سـەر تـوجاران
هــــۆر گــــرتم کــاڵای بــەڵای نــازاران[٢]

نـامان نــە گــۆشت مــەر فــەردەکــەی مـن
فەرد وەش مەزموون بێ گـەردەکـەی مـن:[٣]

ئـەر هـەر سـات دەردێ دەردێ و تـەر چـەنی
بــەیۆ مــاچوو ئــاخ پــەی دەردێ هــەنی[٤]

یــەکــێوەن جــە لام شــادیو رەنــجووری
کــــەیفی و بــێ کــەیفی نــزیکی و دووری[٥]

---

(١) رۆی: رۆژی. خاس: بەرامبەری «عام»، مـەبەس پیاوی خـوایـە، هـەروەها وشـەی «کەس»یش بـەم مـەعنایە. ئـەلەس: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ ئـەو رۆژەی کـە خـوا لە عـالەمی ئەرواحدا قسەی لەگەڵ گیانی هەموو کەس کردو موسوڵمان و کافر لە یەك جوێ نەبوونەوە.
(٢) شای سەر توجاران: مەبەس خوایە. هور گرتم: هەڵم گرتووە. واتە: گوایە لای خۆت دڵت ئێشاوەو دوعای شەڕت لێ کردووم، بەڵام لە خۆڕایی زەحمەتت کێشاوە، چونکە من خۆم لەو رۆژەدا کە لە راستە بازاڕی شاری «الست بربّکم»دا هەرکەس خەریکی مامەڵە کردن بوو، چوومە سەر دوکانچەی شای سەر بازرگانان و پارچەی بەڵای نازارانم بۆ خۆم هەڵبژارد، مەبەسی ئەوەیە لە رۆژی ئەزەلدا کە خوا چارەنووسی دیاری کرد ئەو دەردو بەڵای بەرکەوتووەو ئیتر باکی نیە لە دوعای شەڕی کەس.
(٣) مەر: مەگەر، بۆچی. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەیدا دێ.
(٤) چەنی: لە گەڵی. بەیۆ: بێت. ماچوو: ئەڵێم. هەنی: دیسان. واتە: تۆ کە دوعای شەڕم لێ ئەکەی بۆچی شیعرە بێ گەردە خۆش مەعناکەی منت نەبیستووە کە ئەڵێ ئەگەر هەر سەعاتێ دەردێکم توش بێ و دەردێکی تریش بە دوادا بێت، هێشتا تێری پێ نـاخۆم و ئەڵێم خۆزگە دەردێکی تریشم تووش بهاتایە.
(٥) یەکێوەن: یەیەکە. رەنجووری: خـەفەتباری.. مـەعنای ئـەم شیعرەو دوو شـیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

مـەر چـون تـۆ هـەڵوای مـەحەبەت خـامێ
قــەبای عــەشق دڵ پشت نــاتەمامێ(١)

وەشـــی‌و نـــاوەشی تـــەفاوت زانـــۆ
مـــەلێ نـــەزانـــۆ هـــەر پـــەلێ شـانۆ(٢)

مـەیل‌و قـین هـەردوو هـەر جـە شـەخسێوەن
جــەریمەو خــەڵات شـێوەی کــەسێوەن(٣)

لا هــۆر کــەردە جــەو، پــەی ئـێد تـەماشا
بــەو شــاد، پــێد نــاشاد «کَـلّا و حـاشا»(٤)

سـا هـەر دۆعـا کـەر بـا چـەرخ چـەپ گـەرد
تــا تــاقەتش هــەن هــەر بشــانۆ نــەرد(٥)

---

(١) چون: یەکێك وەك. هەڵوا: حەڵوا، شیرینی. خام: کاڵ. قەبا: کەوا.

(٢) زانۆ: بزانێ. مـەلێ: مـەلە. پـەلێ: پـەل. شـانۆ: بـوەشێنـێ. واتـە: شـادی‌و خـەفەت‌و نزیکی‌و دووری لە لای مـن وەك یـەك وان، مـەگـەر یـەکـێکـی وەکـو تـۆ کـە حـەڵوای خۆشەویستی دۆستانی کاڵ بێ‌و پشتەکەوای عەشقی نـا تـەواو بـێ، فـەرقی خـۆشـی‌و ناخۆشی بکا وە لە دەلیای عەشقا مەلە نەزانی‌و هـەر پـەل بـوەشێنـێ، ئـەگـینا عـاشقی راستەقینە فەرقی لا نیە.

(٣) جـەریمە: جـاران کـە ئـاغا کـوردەکـان تـوڕە ئـەبوون لە فـەلاح حـوکمیان ئـەدا کـە ئەندازەیەکی تایبەتی پارەی لێ بسێنرێ، ئەوە پێی ئەوترا جەریمە. کەسێوەن: کەسێکـە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٤) هورکەردە: هەڵ چەرخاندن. ئێد: ئەم. پێد: بەم. واتە: قین‌و خۆشەویستی‌و جەریمە دانان‌و خەڵات کردن هەردووکیان هەر ئیشی خوان، کەواتە من هەرگیز ئەوە ناکەم حەز بـەمیان بکـەم‌و خـۆشـم لەوی تـریان نـەیەت، وە سـەیری ئـەمیان بکـەم‌و مـل لەویـان وەرچەرخێنم.

(٥) کەر: بکە. هەن: هەیە. بشانۆ: بوەشێنێ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ. لە هەندێ نووسخەدا لە جیاتی «نەرد» نووسراوە «دەرد».

مـن وزۆ ئـەو دەرد، ئـەو ئـەو سـەردی مـەیل
ئەو ئـەو قـەبایل، مـن ئـەو کـۆی دوجـەیل(١)

خــوسوسەن، بــوڵبــوڵ جــە لای زامـداران
دووری خـــاستەرەن نــە وەســڵ یــاران(٢)

نـــزیکی یــاگــەی تـەردیدەی فــەسڵەن
دووری رای خــــەیاڵ قــافڵەی وەســڵەن(٣)

پـــەوکە خـــوو گــرتەی بــەڵاو کــۆســەنان
نـــزیکی بـــێزار، دووری دۆســـەنان(٤)

---

(١) وزۆ: بخاتە. ئەو: ناو. قەبایل: هـۆزەکـان. ئیشارەتە بـۆ ئـەوەکـە لەیـلا کـەوتبوە نـاو عەشیرەتەکانو مەجنوون وێڵی هەردەی دوجەیل بووبوو. واتە: کەواتە تا پێت ئەکرێ هەر دۆعا بکە با چەرخی چەپگەرد تا پێی ئەکرێ هەر زاری چارەڕەشی هەڵدا بۆ من، من تووشی دەردو بەڵا بکاو مەیلی ئەو سارد بکاتەوەو، من وێڵی هەردەی دوجەیل بکا وەك مەجنوونو ئەو بخاتە ناو هۆزەکان وەك لەیل.

(٢) خوسوسەن: بەتایبەتی. زامداران: بریندارانـی دەردی خـۆشـەویستی. مـەعنای ئـەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) یاگە: جێگا. تـەریدە: «طـریدە»، دەربـەدەر کـراو. فـەسڵ: جیایی. را: رێگـا. قـافڵە: کاروان. واتە: من ترسی دۆعای شەڕم نیە بە تایبەتی لەبـەر ئـەوەکـە بـرینداران‌ی زامـی خۆشەویستی دووری‌یان لا باشترە لە گەیشتن بە یار، چونکە نزیکی جێگـەی جـەردەو دەربەدەر بووانی جیایی‌و دوور کەوتنەوەیە، بەڵام دووری رێگای تێپەڕ بوونی کاروانی بە یار گەیشتنە. مەبەسی ئەوەیەکە بە یار گـەیشتن تـووی دوور کـەوتنەوەی لەگـەڵ خـۆی هەڵگرتووە لە بەر ئەوە ناخۆشە، بەڵام دووری پاڵ بە ئیسانەوە ئەنێ بۆ بیر کردنەوە لە بە یار گەیشتن، وە بۆ ئەوەکە بگا بە یار. بەم پێ‌یە دۆعا شەڕەکەی بولبول ئەبێ بە مایە خێر بۆ مەولەوی.

(٤) پەوکە: بۆیە. کـۆسـەنان: کـۆسـم، کـەوس کـەوتنم. مـەعنای ئـەم شـیعرەو شـیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

نــــەکـــۆی نـــزیکی شـــادی وە بــادم
نـــە دەورەی دووری وە یـــادش شــادم(١)

[٤]

## چەرخ هەر ئەو چەرخەن

چەرخ هەر ئەو چـەرخـەن تـا ئـاوەردو بـەرد
دەس ئـەو دەس نگـین تـا خـاتەم ئـاوەرد(٢)

(١) کۆ: خەرمان. دەورە: سەردەم. واتە: بۆیە خـووم گـرتووە بـە بـەڵاو کـۆس کـەتنەوەو بێزارم لە نزیکی‌و حەزم لە دووریی‌یە، چونکە لە سەر خەرمانی نزیکی‌دا شادیم بەر بادە، وە لە سەر دەمی دووری‌دا شادم بە یادکردنەوەی دۆست.

* * *

کە وەرامەکەی مەولەوی ئەگاتە دەستی «بولبول»، ئەم پارچە شیعرەی‌تری بۆ ئەنێرێ:

سەرشار سـەرخـۆش مـەیخانەی «الست» وە نـەشئەی مینای دەس سـاقی مـەست
پـا بـەستە بـە قـەید سـەیادی مـەعنی فـارغ نـە سـوورەت فـیرقەی «لایـعنی»
سـینە خـەزانـەی نـازك خـەیاڵان نـازکتەر جـە نـاز نـازك نـەوهاڵان
شـێویـای شـانای شـیرین ئـەتواران شـەریك تـاڵی‌و شـادی خـەمباران
راسـتەن نـەتیجەی قـیاست سـەختەن مـودەعات ئـیلزام خـەسم بـەدبەختەن
بـەڵام دەعـوای بـەخت جـە دەلالاتـەن قـیاست مـەجموع مـوغالەتاتەن
یـەکسـەر عـەمیقەن قـەزایای تـەحریر غـەیر جـە وسیلەی دەلیـل تـەقدیر
خـۆ مـن ئـەزانـم ئـەدەب تـەقسیرەن واتـەی بـەدکاران جـە لات دڵگـیرەن
بـدیە بـێ‌مـەیلیت وە جـایێ یـاوان بـە واتـەی بـەدان مـەگـیریم تـاوان
سـەد نـەوبەت یـاوان قـرینەی حـاڵی ئـیحتیاج چـیش بـێ هـانای مـەقاڵی
ئاخ جـە حـاڵ زانـیت خـەیلێ ئیشکاڵەن حـاڵ نـەزانـات مـونافی حـاڵەن
پـەی تـەتمەی رەد مـەولام کـافی‌یەن بێ باکیت جـە رووی بێ ئینسافی‌یەن
ئەر بێ وەفـایی، وەر بێ مـەیلیت کـەرد جـە بـەدبەختی مـن هـەرچی بی وبەرد
ئەما حەیف «بوڵبوڵ» جە وێت هەراس کەرد پەی تەنیا گوڵێ وێت کـەس نـەناس کـەرد

[٤]

(٢) چەرخ: گەردوون. نگین: مۆرخانەی ئەمووستیلە، مەبەس شان‌و شکۆی پێغەمبەریەتی‌یە.

دا بـــەزم خـــــوسرەو شــــیرین وە هـــەمدا
جام دا وە سەر جەم، جەم وە سـەر جـەمدا[(١)]

شــۆرەت نــامەی نـام حـاتەمش کـەرد تـەی
کەرد وەکـاسەکـەل کـاسەی کـەلەی کـەی[(٢)]

ســـاقی، گـــەرد ئــارد یــاران هــام فــەرد
مــدۆم نــە دەمــاخ ئـاسیای چـەپ گـەرد[(٣)]

---

☞

خاتەم: ئەمووستیلە، مەبەس حەزرەتی محمدەکە خاتەمی پێغەمبەرانە. واتـە: گـەردوون هەر ئەو گەردوونەیەکە بە چەند جۆر وەزعی هێنایە پێشەوە وە نگینی پێغەمبەریەتی دەس بـە دەس لە لەنـاو پـێغـەمبەرانـا گـێڕا تـا گـەیاندیە سـەر حـەزرەتی مـحمد کـە ئـاخری پێغەمبەرەکانە. مەولەوی لەم شیعرەدا تەعبیرێکی ناسکی بەکار هێناوەکە لە دوای «نگین» کە مۆرخانەی ئەمووستیلەیە «خاتەم»ی هێناوەکە بە ئەمووستیلە ئەڵێن، واتە: وەك چۆن پاش مۆرخانەی ئەمووستیلە ئەمووستیلەکە دێت، پاش پێغەمبەرانیش حەزرەتی مـحمد هات. کۆکردنەوەی «نگین»و «ئەمووستیلە» بە پێی عیلمی بەدیع هونەری «طباق»ی تیایە.

(١) دا: دای. وە هەمدا: بـە یـەکـدا. جـام: ئـاوێنـەکـەی جـەمشیدی شـای ئـێران کـە وا مەشهوورە بە شوێنێکی بەرزەوە دای ئەناو لەشکری دوژمنی لە دوورەوە تیا ئەری. جەم مەبەس لە جەمی یەکەمو دووهەم جەمشیدی شای ئێران، وە مەبەس لە جەمی سێهەم جەمعە بە مەعنا کۆمەڵانی خەڵك. واتە: بەزمی خەسرەوو شیرینیدا بە یەکداو جامی دا بە سەر جەمشیداو کوشتیو جەمشیدی هێنا بە سەر خەڵکاو کردی بە بەڵای گیانیان، یـان کۆمەڵە خەڵکێکی دا بە سەر کۆمەڵێکی تراو بە یەکتری فەوتاندنی. مەبەسی ئەوەکە بەزمو رەزمی هەزار خەسرەوو شیرینو تەختو بەختی هەزار جەمشیدی تێك داوە.

(٢) شۆرەت: شهرت، ناوبانگ. نام: ناو. تەی: پێچانەوە. کەی: کەیخەسرەو، یەکێکـە لە پادشا کۆنەکانی ئێران. واتـە: نـاوبانگی حـاتەمی پـێچاوەتەوەکـاسەی کـەللەی سـەری کەیخەسرەوی کرد بە کاسەی کەل. لەکۆ کردنەوەی «حاتەم»و «تەی»دا بە پـێی عـیلمی بەدیع هونەری «تۆریە» پەیدا بووە، چونکە مەبەس لە «تەی» هۆزەکـەی «حـاتەم» نـیە، بەڵکو پێچانەوەیە.

(٣) گەرد: تۆز. مدۆم: ئەدا. ئاسیا: ئاش. ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

سـەدای ئـاسیاوچی مـەیۆ پـەیاپەی
ئـاساو خـاڵی یـەن نـەوبەتەن سـا دەی(١)

هـەرکـاتێت زانـا چـەرخـێ وەردەوە
چـون یـاران دانـەی ئێمـەیچ هـەڕدەوە(٢)

نـە هـەر سـەردەشتێ کشـتێ کـریابۆ
وە جـۆی چـەمەی چـەم ئـاو نـەدریابۆ(٣)

نـەیاوابـۆ خـاس دانـەش بـەو ئـاوە
لایـق نـین بـەردێش بـەو ئـاسیاوە(٤)

فـیدات بـوون ئـامان سـا هـۆرکـەر بـا بـەی
وە سەرکشتمدا پەی‌پەی جەو جـۆی مـەی(٥)

---

(١) ئاسیاوچی: ئاشەوان. مەیۆ: دێت. ئاساو: ئاش.
(٢) وەردەوە: سووڕایەوە. دانە: دەنك. باراش. هەڕدەوە: هاڕییەوە. واتـە: ئـەی سـاقی ئاشی گەردوون بۆنی ئاردی لاشەی هاڕاوی هاوڕێیان ئەدا بە لووتما، بە سـەرەمڕیش ئاشەوان دەنگی دێ ئەڵێ ئاش خاڵییەو سەرەتانە فەرموون ئەی خاوەن باراشەکان، جا هەر ئەوەندەت زانی ئێمەیش سووڕێکمان خواردو ئاشەکە دانەوێڵەی ئێمەیشی هاڕی. مەبەس لەم شیعرانەدا لە «ساقی» خوای گەورە، وە لە «تۆزی ئارد» خۆڵی لاشەی رزیو، وە لە «ئاش» گەردوون، وە لە «ئاشەوان» فریشتەی گیان کێشان، وە لە «دانە» لەشە. واتە: هاوڕێیان هەموو مردنو سەرەی ئێمەیش هاتووە.
(٣) کشتێ: زەرعاتێك. کریابۆ: کرابێ. جۆ: جۆگە. چەمە: سەر چاوگە. چەم: چاو. نەدار بۆ: نەدار بێ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٤) نەیاوابۆ: نەگەیشتبێ. بەردێش: بیبەن. بەو: بۆ ئەو. واتە: هەر کشتو کاڵێك لە هەر دەشتێکا کرابێ، مادەم بە فرمێسکی لە ترسی خوا داڕژاو ئاو نەدرابێ، وە دەنکەکانی بەو ئاوە پێ‌نەگەیشتبێ، لایقی ئەوە نیە بیبەنە ئەو ئاشە. لەم دوو شیعرەدا مەبەس لە «دەشت» لاشەی ئادەمیزاد، وە لە «کشت» کردەوە، وە لە «جۆگا» سەرچاوەی خوا پەرستی‌یە. واتە: تەنها کردەوەی چاك شایانی ئەوەیە ببرێت بۆ ئەو دنیا.
(٥) بوون: بـم. هـورکەر: هـەڵکـە. بـابەی: بـابێت. مـەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شـیعری دوایی پێکەوە دێ.

ئـــەر ســـەد کشـــتەکـــەم ئـــاخر کـــارشەن
هـــــەفتەکـــەی ئـــاخر نـــەو وەهـــارشەن(١)

بـــــەڵام بـــــەڵ تـــەڵ تـــەڵ کـــەشێو کـــەرۆ
جـــــــەی ئـــــاخرەوە دانـــــاویٚ وەرۆ(٢)

حـــەیفەن تـــۆ مـــیراو ســـەرجـۆی بـادە بـی
وە هـــەر کـــەس بـــە قـەد کـەفاف دادە بـی(٣)

مـــــن کشـــــتم رووزەرد هـــام فـــەردانش بـــۆ
دانـــــەم روو ســـیای هـــام دەردانش بـــۆ(٤)

(١) ئەر سەد: هەرچەند. ئاخر کارشەن: دوایی‌یەتی. نەو بەهار: بەهاری نویٚ. کە لە ئاخرو ئوخری بەهارا باران ئەباریٚو گیای وشك بوو سەوز ئەکاتەوە، ئەڵێن بەهار نویٚ بووەتەوە.
(٢) کەسێوە: کەشێك. کەش کێشمانو هەڵچوونە. کەرۆ: بکا. داناو: دانە ئاو، یەك باران کە بدا لە دەغڵو بی‌بووژێنێتەوە. وەرۆ: بخوا. واتە: دەسم دامێنت بە قوربان ئەو جۆگەی شەرابە هەڵکە با پەی دەر پەی بێت بە سەر کشتو کاڵی مندا، تا هەر چەند تاخرو ئۆخریەتیو دوا هەفتەی بەهاری نویٚیەتی، لقەکانی هەڵچنو لەم دوا دوایی‌یەدا ئاویٚ بخۆنەوە. مەبەسی ئەوەیە هەرچەند عومرم گەیشتووەتە ئاخی، وە تا ئێستا ئیشێکی باشم نەبووە، با بە بێ کردەوەیەکی چاك نەمرم، تەوفیقم بدەو کارێك بکە چاکەیەك بکەوێتە ریزی کردەوەکانمەوە.
(٣) میراو: ئەوەی سەرپەرشتی ئاوی جۆگەکان ئەکاو دابەشی ئەکا بە سەر زەرعات کەرانا. بادە: مەی. کەفاف: ئەوەندەی بەش بکا. دادە بی: دابێت. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دیٚ.
(٤) واتە: حەیفە تۆ میراوی جۆگەی مەی بیو بە هەرکەست بەشی حاڵی خۆی دابیٚ، کەچی من بێبەش بکەیت، منیش دەغڵەکەم وشك ببیٚو ببیٚ بە پووش، وە دانەوێڵەی سەر خەرمانەکەم رەش بێتەوە. مەبەسی ئەوەیە حەیفە تۆ هەموو شتت بە دەس بیٚو، کەچی منیش بە هۆی بەدکرداریمەوە روو زەردی لای هاوڕیٚیانو روو رەشی حوزووری تۆ ببم، مەولەوی بە هێنانەوەی وشەی «ڕوو زەرد»و «ڕوو سیا» بەرامبەر «کشت»و «دانە» ئیشارەتی بۆ ئەوەکردووەکە دەغڵ ئەگەر بارانی نەبوو، ساقەکەی زەرد ئەبیٚو گوڵەکەی رەش ئەبێتەوەو دەنکەکانی ئەبن بەکوێروو.

[٥]

## چون چیهرەی خەیال(١)

چون چیهرەی خـەیاڵ روخسـارەکـەی وێش
نـە تـۆی پـەردەی دڵ مـەعدومی دڵ رێش(٢)

نـــمانا جـــەمین شـــای ســۆســـەن خـــاڵان
کـــەمکەم جـــە گـــۆشـــەی لای ســیاماڵان(٣)

زەمـــــین مـــــنەتبار پـــا مـــنیاو مـــەویەرد
جارجار وە رووی نـاز بـاوەشێن مـەکـەرد(٤)

بـاوەشێن مـەکـەرد ئـەو سـەفحەی بـێ گـەرد
نـازکیش جـــە بـــاد ئـیحتیات مـــەکـەرد(٥)

---

[٥]

(١) مەولەوی بەم قەسیدەیە تەعریفی نازارێکی جاف ئەکا کە لەودیوی دەوارەوە خۆی دەرخستووە.

(٢) چیهرە: روو. نە تۆی: لە ناو. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) نمانا: دەری خست. جەمین: جەبین، ناو چاو. سۆسەن: گوڵێکی پەمەیی تۆخە لەکوێستانەکانا ئەڕوێ. سایواڵ: دەوار. واتە: شای سۆسەن خاڵەکان وردە وردە لە پشتی دەوارەوە خۆی پیشان دا، وە لە دیمەنی روخساری خۆی ئەچوو لە دڵی کون کون بووی مەعدوومی دا. مەولەوی وای داناوەکە ئەو نازارە ئەوەندە شۆخ و جوانە هیچ شتێك نیە بۆ ئەوە دەس بدا پێی بشوبهێنرێ جگە لە وێنـەی خـۆی لە دڵی ئـەمدا. لەم دوو شـیعرەدا تەشبیهی «محسوس» کراوە بە «معقول» واتە وێنەی راستەقینەی یار لە پەنا دەوارا تەشبیە کراوە بە وێنە خەیاڵییەکەی لە دڵی مەولەویدا، وە ئەو دەوارە رەشەی کە یار خۆی لەو دیویەوە دەرخستووە، تەشبیەکراوە بە دڵی برینداری رەش بووەوەی مەولەوی. بە پێی ئەم تەشبیهە ئەبێ وێنەی خەیاڵییەکەی ئەو نازارە لە دڵی مەولەویدا، جوانتر بێ لە وێنەی راستەقینەی خۆی، وە ئەبێ دڵی مەولەوی لە دەوار زیاتر رەش بـوویێتـەوە. ئـەم جـۆرە تەشبیهە لای ئەدیبەکان تەشبیهێکی زۆر جوان و پەسەندە.

(٤) منیا: دای ئەنا. مەویەرد: تێئەپەڕی. مەکەرد: ئەی کرد. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایییەوە.

(٥) نازکیش: ناسکیی. باد: با. واتە: منەتی ئەنایە سەر زەوی و پێی پیا ئەناو تێئـەپەڕی،

نــە تــۆی تــاریکی تــای شــەدەی بــێ گــەرد
لەتافەت چون ئاو حــەیات مــەوج مــەوەرد(۱)

غـــەریب بـــیم چـــەنیم کـــەرەم نـــمانا:
وە ســـــەوقات پـــەرێم خـــەدەنگێ شـــانا(۲)

ئـەر سـەد چـون یـاران گـیان تـەسلیم کـەردم
خاس بـی پـەی یـادگار خـەدەنگێ بـەردم(۳)

[۶]

## چەمان هەم قامەت

چـــەمان هـــەم قـــامەت کـــەیفم، خـــەمبارەن
زەردی نـــــە رووی دڵ زەوقـــم دیـــارەن(۴)

---

☞

جار جارێکیش لە رووی نازەوە روخساری بێ گەردی خۆی باوەشین ئەکرد، روخساری ئەوەندە ناسك بوو ناسکی‌یەکەی ئەترسا لە شنەی بای باوەشێنەکە زیانی پێ بگەیەنێ.

(۱) تا: تاڵ. لەتافەت: ناسکی. مەوج مەوەرد: شەپۆلی ئەدا. واتە: لە ناو تاڵە رەشەکانی پووشینە بێ گەردەکەیەوە ناسکی شەپۆلی ئەدا وەك چۆن ئاوی حەیات لە تاریکایی‌یەکەی‌دا شەپۆل ئەدا. لەم شیعرەدا مەولەوی تـەشبیهی نـاسکیی کـردووە بـە ئـاوی حـەیات، وە تەشبیهی تاڵە رەشەکانی سەرو پووشینی یاری کردووە بەو تاریکایی‌یەی کە ئەڵێن ئاوی حەیاتی تیایە.

(۲) بیم: بووم. چەنیم: لەگەڵم. نمانا: پیشانی دا. سەوقات: دیاری. پەرێم بۆم. شانا: وەشاندی. واتە: غەریب بووم پیاوەتی لەگەڵ کردم، تیرێکی بە دیاری بۆ وەشاندم.

(۳) واتە: هەرچەند منیش وەکوو یاران گیانم تەسلیم کردو کوژرام، بەڵام هەر باش بوو تیرێکم لەگەڵ خۆم برد بۆ یادگار.

[۶]

(۴) چەمان: چەمیوەتەوە. رێ‌یشی تێ ئەچێ «چمان» بێ بە مەعنای «ئەڵێی، کأنه». واتە: باڵای کەیف و شادیم لە خەفەتدا چەمیوەتەوە، یان: ئەڵێی باڵای کەیفم خەفەتبارە، وە زەردی بە سەر روخساری دڵی زەوقمەوە دیارە.

تەوق خەم گەردەن شەوقەکەم بەستەن
کەف پای شادیم خار تێ شکەستەن[١]

ساقی، سا دەخیل جام مەی وەکەف
دەروێش، ئامانەن کەفێ نە رووی دەف[٢]

خۆ نەوی فرسەت جارێ نەجاران
هەر پۆس وە مشت بیم پەی دین یاران[٣]

چەپگەرد جە خاتر وێش هەرگیز نەویەرد
کەی بی جامێمان پڕ جە بادە کەرد[٤]

ئێمە با ساتێ بە زمێمان جەم بۆ
لادێ هەر خاسەن ئەر سەد کە کەم بۆ[٥]

من نالە، تۆ دەف، ئەو سافی یا دورد
هەنی فەرد دەرد مەینەت گەردەن ورد[٦]

---

(١) کەف: لەپ. خار: دڕك. واتە: تەوقی خەمو خەفەت چووەتە ئەستۆی شەوقم، لەپی پێی خۆشیشم دڕکی تیا شکاوەتەوە.
(٢) کەف: لەم شیعرەدا مەبەس لێی لەپی دەستە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٣) نەوی: نەبوو. پۆس وە مشت: ئەوەی دەسکێشی چەرمی لە دەستایە، بەو ڕەنجبەرانە ئەڵێن کە دەسکێشی چەرم لە دەس ئەکەنو دڕك ئەدوورنەوە. دین: چاو پێ کەوتن. واتە: دەخیلتم ئەی ساقی کە پیاڵەی مەی ئەگێڕی، پیاڵەیەکمان بدەرێ، تۆیش ئەی دەروێش دەسێ بدە لە دەفەکەتو هەندێکمان بۆ لێدە، خۆ جارێکیان هەلمان بۆ هەڵنەکەوتو هەمیشە هەر لە ڕەنج کێشانا بووین بۆ چاو پێ کەوتنی یار.
(٤) خاتر: خەیاڵ. نەویەرد: لای نەدا. واتە: فەلەك هەرگیز لە خەیاڵی خۆی لای نەدا، وە جارێك نەبوو کە پیاڵەیەکمان بۆ پڕ بکا لە مەی.
(٥) واتە: با ئێمەیش تاوێك کۆ ببینەوەو کۆڕمان گەرم کەین، ئەو تاوە هەرچەند کەمیش بێ باشترە لە هیچ.
(٦) سافی: شەرابی بێ گەرد. دورد: خەڵتە. هەنی: ئیتر. واتە: من ئەناڵێنمو تۆ دەف لێدەو

[٧]

## چێش واچۆ مەعدووم(١)

چێش واچۆ مەعدووم خەستەی مەهجووریت(٢)
حـــاڵ دیـــدەو دڵ جـــە دەرد دووریت

بـــدیە بـــەو دەجـــلەی بـــێ کـەنارەدا
رەوانـــەن وە بـــەین بـــەغدا شـارەدا(٣)

ســەیر کــەر ئــەو گــەرماو شــەرارەی تـاوە
هــــوەیدان هـــامن جـــەلای بـــەغداوە(٤)

ئـــەو ئـــاخر وشکـــاو ئـــەسرین دیـــدەم
ئـــێد دمـــا نـــەفەس دڵەی خـــەم دیـــدەم(٥)

جـــەو گـــەرماو جـــەو ئـــاو بـەرگوزیدەکـەم
تـــەفتیش کــەر حـــاڵات دڵەو دیـدەکـەم(٦)

---

☞

ساقی‌یش شەرابی بێ‌گەرد یا خڵتەی بنی پیاڵەی دۆستانمان بە سەرا بگێڕێ، شیعری دەردو مەینەتیش ملی بشکێ‌و گۆڕی گوم بێ. مەولەوی لەم شیعرەدا دەوری خۆی‌و ساقی‌و دەروێشی دیاری کردووە لە ئاهەنگەکەدا.

[٧]

(١) مەولەوی لە ١٢٩٢ی ھ ئەم پارچە ھەڵبەستەی نووسیوە بۆ مەحموود پاشای جاف کە ئەو کاتە ماڵی لە بەغدا بووە لە وەرامی نامەیەکیا کە بۆ ھەواڵ پرسینی مەولەوی‌ی ناردبوو.

(٢) چێش واچۆ: بڵێ چی. واتە: منی گرفتاری دەردی دووریت، بڵێم چی‌و چۆنت بۆ باس بکەم کە دیدەو دڵم لە ناو دەردی فیراقت چی‌یان لێ ھاتووە.

(٣) بدیە: بڕوانە. بێ کەنار: بێ قەراخ، مەبەس گەورەیی دەجلەو زووری ئاویەتی. رەوانەن: بە سافی ئەڕوا. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٤) ھوەیدا: ئاشکرا. ھامن: ھاوین. (٥) نەفەس: ھەناسە. دیدە: دیتوو.

(٦) بەرگوزیدە: ھەڵبژاردە. واتە: سەیرێکی ئەو دەجلە پانو پۆڕە بکەکە بە ناوەڕاستی ☜

[٨]

## چەم پەی فەرش پات

چەم پەی فەرش پات مـوژەش چـون خـارەن
بـەڵام چـێش کـەرۆ چـارش نـاچارەن(١)

چـەنی تـاوۆ تـەرك پـا بـۆست کـەردەن
سـەوگەندش وە زوڵف سیای تـۆ وەردەن(٢)

........ ● ........

[٩]

## چون شەماڵەی نور

چـون شـەماڵەی نـوور گـڕ گـڕانـمە
پـەی پـاس مـاران زەنگ زڕانـمە(٣)

---

☞

بەغدادا تێ ئەپەڕێ، وە سەرنجێ بدەرە تینی گەرمای هـاوینی بـەغدا، ئـەویان دواتکـی فرمێسکی چاوەکانمەو ئیتر وشکاویان هاتووە، ئەمیشیان دوا هەناسەی دڵە خەفەتبارەکەمە. جا بەو گەرمای بەغداو ئاوی دەجلەدا بزانە حاڵی دڵو چـاوم چـۆنـەو لێی ورد بـبەرەوە تێ ئەگەی لە چی‌یام.

[٨]

(١) چێش کەرۆ: چی بکا. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٢) چەنی تاوۆ: چۆن ئەتوانێ. سەوگەند: سوێن. واتە: هـەرچـەند چـاوەکـانم بـۆ ئـەوە ناشێن لە بەر پێتا بکەون چونکە برژانگەکانم وەك درك وانو قاچت بریندار ئەکەن، بەڵام چاریان ناچارە چونکە سویندیان بە زوڵفی رەشی تۆ خواردووەکە ئەبێ قاچت ماچ کەن لەبەر ئەوەکە زوڵفەکـانت ئـەوەندە درێژن گـەیشتوونەتە قـاچت، وە نـاتوانـن دەس لەو سوێنەیان هەڵگرن.

[٩]

(٣) شەماڵەی نوور: کرمێکە هاوینانە دەرئەکەوێ‌و بە شەوان لە دوورەوە تیشك ئەداتەوە، پێ‌یشی ئەڵێن «گۆ ئەستێرە» گڕگـڕان: گـەڕانو درەوشـانەوە. زەنگ زڕان: زەنگ لێ‌دان.
☜

[۱]

## خورشید سەمای

خـــــورشید ســــەمای شـــیرین جــەماڵان
ڕەشك ئـــەفزای گـــرۆی دیـــدە غـــەزاڵان(۱)

دانـــەی شـــەو چـــراغ خـــەزانـــەی هـــەستی
مـــەزەی نـــەشئەی عـــەشق بـــادە پـــەرەستی(۲)

دەرگـــــای مـــەدینەی حـــوسن مـــەحبووبی
نوور ئەفزای دیـدەی جـەرگەی یـەعقووبی(۳)

---

(۱) خورشید: خۆر. سەما، «سماء»، ئاسمان. ڕەشك ئـەفزای: داخو خـەفەت زیـادکەر. گرۆ: گرۆە، کۆمەڵ. واتە: ئەی بریسکەدار وەك ڕۆژ بە ئاسمانی جوانانەوە، ئەی زایدکەری خـەمو خـەفەتی ئـەو جـوانخـاسانەی کـە چـاویان وەک چـاوی ئـاسك وایـە. هـۆی وەسفـکردنی ئەو خۆشەویستە بە زیادکەری داخو خەفەتی جـوانـان لەبـەر ئـەوەیەکـە ئەوەندە جوانە، هەرچەند ئەوان سەیری ئەکەن بەخیلی پێ ئەبەنو داخی دڵیان زیاد ئەبێ.

(۲) دانە: گەوهەر. شەو چراغ: شەو وەک چرا ئەدرەوشێتەوە. هەستی: بوون، گیتی. واتە: ئەی گەوهەری شەو درەوشاوە لە گەنجینەی گیتیدا، ئەی ئەوەی کە بۆ دڵداری وەك مەزە وای بۆ مەی خۆر. مەبەسی ئەوەیە وەك چۆن مەی خواردنەوە بێمـەزە نـابێ، جیهانی خۆشەویستیش ئەمی تیا نەبێ بە هیچ دانانرێ.

(۳) مەدینە: شار. نوور ئەفزا: ڕووناکی زیـاد کـەر. جـەرگە: کـۆڕ، کـۆمـەڵ. یـەعقووبی: ئەوانەی موشتاقی چاو پێ کەوتنی یارن، وەك چۆن حەزرەتی یەعقووب موشتاقی چـاو پێ کەوتنی یوسفی کوڕی بوو. واتە: ئەی دەرگای شاری خۆشەویست بوو لە بەر جوانی، ئەی زیاد کەری ڕووناکی چاوی ئەوانەی چاوەڕوانی یـار ئـەکـەن. مـەولەوی تـەشبیهی یەکەمی ئەم شیعرەی لەو حەدیسە وەرگرتووەکە پێغەمبەر فەرموویەتی:
«أنا مَدِینَةُ العِلْمِ وَ عَلِيٌّ بابُها». واتە: من دەرگای شاری زانستم، وە عەلی دەرگاکەیەتی. وە تـەشبیهی دووهـەمیشی لە مـەسەلەکـەی حـەزرەتی یـوسف وەرگـرتووەکـە لە قـورئانا ئەفەرموویت: یەعقووب بە هۆی گوم بوونی یوسفی کوڕیەوەکوێر بووبوو، بەڵام هەر کە یوسف کراسەکەی خۆی لە میسرەوە بۆ نارد هێنای بە چاویاو چاوی ڕۆشن بووەوە.

خــــودا وه تـــۆش دان بـــاڵای عــەرعەری
هــــەر لایــق وه تــۆن شـێوەی دڵبــەری(١)

کـــاڵای شـــیرینی وه بـــاڵات بـڕیـــان
تـــاس مــەحبووبیت نــە عــاڵەم زڕیــان(٢)

نـــیگای خــــوماریت خـــەمبارم کـــەردەن
ژار مـــــــار دەرد وه دڵدا بـــــــەردەن(٣)

بــــە وێنـــەی نـــەچیر زامـــان ئـــاوەردەم
نـــێش گــــولوولەی خـــەمباری وەردەم(٤)

پــەلەپەل پــەی گــیان نــە دەس تـۆ بـەردەن
پـــــەنام وه پــــەنای فـــیراقت کـــەردەن(٥)

ئـــیسه بــێ ئـــامان خــەستەی هــیجرانــم
ســەر کــەردەن هـــووناو نــە تـۆی زامـانم(٦)

نـــــە ســـــەبرم چـــەنی دووریت مــەسازۆ
نــــە وەســــڵت وه مــــەیل دڵم نـــەوازۆ(٧)

---

(١) وه تۆش دان: به تۆی داوه. عەرعەری: وەك عەرعەر که دارێکی بەرزه وەك چنار.
(٢) بریان: براوه. تاس: تەپڵ. زڕیان: زڕیاوه. واته: کاڵای جوان چاکی بڕاوه بـه بـاڵاتو ناوبانگی خۆشەویستیت له جیهانا دەنگی داوەتەوه.
(٣) نیگا: روانین. خوماری: مەستانه. بەردەن: بردووه.
(٤) گولوولە: گـولله. واتـه: وەك نـەچیری راو بـریندار بـوومو ئـازاری گـوللەی خـەفەتم چەشتووه.
(٥) بەردەن: رزگار کردن. واته: بۆ ئەوەی به تیری چاوت گرفتار نەبمو گیانم رزگار کەم له دەستت، به هەڵه داوان پەنام برده بەر دوور کەوتنەوه لێت.
(٦) واته: کەچی ئێستا تووشی دەردی بێ ئەمانی دووریت بوومو خوێناو له زامەکانمەوه لێشاوی کردووه.
(٧) چەنی: لەگەڵ. مەسازۆ: ئەسازێنـێ. نـەوازۆ: ئـەلاوێنـێتـەوه. واتـه: نـەسەبری مـنو دووری تۆ پێکەوه ئەگونجێن، وه نه وەسڵیشت به خۆشەویستی یەوه دڵ نەواییم ئەکا.

نــــە یــــارای خــــەیاڵ وەســـاڵ تــۆمــەن
نـــــە تــــاب دووریِ خــــەیاڵ تــۆمــەن[١]

دڵ مــــەندەن نـــە بـــەین خـــۆف‌و رجـــادا
مــــەزانـــــۆ راش کــــام یـــاوۆ ئـــەو لادا[٢]

مــــەرتۆ وەکــــەرەم تـــــەشریف بـــاوەری
یــــا وە لای وەســـڵـت رابـــەریش کـــەری[٣]

وەر نــــە، ئــــازیزم، قــــەسەم وە نـــامەت
ســــەرگەردان مــــەبۆ تـــا رۆی قـــیامەت[٤]

---

(١) یارا: ماوەی فرسەت. تاب: توانا. واتە: نە فرسەتم هەیە بیر لە وەسڵت بکەمەوە، وە نە توانای ئەوەم هەیە دوور بم لە خەیاڵ کردنەوە لێت.

(٢) مەندە: ماوەتەوە. مەزانۆ: نازانێ. یاوۆ: ئەگات. واتە: دڵم ماتڵ ماوە لە نێوانی ترسی نەگەیشتن بە تۆو هیوای گەیشتن‌دا، وە نازانێ ڕێگای ئەچێتە سەرکامیان.

(٣) باوەری: بێنیت. واتە: مەگەر یا تۆ بە پیاوەتی خۆت تەشریف بێنی بۆ لام، یا ڕێگای پیشان‌دەی کە لەکوێوە ئەگاتە گەیشتن بە تۆ.

(٤) نامەت: نامت، ناوت. واتە: ئەگینا گیانەکەم قەسەم بە ناوت، دڵم تا ڕۆژی قیامەت بە سەرگەردانی ئەمێنێتەوە. ئەش گونجێ «نامەت» نەبێ «نامت» بێ، وە «قیامەت» نـەبێ «قیامت» بێ بە مەعنای «ڕاست بوونەوەت». بەم پێیە مەعنای شیعرەکە بەم جۆرە ئەبێ: ئەگینا ئازیزم قەسەم بە ناوت، دڵم تا ئەو ڕۆژەی تۆ هـەڵئـەسیتەوە بـێی بـۆ لای، هـەر سەرگەردان ئەبێ.

[۲]

## خامەی سەراوێز(۱)

خـــامەی ســـــەراوێز نـــە چـــای ســـیایی
مـــەڕێزۆ ئـــەسرین شـــەکـــوای جـــیایی(۲)

نـــامەی ســـەد شکـــەنج وە هـــەم پـــێچ وەردەن
چون من سەر تـا پـاش شکسـتەی دەردەن(۳)

دەوات دووی ســـــیاش جـــە دەم مـــەخێزۆ
نـــــامە ســــیا خـــاك وە ســـەر مـــەڕێزۆ(۴)

دەوات دووی دەروون گـــــێج دان وە هـــەمدا
لیـــقە وێش کـــێشـــان وە لیـــتەی خـــەمدا(۵)

---

[۲]

(۱) مەولەوی ئەم غەزەلەی بۆ برادەرێکی نووسیوە، گلەیی تیا ئەکا لە چەرخی رۆزگار بە بۆنەی ئەوەوەکە ماڵەکەی ئاگری تێچووەوەکتێبو هەڵبەستەکانی سووتاون.

(۲) خامە: قەڵەم. سەراوێز: سەرەوخوار. چا: چاڵ. مەڕێزۆ: ئەڕێژێ. واتە: قەڵەکـەم کـە سەرەوخوار بووەتەوەو کەتوتووەتە ناو چاڵی رەشـی شـووشەی مـەرەکـەب، لە داخـی دووری دۆست ئەگری‌و سکاڵای حاڵی خۆی ئەنووسێ. مەبەسی لەگریانەکەی ئەوەتەکە مەرەکەب لە نووکەکەی ئەتکێ.

(۳) شکەنج: شکاندنەوە، قەد کردن. وەردەن: خواردووە. واتە: کاغەزەکەم کـە ئـەوەندە دوورو درێژە سەد جار قەدکراوە، پێچی خواردووە بە یەکاو وەك من هەموو لەشی لە تاو دەرد تێك شکاوە.

(۴) دەوات: شووشەی مەرەکەب. دوو: دووکەڵ. مەخێزۆ: هەڵئەسێ. واتە: شووشەی مەرەکەبەکەم دووکەڵی رەشی لە دەم دەر ئەرئەچێ، کاغەزەکەشم خۆڵە رەشە ئەکا بـە سەری خۆیا. مەولەوی لەم شیعرەدا ئیشارەت بۆ ئەوە ئەکا کە جاران لە حوجرەکانا بـە مەرەکەبی رەش ئەیان نووسی، هەندێ جار کە مەرەکەبەکە ماوەیەك بەکار نەهێنرایە، کە قەڵەمیان تیا را بدایە، هـەڵمێکـی رەشـی لێ هـەڵئـەسا. هـەروەها نـووسراو کـە وشك نەبوایەتەوە خۆڵیان پیا ئەکرد تا وشکی بکاتەوە، ئەنجا خۆڵەکەیان دائەوەراند.

(۵) لیقە: جاران کە بە مەرەکەبی رەش ئەیاننووسی پارچـە پـەڕۆیـەکیان ئـەخستە نـاو

خـــامە شـــەوق وەردەن دەم مـــەكـــەردەوە
زار زار مـــــــەناڵۆ وە دەم دەردەوە[١]

مـــەوات هـەی ئـاوات واسـتەكـەی جـەستەم
هـــەی مـــۆمـــيايی پـــێشـــەی شكـــەستەم[٢]

كـــام زام بـــی جـــە تـــۆ مـن نـەويم نـەسيب
جـــەفا هـــەر وە مـــن، وەفـــا پـەی رەقـيب[٣]

زامـــــان تـــــاونان هـــــووناوان جـــۆجـــۆ
دەرد وە بـــان دەرد يـــە جـــە دووری تـــۆ[٤]

بـــــڕيـــان تـــای روبـــاب قـــافيە خـــوانـــيم
نـــــەمەندەن تـــــاقەت عـــيبارەت زانـــيم[٥]

☞

شووشەكەی بۆ ئەوەی مەرەكەبەكە هەڵمژێ تا درەنگ تەواو ببێ، بەو پارچە پەڕۆيەيان ئەوت ليقە. واتە: دووكەڵی ناو دەواتەكەم خۆی داوە بە يەكاو، ليقەكەی ناويشی خۆی هەڵژەندووە لە قوڕو ليتەی خەم‌كە مەرەكەبەكەيە.

(١) شەق‌وەردەن: شەقی بردووە. زار زار: بە خەفەتەوە. مەناڵۆ: ئەناڵێنێ. مـەعنای ئـەم شيعرەو دوو شيعری پاشەوەی پێكەوە دێ.

(٢) مەوات: ئەی‌وت. مۆميايی: دەرمانێكە جاران بـۆ گـيرساندنەوەی ئـێسـقانی شكـاو بەكاريان ئەهێنا. پێشە: ئێسقان.

(٣) واتە: قەڵەمەكەم شەقی بردووە، دەمی ئەكردەوەو بە دەم دەردەوە بـە عـاجزی‌يەوە ئەی ناڵاندو ئەی‌وت ئەی دۆستە ئاوات بۆ خوازراوەكەم، ئەی گيرسێنەرەوەی ئێسقانی شكاوم، من كام دەردم تووش نەهات لە ڕێگای تۆوە، كەچی تۆيش وەفات هەر بۆ بەدكار بوو، وە بۆ من هەر ئێش‌و ئازارت هەبوو.

(٤) تاونان: تواندووەوە. جۆ: جـۆگـە. يـە: ئـەمە. واتـە: زامـەكـانم خـوێنـاوی لەشـميان تواندووەتەوەو جۆگەيان لێ هەڵكردووە، ئێستەش وا لە ئێشی دووری تۆ دەرد لە سەر دەرد كەوتووە بەسەرما.

(٥) بڕيان: پچڕاو. تا: تاڵ. روباب: ئالەتێكی موسيقايە. قافيە: شيعر. نـەمەندەن: نـەماوە. ☞

دەمـــەی هـــەناسەی گـــەرم تـارەكـەم
نـەكـوورەی دەروون پڕ جـە خـارەكـەم[١]
ئـــایر دان حـــوجرەی دڵەی پـــڕ دەردم
سـۆچـــنان كـتاو مـەجمووعەی فـەردم[٢]

•••••••━━●━━•••••••

[٣]

## خاڵۆی مەنزڵ چی[٣]

خـــاڵۆی مـــەنزڵ چـی، سـەركردەكـەی دەرد
تەمام بـە تـۆ بـێ، ئـای یـە چـێشت كـەرد[٤]

---

☞

واتە: ژێی موسیقای شیعر دانانم پچڕاوەو تـاقەتی تـێ گـەیشتنی نـووسراوم نـەماوە. لەم شیعرەدا تەشبیهی شیعر دانان كراوە بە رەبابە لێ دان، هەروەك رەبابەكە ژێ كەی پچڕا ئیتر پێی لێ نادرێ ئەمیش ئەو هێزەی نەماوەكە پاڵی پێوە ئەما بۆ شیعر وتن.

(١) دەمە: تین. نار: ئاگر. جەخار: زوخاو. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێكەوە دێ.

(٢) سۆچنان: سووتاندوویە. كتاو، كتێب. واتە: تینی بۆقی گەرمی دەروونە پڕ زوخاوەكەم ئـاگـری بـەرداوەتـە حـوجرەی دڵی پـڕ دەردمو هـەرچـی شـیعری تـیابووە هـەمووی سووتاندووە، ئیتر هیچ شیعرم بۆ نایەت. مەولەوی بەم جۆرە ئیشارەت ئەكا بۆ سووتانی كەشكۆڵی شیعرەكانی، وە دەری ئەخا كە ئەو كارەساتە ناخۆشە چ كارێكی كرد بوە سەر دڵو هەستی.

رێكەوتێكی سەیر: هێشتا لە چاپ كردنی فۆرمەی پێش ئـەم فـۆرمـەیە نـەبووبووینەوە چاپخانەی نەجاح كە ئەم دیوانەی تیا لە چاپ ئەدرێ ئاگری تـێ چـوو، وە چـەند بـەند كاغەزو فورمەی ئەم كتێبەشی تیا سووتا.

[٣]

(٣) لەم قـــەسیدەوە وا دەرئـەكـەوێ كــە لە لاوانــدنەوەی لاوێك لە شـێخـەكـانی «پەنجە»«پاپاڵە»دا وترابێ، وە ئەو لاوە لە زەردو مایەكەوەكەوتبێتـە خـوارو لەشـی تێك شكابێ و برابێتەوە بۆ ماڵو لەوێ مردبێ، وە وادەرئەكەوێ كە ئەم كارەساتە لە سەفەرێكی راوا رووی دابێ، وە مەولەوی بەم قەسیدەیە گلەیی لەكابرای بنەی راوچی یەكان بكا كە بۆچی ئاگاداری ئەوكوڕە نەبوو تا وای بەسەر هات.

(٤) واتە: ئەی خاڵۆی سەرپەرشتی كەری بنەی راوچی یەكانو ئـەی سـەركردەی دەردو

وەختێ بەو گەردەن سیم سافەوە
چون وەش غەزاڵان وە بۆی نافەوە(١)

دەور مدا وە پێچ ئەو کاوو بەردە
بۆ بەخشانیش بێ ئەی هەرد بەو هەردە(٢)

ئەو بۆ جەو تەرەف سوب نەسیم ماوەرد
هەر جە دوورەوە زام سارێش مەکەرد(٣)

خەیلێ دێرت کەرد، ئافەرین چەپ گەرد
بەو بۆ دڵ شاد بیم ئەویشت لابەرد(٤)

ئیسە ئەو گەنجە، بەو لارو لەنجە
رەنجەکەرد پەنجە، شی پەرێ «پەنجە»(٥)

---

☞

مەینەت، من بە تەمای تۆ بووم ئاگات لەوکوڕە بێ، کەچی گوێت نەدایە تا بۆ خۆی وای بە سەر هات... توخوا خاڵۆ تۆ ئەوە چیت کرد؟

(١) سیم: زیو. ناف: ناوك. مەبەس بۆنی میسکەکە پارچە خوێنێکی مەییوە لە لای ناوکی هەندێ جۆری ئاسکەوە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٢) کاو: بەرزایی. بۆ بەخشانی: بۆن بڵاو کردنەوە.

(٣) ماوەرد: ئەی هێنا. واتە: کاتێك کە ئەو لاوە گەردەن وەك شووشی زیوی بێ گەردە، بەو پێچو زەردو مایەدا ئەسووڕایەوە، وە بۆنی خۆشی بڵاو ئەکردەوە بە هەردەکانا، وەك ئاسکی خوتەن کە بۆنی میسکی لێوە بێت، بای نەسیمی بەیانیانیش لەو سەرەوە ئەو بۆنەی ئەهێناو ئەیدا بە لووتمانا، وە هەر لە دوورەوە برینەکانمانی سارێژ ئەکرد.

(٤) دێرت کەرد: پەلەت کرد. واتە: ئافەرین چەپ گەرد بۆ کارێ کردت، ئێمە دڵمان بەو بۆنە خۆش بوو، ئەویشت بە پەلەپەل لابرد. ئەش گونجێ «دێرت کەرد» نەبێ «ویرت کەرد» بێ، واتە: بیرت کردەوە تا ئەو بەڵایەت بۆ دۆزینەوە.

(٥) رەنجەکەرد: ئەزیەتی دا. پەرێ: بۆ. پەنجە: دێیەکە لە ناوچەی «دیواندەرە» لەکوردستانی ئێران. واتە: ئێستە ئەو لاوە بەو لارو لەنجەوە پەنجەی خۆی ئەزیەت داو رۆیشتەوە بۆ پەنجە.

ئــــیسه تـــەن وەی زام دڵ وەی خــەریکی
دیــدار وەی دووری، مـەرگ، وەی نـزیکی(١)

ئــــەو لا کـــێ بـــەروون ئـــەی راو تـــەدبیره
ئـاخ جـەی تـەدبیره، داخ جـەی تـەقدیره(٢)

خـەیر، مـەینەت زەدەی جـەگـیان هـەراسـان
بـەخته سـیاکـەی وێش زووتـەر نـاسان(٣)

پـەی فـەنای ئـەو هـەم جـە دووری دڵبـەر
نـەك جـارێ، چـوار جـار، «اللّـهُ اَکـبر»(٤)

[٤]

## خاڵۆ چون تەدبیر

خـــاڵۆ چـــون تـــەدبیر دەرد زانـــات نـــەوی
هــانام کـــەرد ئـــەو تـــۆ تـەوانـات نـەوی(٥)

---

(١) مەعنای ئەم شیعره بەسراوه به شیعری دوایی‌یەوه.

(٢) ئەو لا: بەو لای. به روون: بەرم. واته: ئێستا که ئەو لاوه رۆیی‌و منیش لەشم ئەوەنده بریندارەو دڵم ئەوەنده مەشغوڵەو دیتنی ئەویش ئەوەنده دوورەو مەرگم ئەوەنده نزیکه، ئەبێ ئەم پرس‌و راو سکاڵای حاڵمه بەرمه لای کێ... هەی هاوار لەم مەسەلەیەو لەم قەزاو قەدەرەکه بەسەر منا هات.

(٣) خەیر: نه. ناسان: ناسیوه. مەعنای ئەم شیعره لەگەڵ شیعری پاشەوه دێت.

(٤) واته: نەخێر، با باسی تەگبیر کردن‌و چاره دوزینەوه نەکەین، چونکه ئـەم گـرفتاری مەینەتەکه هەراسان بووه له گیانی خۆی ـ مەبەسی خۆیەتی ـ بەختی رەشی خۆی زووتر ناسیوه، کەواته ئەبێ لەبەر فەوتانی ئەویش به هۆی دەردی دووری دولبەرەوه، له جیاتی جارێ، چوار جار «الله اکبر» بکەین. مەبەسی ئەوەیه ئەبێ نوێژی مردووی له سەر بکرێ که چوار جار «الله اکبر»ی تیایه، وەك چۆن له سەر جەنازەی ئەو لاوه پەنجەیی‌یەکرا.

[٤]

(٥) زانا: زانین. هانا: هاوار. مەعنای ئەم شیعره بەسراوه به شیعری پاشەوه.

نـــــەتاوات وێت دەی وە مـــــەودای وەی‌دا
گـــێج بـدەی نـە گـێج دەریـای بـێ پـەی‌دا(١)

هـــا خـــودام، وە حـــەق شـــادەتم ئـــاوەرد
خاڵۆت گێج مەوج دەریـای هـەواش کـەرد(٢)

جـــە کـــەنارەوە ســـەعی کـــەردەت بـــۆ
هـــەوڵ پـــڵو پـــووش ئـاو ئـاوەردەت بـۆ(٣)

پەی چێش خاڵۆکەی دەروون جە هوون کەیل
خەیلێن ئەجزای مەیل لەیلەکەی پـڕ مـەیل(٤)

ئـــامێتـــەن وە جـــزو ڕێزەی مـــەجنوون‌دا
حـەیفەن ئـاو بـەرۆش وە تـوونای تـوون‌دا(٥)

---

(١) مەودا: نووکی تیژ. واتە: خاڵۆ گیان لەبەر ئەوەکە چارەی دەردی عەشقت نەئەزانی، زۆرم پێ وتی خۆشەویستی ئەرکێکی قورسە لە عۆدەی نایەیت، وە زۆر دەسەو دامێنت بووم کە دەسی لێ‌هەڵگرە، بەڵام بە گوێت نەکردم، کەچی نەشت توانی خۆت بدەی بە سەر نووکی تیژی شیری دەردو مەینەتا، وە لە دەلیای بێ‌بنی عەشقا مەلەوانی بکەی.
(٢) شادەت: «شهادت»، «اشـهد ان لا الە الا الله». هـەواش: خـۆشـەویـستی ئـەو. واتـە: خوایە، وا شایەتیمانی بە حەقم هێناو باوەڕم کرد کە خاڵۆت سەرگەردان کردووە بە دەم شەپۆلی دەلیای خۆشەویستی‌یەوە. لە شیعرەکانی پاشەوەدا دیسانەوە مـەولەوی ڕووی قسەی وەرئەچەرخێنێتەوە بۆ لای خاڵۆو لەگەڵی ئەکەوێتە دوین..
(٣) کـەنار: قـەراخ ئـاو. واتـە: ئـێستەش مـادەم تـووش هـاتووی‌و شـەپۆلی دەلـیـای خۆشەویستی فڕێی داویتەکەنارەوە، هەوڵ بدە بەڵکو ئەمە خوایە دەستت‌گیر ببێ لە پڵ‌و پووشی لافاو هێناو، وە خۆت ڕزگار بکەی.
(٤) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٥) ئامێتە: تێکەڵ. ڕێزە: وردە. توونای توون: گێژی ئاوی نـاو شـیو. واتـە: لە بـەرچـی؟ چونکە ئەی خاڵۆی دەروون پڕ لە خوێن، دەمێکە تۆسقاڵەکانی خۆشەویستی لەیلی پـڕ مەیل تێکەڵ بوون لەگەڵ وردە پارچەی لەشی مەجنوونا، کە تۆیت، لەبەر ئەوە حەیفە ئاو ئەو لەشە بەرێ‌و لە گێژی خۆیا نوقمی کاو تۆسقاڵەکانی خۆشەویستی لەیلێشی لە گەڵا بفەوتێ.

## [٥]
## خەرامان ئاما

خـــەرامـــان ئـــاما نـــە تــۆی پــەردەوە
نــیقاب جــە ســەفحەی جــەمین کــەردەوە(١)

چــیهرەی دڵەی زار خــووی گــەرمی پــێدا
عــــەکسش هـــــوەیدا مــــنمانا تـــێدا(٢)

بـاوەشێن مـەکـەرد ئـەو سـەفحەی بـێ گـەرد
نــازکیش جــە بــاد ئــیحتیات مــەکـەرد(٣)

نـــە تــۆی ئــاینەی جـــەمین چـــون گـــۆل
کەم مـەکـەرد نـەنم خـووی روخسـار دڵ(٤)

---

### [٥]

(١) خەرامان: ئافرەتی بە لەنجەو لار. نیقاب: پەچە. سەفحە: تەخت. واتە: یار بە لەنجەو لارەوە هات، عاباو پەچەی دادابوەوەو، کەگەیشتە بەرەوە پەردەی لە سەر تەختی رووی خۆی لادا.

(٢) هوەیدا: ئاشکرا. واتە: رووی دڵەی خەفەتبارم لەگەرمای خۆی ئارەقی بە ناو چاوی یار کرد، وە وێنەی بە ئاشکرا لە تەوێڵیا دەرکەوت.

(٣) واتە: ئەویش لە بەر گەرما باوەشێنی رووی بێ‌گەردی خۆی ئـەکـرد، دەمو چـاوی ئەوەندە ناسك بوو ئەترسا باوەشێنەکە زیانی پێ بگەیەنێ. ئەم شیعرە لە قەسیدەیەکـی تریشا هەبوو. مەولەوی ئەوەی هەیە جار بە جار شیعرێك یا نیوە شیعرێك لە زیاتر لە یەك قەسیدەدا ئەڵێتەوە.

(٤) واتـە: بـە هـۆی بـاوەشێن کـردنەکـەیەوە نـمی‌ئارەقی رووی دڵـمـی بـە سـەر رووی خۆیەوەکەم کردەوە.

[٦]

**خەمە فرسەتێ**

خــــەمە فــــرسەتێ ســـاتێ، وە بــێ خــەم
گـــەرد پــاڵاكــەش بگــێروون وە چــەم[١]

چـــەرخ چـەپ چـەنیم راس بـەستەن كـەڵەك
مــەر مــن ســەنگم دان وە مـینای فـەڵەك[٢]

چـــەپ گـــەرد نــمازۆ ســاتێ فــەراغــەت
ئەی خوا یا وەسڵ، یـا مـەرگ، یـا تـاقەت[٣]

[٧]

**خەیر بۆ هەم فەڵەك**[٤]

خــەیر بـۆ هـەم فـەڵەك كـام خـەیاڵ كـەردەن
دیســـان مـن پـەی شـەڕ وە یـاد ئـاوەردەن[٥]

---

[٦]

(١) خەمە: ئەی خەم. پاڵا: كەوش. بگێروون بگرم. واتە: ئەی خەم سەعاتێك مۆڵەتم بدە با بە بێخەم تۆزی كەوشەكانی بە چاو بگرم، یا بگرمە چاوم.

(٢) چەنیم: لەگەڵ. بەستەن كەڵەك: كەڵەكی چنیوە، مەبەسی لەوەیە بنیانی دوژمنایەتی ناوە. مەر: مەگەر، بۆچی. سەنگ: بەرد. مینا: شووشە. واتە: چەرخی چەپگەرد بە راستی بنیاتی دوژمنایەتی ناوە لە گەڵما، نازانم بۆچی وا ئەكا خۆمن بەردم نەداوە بە شووشەی ئاسمانا.

(٣) نمازۆ: نایەڵێ. واتە: چەرخی چەپگەرد نایەڵێت سەعاتێك بۆ خـۆم بـحەسێمـەوە، سا خوایە یا بمگەیەنە بە یار، یا بمكوژە، یا سەبووریم بدە.

[٧]

(٤) مەولەوی جارێكیان خەبەری بۆ دێنن كە دۆستێكی لە سەرەمەرگایە وە بانگی ئەكەن كە بچێ بۆ لای، ئەویش بەو موناسەبەتەوە ئەم شیعرانە ئەڵێ:

(٥) واتە: خوا بە خێری بگێڕێ، ئەبێ دیسان فەڵەك خەیاڵی چی لە دڵا بێ، وا ئەمجارەش منی بۆ شەڕ كەوتووەتەوە یاد...

دیـــــارەن ئـــەساس دووری مســـــازۆ
وە بــــاڵام كــــاڵای خــــەمان مــوورازۆ(١)

داخــۆم دووی دووری كــێش هــانە سـەردا
دیســـــان مــن مــدۆ وە رووی چـــەمەردا(٢)

[٨]

## خەیلێوەن خەریك

خـــــەیلێوەن خــــەریك زاكــــەی زەحـــمەتم
بــــەڵكــو وە را بــۆ بــەرشۆ عــوسرەتم(٣)

فــــەڵەك وە بــــەختم مـــەگــەس مكــیانۆ
وە راكـــەی رەحـــمەت هـەم دیس مـرپـیانۆ(٤)

---

(١) ئەساس: بنچینە. مسازۆ: دروست ئەكا. موورازۆ: ئەدووریێ. واتە: وادیـارە بـناغەی دوور خستنەوەی دۆستێكی تریش دائەمەرزێنێو بەرگی خەمو مەینەت ئەبڕێ بە باڵای من.

(٢) كێش: كێی. چەمەر: شینو زاری. واتە: ئاخۆ ئەبێ خەیاڵی دوور خستنەوەی كێی لە سەرا بێ، وا دیسان من ئەخاتەوەكۆڕی شینو زاری.

[٨]

(٣) خەیلێوەن: دەمێكە. زاكە: هاوار. وە را بۆ: بكەوێتە رێ. بەرشۆ: دەرچێ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێكەوە دێ.

(٤) مەگەس: مێش. مكیانۆ: ئەنێرێ. راكەی: رێگاكەی. مرپیانۆ: ئەڕپێ، پیسی ئەكا. واتە: دەمێكە سەرم قاڵە بە دەس هاوارو ناڵەی زەحمەتەوە ئەمەوێ بیخەمەوە رێو دووری بخەمەوە تا نارەحەتیم نەمێنێ، كەچی لە چارەی رەشی منا فـەڵەك مێشسێك ئـەنێرێ رێگاكە پیس ئەكاتەوە تا مەینەتەكەم رێگای رۆیشتنی نەبێ. هەروەها لەگەڵ ئەم مەعنایەدا مەولەوی مەعنایەكی تریشی مەبەس بووە، كە ئەوەتە: دەمێكە خـەریكی تـیپی «زێ»ی وشەی «زەحمەت»م نوختەكەی ئەكرێنم تا بیكەم بە «رێ»و ببێ بە «رەحمەت» بەڵكـو مەینەتم لەكۆڵ ببێتەوە، كەچی لە بەختی رەشما چەرخی چەپگەرد مێشێك ئەنێرێ گوو ئەكا بە «رێ» كەداو ئەیكاتەوە بە «زێ»و «رەحمەت» ئەبێتەوە بە «زەحمەت».

[٩]

## خەیاڵان شەو

خـــــەیاڵان شـــــەو، هــــیجرانــــان رۆ
قامەت خەم کەردەن چـون چـەمیلەی چـۆ(١)

دڵ بـــــیەن وە دار ســــــەر کــەل لای وەشت
چـــەمەڕای وایـێن ریشـەش بـێ وە دەشت(٢)

........——●——........

[١٠]

## خاك وە دەس(٣)

خــــاك وە دەس زۆر زەنـــــجیرم کـــەردەن
یـــاد هـــــەمڕازان جــــە یـــادم بــەردەن(٤)

هــاو قـەد خـاكو سـەنگ وە جـەسەم بـارەن
نـــە راگــەی جـواب، نـە جـای گـوفتارەن(٥)

---

[٩]

(١) رۆ: رۆژ. چۆ: دار. واتە: بیرکردنەوەی شەوو دووری رۆژ باڵامیان وەك داری چەماوە چەماندووەتەوە.

(٢) وەشت: باران. وایێن: بایەکە. واتە: دڵم وەك دارێکی لێ‌هاتووەکە بەسەر یاڵێکەوە بێ لە شوێنێکا کە باران بنەکەی کەندڕ کردبێ‌و ریشەکەی دەرخستبی، وە چاوەڕێی بـایەك بێت هەڵ‌کاتو ریشەکێشی‌کا.

[١٠]

(٣) مەولەوی ئەم دوو شیعرەی لەکاتێکا وتووەکە خەریکی خـەندەق لێ دان بـووە بـو خانوو، وەرامی دۆستێکی پێ ئەداتەوەکەگلەیی لێ کردبوو لە سەر ئەوەکە خستبویە پشت گوێ.

(۴) مەعنای هەردوو شیعرەکە پێکەوە دێت.

(٥) هاو قەد: بە ئەندازەی باڵام. راگە: رێگا. واتە: خاك بـە دەسـتی زۆرو تـوانـای خـۆم

[١١]

## خالۆ خالۆتەن(١)

خالۆ خالۆتەن، کەم واچە خالۆ
خالۆ دەم وە بان خالانت مالۆ(٢)

شەرت بۆ من جە داخ خالۆ خالۆی تۆ
وێم کەروو وەکوڕ چواردە ساڵەی نۆ(٣)

☞

گرفتاری کردووم‌و یادی برادەرانی لە بیر بردوومەتەوە، ئێستا وا بە بەرزی باڵام خاك‌و بەرد لە سەرم کەڵەکەی کردووە، نە ڕێگەم هەیە وەرامێ بدەمەوە، وە نە ماوەم هەیە قسە بکەم. مەولەوی لەم دوو شیعرەیا خۆی شوبهاندووە بە مردوو لە گۆڕا کە ماوەی قسەکردن‌و توانای وەرام دانەوەی نەبێ.

[١١]

(١) مەولەوی پێش مارەکردنی عەنبەر خاتوونی خێزانی، چووە بۆ ماڵی باوکی تا چاوی پێ بکەوێ بزانێ ئاخۆ دڵی ئەی‌گرێ یا نە. لەوێ داوای ئاوو دۆیەك ئەکا لە عەنبەر خان تا بەو بیانووەوە ببینێ، عەنبەرخان کە ئاوو دۆکەی ئەداتە دەستی پێی ئەڵێ «فەرموو خالۆ» ئەمیش بەو موناسەبەتەوە ئەم دوو شیعرە ئەڵێ:

(٢) واچە: بڵێ. مالۆ: بماڵێ، بکوتێ. واتە: خالۆ خالۆی چیتە، بەس بڵێ خالۆ، یاخوا خالۆ دەمی بماڵێ بە سەر خاڵەکانتا.

(٣) کەروو: بکەم. نۆ: نوێ، تازە. واتە: شەرت بێ لە داخی خالۆ خالۆی تۆ، خۆم بکەمەوە بەکوڕێکی تازەی چواردە ساڵان.

[١٢]

## خاست فەرماوان[١]

خاست فەرماوان ئەربابەکەی خەم
ساکن نە گۆشەی باڵەخانەی چەم[٢]

[١٣]

## خەرمانی خەمان

خەرمانی خەمان ها وەکەل باوە
شەن کەر یەکێکە دوو شەن وە لاوە[٣]

---

[١٢]

(١) جارێکیان مەولەوی لە سنە ئەبێ، بە بەردەمی باڵاخانەی یەکێك لە ئەعیانەکانا تێ ئەپەڕێ کە لە سەر روخی رووبارێك بووە. یەکێك لە ژنە ئەعیانەکان لە پەنجەرەوە سەیری خوارەوە ئەکا، ئەو ژنە شاعیرە بووەو ناوی «زیبا خانم» بووە، کە چاوی بە مەولەوی ئەکەوێ بانگی ئەکاو ئەم شیعرەی بۆ ئەڵێ:

هەرکاتێت زانا چەم دا وە هەمدا    باڵاخانەی چەم دا وە رووی چەمدا

واتە: هەر ئەوەندەت زانی خوا ئەم چەمەی دا بە یەکاو لافاوی هەڵساندو ئەم باڵاخانەی سەرچەمەی دا بە سەر چەمەکەداو بردی، یان کاتێکت زانی خوا چاوی مەیلی دا بە یەکاو پێڵووی چاومانی هێنایەوە بەسەر چاوماناو مراندینی. مەولەویش بەم شیعرەی خوارەوە وەرامی ئەداتەوە.

(٢) فەرماوان: فەرمووە. ئەرباب: خاوەن. واتە: قسەکەت راستەو چاکت فەرمووە ئەی خەم پەروەری دڵداران، ئەی لە گۆشەی باڵەخانەی سەرچەما دانیشتوو، یان ئەی لە گۆشەی چاوما جێ گرتوو.

[١٣]

(٣) مەبەس لە «خەرمانی خەمان» رووی یارەکە خرە وەك خەرمان وە لە جوانیدا بووە بە مایەی خەفەتی دڵی دڵداران. وە مەبەس لە «کەلی با» گەردەنی بەرزی یارە، کە هەمیشە شەماڵ ئەیگرێتەوە، وە مەبەس لە «شەن کەر» بای شەماڵە، کە زوڵفەکانی تێك ئەدا، وە لە دووشەن زوڵفەکانیەتی کە بای شەماڵ هەڵیان ئەسوورێنێ. واتە: بای شەماڵ زوڵفەکانی یار ئەجووڵێنێ و رووی رووناکی دەرئەخاو لەوەوە خەم و خەفەت بڵاو ئەکاتەوە بە سەر دڵدارانا.

## [١]
## دڵەی دڵ...(١)

دڵەی دڵ وە مـــەی مـــەیل لەیـلێ کــەیل
مـەحرەم وە رازان خـەڵوەت خـانەی لەیـل(٢)

لانە حەڵقەی زوڵف عـەنبەر بـۆی شـەو رەنگ
هام دەم جای تەنگ ئەڵحـەدسەرای سـەنگ(٣)

پـەروانـەی مـەزار ئـەو ئـاوات واسـتەم
تـەرجـەمەی حـاڵات پـەشێوی جـەستەم(٤)

عـــەرز کــەر وە لەیـلا وە سـەد خـەمەوە
چـــەم وە نـــمەوە، دڵ وە تـــەمەوە:(٥)

دێوانـەکـەت دیـم بـڵێسـەش بـەرز بـی
بەرزی بڵێسەش هەر سات سەد تـەرز بـی(٦)

---

[١]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەشی لە لاواندنەوەی عەنبەر خاتوونی خێزانیا وتووە.
(٢) کەیل: پڕ. واتە: ئەی دڵەکەم کە پڕ بوی لە شەرابی حەزکردن لە لەیل، وە مەحرەمی ژووری تایبەتی ئەوی کە گۆڕەکەیەتی. مەبەسی ئەوەیە ئەی دڵەکەم کە لەگەڵ لەیلا چوویتە گۆڕ.
(٣) لانە: هێلانە. جا: جێ. واتە: ئەی دڵەکەم کە لەسەر ئەڵقەی زوڵفی رەشی بۆن خۆشی یار هێلانەت کردووەو بووی بە هاودەمی جێگە تەنگەکەی کە ئەلحەدی گۆڕە بەردینەکەیەتی.
(٤) مەزار، زیارەتگا، گۆڕستان. واتە: ئەی دڵەکەم کە وەك پەروانە بە دەوری گۆڕی ئەو یارە ئاوات بۆ خوازراوەما ئەسوورێیتەوەو بووی بە تەرجومانی حاڵی جەستەی پەشیوم لای ئەو.
(٥) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٦) واتە: بە دڵی خەفەتبارو چاوی پڕ فرمێسكو دڵی تەماوییەوە عەرزی لەیل بکە چاوم بە دڵدارە شێت بووەکەی کەوت گڕی تێبەر بووبوو، وە هەر سەعاتە بە سەد جۆر گڕەکەی ئەچوو بە ئاسمانا.

وە هـــــەر تـــــەرزێ لەیـــــل مـــــلاوناوە
دڵەی ســـــەنگ ســـــەخت مـــــتاوناوە[١]

گـــا گـــۆیـــا مـــەویەرد ئـــیند مـــەویەردەوە
گـــــا مـــــوات وە دەم ئـــــێش دەردەوە:[٢]

ئـــای جـــە ئـــێش تـــەن جـــە گـــیان جـــیای مـــن
ئـــای جـــە لوای تـــۆو ئـــەو شـــۆن دیـــای مـــن[٣]

ســـــەختی ئـــــێش دەرد بـــــەدحاڵـــــم لایـــــێ
وای بـــــێ تـــــۆ مـــــەنزڵ گشت خـــاڵـــیم لایـــێ[٤]

وە هـــــەر مـــــەنزڵداو هـــــەر راگـــــوزەردا
هـــەر دەست حـــەسرەت مـــدا وە ســـەردا[٥]

چـــێشـــەن مـــوینوون مـــەنزڵ بـــێ تـــۆ بـــۆ
بـــێ هـــۆشـــم، خـــەو بـــۆ، راس بـــۆ، درۆ بـــۆ[٦]

---

(١) ملاوناوە: ئەلاواندەوە. متاوناوە: ئەتواندەوە. واتە: هەر چۆن لەیلی ئەلاواندەوە دڵی بەردی رەقی ئەکرد بە ئاو.

(٢) گا: گاه، جاروبار. مەویەرد: تێ ئەپەڕی، ئەمرد. مەویەردەوە: ئەبووردەوە. موات: ئەی وت. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) لوا: رۆیشتن. ئەو شۆن: بە دوادا. دیا: روانین. واتە: جارو بار ئەوەندە ئەبووردەوە ئەت وت مردووە، جارو باریش کە هۆشی ئەهاتەوە بە خۆیا بە دەم دەردەوە ئەی وت هاوار لە ئێش و ئازاری لەشی بێ گیانی من، هاوار لە تاو رۆیشتنی تۆو بە دوادا روانینی من...

(٤) واتە: ئەی وت لەلایەکەوە ئێشی دەردم زۆر سەختە، وە لەلایەکی ترەوە ماڵەکەم بە بێ تۆ چۆڵ بووە، وە هاواری بوو لە دەس ئەم حاڵە.

(٥) مدا: ئەدا. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٦) موینوون: ئەبینم. واتە: لە هەموو مەنزڵێك و رێ گوزەرێکی تۆدا هەر دەستی داخ و حەسرەتی ئەدا بە سەریاو ئەی وت چیە وا ئەبینم ماڵ تۆی تیا نیت، نازانم هۆشم لە خۆم نیە، یان خەو ئە بینم، وە ئەمەی ئەی بینم راستە یان درۆیە.

گـا تـێکـەڵ مـەکـەرد چەنی دەرد وێش
فـەرد هـام فـەردش چـەنی فـەرد وێش(١)

مـوات: فـیداش بـام یـە جـای شـیرینەن
گـوزەرگای ئـەو شـۆخ زوڵف عـەنبەرینەن(٢)

جـە بـاڵای ئـەی سـەنگ پـا ئـاوەردەوە
بەرقەی ناز جە رووی ئەو شەنگ کـەردەوە(٣)

جـەو جـاسووس گـاوە، بـەو خـەدەنگەوە
دڵ تـــلنا وە زام هـــەزار رەنگـــەوە(٤)

جـــەو سـەردەشتەوە گـوڵاو ڕێزان کـەرد
سـارا بـۆی عـەنبەر سـارا هـەرزان کـەرد(٥)

چـۆگـە جـەلای جـام جـەبهەی جـەماڵ دا
بـــەرگەشتی وە بـەخت بـەدر کـەماڵ دا(٦)

(١) چەنی: لەگەڵ. واتە: جارجاریش لەگەڵ دەردو ئێشی خۆیا شیعری «فەرهاد»ی هاوڕێی تێکەڵی شیعری خۆی ئەکرد. ناوەرۆکی شیعری پاش ئەم شیعرە لە سەر زوبانی فەرهاد وتراوە لە چیرۆکی «شیرین‌و فەرهاد»دا، مەبەسی مەولەویش ئەوەیەکە ئەڵێ شیعری خۆی‌و فەرهادی تێکەڵ ئەکرد.

(٢) واتە: ئەی‌وت بە قوربانی‌بم ئەمە جێگەی شیرینەو گوزەرگەی ئەو شۆخەیەکە بۆنی زوڵفی وەك عەنبەر خۆش بۆیە.

(٣) بەرقە: «برقع»، سەرپۆش. واتە: وەختی خۆی ئەو شەنگە پێی لە سەر ئەو بەردە هەڵ هێنایەوەو سەرپۆشی نازی لە سەر رووی خۆی لادا.

(٤) تلنا: تلاندەوە. واتە: لەو جاسووسگەی راوچی‌یانەوە بە تیری نیگای خۆی دڵمی گرفتاری هەزار رەنگ زام کرد.

(٥) واتە: لەو تەختە بەرزانەوە ئارەقی رووی خۆی هەڵپرژاند کە وەك گوڵاو بۆن خۆش بوو، وە ئەو دەشتە بە هۆی بۆنی ئەو ئارەقەوە بۆنی عەنبەری تیا هەرزان بوو.

(٦) چۆگە: لەوێ. واتە: لەوێ ئاوێنەی تەوێڵی جوانی خۆی پاك کردەوەو بەختی مانگی چواردەشەوەی شێواند.

چــــێگــە حــوقەی ڕاز شــیرین کــەردەوە
تــــام تــــاڵی دەرد دووری بــــەردەوە(۱)

گوزەرگەی جیلوەی لەیل بێ حـەد بـەو تـەرز
زایەڵەی مەجنوون چە عـەد ڕەد بـەو تـەرز(۲)

چــۆن کــەروون تـەقدیر پـەی سـەر کـار تـۆ
نــــە تـــۆ بـــژنەوی نــە دۆس‌دار تــۆ(۳)

مــەعدووم چــون قــەزا ئــاما چــە نــاکــاو
دانـــا چــــون نــــادان وزۆ وە گــەرداو(۴)

عــــیرفانەکــەت کــۆن، فــامت کــۆ شــیەن
ئـای پـەی جـیلوەی دۆس نـیهایەت نـیەن(۵)

---

(۱) چێگە: لێرە. حوقە: قوتووی نوقڵ. واتە: لێرەش دەمی کردەوەو دەسی کرد بە قسەی وەك شەکر شیرین، وە تامی ناخۆشی دەردی دووری لە دڵمانا نەهێشت.
(۲) حەد: ئەندازە. عەد: ژمارە. ڕەد: تەجاوەز کردوو. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(۳) کەروون: بکەم. تەقریر: باس کردن. سەرکار: سەرگەورەی خزمەتکاران وە وەکیلی ئاغا لە دێهاتەکانا. بژنەوی: ببیسی. واتە: گوزەرگەی خۆدەرخستنی لەیل بەو چەشنە لە ئەندازە بە دەر بوو، وە هاوارو ناڵەی مەجنوونیش ئەوەندە زۆر بوو لە ژمارە نەئەهات، ئیتر من چۆن بتوانم باسی ئەمە بکەم بۆ سەرکارەکەی تۆ؟ حاڵەکەی ئەوەندە ناخۆشە یاخوا نە خۆت ببیسی و نە دۆس‌دارت. لە ئەدەبی کۆنا باو بۆ ڕێز گرتن لە قسە لەگەڵ کراوو نامە بۆ نێرراو، ڕووی قسە ئەکرێتە خزمەتکارەکەی، گوایە قسەکەرەکە یا نامە نووسەکە خۆی بە شایانی ئەوە نازانێ ڕاستەو خۆ لەگەڵ ئەو بکا. لێرەشا هەر بەو جۆرە مەولەوی داوای لە دڵی خۆی کردووەکە ڕووی قسە بکاتە سەر نۆکەرانی یار، وە خۆی بە شایانی ئەوە نەزانی کە ڕاستەوخۆ بۆی باس کا.
(۴) وزۆ: ئەخاتە. لێرەوە مەولەوی ڕووی قسە وەرئەچەرخێنێتەوە بۆ سەر خۆی، وە بە خۆی ئەڵێ قەزاو قەدەری خوا کە لە ناکاو هات عاقڵ و بێ‌عەقڵ وەك یەك ڕاپێچ ئەکاو ئەیانخاتە گەرداوەوە.
(۵) کۆن: لەکوێیە. کۆ شیەن: بۆ کوێ چووە. مەعنای ئەم شیعرە شیعرەکانی پاشەوە پێکەوە دێ.

ئـــارۆ یـــەك جـــیلوەش هـــا نـــە رووی كـــاردا
فـەردا چـێش ئـەو یـەك جـیلوەش دیـار دا[١]

لا، بـــەڵ ئـــەو جـــیلوەی روو نـــە پـــەنهانی
نـــەوعە زوهـــوورێن، زانـــاش ویـجدانـی[٢]

چ مـــــــاتەمێوەن پـــــات بـــــیەن پـــێوە
دانـــاو مــەخشووشی كــێ دیــەن پـێوە[٣]

ئـــەو جـــیلوەكـــەردەن ئـــەر شـــی وە تـــاقی
ئـــێد جـــیلوە كـەردەن سـوراحـی‌و سـاقی[٤]

---

(١) ئارۆ: ئەمرۆ. فەردا: سبەی. دیاردا: دەرخست.
(٢) لا: نەخێر. بەڵ: بەڵكو. زاناش: تێ‌گەیشتن‌و لێ حاڵی بوونی.
(٣) كێ دیەن: كێ دیویە. پێوە: بە یەكەوە.
(٤) شی: بە سەرچـوو. تـاقی: «تـحقیق»، راسـتی. سـوراحـی: كـاسەی مـەی. مـەبەسی شەرابی مەرگە. واتە: ئەوە عەقڵ‌و تێ‌گەیشتنت چی بە سەر هاتووە، بۆچی نازانی لوتفی خوا بڕانەوەی بۆ نیە، ئەمڕۆ خۆ دەرخستنێكی لە ناوایە، كە ئەوە نەما سبەینێ یەكێكی تری دێتە رووی كار، بەڵكو هەرگیز هەر لەناو ناچێ، وە گوم بوونی هەر لوتفێكی لە راستیدا جۆرە دەركەوتنێكی تریەتی كە پیاوی خاوەن باوەڕو دەروون پاك هەستی پێ ئەكا، كەواتە بۆچی قاچت كەوتووەتە بەر دوای خەم‌و خەفەت، وەكێ دیویە پیاوی تـێ‌گـەیشتوو وا سەری لێ بشێوێ. ئەگەر ئەمڕۆ لوتفی خوا ـكە لە ژیانی عەنبەر خاتوونا دیمەنی دیاری ئەدا ـ وا لە شێوەیەكـی تـرا دەركـەوت كـە نـۆشـاندنی شـەرابـی مـەرگە پـێی، لە لایـەن مەی‌گێڕەوەكە فریشتەی گیان كێشانە.
ئەش گونجێ مەبەسی ئەوەبێ ئەمڕۆ لوتفی خوا لە ژیانی عەنبەر خاتوونا دەرئەكەوێ‌و لە قیامەتا لە زیندوو كردنەوەی‌دا، وە ئەگەر ئەمڕۆ خوا بیباتەوە بۆ خۆی لە قیامەتا ئەیداتەوە پێكەوە لە بەهەشتا مەی نۆش ئەكەنەوە...

[۲]

## دڵ تەم کەردەوە(۱)

دڵ تـــەم کـــەردەوە گـــرتەوە کـــاوان
دیســان دووی نــامەی تــۆش وەلا یـاوان(۲)

مــەزموون: هـەوای مـەرگ، زامـداری تـیرت
پـــەنهانی قـــاتیل، دەواو، تـــەدبیرت(۳)

لاڵ بوون پەی مەینەت جەستەی خەستەکەت
بـمروون پـەرێ زام جـێ نـەڕەسـتەکـەت(۴)

مـــن و تـــۆ بـــەڵاو زامـــان ئـاوەردەن
نـە چـەشمەی حـەیات ئـاومان وەردەن(۵)

خـــەیاڵ خـــامەن ئـــینە تـــۆ کـەردەن
پـــەیما نـــمەبۆ جـــیایی وە مـــەردەن(۶)

---

[۲]

(۱) مەولەوی ئەم غەزەلەی لە وەرامی دۆستیکیا نووسیوەکە نامەیەکی بۆ ناردبو، وە سکاڵای حاڵی خۆی کردبوو.

(۲) یاوان: گەیشتووە. واتە: دڵم تەمی کردووەتەوەو تەمەکەی بەرزاییەکانی داگرتووە، چونکە دیسانەوە دووکەڵی نامەی تۆی پێ گەیشتووە.

(۳) مەزموون: ناوەرۆك. هەوا: ئارەزوو. واتە: ناوەرۆکی کاغەزەکەت ئەوەبوو بە تیر گرفتاریو نازانی کێ برینداری کردوویو دەرمانت کامەیەو چارت چیە، لە بەر ئەوە ئاواتی مەرگی خۆت ئەخوازی.

(۴) پەرێ: بۆ. جێ نەڕەستە: لێ رزگار نەبوو. واتە: لاڵ بم بۆ مەینەتی لەشی بیمارتو بمرم بۆ ئەو زامەی لێی رزگار نەبوویت. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «بمروون» نووسراوە «مرروون».

(۵) چەشمە: کانی. وەردەن: خواردووەتەوە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(۶) ئینە: ئەمە. پەیما: بۆمان. واتە: من و تۆ لە رۆژی ئەزەلا دەردو بەڵامان گرتووەتە

هـا چـەند هـەوات دا وەگـێج بـێ پـەی
بـمریو بـناڵی گـیان تـەسلیم نـەکـەی[١]

تـازە وارگـەی عـەشق مـەنزڵ کـەردەنی
هـەوەسیای هـازەی بـاڵ دەردەنـی[٢]

خوسووس بەو جەستەی خەستەی مەهجووری
کـەفتەنی نـە پـێچ رای دوەی دووری[٣]

هـۆشت نـە تـۆی کـاخ دەمـاخ فـیرارەن
وەرنـە چ خـێرەن قـاتیل دیـارەن[٤]

کـێ بـۆ چـون خـەدەنگ نـاز هـەوا دەرۆ
هـەریەند بـزانـی جـەوپەڕ بـویەرۆ؟[٥]

☞

خۆمانو لە سەرچاوەی ئاوی حەیات ئاومان خواردووەتەوە، کەواتە تۆ شوێن خەیاڵی خاوکەوتووی کە ئەتەوێ بمری، وە ئێمە بە مەرگ رزگارمان نابێ لەم ژیانەی ئێستامان.

(١) هەوات دا: فڕەتدا. گێج بێ پەی: گێژی بێ بن.

(٢) وارگە: هەوارگە. هەوەسیا: حەپەساو. واتە: بۆیەکەوتوویتە پەلەقاژە چونکە تازە هەوارگەی عەشقت کردووە بە مەنزڵو حەپەساوی لە هاژەی باڵی دەردو مەینەت.

(٣) کەفتەنی: کەوتوویتە. واتە: بە تایبەتی بەم لەشەتەوەکە نەخۆشی دەردی دوور کەوتنەوەی دۆستە، رێت کەوتووەتە قەمچو پێچی رێگای تەم داگرتووی دووری. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «مەهجووری» نووسراوە «ڕەنجووری» واتە: مەینەتباری، وە لە جیاتی «دوەی» نووسراوە «دەورەی» واتە: لوفەدار.

(٤) نەتۆ: لەناو. کاخ: باڵەخانە. واتە: لە بەر ئەوەکە تازە دڵداریو حەپەساوی، فامو تێگەیشتنت باڵەخانەی مێشکتیان بەجێ هێشتووە، ئەگینا چ خێرتە ئەڵێی قاتڵەکەم دیار نیە، دیارەکێیە، دۆستە چالاکە دەس راستەکەی خۆمانەکە هەموومان ئەیناسین...

(٥) هەوا دەرۆ: فڕێدا. بویەرۆ: تێپەڕێ. واتە: کێ بێ غەیرەز ئەو هەرکە تیری نازی تەقاند ئەوەندە بزانێ لەو دیوی نیشانەکەوە دەرچێ؟

کێ بۆ بەو جەمین نەزاکەت چون گوڵ
خەیمەش هۆر بدا نە پای دەشت دڵ؟[١]

کێ بۆ پێکۆ دڵ زام نەسرەفتەش
یەکێو کوشتەش، ئێد ئەو زەمین کەفتەش؟[٢]

ئەر رستگاریت جەو دەرد ئومێدەن
دەوای خەلاسی‌و تەدبیرت ئێدەن[٣]

مەبۆ وەخت سەخت زامان ئاوەردەت
رەماو پەلەپەل هەردەو هەرد کەردەت[٤]

پەی چێش تا ئیسە لێت مەعلووم نیەن
سەیاد جە واکوژ درێغش نیەن[٥]

بەلاّم یە رەویەی ئیبتیدای مەشقەن
خیلاف شێوەی تاویای عەشقەن[٦]

---

(١) خەیمە: خێوەت، دەوار. پا: بنار. واتە: کێ بێ لەو بەولاوە بەو ناوچاوە وەك گوڵ ناسکەیەوە لە بناری دەشتی دڵی عاشقانا دەوار هەڵدا؟

(٢) پێکۆ: بپێکێ. نەسرەفتە: نەسروتوو. یەکێو: یەکێك. واتە: کێ بێ لەو زیاتر دڵی بریندارە زام نەسرەوتووەکەی خۆی بداتە بەر تیر، وە یەکێك بکوژێ‌و یەکێکی‌تر بدا بە عەرزا؟

(٣) رستگاری: رزگار بوون. ئێدەن: ئەمەیە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٤) مەبۆ: نابێ. رەما: راکردن. واتە: ئەگەر بە تەمای لەو دەردە رزگار بێ دەرمانی رزگار بوون‌و تەگبیرت ئەوەیە نابێ لەکاتێکا کە ئەو دۆستە زامێکی سەختت لێ ئەکا تۆ را بکەیت‌و پەلەپەل بکەویتە هەردەو هەرد کردن، چونکە تا تۆ زیاتر را بکەیت خوێنت زۆرتر لێ ئەرژێ‌و ئەویش شوێن پێت هەڵئەگرێ‌و ئەت دۆزێتەوەو تیرێکی ترت پێوە ئەنێ، بەلاّم ئەگەر لە شوێنی خۆتا بکەوی وا ئەزانێ مردوویت‌و وازت لێ دێنێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «مەبۆ» نووسراوە «نەبۆ» واتە: نابێ.

(٥) واکوژ: دیسانەوەکوشتنەوە. واتە: بۆچی تا ئێستا نەت زانیوەکە راوچی دریغی ناکا لە دووبارەکردنەوەی کوشتنی نەچیر؟

(٦) یە: ئەمە. رەویە: ئوسووڵ. تاویا: تواوە. واتە: بەلاّم ئەم پێ ناخۆش بوونی زامی

دەخیل سـەر سـەخت بـەر هـەر بکـەر بـازی
نــازی دڵ سـەرد بـۆ جـە تـیرئەندازی(١)

نـــە دڵەی پــڕ زەوق کـــۆنــە نـەچیردا
هـــای لەزەت دارۆ تـیر وە شـۆن تـیردا(٢)

[٣]

## دڵە، راگەکەت(٣)

دڵە، راگـــەکـــەت خـــەیلێ تـــاریکەن
پـــردەکـــە ســەختەن، خـــەیلێ بــاریکەن(٤)

ســـارای هـــیدایـــەت تـــاریك مـــەوینوون
رای نـــەجات یـەکـجار بـاریك مـەوینوون(٥)

---

☞

دۆستو بە دوای دەرماناگەڕانە، ڕەوشتی ئەوانەیەکە تازە فێری دڵداری بوونو هێشتا تیا قاڵ نەبوون، وە لەگەڵ شێوەی ئەوکەسانەدا یەك ناکەوێ کە لە عەشقا تواونەتەوە.

(١) بازی: یاریوگاڵتە. نازی: نایەڵی. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دواییەوە.

(٢) لەزەتدارۆ: بەلەزەتە. شۆن: دوای. واتە: دەخیلت بم هەر سەرسەختو کەللەرەق بەو بۆ خۆت یاری بکە، وە مەیەڵە دۆست دڵی سارد ببێتەوە لە تیر هاویشتن، چونکە لە دڵی پڕ زەوقی کۆنە عاشقا زۆر شتێکی خۆشو بەلەزەتە یار یەك لە دوای یەك تیری پێوە بنێ. مەبەسی ئەوەیە دڵداری قاڵ بوو هەتا زۆرتر ئازار بچێژێ لە یارەوە زیاتر لەزەتی پێ ئەگات.

[٣]

(٣) مەولەوی لەم قەسیدەدا لۆمەی خۆی ئەکاو سامی ڕۆژی قیامەت دێنێتەوە بەرچاو، وە خۆی بانگ ئەکا بۆ خواپەرستیو بەندەگی ڕاست.

(٤) ڕاگەکەت: ڕێگاکەت، مەبەس گۆڕیەتی کە ڕێگایە بۆ قیامەت. خەیلێ: گەلێك. پردەکە: مەبەس پردی سیراتە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «خەیلێ»ی دووهەم نووسراوە: «یەکجار».

(٥) سارا: سەحرا، دەشت. هیدایەت: ڕێ بە دەرکردن. مەوینوون: ئەبینم. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «یەکجار» نووسراوە «یەکسەر».

**چـــۆڵە چـــراوێ پـــەرێ وێت ســاز دەر**
**وە قــەد تــوانــای وێت بــاربەندی کــەر**[(١)]

**ئـــەر گـــونا رای راس بــەردەنی جــەویر**
**شـۆن پـای کـردار هـام فـەردان هـور گـیر**[(٢)]

**بـــەڵ لەو دیـــوان‌دا دێوانــەی ســەرشێت**
**خــەجاڵەتــی بــەزم یــاران نــەیۆ پــێت**[(٣)]

**بــارێ ئــەر غــەفڵەت دام تــەندەن نــە رێت**
**نـــیەنی وە تـــەنگ شــەرمەساری وێت**[(٤)]

**یـــاد ئـــەو ســـەروەر وە دەروون بــاوەر**
**ئــەر واچـان پـەنەش نـەو بـەزم مـەحشەر**[(٥)]

**یـــە مـــەنسووب تــۆن ئـینە کــردەشەن**
**چــەنی تــوانــای ســەر هـۆردەردەشـەن**[(٦)]

---

(١) چـۆڵە چـراو: چـرای بـچکۆلە، بـە قـوتیلە ئـەڵێن. پـەرێ: بـۆ. بـاربەندی کـەر: بـار بپێچەرەوە. واتە: قوتیلەیەك پـەیدا کـە بـۆ خـۆت‌و ئـەوەندەی پـێت ئـەکـرێ کـۆڵ‌و بـار بپێچەرەوە. مەبەسی لە خۆ ئامادەکردنە بۆ ئەو دنیا.
(٢) گونا: گوناه. واتە: ئەگەر گوناح رێی راستی لە یاد بردوویتەوە شوێن پـێی کـردەوەی باشی هاورێیان هەڵگرە.
(٣) بەڵ: بەڵکو. نەیۆ: نەیەت. پێت: بۆت. واتە: بەڵکو لە دیوانی رۆژی حیساب‌دا، هەی دێوانەی سەرشێت، لەکۆڕی بەزم‌و رابواردنی یاران‌دا خەجاڵەتی نەیەت بە سەرتا.
(٤) بـارێ: لە سـوورەتێکـا. دام: داو. تـەندەن: تـەنیوەتەوە. مـەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٥) باوەر: بێنە. واچان: بڵێن. پەنەش: پێی. نەو: لەو.
(٦) یە: ئەمە. ئینە: ئەمە. هوردەردە: هەڵبڕین. واتە: وە ئەگەر لە سوورەتێکا بێ ئاگایی‌و قیامەت لە بیر چوونەوە دوای لە رێتا تەندووەو تۆیش بە تەنگی شەرمەزاریی خـۆتـەوە نیت، هەر هیچ نەبێ ئەوە بێنە یادی خۆت کە لە رۆژی مەحشەرا بە پێغەمبەر بڵێن ئەمە سەر بە تۆیەکەچی ئەوەکردەوەیەتی.

ئـــەو بـــە شـــەرمەوە مـــدیۆ بـــە وەردا
مـــن مشـیۆ کـام خـاك کـەروون وە سـەردا(١)

ئـــیسە مـــوینی چـــێش پـەنەم ئـامان
هـــانا هـــاوارەن هـــای نـەی‌چی ئـــامان(٢)

جـــفت مـــەعسیەت، جـــە تـــاعەت تـاقم
روو ســـیای مـەجلیس جـەرگەی عـوشاقم(٣)

بـــینای وجـــوودم خـــەجڵەت ئـەساسەن
بـــەختم مـــوخالیف، نـــامەدیم راســـەن(٤)

«صـــبا»ی هـــەناسەم نـە دەروون سـەد تـەرز
کـــەردەن کـــڵپـــەی نـار ئـیبراهـیمی بـەرز(٥)

پـــەنجەت بـــەو نـــەغمەی بـــین وە تـــینەوە
بـــاوەرە ئـــــەی بـــەیت وە حـــەزینەوە:(٦)

---

(١) مدیۆ: ئەڕوانێ. بە وەردا: بە بەردەمی خۆیا. مشیۆ: ئـەشێ. واتـە: ئـەو کـاتە ئـەو لە شەرمانا سەر دائەنەوێنێ، جا ئەبێ من خاکی کوێ بکەم بە سەری خۆما.

(٢) موینی: ئەبینی. واتە: ئێستا ئەبینی چیم بە سـەر هـاتووە، هـاوار هـەی شـمشاڵژەن بگەرە فریام.

(٣) جفت: جووت. مەعسیەت: گوناه. واتە: لەگەڵ تـاوانـا بـووم بـە هـاو جـووت‌و تـاك کەوتووم لە خوا پەرستی‌و رووڕەشی کۆڕی ئەنجومەنی دڵداران بووم.

(٤) موخالیف: پێچەوانە. نامەدی: بۆ نەهاتن. واتە: بنچینەی بوونم لە سەر خـەجاڵەتـی دامەزراوەو بەختم یار نیەو نەگبەتیمە.

(٥) «صبا»: بای بەیانی. نار ئیبراهیمی: ئاگرێ بە تینی وەك ئـەوەی نـەمروود کـردیەوەو ئیبراهیمی تێ فڕێ دا. واتە: هەناسەی وەك بای سەبا بە تەوژمم بە هەزار جۆر کـڵپـەی ئاگری بە تینی دەروونمی بەرز کردەوە.

(٦) باوەرە: بێنە. واتە: کاکەی نەی‌چی پەنجە بخەرە سەر نەیەکەت‌و دەمی پێوە نێ‌و بە ئاوازە بەرزو بە هێزەکەت بە خەفەتباری‌یەوە ئەم شیعرەم بۆ بڵێ.

سـەهلەن مـن روو زەرد سـەر نـەوەرەنان
ئـای مـایەی تـەسدیع پـەیغەممەرەنان(۱)

[۴]

## دڵ دیار نیەن

دڵ دیـار نـیەن هـای نـەکـەردەبۆ
وە خـزمەت ئـازیز تـەشریف بـەردەبۆ(۲)

جـەو دمـا مـن داد وە لای کـێ بـەروون
نـا بـەڵەد تـەنیا را چـۆن دەر کـەروون(۳)

پای دڵ سفتەی دەرد سـەر هـەردان سـەختەن
وێت یـاونەوە هـای نـەسیم وەخـتەن(۴)

بکـیان پـەرێ مـن دڵ ئـەو دمـاوە
وێت، وێت ئـاسایی بشـۆ وە راوە(۵)

(۱) سەر نە وەرەنان: سەر دانەویوم. واتە: قەیدی نیە من خۆم روو زەردمو سەرم دانەواندووە، بەڵام ئاخ بووم بە مایەی زەحمەت کێشانی پێغەمبەر «درودی خوای لێ بێ».

[۴]

(۲) نەکەردەبۆ: نەی کردبێ، ناشێ.
(۳) جەودما: لەمەوپاش. بەروون: بەرم. را: رێ. وەرکەروون: دەرکەم. واتە: دڵەکەم شارەزای رێگای ماڵی یار بوو، کە ئەوم لەکیس چوو ئیتر من تەنیا چۆن رێ دەرکەم.
(۴) سفتە: سووتاو. یاونەوە: بگەیەنەرەوە. واتە: پێی دڵم بە ئاگری دەرد سووتاوەو سەر هەردەکانیش سەختن ناتوانێ پیایانا بڕوا. دەسا نەسیم دەسم دامێنت وەختیەتی خۆت بگەیەنەرەوە لام.
(۵) بکیان: بنێرە. بشۆ: بڕۆ. واتە: دڵەکەم بۆ بگێڕەوە دواوەو. خۆیشت خۆت ئاسایی بە رێی خۆتا بڕۆ...

مســـپارووت وە دەس کــزەی تــاسەی وێم
وە دووی گێجەلوول سـوب هـەناسەی وێم(١)

چـــون یـــاوای وە لای بـــاڵا عـــەرعەر تـەرز
پـــەرساش جـــواو دەر وە زایـــەڵەی بـەرز(٢)

گـــــلاراوش بـــــی چـــــەنی ئـــێش چـــەم
مـەوات‌و مـەوەرد خـەم وەکـووزەی خـەم(٣)

چـــەم جـــە ئـــێش دەرد مـــەحرومی پـاڵات
نـــــمەنمانۆ عـــــەکس خـــەیاڵ بـــاڵات(٤)

پـــــەردەی لێڵایـــــی گـــــرتەن دوو دیـــدە
خـــەڵوەتـــەن ســـا بـــۆ هـــەی بـەرگوزیدە(٥)

دیـــــدەم تــــاو ســــەیل هــووناوان وەردا
هـــــا ئـــاو بـــە دەردا ئـــاما جـــە ســـەردا(٦)

---

(١) مسپاroووت: ئەت‌سپێرم. واتە: ئەت‌سپێرم بەکزەی بیر کردنەوەو تـاسەم بـۆ یـار، وە ئەت‌دەمە دەسی گەردەلوولی هەناسەی بەیانیانم.

(٢) چون: کە. یاوای: گەیشتی. پـەرساش: پـرسی. مـەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شـیعری دوایی پێکەوە دێ. (٣) مەوەرد: ئەی‌خوارد. کووزە: گۆزە.

(٤) نمەنمانۆ: نانوێنێ. واتە: کە گەیشتیتە لای ئەو باڵا بەرزەو هەواڵی منی لێ پرسیت، بە دەنگی بەرز هاوار بکەو وەرامی بدەرەوە بڵێ لە بەر چاو ئێشـە گـلاراوی پـێ کـەوتبوو، گۆزەی خەم‌و مەینەتی نابوو بە سەریەوە ئەی‌خواردەوەو ئەی‌وت چـاوم لە تـاو ئـێشـی دووری تۆزی کەوشەکانت وێنەی خەیاڵی باڵاتی تیا دەرناکەوێ.

(٥) گرتەن گرتووە. بۆ: وەرە. بەرگوزیدە: هەڵبژاردە. واتە: پەردەی لێڵایی هاتووە بە سەر چاوەکانما، فرسەتە ئازیز وەرەکەس لەوێ نیە.

(٦) وەردا: بەردا. واتە: چاوەکانم لافاوی بە تاوی خوێناویان بەردا، ئەوەتا ئاو لە سەرەوە هات‌و لە دەرگاوە دەرچوو.

دڵ یــەند جــۆش گــەرم خــەمان دان پــیٚدا
ســــەمەندەر لانــــەش مــەگــێرۆ تــیٚدا[١]

فــیدات بــوون ئـازیز جـەمین پـەڕەی گـوڵ
دووریت کـاریٚ کـەرد ئـانە چـەم، ئـێد دڵ[٢]

حــاڵ چــینە تــەنگ‌تەر نــیەن پـێم ئــامان
قــەدەم رەنــجە کــەر ئــامان سـەد ئـامان[٣]

چــون جــەستەی خـەستەی مـەینەتان مـایە
بــــەڵکــم دیــدەو دڵ نــەشان وە زایــە[٤]

دیــــدە ســورمەی تــۆز پــاڵاکــە نــاسەن
دڵ جــای دەردتــەن مــەندەیشا خـاسەن[٥]

(١) پێدا: پیایا. سەمەندەر: پەلەوەرێکە ئەڵێن لە ناو ئاگرا هێلکە ئەکا. مەگێرۆ: ئـەگـریٚ. واتە: جۆشی گەرمای خەمو خەفەت ئەوەندە داویە بە دڵما، وتای لیٚ هاتووە سەمەندەر کردوویە بە هێلانەی خـۆی. لە هـەندیٚ نـوسخدا لە جـیاتی «پـێدا»و «تـێدا» نـووسراوە «پێش‌دا»و «تێش‌دا» وە لە جیاتی «لانەش» نووسراوە «لانە».

(٢) ئانە: ئەوە. واتە: ئازیزە ناوچاو وەك گوڵەکەم، بە قوربانت بم، دووریت کارێکـی لیٚ کردم ئەوە حاڵی دڵو دیدەمەکە ئەی‌بینی.

(٣) چینە: لەمە. رەنجەکەر: ئەزیەت بدە. واتە: گیانە دەسم دامێنت هەرگیز وەزعم لەمە ناخۆش‌تر نابیٚ، ئەزیەتی قاچی خۆت بدەو وەرە لام.

(٤) نەشان: نەچن. زایە: «ضایع»، فەوتاو. واتە: بەڵکو دیدەو دڵیشم نەفەوتێن وەك لەشی نەخۆشم فەوتاکە بووبوو بە مایەی خەمو خەفەت بۆم.

(٥) سورمە: کلە. مەندەیشا: مانەوەیان. واتـە: چـاوم تـۆزی کـەوشەکـانی تـۆ ئـەناسیٚو کردوویە بەکلە بۆ خۆی، دڵیشم جێگای دەردو بەڵای تۆیە، لەبەر ئەوە مانەوەیان چاکترە.

## [٥]
## دەرمان زامان(١)

دەرمـــان زامـــان دەردەکـــەی کـــاریم
هـــامراز نـــاڵەی شـــەوان بـــێداریـــم

راحـــەتی جـەستەی مـەینەت بـارەکـەم
تـــەسکینی دڵەی پـــڕ جـــە خـارەکـەم

نـــامەو هـــەدیەی دۆســـانەت یـــاوا
تـــەسدیعت کـێشـا خـەیلێ مـاڵ ئـاوا

رەویـــەی بـــوزورگیت وە جـا ئـاوەردەن
غـــەریب نـــەوازیت وە پـیشە کـەردەن

بـــەڵام بـــینایم، مـــن دۆس گـــیانیم
نـــەك چـون بـێشـەرتان نـانیو زوبـانیم(٢)

دڵم وە مـــۆبـــەت مـــەیل تـــۆ شـادەن
ئـــەی تـــەعاروفە جـــە لام زیـــادەن(٣)

خـوسووس مـن سـەرعیو لێوەو وێڵ تـۆم
ســـەودایـــی خـــەمبار ئـەڕاگـێڵ تـۆم(٤)

---

[٥]

(١) مەولەوی ئەم غەزەلەی بۆ دۆستێکی نووسیوەکە دیاریەکی بۆی ناردبوو، دووریش نیە ئەو دۆستە شێخی تەوێڵە بووبێ.
(٢) بینایم: ئەی رووناکی چاوم. نانیو زوبانی: ئەو دۆستەیەکە هەر بە زمان، وە بە هیوای وەرگرتنی دەسکەوتێك دۆستت بێ.
(٣) مۆبەت: محبت، خۆشەویستی.تەعارف: خۆ ناساندن، مەبەسی دیاری ناردنە.
(٤) سەرعی: فێ دار.لێوە:کەف چەرێن. ئەڕاگێڵ: بە دواداگەڕاو، لە بنچینەدا دوو وشەیە «ئەڕا» واتە «بۆ» وە «گێڵ» واتە «گەیشتن». لە هەندێ نوسخەدا نیوەی دووهەمی ئەم شیعرە بەم جۆرە نووسراوە:

پــــەی تـــۆ خـــاترم پـــڕ نـــێش‌و خـــارەن
پـــەی تـــۆ زیـــندەگـــیم چـــون ژار مـــارەن[۱]

دەروونــم دایــم جــە هــوون کــەیل تــۆن
حــەیاتم وە شــەوق هــەوای مــەیل تــۆن[۲]

هــەرگا دیــم وە چــەم شــێوەی بــاڵاکــەت
بــۆســام خــاك پــاو گــەرد پــاڵاکــەت[۳]

ئـــانە گـــــرد مـــایەی کـــامەرانـــیی‌مەن
ئـــانە گـــــرد وەشـــــیی‌و شـــادمانیی‌مەن[۴]

وەر نـــە ئـــیسە مـــن هـــوون دڵ وەردە
قـامەت سـەنگی بـار خـەمان خـەم کـەردە[۵]

دەروون وە مـــەودای دووریت بـــیەن ڕێش
هەی خاکم وە سەر سـەوقاتم پـەی چـێش[۶]

---

☞

سەودای ئەڕاگێڵ لەعل لێڵ تۆم

واتە: نەخۆش کەوتووی گەڕانم بە دوای لەعلی لێڵی لێوی تودا.

(۱) خاتر: دڵ. نێش: ئێش. زیندەگی: ژیان.

(۲) هوون: خوێن. کەیل: پڕ. هەوا: ئارەزوو.

(۳) گا: کات. بۆسام: ماچم کرد.

(۴) ئانە: ئەوە. گرد: هەموو. وەشی: خۆشی.

(۵) وەرنە: ئەگینا. وەردە: خواردوو. خەم: چەماوە. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی دا دێ.

(۶) مەودا: تێغ. ڕێش: بریندار. سەوقات: دیاری. واتە: ئەگینا ئێستە من کە خوێنی دڵی خۆم ئەخۆم‌و باری قورسی خەم‌و مەینەت پشتمی چەماندووەتەوەو دەروونم بە تێغی تیژی دووریت بریندار بووە، هەی قوڕم بە سەر دیاریم بۆ چیە؟

[۶]

## دڵە، وەردەی نەفس(١)

دڵە، وەردەی نــــەفس گـــوناه ئـــاوەردە
سـیفەت نـەڕووی زات وە پـەردە کـەردە(٢)

جــە ڕووی بــێ شــەرمی پــەردەت دردەوە
هــیچ نـەویت وە تـەنگ ئـەودیم پـەردەوە(٣)

ســـــەتاری لاو دا وە یـــــانەتەدا
کــــەریمی شـــوومی وە شـــانەتەدا(۴)

کـــردم وە عـــامی ڕەحـــمەتەکـەی وێش
وادەی بـەزم گــەرم خــزمەتەکـەی وێش(٥)

[۶]

(١) مەولەوی لەم قەسیدەدا لەگەڵ دڵی خۆی ئەدوێ‌و تانەی لێ ئەدا.

(٢) وەردە: خوراو. ئاوەردە: هێناو. واتە: ئەی دڵ کە نەفسی گوناهبار خـواردوویـتی، وە سـیفەتی خـوات کـردووە بـە پـەردە بـە ڕووی زاتـیەوە. مـەبەسی ئـەوەیەکـە سـیفەتی «بەخشەندەیی خوا»ت کردووە بە قەڵغان، وە بەو بیانووەوە خوات لە بەر چاوی خۆت لا بردووەو دەستت کردووە بە گوناح کردن.

(٣) دەردەوە: دادڕی. نـەویت: نـەبوویت. ئـەودیم: ئـەودیو. واتـە: لەبـەر بـێ‌شـەرمی‌و بێ‌عاری خۆت پەردەی حەیات لە سەر ڕووی خۆت لادا، وە هیچ بە تەنگی ئەو خواوە نەبووی کە وا لەو دیوی پەردەی غەیبەوە، وە بە هەموو شتێکت ئەزانی. یان: نەبووی بە تەنگی ئەوەوە کە لەو دیوی پەردەی حەیاوە خۆت هەی کە هەموو گیانت گوناحەو عالەم پێت ئەزانێ.

(۴) لاو: لافاو. شانە: شان. واتە: یاخوا بەخشەندەیی خوا لافاو بێنێ بە سەر مـاڵەکـەتاو نەگبەتی بدا بە شانتا.

(٥) عامی: هەموو کەس گرەوە. وێش: خۆی. مەعنای ئەم شیعرە بـەسراوە بـە شـیعری دوایی‌یەوە.

ویـــەرد، نـــەزانـــاش سـیـوای ئـــەو هـــەنی
ئـــاخ زانـــایی ئـــەو چـێش کـەری چـەنی[١]

نـــــەو دەمدا جــــە یـــاد کـــردەی ویـــەردەم
جــە حــاڵەت سـەخت وە دۆزەخ بـەردەم[٢]

هـــــــــەر دەلاڵەتـــــــێش مـــــەلالەتێوەن
هـــەر لوتــفێش پـــەرێم خـــەجاڵەتــێوەن[٣]

هــەوای وەش نــەسیم وەســڵو حـوزووری
ســـەمووم‌ەن پـەرێم چـون شـنۆی دووری[٤]

هـــــای نـــایی نـــایێ، مــوتریب مــەقامێ
مـــــوغەننی تــــەرزێ، ســاقی‌یا جــامێ[٥]

تـــا دەمـــاخ نـــەی بـــەزم نـــەشئەیێ ســانو
مـــــانۆ، تـــــا ئـــــەبەد وە جـــــیا مـــانۆ[٦]

---

(١) ویەرد: بووورد. هەنی: هەیت. واتە: وا فەرزمان کرد لەکاتی بەزمی گەرمی بە حوزووری خوا گەیشتن‌دا ئەو بە رەحمەتی فراوانی خوی لێت بووردو لەو بەولاوەکەس نەی‌زانی تۆ هەیت، باشە خۆ خوا خۆی پێت ئەزانی، ئەی لە حوزووری ئەوا چۆن رووت دێ سەر بەزر کەیتەوە.

(٢) نەو: لە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) دەلالەت: دڵدانەوە.

(٤) سەموم: بای سەبوون. واتە: لەو کاتەدا کە بیر ئەکەمەوە لەکردەوەی رابردووم‌و لەو وەزعە ناخۆشەم کە ئەبێ بە هۆی چوونە دۆزەخم، ئا لەو کاتەدا هەر دڵدانەوەیەکم لەلایەنی خوای گەورەوە هۆی شەرمەزاری‌یەکە بۆم، وە هەر لوتفێکی خوا لە لەگەڵم ئەبێ بە مایەی خەجاڵەتی بۆم، وە هەوای خۆشی بە خزمەت گەیشتن وەك بای سەبوون وایە بۆم لەشم ئەسووتێنێ، چونکە خۆم بە شایانی ئەو بە خزمەت گەیشتن‌و لوتف‌و دڵ دانەویەوە نازانم. (٥) نایێ: نەی‌ژەن.

(٦) سانۆ: وەربگرێ. مانۆ: بمێنێتەوە. مانۆ: ئەمێنێتەوە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

شـــنۆش نــەی دەمدا، نــەی دڵەی تــەنگدا
ڕێشـــەی ویـــر غـــەیر بـدۆ وە هــەمدا
بـــەڵ دڵەی چـــەند ســاڵ ئـینتیزارەکـەش
لەزەتـــێ بـــەرۆ جـــە دیـدارەکـەش(١)

[٧]

## دڵە پڕ چینەن(٢)

دڵە پـــڕ چـــینەن پـــێشــانی شــەوقت
پـۆس مــەردەن وە بـان روخسـار زەوقت(٣)

شـــادیت مـــواچـــی ئـازیزش مــەردەن
کـەیفەکـەت مـاچی لەیـلش گـوم کـەردەن(٤)

گــــومانم وەی رەنگ زامت نــــەسرەوتەن
کۆچ خێڵ خانەی «ئەحمەد» دوور کـەوتەن(٥)

---

(١) بەرۆ: ببا. واتە: بۆ ئەوەی دەماخم نەشەیەکی وا لەم بەزمە وەرگرێ، تـا «ئـەبەد» بـە تەنیا ئەمێنێتەوە، هەر بمێنێتەوە وە شنەی ئەو بەزمە ریشەی داری بیرکردنەوە لە غەیری خوا لە دڵی خەفەتبارما هـەڵ کـەنێو نـەی هـێڵێتـەوە، تـا دڵە چـەند سـاڵ چاوەڕوانـی کردووەکەم لەزەتی وەر بگرێ لە دیداری خواو رووی بێ چاوی پێ بکەوێ.

[٧]

(٢) مەولوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی کۆچ کردنی ئەحمەد بەگی برای حـەمە پـاشای جافەوە وتووەکە چووە بۆ مەریوان بۆ هاوینە خۆری.

(٣) پڕ چینەن: پـڕە لە چـرچو لۆچ. پێشـانی: نـاوچاوان. پـۆس: پـێست. واتـە: ئـەی دڵ ناوچاوانی شەوقت لۆچی زۆری تێ‌کەوتووە، وە پێستی رووت وشك بووەتەوە بە سەر دەمو چاوی ئارەزووتا، مەبەس لە خەفەتباری‌یە.

(٤) مواچی، ماچی: ئەڵێیت. لە هەندی نوسخەدا نیوەی شیعری دووهەمی ئەم شـیعرە بەم جۆرە نووسراوە:
کەیفت مواچی لەیلش کۆچ کەردەن.

(٥) گومانم: وا گومان ئەبەم. نـەسرەوتەن: نـەسرەوتووە. واتـە: وا بـزانـم بـۆیـە وا زامت ناسرەوێ چونکە بنەو بارگەی ئەحمەد بەگ دوور کەوتووەتەوە.

نــــەواتــــم دەخــیل ئــامان ســەد ئــامان
وێت مـەدەر وە مـەیل نـەو تـووڵ نـەمامان[١]

وەس وە تــەمای وەســڵ مــەزاقت شـاد بـۆ
ژار مــــار دەرد دووریت وە یـــاد بـــۆ[٢]

نــەژنەفتی چــەنەم ســەد جـار دادم کــەرد
ئیسە های گەردش گـەردوون چـەپ گـەرد[٣]

وە تـای قـەڵمـاسك تـنیای سـەردی مـەیل
ئەو هۆردا پەی حەی، تۆ پەی کۆی دوجەیل[٤]

سـا خـاسەن ئـەمجار شـووم سیا بـەخت
تـۆ ئـالوودەی دەرد، مـن زامـان سـەخت[٥]

ســــاقی گـــەرد کـــۆچ یـــاران دیـارەن
هـــاوماڵان پـــەرێم نـــە ئـــینتیزارەن[٦]

---

(١) نەواتم: نەموت. وێت مەدەر: خۆت مەدە. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٢) وەس: بەس. مەزاق: چەشتن، مەبەس لە دڵە.

(٣) نەژنەفتی: نەتبیست. چەنەم: لێم.

(٤) قەڵماسك: قۆچەقانێ. تنیا: تەنراو. هوردا: هەڵدا. حەی: خێڵەکەی لەیل. دوجـەیل: شوێنەکـەی مـەجنوون. واتـە: چـەند دەسـەو دامێنت بـووم کـە خـۆت نـەخەیتە داوی خۆشەویستی باڵا بەرزانەوە، چەندم پێ وتی دڵت بە وەسڵیان خۆش مەکەو ژاری ماری دووریت لە یاد بێ، کەچی هەرچەند دادم کرد گوێت نەدایە، وا ئێستا گەردوون وەك بەرد خستنیە ناو قۆچەقانێی لەکـەم مـەیلی تـەنراوو هـەر یـەکـەی فـڕێ دانـە شـوێنێك کـە بەزەحمەت بتوانن بگەنەوە یەك.

(٥) سیا بەخت: چارە رەش. ئالوودە: گرفتار. واتە: جا چاکت کرد ئـەی دڵەی شـوومی چارە رەش خۆتت گرفتاری دەردو منیشت گیرۆدەی برینی نابار کرد.

(٦) پەرێم: بۆم. مەولەوی لەم شیعرەوە رووی قسە لە دڵیەوە وەر ئەگێڕێتە سەر ساقی، وە داوای لێ ئەکا بگاتە فریای. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

مــن خــۆ تـەنیا مـاڵ، وامـەندەی دڵ تـەنگ
بێ کەس، بار سـەنگی، پـای بـارەبەر لەنگ(١)

مــەرتۆ وە هــەی هــەی نـەشئەی جـام مـەی
نەی رای پلەی سـەخت فـەریاد رەسـیم کـەی

ســا پــێم دەر جــامێ مــنیچ چــون یــاران
هەی کەروون ئـەو کـۆچ تـا سـەر هـەواران(٢)

## [٨]

## دڵە چەند مەستیت(٣)

دڵە چــەند مــەستیت جــەم بــی نـە سـەردا
چــەند کــار ئــارۆت وسـتەو رۆی فـەردا(٤)

---

(١) وامەندە: داماو. بارەبەر: وڵاخ. لەنگ: شەل.

(٢) منیچ: منیش. کەروون: بکەم. ئەو: لە. واتە: ساقی، ئەوەتا تۆزی کاروانی یاران دیارەو چاوەڕێم ئەکەن، منیش تەنیا ماڵ ماومەتەوە بە دڵ تەنگی‌یەوە، کەسم نیەو کـۆچو بـارم قورسەو پێی وڵاخەکەیشم شەلە، کە ئـەمە ئـەوپەڕی دامـاوی‌یە... جـا لە وەزعـێکـی وا ناخۆشا مەگەر تۆ بە نەشەی جامی مەیەکەت ـ کە وەك هۆرەی کۆچ کردوو وایە ـ لەم پلە رێ سەختەدا بگەیتە فریام، سا بۆ خوا پیاڵەیەك مەیم بدەرێ با منیش وەك یاران دەس کەم بە هۆرەکردنو بخورِمەکوچو بارەکەمو برۆم تا ئەگەمە سەر هەوارەکـان. مـەولەوی لەم شیعرانەی‌دا هۆرەی کاروانی شوبهاندووە بە مەی لەوەدا کە وەك چـۆن مـەی یـارمەتی خەفەتبار ئەدا بۆ ئاسان کردنی مەینەتەکەی، هۆرەیش یارمەتی کاروانی ئـەدا لە بـڕینی رێگاو گەیشتنە جێ‌دا.

**[٨]**

(٣) مەلەوی لەم قەسیدەشا هەر بە سەر نەفسی خۆی‌دا دێتو لۆمـەی ئـەکـاو لە خـوا ئەپارێتەوەکە لێی ببوورێ.

(٤) ئارۆ: ئەمڕۆ. وستەو: خستەوە. واتە: ئەی دڵ چەند مەستی کۆبـووەتەوە لە سـەرتاو چەند ئیشی ئەمڕۆت ئەخەیتە سبەینێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «چەند» نووسراوە «یەند» واتە: ئەمەندە.

شــــەرتێوم نـــیەن جــە بــێ شــەرتی تــۆ
روو ســـیای تــۆبــەی ســەد فــەردا نــەبۆ(۱)

نــەکــەفتی ئــەو را پــەی حــەق پــەرستی
تــا بــی وە هــەمتای مــەستی پـای سستی(۲)

پــیری حـــەڵقــە ســـان خــەم پــەنەم وەردەن
پــەی دەرگـــای عـــەدەم ئـامادەم کــەردەن(۳)

ســــــەروەخت ئـــــەدای ئـــــەمانەتمەن
نـــــــەشر ســـــیاهەی خــــیانەتمەن(۴)

مــوغەننی ، تــە نــەخوای مــن وە نــەوایــێ
وەی چـــەند فــەردەوە هــۆردەر ســەدایــێ(۵)

یـــا رەبـــی نــەی شــەو تــاریکەی فــانی
هـــــەر تــۆ وەکـــردەی بــەدیم مــزانــی(۶)

---

(۱) شەرتێوم: شەرتێکم. واتە: بە هۆی بێشەرتی تۆوە شەرتێکم نیە روو رەشی لای تۆبەی سەد سبەینێ نەبوبێ. مەبەسی ئەوەیە هەرچی شەرت ئەکەم کە خەراپە نەکەمو تۆبە لەو خراپانە ئەکەم، بۆ سبەینێ ئەو شەرتە ئەشکێنمو دیسانەوە تۆبە ئەکەمەوەو شەرتەکەم لە حوزووری ئەو تۆبانەدا روو رەش ئەبێ.

(۲) نەکەفتی ئەو را: نەکەوتە رێ. بی: بوو. واتە: نەکەوتە رێی حەق پەرەستی تا پیری بوو بە هاورێی سەرخۆشی یەکەتو کەڵکت پێوە نەما.

(۳) حەڵقەسان: وەك ئەڵقە. واتە: پیری وەك ئەڵقە چەماندوومیەتەوەو ئامادەی کردووم بمکوتێ بە دەرگای نەبوونی دا کە گۆڕە. چەند جوانە لێرەدا مەولەوی ئەڵقەو دەرگای خستووەتە یەك، چونکە ئەڵقە بە دەرگادا ئەکوترێ.

(۴) ئەدا: دانەوە. نەشر: بڵاوکردنەوە. سیاهە: لیستە.

(۵) تەنخوا: لە جیاتی. نەوا: ئاواز. سەدا: دەنگ.

(۶) واتە: خوایە لەم تاریکە شەوەی دنیای فانی دا هەر تۆ شارەزای کردەوەی خراپمی.

ئــای ســوبح مــەحشــەر ســەر ئــەفگەندە وێم
شــەرمندەی حــوزوور خــوداو بــەندە وێم[(١)]

بــە رەحــمەکــەی وێت فــەرد تــەنیای تــاك
بــەشق مــەشق عــەشق دڵ پــاکــان پــاك[(٢)]

بــــەو فـــەسڵ فــیراق خـــاتر پــڕ خـــاران
بــــەو دیــای دمـــای یــەکــتری یــاران[(٣)]

ئــەر ســەد تــاوانــم جــە حــەد ئــەودەرەن
دەفـــتەرم جـــە رووی وێم ســـیاتەرەن[(٤)]

تـــۆ بـــویەر جـــە مـــن جـــە پــڕ ئــینسافی
مـــن روو زەردی وێم کـــافی‌یەن کـــافی[(٥)]

[٩]

## دڵە تەب خاڵەت[(٦)]

دڵە تـــــەب خـــــاڵەت وە لێو مـــــەوینوون
حـــاڵاتت یـــەکـــجار پـــەشێو مـــەوینوون[(٧)]

---

(١) سەرئەفگەندە: سەرداخستوو. وێم: خۆم.

(٢) بەشق: بۆ خاتری. واتە: ئەی خوای تاكو تەنیا سوێندت ئەدەم بە رەحمی خۆت، وە لەبەر خاتری مەشقی دڵداری پاکی دڵپاکان...

(٣) دیا: چاو بە یەك کەوتنەوە. دما: دوایی. واتە: خوایە سوێندت ئەدەم بەکاتی لە یەك جیابونەوەی دۆستە دڵ پڕ دڕکەکان، وە بەکاتی بە یەك گەیشتنەوەی لەوەو پاشیان.

(٤) ئەر سەد: هەرچەند. ئەو دەرەن: بە دەرە.

(٥) بویەر: ببوورە. کافی‌یەن: بەسە. مەولەوی بە عادەتەکەی خۆی لەم قەسیدەدا چەند شیعرێکی وتەوەکە لە شوێنی تریشا وتبوونی.

[٩]

(٦) مەولەوی لەم قەسیدەشا هەر لەگەڵ نەفسی خۆی قسە ئەکا.

(٧) دڵە: ئەی دڵ. تەب خاڵە: خاڵی تێ، ئەو زیتکانەیە بە سەر لێوی تادارەوە پەیدا ئەبن. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

کـــەردەنیش وە تـــەیر هـــەڵۆ هـــۆش بـــەردە
نـــا کـــەردە کـــەردە، کـــەردە نـــا کـــەردە(١)

رجـــات، گـــا بـــەی دیـــو، گـــا بـــەو دیـــمەدا
هـــــانە گـــــەردەلوول بـــــاد بـــــیمەدا(٢)

هـــا نـــەکـــەردەبۆت تـــۆ یـــەت کـــەردەبۆ
پـــــێچ عـــــەقیدەی وە دڵ بـــــەردەبۆ(٣)

پەی چێش هەر کـۆ وەسـف وەش نـیگارانـەن
چـــەنی عـــەقیدەی دڵ ئـــەوگارانـــەن(٤)

تـــۆ زەنـــنت چـــێشـەن ئـەویچ بـەو تـەورەن
ئەر مەیلەن، مـەیلەن وەر جـەورەن، جـەورەن

ســـتارەی رجـــات هـــەر دەم دارۆ ســـوو
دەمـــاخ شـــاد، وە بـــۆی «وَ لا تَـیْأَسُوا»(٥)

---

(١) کەردەنیش: کردوویەتی. واتە: ئەی دڵ ئەبینم وەك تادار زیتکەت بە سەر لێوەوەیەو حاڵت یەکجار پەشێوە، وە وەك باڵداری هەڵۆ فڕاندوو هۆشت لا نەماوەو بە جۆرێ سەرت لێ تێك چووە ئەوەی نەت کردووە وا ئەزانی کردووتە، وە ئەوەی کردووتە لە یادت چووەتەوە.

(٢) بەی دیم: بەم دیو. بیم: ترس. واتە: تەمای رەحمەتی خوات کەوتووەتە بەر گەردەلوولی بای ترس، وە وەك پووش تاوێك بەمدیوو تاوێك بەویوا ئەکەوی. مەولەوی لەم شیعرەدا ئەویەڕی وردیی بەکار هێناوە چونکە مرۆڤ خۆی لە بەینی ترس‌و تەمادا ئەبێ، کەچی ئەم هاتووە تەماکەی خستووەتە بەینی ترس‌و تەما.

(٣) یەت: ئەمەت. پێچ: گرێ. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە سێ شیعری پاشەوە.

(۴) هەرکۆ: لە هەرکوێ. وەش‌نیگار: جوان چاك. چەنی: لەگەڵ. ئەوگار: گرفتار.

(٥) ستارە: ئەستێرە. دارۆ: بیبێ. سوو: تیشك. «ولاتیأسوا»: بەشێکە لە ئایەتێکی قورئانی مەعناکەی ئەوەیە: بێ تەما مەبن لە رەحمەتی خوا. واتە: ئەی دڵ دەسم دامێنت نەکەی باوەڕت لەق بێ‌و گرێی تێ کەوێ، چونکە سیفەتی جوان چاکان بە پێی باوەڕی

ویـــەردە ویـــەرد، هـــەولێ پـەی بـاقی
ئەمجار یـە دەروێش، یـە نـەیچیو سـاقی[١]

هۆش وە سەدای دەف، گۆش وە نـەوای نـەی
دەس وە شـــیشەوە، لێو وە جـــام مـــەی

ســـەفات جـــەفا دۆ وە قـــەفای هـەستی
نـۆشـا نـۆشت بـۆ دەواچـەی مەستی[٢]

وە کـــردە وە فـــام ئـــەر گـا نـاوەردەن
بـــاك نـــیەن وەفـام وە بـاوەڕ کـەردەن[٣]

•••••••—●—•••••••

☞

دڵدارەکانیانە پێیان، ئەوان گومانی چییان پێ بەرن ئەوانیش بەو جۆرە ئەبن، ئەگەر بە تەمای خۆشەویستی بن خۆشیان ئەوێن، وە ئەگەر بە تەمای سزا بن سزایان ئەدەن.

(١) ویەردە: بەسەر چوو. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.

(٢) دۆ: بدا. قەفا: پشتی مل. دەواچە: دەرمان. واتە: ئەوەی بەسەر چوو بـە سـەرچـوو، هەوڵێ بۆ پاشماوەی عومرت بدە، ئەوە دەف ژەنو شمشاڵ لێدەرو مەی گێڕ، نـۆبـەتە لەگەڵیان، هۆش بدە بە دەنگی دەفو گوێ بدەرە ئاوازی شمشاڵو شیشەی مەی بگرە بە دەستەوەو جامی مەی بنێ بە لێوتەوە، تا شـادیت شـەقازلەیەك بـدا لە بـنا مـلی بـوونو دەرمانی مەستی نۆشی گیانت بێو گیتیت لە بیر بچێتەوە.

(٣) واتە: ئەگەر جار جار بەکردەوە وەفام نەهێنابێتە دی، قەید ناکاو ترسم نیە، چـونکە وەفام کردووە بە باوەڕی خۆم. ئەم شیعرە ئیشارەتە بۆ حەدیسی پێغەمبەر کە فەرموویەتی: «لا يَضُرُّ مَعَ الْاِيمانِ ذَنْبٌ» واتە: لەگەڵ باوەڕدا گـوناح زیـان نـاگـەیەنێو مـوسوڵمـان لە موسوڵمانیەتی ناخات.

[١٠]

## دەرد وە بان دەرد(١)

دەرد وە بـــــان دەرد زامـــــان کـــاری
گرد جە لام جەم بی، یـە تـەشریف مـاری(٢)

ئــای یــە چـێشت کـەرد تـەشریفت نـاوەرد
دەردت دا وە دەرد، مـــنت مـاتەم کـەرد(٣)

ئـــیسەیچە دیـــدەم چـــەم هـــا وە راوە
هـــەڵای ســـەروەشم بـــەو تـــەمەنناوە(٤)

ئـــەمرت مـــوتاعەن «اَطَـــعْنا» وەنـــدم
دۆعـای چـەمە زەخـم جـە پـیران سـەندم(٥)

---

[١٠]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ ئامینە خان ناوێك نووسیوەکە یـەکێك بـووە لەکچە بەگزادەکانی جاف، وە بە هۆی شیر خواردنەوە مەحرەم بووە بە مەولەوی، ئامینە خـان گفتی دابوو بە مەولەوی کە بچێ سەری لێ بدا، بەڵام پاشان بۆی ئەنووسێ کە ناتوانـێ بچێ بۆ لای، وە داوای دوعایەکی چاوەزاری لێ ئەکا، مەولەویش دوعاکەی بۆ ئەنێرێ لەگەڵ ئە پارچە هەڵبەستەدا.

(٢) ماری: ئەهێنی. واتە: دەردی کـاری زامـەکـانم و دەردی چـاوەڕوانـی کـردن هـەموو کۆبوونەوە لەسەرم بە هۆی ئەوەوەکە بڕیار بوو تەشریف بێنی.

(٣) واتە: ئای ئەوە چیت کرد تەشریفت نەهێناو دەردت‌دا بـە دەردەکـانم و خـۆیشـمت خەفەتبار کرد.

(٤) ئێسەیچ: ئێسـتاش. هـەڵای: هـێشـتا. واتـە: ئـێسـتاش هـێشـتا هـەر چـاوم لە ڕێـتـەو سەرخۆشی هیوای هاتنتم.

(٥) موتاع: بە گوێ کراو. «اطعنا»: بە گوێمان کرد، ئیشارەتە بە ئایەتی «سَمِعْنا وَ اَطَـعْنَا». وەندم: خوێندم. چەمەزەخم: چاوەزار. واتە: فەرمانت ڕەوایەو هەرکە بیستم وتم بە سەر چاو، وە چووم دوعای چاوە زارم بۆ وەرگرتی لە شێخ.

تــەعویز بــەند ریشــەی دڵەی ســەد پــارەم
بــەرگش پــەڕەی جــەرگ وە دەرد ئـاوارەم(١)

حــافیز بــۆ وە عــەشق مــەستان یــا هــوو
بــپێچــەش نــە دەور بـاهووی بــێ ئـاهوو(٢)

ئـــــینە عـــادەتێن وە زاهـــیر ئـــامان
وەرنــە هــەی ســەرخێڵ نـازک ئـەندامـان(٣)

تــۆ ئــیند نــازکیت جــە حــەد ویــەردەن
بــینایی خــەیاڵ راگــەش گــوم کــەردەن(٤)

ســـەفات خــەجاڵەت دان وە جــام جــەم
دیدەی بەد مەر عەکس وێش بدیۆ وە چـەم(٥)

دیــدەی بــەد دەردش نـــا دیــاری بــۆ
جــە کــۆ مــوینۆت تــالێت کــاری بــۆ؟(٦)

---

(١) تەعویز بەند: بەنی بەستنی نووشتە. پارە: پارچە. مەولەوی لەم شیعرەو شیعری دوایی‌دا لە ئامینە خان ئەگەیەنێ کە چی بکا لە دوعاکە. واتە: ریشەی دڵە سەد پارچە بووەکەم بهۆنەرەوەو بیکە بە قەیتان بۆ بەستنی دوعاکە، وە پەڕەی جگەری دەردەدارم بکە بە بەرگ‌و دوعاکەی پێوە بپێچە.
(٢) حافیز: پارێزگار. بپێچەش: بیپێچەرەوە. یاهوو: ئەی خوا. باهوو: قۆڵ. ئاهوو: عەیب. واتە: خوا بکا بۆ خاتری عەشقی ئەو پیاو چاکانەی کە سەرمەستی هاوار لە خوان، ئەو دوعایە پارێزگاریت بکا. ئەنجا ئەڵێ: دوعاکە بپێچە بە دەوری قۆڵتا.
(٣) وەرنە: ئەگینا. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٤) ئێند: ئەوەندە. واتە: ئەم دۆعا نووسینە شتێکە بۆ عادەت‌و هۆیەکی زاهیری‌یە، ئەگینا ئەی سەرقافڵەی جوانخاسان جوانی تۆ ئەوەندە لە ئەندازە لای‌داوە هەتاوەکوو چاوی خەیاڵیش رێگای گوم کردووەو نات دۆزێتەوە.
(٥) دیدەی بەد: چاوی پیس. بدیۆ: ببینێ. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.
(٦) جەکۆ: لەکوێ. واتە: پاکی‌و بێ‌گەردی رووی تۆ ئاوێنەکەی جەمشیدی خەجاڵەت کردووەکە هەموو شتێکی تیا بەدی ئەکرا، ئیتر چاوی پیس کەی سەیری تۆ بکا مەگەر هەر

[١١]

## دەورێ دەر ساقی

دەورێ دەر ســـــاقی وە لای مـــــەحزوونەدا
لەیـــل ئـــاسا بـــویەر وە لای مـــەجنوونەدا[١]

جــامێ جـــە ســـەهبای دیـــای بـــاڵاکـــەت
ئـــــالوودەی غــــوبار تــــۆز پــــاڵاکـــەت[٢]

بــــەو نـــــازو عــــیشوە وێت پــێم دەردەوە
جـــەستەی پـــەژموردەم ئـــیحیا کـــەرەوە[٣]

جـــــەی «قـــلب الاســـد» تـــاوسان دووری
فـــێنك کـــەرەوە جـــەستەی مـــەهجووری[٤]

بـــــەڵکـــــەم شــــەرارەی نــــائیرەی فــــیراق
نـــەسۆچـــنۆ تـــەمام ســـەوزەی ئـــیشتیاق[٥]

---

☞

رووی خۆی لە ناو چاوتا ببینێتەوە. کەواتە ـخوا تووشی دەردێکی بکا کەس سەری لێ دەرنەچێ ـ چۆن ئەتوانێ بتبینێ تا کارت لێ بکا؟.

[١١]

(١) واتە: ئەی مەیگێڕ سووڕێ بخۆ بە لای منی خەفەتباراو، وەك لەیل بە لای منی مەجنوونا تێپەڕە.

(٢) سەهبا، «صهباء»: مەی. دیا: دیتن. ئالوودە: تێکەڵ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) پەژموردە: سیس‌و ژاکاو. واتە: بە نازو عیشوەوە پیاڵەیەك شەرابی دیتنی باڵای خۆتم بدەرێ بەو شەرتە کە تۆزی کەوشەکانتی تێکەڵ بووبێ، وە بەو پیاڵە شەرابە لاشەی سیس بووم ببوژێنەرەوە.

(٤) «قلب الاسد»: ناوەڕاستی هاوین کاتێك کە ڕۆژ ئەچێتە برجی ئەسەدەوە. تاوسان: هاوین. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی دا دێ.

(٥) نایرە: نائیرە، ئاگر. نەسۆچنۆ: نەسووتێنێ. سەوزە: شینایی. واتە: لەم قرچەی هوینی گەرمی دووریەدا بە شەرابی دیتنت لەشم فێنك کەرەوە، بەڵکو بزیسکەی ئاگری جیایی شینایی سۆزم بە تەواوی نەسووتێنێ.

بـــەڵام بـــەو شـــەرتە مـــەیلت مـــودام بـــۆ
مـــــنیچ بـــەو مـــەیلە دنـــیام وەکـــام بـــۆ(١)

نـــــەك غـــــەزاڵ ئـــــاسا دیـــاو رەمت بـــۆ
گـــــا مـــەیل شـــادی، گـــا مـــاتەمت بـــۆ(٢)

ئـــــیتر کـــــافی بـــۆ جـــەورو جـــەفاکـــەت
بـــەڵ تـــا وە ســـەر بـــۆ مـــەیل و وەفـاکـــەت(٣)

ئـــــەر چـــەند هـــەفتەیێ عـــومرم مـــەندەبۆ
بـــــەڵکـــــەم دووری تـــۆ لێم نـــەسەندەبۆ(٤)

[١٢]

## دووریت دیارەن(٥)

دووریت دیـــارەن چـــەند ســـاحیب نـێشـەن
تۆی دەروون وە خار نـێشـێو تـەر رێشـەن(٦)

هـــەرچـــی بـــوینوون شـــێوەی تـــۆ پـێشـەن
دڵ وە هـــەتیتەی حـــەسرەتدا کـــێشـــەن(٧)

---

(١) مودام: دەوامدار. وەکام: بە ئارەزوو.

(٢) غەزاڵ: ئاسك. رەم: راکردن. واتە: نەك وەك ئاسك هەر خۆت دەرخەیتو راکەیت...

(٣) تا وە سەر بۆ: تا سەر بێ.

(٤) مەندەبۆ: مابێ. لێم نەسەندەبۆ: لێم نەسێنێ.

[١٢]

(٥) مەولەوی ئەم قەسیدەشی لە لاواندنەوەی عەنبەر خاتونی خێزانیا وتووە.

(٦) خار: درك. نێشێو تەر: ئێشێکی تر. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی یەوە.

(٧) پێشەن: پێوەیەتی. هەتیتە: تەختە دارێکە شاڵی بە توندی پێوە ئەپێچن بۆ ئەوەی دەق بگرێ. کێشەن: راکێشەرە. واتە: هەرچەند کە دیارە ئێشو ئازاری دووریت چەند زۆرە، بەڵام من جگەرم بە درکی ئازارێکی تر بریندار بووەکە ئەویش ئەوەتە هەرچی ببینم شێوەی تۆی پێوە بێ دڵم لە دار هەتیتەی داخو خەفەت ئەکێشێ.

هـــەر مـــاهێ نـــەو بـــۆ حـــاڵم پـــەشێوەن
چون هیلال شێوەی ئـەبرۆی تـۆش پـێوەن(١)

نـــە شـــــەو راحـــــەتم، نـــە رۆ دڵشـــادم
شـەو زوڵفـو رۆ رووت مـەوزۆ ئـەو یـادم(٢)

شـــمشادو نـــەرگس وەنـــەوشەی چـــەمەن
ســـەیرشان ئـــازار بـــینایی چـــەمەن(٣)

ئـــاد مـــارۆ بـــە ویـــر تـــەرزەکـــەی بـــاڵات
ئـــەو دیـدەی مـەستت ،ئـێد خـاڵ ئـاڵات(٤)

ســـۆچـــنۆم حـــەسرەت دەرد جـــیاییت
نـــەك چـــون بـــلێســـەی یـــاد تـــەنیاییت(٥)

وە مـــــەرگت، دیـــدەم، هـــام نـــە گـــوزەردا
مـــنیچ لام لای تـــۆن ئـــارۆ یـــا فـــەردا(٦)

---

(١) ماە: مانگ. نەو: نوێ، تازە. واتە: هەر مانگێ نوێ ببێتـەوە مـن حـاڵم تـێك ئـەچێ، چونکە مانگی یەكشەوە لە ئەبرۆی تۆ ئەچێ.

(٢) مەوزۆ: ئەخاتە. واتە: نە بە شەوو نە بـە رۆژ رەحـەتیم نـیە چـونکە شـەوی تـاریك زوڵفی رەشت دێنێتەوە یادمو رۆژی رووناك رووی درەوشاوەت.

(٣) شمشاد: دارێکی بەرزە. سەیرشان: تەماشا کردنیان. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە دوایی‌یەوە.

(٤) ئـاد: ئـەو. مـارۆ: دێنـێ. ئـاڵا، ئـاڵ. واتـە: تـەماشا کـردنی دار شـمشادو نـەرگسو وەنەوشەی باخەکان ئازاری چاوم ئەدا، چونکە دار شمشادەکە باڵاتـم دێـنێتـەوە یـادو، نێرگسەکە چاوی مەستتو وەنەوشەکە خاڵی ئاڵت.

(٥) سۆچنۆم: ئەمسووتێنێ. واتە: راستە داخی دەردی جیایی ئەم سووتێنێ، بەڵام ناگاتە ئەندازەی ئێشی یادکردنەوەی تەنیاییت لە گۆڕا.

(٦) تۆن: تۆیە. ئارۆ: ئەمڕۆ. واتە: ئازیز قەسەم بە مەرگت مـنیش لە سـەر ڕۆیشتنم، وە ئەمڕۆ بێو سبەی بێ شوێنم لای تۆیەو ئەمرمو دێمە لات.

مـــــوتريب مـــەقامێ دەردم نـــاچارەن
ســـــاقيا جـــامێ دۆس ئـــينتيزارەن[١]

[١٣]

## دەلیل وادەی[٢]

دەلیـــــل وادەی ســــەر ســـەراوەکـــەم
بـــينايی ديـــدەی شـــەو بـــێ خـــاوەکـــەم[٣]

رەفـــێق ســــەرحــــەد ئــــەقليم دەردان
نـــاخودای کـــەشتی بـەحرەکـەی هـيجران[٤]

ئـــــوستاد تــــەعليم دەرس مـــــەجنوونيم
دەسگــــير راگـــەی ســـەختیو زەبـــونيم[٥]

---

(١) ناچارەن: چار ناکرێ. واتە: کاکەی گۆرانیبێژ سەدای مەرگم هەڵدە، چونکە دەردم بێ دەرمانە، کاکەی مەی گێڕ تۆیش پیاڵەیەك شەرابی مەرگم بدەرێ، چونکە یار چاوەڕوانمە با بمرمو بڕۆم بۆ لای.

[١٣]

(٢) جارێکیان شێخی «بهاءالدين»ﷺ ئەنێرێ بە دوای مەولەویدا بۆ ئەوەی بە سەفەر بینێرێ بۆ شوێنێكو ئیشێکی پێ بسپێرێ، مەولەویش پێی ناکرێ بڕوا، لە وەراما ئەم پارچە هەڵبەستە بۆ شێخ ئەنێرێ.

(٣) وادەی سەر سەراوەکەم: کاتی بردن بۆ سەر ئاو بۆ شۆرین پاش مردن. واتە: ئەی رێنموونی کەرەم لەکاتی مردنا، ئەی بینایی چاوەکانم کە شەو خەویان نیە.

(٤) سەرحەد: سنوور. ئەقلیم: وڵات. ناخودا: کەشتیەوان. واتە: ئەی هاوڕێم لە سنووری وڵاتی دەردو مەینەتاکە ئەمپارێزی، وە ئەی کەشتیەوانی ناو دەلیای دووری کە ئەمگەیەنیتە جێ.

(٥) ئوستاد: مامۆستا. مەجنوون: عاشق بوون وەك مەجنوون. واتە: ئەی مامۆستایەك کە دەرسی عەشقت فێر کردم...

شـــەمع بـــەزمگەی مـــەهجووری‌و دووری
مـــیعمار ئـــەساس پـــایەی ســـەبووری(١)

مـــــەسقەڵچـــــی ســـەواد ئـــاینەکـــەی دڵ
غـــەواس دانـــەی دەریـــاچەی مـۆشکـوڵ(٢)

خـــەم نـــە وەخت بـــەزم فـــەرمان فـــەرماشەن
شـــادیم ئـــەلوەدای جـــە لەیـــل جیاشەن(٣)

مـن خـۆ پـای خـەمان سـامان سـام کـەردەن
دەك بـــمرم هـــانات بـــەمن ئـــاوەردەن(٤)

وە مـــــەرگت دایـــــم زامـــم هـــەر بـــەسۆن
دەرد ویٚم کـــەمەن ئـــەمجار نـــۆبـەی تـۆن(٥)

پـــێســـــە مــــزانــــی هـــیچم کـــەم نـــیەن
ویٚران یـــــانەکـــەم ویٚت وە چـــەم دیـــەن(٦)

---

(١) شەمع: مۆم. میعمار: وەستا بەنای بەناوبانگ. واتە: ئەی روون کەرەوەی دڵم لەکاتێکا کە بە هۆی دووری دۆستانەوە دنیام لێ تاریك ئەبێ، وە ئەی دروست کەری بـنچینەی دیواری خۆ ڕاگرتن‌و بوردەباریم.

(٢) مەسقەڵچی: سپی‌کەرەوە. سەواد: ڕەشایی. غەواس: ئـەوەی خـۆی لە بـنی دەلیـادا نوقم ئەکاو گەوهەر دەردێنێ. واتە: ئەی ڕۆشن کەرەوەی ئاوێنەی ڕەش بووەوەی دڵم، وە ئەی دەرهێنەری گەوهەری مەعنا لە دەلیای ئەو باسە عیلمی‌یانەدا کە زانینیان گرانە.

(٣) فەرمان فەرما: حوکمڕان. ئەلوەدا: «الوداع»، مـاڵاوایـی. واتـە: خـەم‌و مـەینەت وا لە بەزمی فەرمان ڕەوایی‌و سەرداریدا، وە شادی خەریکی ماڵاوایی کردنە بە بۆنـەی جـیا بوونەوەیەوە لە من.

(٤) سامان‌سا: تـەخت وەك زەوی. واتـە: قـاچی خـەفەت منی لەگـەڵ زەویـدا تـەخت کردووەو پلیشاندوومیەتەوە، کەچی تۆیش هانات هێناوەتە منی بێ دەسـەڵات کـە ئـەو ئیشەت بۆ بکەم.

(٥) سۆ: سوێ. واتە: قەسەم بە مەرگت زامی دڵم هەمیشە سوێی پیا دێتەوە، ئـەنجا بـە مەعناوە ئەڵێ: دەردی خۆم کەمەو هەر هی تۆی ناتەواوە، با ئەویشی بێتە سەر.

(٦) پێسە مزانی: وائەزانی. دیەن: دیوە. واتە: وائەزانی هیچم کەم نیەو حاڵم ڕێك‌و پێکەو

## [١٤]

## دەخیلم خاڵۆ(١)

دەخـــــیلم خـــــاڵۆ زەدەی زام ســــەخت
حاڵ شێوێنەکەی مـەعدوومی بـەد بـەخت(٢)

راز رێزەی شـــەکـــەر، شـــای شـەکـەر رازان
فـــتێڵە پـــەی زام کـــەسێ مســـــازان(٣)

وەخـــــتێ دڵ وە تـــیر مـــەینەتان رێش بـــۆ
جـەو دمـــا تـــەمای سـارێشـی پـێش بـۆ(٤)

خـــۆ جـــای پـــەیکانان ژار وەردەکـــەی تـــۆ
تـــا بـەر پـەڕەی دڵ پـەی کـەردەکـەی تـۆ(٥)

---

☞

لە سەر خۆیەتی، خۆ تۆ بە چاوی خۆت ماڵە وێرانەکەمت دیوەو ئەزانی چۆنە، ئیتر چۆن تەکلیفی وام لێ ئەکەی؟

**[١٤]**

(١) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ شێخ یوسفی نوسمەیی برادەری نووسیوە لە وەرامی نامەیەکی ئەوا کە هاواری لە دەس وەزعی خۆی کردووە تیایا، وە داوای چارەی کردووە لێی.

(٢) زەدە: لێ دراو. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێت.

(٣) راز: قسە. رێزە: وردە. فتێڵە: پەڕۆیەکی لوول دراوە جاران ئەیان کرد بە ناو برینا بۆ پاك کردنەوەی زووخ و کیمەکەی. مسازان: دروست ئەکەن.

(٤) جەودما: لەوەوپاش. پێش: پێی. واتە: دەسم دامێنت ئەی خاڵۆی گرفتاری زامی سەخت، وە ئەی ناخۆشکەری حاڵی من بە دەنگ و باسی گرفتاریت، وە ئەی کەسێك کە قسەت وەك وردە شەکر وایەو شای شیرین گوفتارانی، فتێڵە بۆ زامی کەسێك دروست ئەکرێ کە ئەگەر دڵی بە تیری مەینەت بریندار بوویێ بە تەمابێ لەوەو پاش سارێش ببێ، خۆ تۆیش لە وانە نیت.

(٥) پەیکان: تیر. پەی کەردە: بڕێوو کون کردوو: مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

وەختێ فوارەی هووناوان پێشەن
زوخاو جۆش بدۆ، ئانە سارێشەن[١]

دەرگای مەینەتان جای نەدامەتەن
ناسۆریش یادئار رۆی قیامەتەن[٢]

فتێڵە پەی چێش رۆ وە یانەم رۆ
یەك جار داد نە دەس ئیستیغناکەی تۆ[٣]

تۆ پیرت بازەم دڵ وەشی دڵەن
غەم زەدەی زامان وەشیش موشکوڵەن[٤]

[١٥]

## دیاکەی وە شەرم

دیاکەی وە شەرم جە پەنجەرەی ناز
تاتا ریشەی جەرگ بەراوەرد وە گاز[٥]

---

(١) ئانە: ئەوە واتە: خۆ سارێش بوونی راستەقینەی جێگای تیرە زەهراوییەکانی تۆکە تا پەڕەی دڵی سمیوە، کاتێك ئەبێت کە فوارەی خوێناوی لێوە بچێت بە ئاسماناو زوخاوی لێوە هەڵقوڵێ.

(٢) نەدامەت: پەشیمان بوونەوە. یاد ئار: بیر خەرەوە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) واتە: کرانەوەی دەمی زام وەك دەرگا وایە بۆ پیا رۆیشتنی پەشیمان بوونەوە لە گوناه، بە ناسۆر کەوتنەوەشی رۆژی قیامەت دێنێتەوە یاد. کەواتە بۆچی ئەتەوێ فتێڵە بخەیتە دەمی زامتەوە، هەر قوڕ بە ماڵی منا بدرێ، وە هاوار لە دەس بێ باکی تۆکە ناتەوێ دەمی زامت کراوە بێ تا هەمیشە قیامەتت بخاتەوە یاد.

(٤) بازەم :لێم گەرێ. وەشیش: چاك بوونەوەی. واتە: بۆ خاتری پیرەکەت لێم گەڕێ، چونکە ئەمەکە ئەڵێیت فتێڵە بۆ برینەکەت دروست بکەم، مەگەر هەر کەڵکی دڵ خۆش کردنتی پێوە بێ، ئەگینا چاك بوونەوەی گرفتاری زامی عەشق زۆر زەحمەتە.

[١٥]

(١) دیاکەی: سەیر کردنەکەی. واتە: یار کە بە شەرمەوە لە پەنجەرەی نازەوە سەیری کردم، تاڵەکانی ریشەی جەرگمی یەك یەك بە گازی سەرنجی دەکێشا.

پـــەترۆی زامـــەكـــەم هـەم لابـەردەوە
وەخت بـــی ســـارێش بـێ تـازەش كـەردەوە

تــــیرێ هـــەوادا وە پـەنجەی بـێ گـەرد
دا نــە پـەڕەی دڵ تــا سـۆفـار ویـەرد(١)

لاو هــوون گــۆلاو دەروونــم كــەرد كـەیل
سەرواز كەرد جۆشا نە دیدەم چـون سـەیل(٢)

خـاشاك هـەستیم هـۆر گـرت جـە نـاو بـەرد
وســتش نــە گـێجـاو تـەنوورەكـەی دەرد(٣)

ئـیسە هـانە تـۆی بـەحرەكـەی بێ پـەی
سـاقی جـەو جـامە، یـا، هـا دات بـە كـەی(٤)

وە قــــەترەی مــــنیچ ئـــاویاری كــــەر
مەست بوو تا مەحشەر سەر باروو ئەو بـەر(٥)

---

(١) نە: لە. سۆفار: ئەو پەڕەیەكە بە بنی‌تیرەوەیە. واتە: بە پەنجە بێ گەردەكانی تیرێكـی تێ‌تەقاندم دای لە پەڕەی دڵم وە تا بن چەقی.
(٢) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەی‌و نیوەی یەكەمی شیعری پاشترەوە.
(٣) خاشاك: پڵ‌و پووش. وستش: خستیە. تەنوورە: ئەو شوێنەیە. كە ئاوی رووبـارەكـان لوولی تیا ئەخواو پڵ‌و پووشی تیا نوقم ئەكا، چونكە شوێنەكە خۆی بنی قووڵە.
(٤) ها: وا. جەو: لەو. یـا، هـا: ئائەوەی. كـەی: كـەیخەسرەو. مـەعنای نـیوەی شـیعری دووهەمی ئەم شیعرە لەگـەڵ مـەعنای شـیعری پـاشەوەی‌دا دێ، واتـە: لافـاوی خـوێن گۆلاوی دەروونمی پڕ كردو لێشاوی كردو بە خوڕ لە چاومەوە هاتە خوارو لەشی وەك پڵ‌و پووشی سوكمی هەڵگرت‌و لەو ناوەی‌دا نەی هێشت، خستیە گـێژی تـەنوورەی دەردو مەینەتەوە، وە ئێستا لە ناو دەلیای بێ بن دایە.
(٥) ئاویار: ئاودار. باروو: بێنمە. ئەوبەر: دەرەوە. واتە: كاكەی مەی گێڕ بە قەترە ئـاوێك لەو جامەی دات بەكەیخەسرەو منیش ئاو بدە بۆ ئەوەی تا رۆژی مـەحشەر سـەرخۆش ببم‌و ئەو كاتە سەر بەرز كەمەوە. لە ئەفسانەی كۆنا ئەگێڕنەوەكەكەیخەسرەو شای ئێران سەودای نە مردن دابووی لەكەللەی، وە بە دوای «ئاوی حەیات»ا ئەگەڕا. مەشهووریشە ☜

[١٦]

**دیدەم وە دیدەت**

دیـــدەم وە دیـــدەت شـــای شـــیرین چـەمان
فـــیراقت قـــامەت کـــەردەن وە کـــەمان(١)

مـــەزاق یـــەند تـــاڵی دووری تـــۆ چـــەشتەن
هـــووناوەکـەی چـەم سـەرزەمین رەشـتەن(٢)

سـەر پـەیکانەکـەت بـڕیـەن رشـتەی دڵ
وە نـــاسۆر کـــەفتەن دایـــم مـــدۆ چــڵ(٣)

ســــەمتوور ســـینەم وە زایـــەڵەی بـــەرز
مـــەژەنۆ نـــەوای دووریت وە ســـەد تـەرز(٤)

بـــڵێســـەی کـــوورەی دەروون گـــرتەن تـــاو
نـــە بـۆتـەی خـەمدا دەروون کـەرد وە ئـاو(٥)

---

☞

ئاوی حـەیات لە تـاریکایی‌دایـە، ئـەویش جـارێکـیان لە گـەڕانـەکـەیا ڕێی ئـەکـەوێتـە ئەشکەوتێکی تاریکی بێ پایان، وە پیا ئەڕواتو سەر نایەنێتە دواوە...

[١٦]

(١) کەمان: کەوان. واتە: چاوەکەم ئەی شای چاو جوانان، قەسەم بە جوانیت دووریت باڵامی وەك کەوان چەماندووەتەوە.

(٢) مەزاق: چەش، مەبەس دڵە. چەشتەن: چەشتووە. رەشتەن: رەنگ کردووە. واتە: دڵم ئەوەندە تاڵی دووریی تۆی چەشتووە، لە خەفەتانا چاوم خوێنـاوی لێ ئـەرژێ، وە ئـەو خوێناوەی چاوم رووی زەوی رەنگ کردووە.

(٣) بڕیەن: بڕیوە. واتە: نووکی تیرەکەت تاڵی دڵمـی بـڕیوە، ئـێستا ئـەویش بـە نـاسۆر کەوتووەتەوە هەڵ چڵ ئەداو ژان ئەکا.

(٤) مەژەنۆ: ئەژەنێ، لێ ئەدا. واتە: سازو سەمتووری سنگم بە هاواری بـەرز بـە سـەد جۆر ئاوازی دووری لێ ئەدا.

(٥) بۆتە: کوورەی تواندنەوەی زێڕو زیوو شتی وا. واتە: بڵێسەی کوورەی دەروونم تاوی سەندووەو دڵمی لەکوورەی خەفەتدا تواندووەتەوەو کردوویە بە ئاو.

گـــلاراوەکـــەی جـــە تـــۆ جـــیامەن
وەخت لواکـــــەی ئـــەوە نـــامامەن(١)

پـــووشەکـەی هـەستیم، گـیاکـەی پـای چـەم
وای نـــیستی فـــەنا بـەردەش پـەی عـەدەم(٢)

[١٧]

## دڵەی خەم خەیاڵ(٣)

دڵەی خـــــەم خـــەیاڵ جـــۆش ئـــاوەردەوە
مـەعدووم هـەم هـەوای «زەهـاو» کـەردەوە(٤)

زرنگـەی سـەدای سـاز جـە ریشـەی ئـەعزام
کـــــەمانچە دەســــتوور مـــاوەرۆ مـــەقام(٥)

(١) لوا: رۆیشتن. ئەوەناما: نەگەڕانەوە دوا. واتە: بۆیە گلاراوم پێ کەوتووە چونکە لە تۆ جیابوومەتەوە دەمی رۆیشتنی بێ گەڕانەوەمە.
(٢) وا: با. نیستی: نەبوون. بەردش: بردی. واتە: لەشم کە وەك پووش‌و گیای رزیوی گوێ چەمان وایە، بای لەناو بردن هەڵی گرت‌و بردی بۆ جیهانی نەبوونی.

[١٧]

(٣) مەولەوی ئەم پارچە شێعرەی بە بۆنەی یادکردنەوەی هەندێ برادەری زەهاویەوە وتووە.
(٤) زەهاو: ناوچەیەکە بە ناوی گەورە دێیەکەوە ناو نراوە لە سەر سنووری عێراق‌و ئێران لە نێوانی خانەقین‌و قەسردا. واتە: دڵەکەم کە لەبەر زۆری خەم‌و خەفەتی خۆی هەمیشە بیر لە خەفەت ئەکاتەوە، دیسانەوە هاتەوە جۆش‌و منیش خەیاڵی سەفەری زەهاوم کەوتووەتە سەر.
(٥) ساز: ئالەتێکی موسیقایە. کەمانچە: ئالەتێکی‌تری موسیقایە. دەستوور: بە دەستووری، وەك. مارۆ: دێنێ. واتە: زرنگەی دەنگ دانەوەی ئەو سازەکەکە دروست کراوە لە ریشەی ئەندامی لەشم، وەك کەمانچە ئاوازی لێ دێ. مەولەوی لەم شیعرەدا لەشی خۆی شوبهاندووە بە ساز، وە دەمارەکانی لەشی شووبهاندووە بە تاڵەکانی ژێی سازەکە، وە لەبەر زۆری ئازاری لەشی، زریکەیەکی بە خەیاڵ بۆ داناوەو ئەو زریکەیەی شوبهاندووە بەو ئاوازەی لەکەمانچە بەرز ئەبێتەوە.

بـــانگ رســـوایـیم جـه عـالّەم بـەرزەن
زیــــندەگــــیم زیـاد، مـەردەنم فـەرزەن

لەت لەت جــــەرگم «عــــومان» عــەینەین
پــڕ کــەردەن، بـڕیـان بـوخار «بـەحرەین»[١]

بـەو تـەور تـەن غـەرقەن نـە گـێج هـوونْدا
مـاچی مـوورێوەن هـانە «جـەیحوون»دا[٢]

ئـیمشەو وە هـەر حـاڵ شـەو وە رۆ بـەروون
ئەی خودا سا مەرگ سەحەر چێش کەروون[٣]

---

(١) عومان: وڵاتێکە لە گوێی دەلیای عەرەبا لە خوار خەلیجی بەسرەوە، وە ئەو بەشەی دەلیای عەرەب کە ئەکەوێتە سەر سنووری ئـەو نـاوچەیە بـە دەلیـای عـومان نـاوبانگی دەرکردووە. بەحرەین: وڵاتێکی چەند جەزیرەیە لە ناوچەی خەلیجی بەسرە دا. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٢) مـاچی: ئـەڵێی. مـوورێوەن: مێروولەیـەکـە. جـەیحوون: رووبـارێکـی گـەورەیە لە تورکستانی سۆڤیەتی «پێشوو». مەولەوی لەم دوو شیعرەدا چاوەکانی خۆی شووبهاندووە بە دەلیای عومانو بەحرەین، وە فرمێسکـی سـوێری خـۆی دانـاوە بـە ئـاوی دەلیـا، وە بڕیاریشی داوەکە وەك چۆن دەلیا هەڵمو بوخاری لێ هەڵ‌ئەسێ، چاوەکانیشی کە ئەوسا فرمێسکییان تیابوو هەڵمیان لێ هەڵ‌ئەسا، جا ئەڵێ: لە تـاو زۆری دەردو ئـازار ئـەوەندە گریاوم فرمێسکی چاوەکانم بووە بە خوێن، هەر ئەڵێی پارچە پارچەی جگەرم لەکاسەی چاوما گیرساوەتەوە لەشیشم خەڵتانی خـوێن بـووەو لە دەلیـای خـوێنـا خـنکاوە ئـەڵێی مێروولەیەکە لە ناو روباری جەیحووندا کە دیارە بە هیچ کلۆجێك دیاری نادا.

(٣) بەروون: ئەبەم. واتە: ئەمشەو هەر چۆن بێ ئەتوانم رۆژ بکەمەوە، بەڵام خوایە گیان سبەینێ چی بکەم، وە بەم حاڵەوە چۆن بتوانم بڕۆم بۆ زەهاو؟

## [١٨]

## دنیا نە گێجاو[١]

دنـــیا نـــە گـــێجـاو تـاریکە شـەو بـی
جـەلاو رۆشـنیش جـە لا چـون خـەو بـی[٢]

نـاگـا شـۆڵەی خـۆر سـوب فـەردا، فـەڕ دا
وە سـەر بـەرز هـەرد وە دەشتو دەردا[٣]

تـەك دا تـاریکی ئـەو لای تـەریکی
ئـاڵەم چـەنی نـوور کـەرد هـام شـەریکی[٤]

دنـیایێ مـەویەرد وە عـەیش شـیرین
ساحیب دین دیدەش بی وە سـاحیب دیـن[٥]

ئـەو شـۆڵە دیسـان مـەیل ئـاوەردەوە
ئـەو لای پـەردەوە تـەشریف بـەردەوە[٦]

---

## [١٨]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە پیاهەڵدانو لاواندنەوەی شێخ «عبدالرّحمان» خالسی تاڵەبانیدا وتووە.

(٢) واتە: دنیا لە گێژاوی تاریکە شەودا بوو، وە ڕۆشنی شەوق دانەوەی وەك خەو ئەهاتە بەرچاو، چونکە دەورو بەری کەرکوك کەسێکی وای تیا نەبوو ڕێنموونی خەڵك بکا بۆ ڕێگای ڕاست.

(٣) ناگا: لە ناکاو. شۆڵە: «شعلە»، تیشك. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٤) ئـاڵەم: عـالەم، خـەڵك. واتـە: کـوتوپڕ تـیشکی ڕۆژی بـەیانی دای لە سـەر هـەردە بەرزەکانو لە دەشتو دەر، وە دنیای ڕوون کردەوەو تاریکی پاڵیدا بـە پـاڵی تـەنهاییو کەنارەگیرییەوەو گیتی لەگەڵ ڕووناکیدا بوون بە هاوبەش... مەبەس پەیدا بوونی شێخ «عبدالرّحمان»ە.

(٥) مەویەرد: تێئەپەڕی. دین: ئایین. دین: دیتن. واتە: دنیایەکی خۆش تێئەپەڕێ، وە چاوی هەر پیاوێکی دیندار بینا بووبوو، هەموو شتێکی ئەبینی.

(٦) واتە: بەڵام دیسانەوە ئەو تیشکە لای دایەوەو کەوتەوە پشتی بەردو ئاوا بوو.

دل پــــەی تـــەئریخ وات وە دەم دەردەوە:
ئـەی وای وەی دنـیاش تـاریك كـەردەوە(١)

[١٩]

## دیدەم نەو نەمام(٢)

دیـــدەم نـــەو نـــەمام نــەوتووڵ ســاوا
نــامەت پــەی خــەرجـی وە لا مـن یـاوا(٣)

ئـەمرت دڵگــیرەن، فــەرموودەت خــاسەن
بـــێ شك مـــاهەنی مـاهانەت راســەن(٤)

بــەڵام جــە دووریت هــۆشــم رەم كــەردن
ئـــاگـــاهیم نــیەن چــەن رۆ ویــەردەن(٥)

هـــەر ئـێد مـزانـوون ئـازیز گـیان تــۆ
نـــەدیەنم وە چـــەم هــەڵای مــاه نــۆ(٦)

---

(١) وات: وتی. واتە: دڵ لە مێژووی وەفاتیا بە دەم دەردەوە ئەو نیوە شیعرەی وت كە مەعناكەی ئەوەیە هاوار دنیای تاریك كردووە. ئەو نیوە شیعرە بە پێی ژمارەی ئەبجەدی وە بە شێوەی نووسینی كۆن «ای وای وی دنیاش تاریك كردوە» ئەكاتە ١٢٧٧ كە ساڵی كۆچ كردنی شێخ عبدارحمانە.

[١٩]

(٥) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەرامی نامەی شێخ عەزیزی جانەوەرەیی برادەریا نووسیوەكە ناردبوویە لای پارەی بۆ بنێرێ، لەكاتێكاكە هەردووكیان لە فەقێیەتیدا بوون.
(٣) واتە: ئازیزە نەونەمامەكەم نامەكەتم پێ گەیشت كە بۆ خەرجیت نووسی‌بوو.
(٤) واتە: جوانت فەرمووەو ئەمرت لەسەر سەرم، تۆ خۆت چونكە وەك مانگی پێویستە مانگەكانت بدرێتێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «دڵگیرەن» نووسراوە «موتاعەن».
(٥) رەم كەردەن: هەڵاتووە. واتە: بەڵام لە تاو دەردی دووری تۆ هۆشم لا نەماوەو نازانم چەند رۆژ لە مانگ بەسەر چووە.
(٦) هەڵای: هێشتا. واتە: ئازیز بە گیانت قەسەم هەر ئەوەند ئەزانم هێشتا مانگی نوێم بە چاوی خۆم نەدیوە.

شــــیرین رایــــەتم، خــــاسەی ســــەر کــــارم
بــــێ وادە زوڵمــــەن بــــدەی ئــــازارم(١)

هــەرگا دیــم هــیلال ئــەو ئــەبرۆی سێوەنگ
یــە ســیم ئــەسرین، یــە ئــەشرەفی رەنگ(٢)

[٢٠]

**دەروێش**

دەروێش ئــەهل خــەم هــەر یــەند جــەم مــەبۆ
پــای کــاو دەروون هــەر یــەند تــەم مــەبۆ(٣)

کــام زامــەت مــەندەن دڵ پــێش نــە ئــێشۆ
کــام خــەفەت مــەندەن جــەسەم نــەکــێشۆ(٤)

هەنی چێش واچوون چــۆن مــەکــەرۆ چــوون
گــــەرد ئــاردەشان ئــاسیای گــەردوون(٥)

---

(١) رایەت: رەعیەت. خاسەی سەرکار: نۆکەری تایبەتی ئاغا. واتە: رەعیەتێکی فەرمان بەرمو نۆکەرێکی تایبەتیم، زوڵمە بێ وادە ئازارم بدەی.

(٢) سێوەنگ: رەش‌و پەیوەست. سیم: زیو. ئەشرەفی: لیرەی زەرد. واتە: هەر کاتێ مانگی نوێی برۆی رەش‌و پەیوەستی تۆم دی، فرمێسك وەك زیوو رەنگی وەك ئەشرەفی زەردت پێشکەش ئەکەم. مەبەسی ئەوەیە هەرکات خۆت هاتیتەوە بە رەنگی زەردمەوە لە خۆشی‌یانا ئەگریم بە سەرتاو فرمێسك ئەرێژم‌و مانگانەکەت ئەدەمێ.

[٢٠]

(٣) مەبۆ: ئەبێ. واتە: کاکەی دەف ژەن چاوەڕوانی چیت، خەفەتباران هەر ئەوەندەکۆ ئەبنەوەو بناری شاخی دەروون هەر ئەوەندە دای ئەگرێ.

(٤) واتە: کام زەحمەت ماوە دڵم بە هۆیەوە ژان نەکا، وەکام خەفەت ماوە لەشم هەڵی نەگرێ.

(٥) هەنی: ئیتر. ئاردەشان: ئەو ئاردەی کە ئاش لە ژێر بەردەکەیەوە ئەی‌کاتە دەر. ئاسیا: ئاش. واتە: ئیتر من بڵێم چی‌و تۆزی ئاردی ئاشی گەردوون چی ماوە پێمی بکا؟

یـەند تـۆز مـەینەت جـە دڵ جـا کـەردەن
بـــینایی خـەیاڵ بـاڵاش گـوم کـەردەن(۱)

سـا دەی سـەر پـەنجەت پـەی دەف بـەرەوە
رووی یـــاد بـــاڵاش مـەخسەڵ دەرەوە(۲)

[۲۱]

## دیارەن دیدەم

دیـــارەن دیـــدەم هـــەم دەرد نـۆمـەن
ئـەمجاریش جـە نـۆ ئـارەزووی تـۆمـەن(۳)

جـە گـۆشـەی مـزگی تـەنیایی پـڕ دەرد
نـــیشتەبێم خـەیاڵ دەرمـانم مـەکـەرد(۴)

نـاگـا مـەیلەکـەت عـەودش کـەردەوە
دیســـــان نـــێش دەرد، دا وە دەردەوە(۵)

هـیجرانت دەردان جـە لام جـەم کـەردەن
هەر جـوزوێم پـەی وێش خـەریك دەردەن(۶)

---

(۱) واتە: ئەوەندە تۆزی مەینەتی جێ کردووەتەوە لە دڵما، هەتاوەکو بە چاوی خەیاڵیش باڵای یارم بۆ نادۆزرێتەوە.

(۲) مـەخسەڵ: رۆشـن، لە «مـغسول»ەوە وەرگـیراوە. واتـە: کـەواتـە هـەی دەروێش سەرپەنجەت بەرەوە بۆ دەفەکەتو دەفێکمان بۆ لێدە تا خەمو خەفەت لە دڵمانا نەمێنێو رووی یادی باڵای یارم بۆ رۆشن کەرەوە.

[۲۱]

(۳) نۆ: تازە.
(۴) مزگی: مزگەوت. نیشتەبێم: دانیشتبووم.

(۵) عەود: گەڕانەوە. واتە: لە نـاکـاو ئـارەزووی دیـتنت هـاتەوە بـە دڵمـا، وە دیسـانەوە دەردێکی تری سەرەڕای دەردەکانی خۆم کرد.

(۶) جوزو: «جزء»، پارچە. واتـە: دووریت هـەزار دەردی کـۆکـردووەتەوە لە سـەرم، وە ئێستا هەر ئەندامێکی لەشم بۆ خۆی گرفتاری دەردێکە.

دەرد کـۆنــەو نــۆ یــەکســەر جــەم بــیەن
ســەر تــاپام جــە دەرد هــیچ خــاڵی نیەن

[٢٢]

## دەك فەڵەك

دەك فــەڵەك چــون مــن دەردت کــاری بــۆ
زامت پــــڕ نــــە ئـــێش نـــادیاری بـــۆ

جــەفای نــەونەمام ســەفات هــۆر کــێشــۆ
خــاترەت وە نــێش حــەسرەتان بــێشــۆ[١]

ســاتێ بــێ خــەم بــی جــەستەن جــەفاکێش
ویــــارا وە شــــاد چـــەنی یــار وێش[٢]

وەخت بــــی لێڵاویت بگــــێرۆ چـــــەمان
تــــا ئــاخر دووریت وست نــە بــەینمان[٣]

[٢٣]

## دڵ یەند وە ئایر

دڵ یـــەند وە ئـــایر دووری تــــۆ تــاوان
ســـا راســـەن کــزەش وە لات نــەیاوان[٤]

---

[٢٢]

(١) بێشۆ: بێشێت. واتە: یا خوا ئازاری دەردەکەت نەونەمامی شادیت لە بن هەڵکەنێ‌و دڵت بە ئێشی داخەوە بێتە ژان.

(٢) ویارا: وەختی بردەسەر، مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٣) بگێرۆ: دابگرێ. وست: خست. واتە: لەشی مەینەتبارم تاوێك بە خۆشی وەختی لەگەڵ یار بردە سەر، کەچی تۆ لە بەخیلی‌دا وەخت بووکوێراییت دابێت‌و لە یەکت جوێ کردینەوە.

[٢٣]

(٤) تاوان: تواوەتەوە. نەیاوان: نەگەیشتووە. واتـە: دڵم ئـەوەندە بـە ئـاگری دووری تـۆ هەڵقرچاوە تەڕایی لێ بڕاوە، کەواتە راستەکزەی هەڵقرچانەکەی نەگەیشتووەتە لای تۆ.

وەی مـــن پـــەی ســـەفای یـــاران هـــام دەم
ئـــای پـــەی ئـــەو ســـەیران مـــاردمو کـــەڵرەم[(١)]

یـــاران گـــردین شـــین وە تـــووناى تـــووندا
هـــەر خـــەیاڵ مـــەندەن نـــە تـــۆی دەروونـدا[(٢)]

[٢٤]

## دڵ، ئەرچی[(٣)]

دڵ، ئـــەرچـــی شـــەماڵ قـــەدیمی یـــارەن
پـــەی شـــنۆی زەلان یـــار جـــە نـــزارەن[(٤)]

بـــــەڵام کـــــۆن تـــــاقەت دیـــــن دڵدارم
ئـــەو مـــەه چـــیرەسان، مـــن کـــەتان وارم[(٥)]

---

(١) واتە: ئاخ بۆ رابواردنەکەی جاران لەگـەڵ یـارانو هـاورێیـان، وە داخ بـۆ سـەیران کردنەکانمان کە پێکەوە تفەنگمان هەڵ ئەگرتو ئەچووین بۆ راوەکەڵ.

(٢) شین: رۆیشتن. واتە: یاران هەموویان تووناو توون کـەوتنو مـردن، ئـیستا هـەر یـاد کردنەوەیان ماوە.

[٢٤]

(٣) مەلەوی جارێکیان لەگەڵ برادەرێکی لە شوێنێکی نسـرما دائـەنیشێ، تـاقمێکـی‌تر لەولاوە بانگی ئەکەن بۆ نایەیتە ئێرە شەماڵ ئەی‌گرێتەوە، ئەویش لە وەرامـیانا ئـەم دوو شیعرە ئەڵێ:

(٤) زەلان: رەشەبا. واتە: هەر چەند شەماڵ دۆستی کۆنە، بەڵام دڵ بۆ وەرگرتنی شنەی رەشەبای لۆمەی یار لەم شوێنەدا دانیشتووە.

(٥) کۆن: کوا. مەه چیهرەسان: روو وەك مانگ. کەتان: جۆرە پارچەیەکـە ئـەڵێن ئـەگـەر تیشکی مانگەشەو لێی بدا دائەڕزێ. واتە: بەڵام لەگـەڵ ئـەوەشا مـن کـوا تـوانـای چـاو پێ‌کەوتنی یارم هەیەکە ئەو رووی وەك مانگ وایەو من وەك کەتان وام، وە هەرکە سەیرم بکا دائەفرەقێم.

## [٢٥]

### داخۆ چەند(١)

داخـــــۆ چــــەند وە دەس نــازك نـــەوهاڵان
ئـــامۆشـــۆت کـــەردەن پـــەی دڵێ مـــاڵان[٢]

ئـیسه هــا چـــون مـــن پـەشێوت بـی حـاڵ
کـــەفتەنی نـــە خـــاك مـــەکـــەرات پـاماڵ[٣]

••••••

## [٢٦]

### دڵ بیەن وە دار

دڵ بــــــیەن وە دار ســــــەرکەل لای وەشت
لافـــاوان ئـامان ریشـەش وست وە دەشت[٤]

چـــــەمەڕای وایـــێن نـــــەسیم بــدۆ لێش
ریشـــەکـەنش کـۆ سـاکـن بـۆ پـەی وێش[٥]

••••••

---

**[٢٥]**

(١) مەلەوی بەم دوو شیعرە قسە لەگەڵ گۆزە شکاوێکا ئەکا.

(٢) نەو هاڵ: تازە هەڵچوو. دلێ: ناو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٣) کەفتەنی: کەوتووی. مەکەرات: ئەتکەن. واتە: گۆزەکە ئاخۆ چەند بە دەستی یارانی تازە پێ‌گەیشتووەوە هاتو چۆی ناو ماڵانت کردووە، کەچی ئێستا وەك من حاڵت پەشێو بووەو کەوتوویتە سەر عەرزو خەڵکی ئەتسوونەوە بە پێ‌یان.

**[٢٦]**

(٤) وەشت: باران. وست: خستە. واتە: دڵم وەك دارێکی لێ هاتووەکە بە بەرزایی‌یەکەوە بێ و باران لێی دابێ و لافاوێ هاتبێ ریشەکەی خستبێتە دەر.

(٥) کۆ: بکا. واتە: ئێستا چاوەڕوانی بایەکە لێی بداو ریشەکەی لە بن هەڵکەنێ، تا بۆ یەگجاری بۆ خۆی دامرکێتەوە.

[۲۷]

## دیسان دەس...

دیســـــان دەس چـــەرخ هـــەم هـــانە کـــاردا
تـــای تـــانتەی دووریش وســـتەن وە داردا(۱)

[۲۸]

## دیدەن دیدار

دیـــــدەن دیـــــدار غـــــەزاڵەی وەرمــــن
چـــی دمـــا یـــاران وەرمـــەن پـــەرێ مـــن(۲)

[۲۹]

## دەفتەری قەزات(۳)

دەفـــــتەری لەوحـــــی قـــــەزات لە بـــــەرە
خـــــەفەتت جـــــەهلی خـــاوەن دەفـــتەرە(۴)

---

[۲۷]

(۱) تانتە: تان. واتە: دیسانەوە دەستی گەردوون کەوتووەتەوەکارو تـانی پـارچـەی دوور خستنەوەی دۆستانی بەستووەتە دارو ئەیەوێ پۆی بۆ بکاو قوماشی لە یەك کردنمان بچنێ.

[۲۸]

(۲) غەزاڵە: «غزال»، ئاسك. وەرمن: دێیەکە لە ناوچەی شەمێران لە قەزای هـەڵەبـجە. چیدما: لەمەوپاش. وەرم: خەو دیتن. واتە: لە ئێستە بە دواوە مەگەر لە خەوما چاوم بە یارە وەرمنی‌یە وەك ئاسك جوانەکەم بکەوێ.

[۲۹]

(۳) مەولەوی جارێکیان لەگەڵ «قەمەر» ناوێکا ئەکەوێتە مشتو مڕ لە سەر نوێژ، پێی ئەڵێ بۆچی نوێژ ناکەی؟ ئەویش ئەڵێ چونکە لە دەفتەری عیلمی خوادا تێ‌پەڕیوەکە من نوێژ ناکەم، خواستو زانراوی خوایش نابێ پێچەوانەی یەك بن، کەواتە خوا خۆی نایەوێ من نوێژ بکەم، مەولەویش لە وەرامیا ئەم شیعرە ئەڵێ:

(۴) واتە: دەفتەری لەوحی قەزاو قەدەری خوات لە بەرەو ئەزانی تیا نووسراوە نوێژ ناکەی!، وە ئەترسی ئەگەر نوێژ بکەی خوا بە نەزان دەر ئەچێ؟! بیانوویەکی هیچو پووچو بێ جێ‌یە...

## [٣٠]

### دزەکەی زەهاو(١)

دزەکــــــەی زەهـــــاو زاووزۆ کـــەردەن
هــەر دزێ حــەو دز پــەی وێش ئــاوەردەن(٢)

## [٣١]

### دیدەم

دیـــــــدەم «رێژاو»ە روخســـــارم «زەردە»ن
جـــە داخ «یــاران»، «پــیران»م کــەردەن(٣)

## [٣٠]

(١) جارێکیان لە دانیشتنێکا باسی ئەوە ئەکرێ کـە نـاوچەی زەهـاو دزی زۆری تـیایە، مەولەویش بەو بۆنەیەوە ئەم شیعرە ئەڵێ:

(٢) زاو زۆ: زاو زێ. واتە: دزی زەهاوی زاو زێیان کردووە، وە هـەر دزێکـیان حـەوت دزی لێ کەوتووەتەوە. کۆ کردنەوەی «زەهاو»و «زاو زۆ» کە لە وشـەو مـەعنادا نـزیکن لە یەك، شتێکی جوانە.

## [٣١]

(٣) رێژاو: فرمێسك رێژ. پیران: ئەوەتەکە منالْ لە ئەنجامی گـریانی زۆرا لە تك ئـەچێ‌و دەنگی دەرنایەت. واتە: چاوم فرمێسك ئەرێژێ‌و رەنگم زەرد بووە، وە لە داخی دووری یاران ئەوەندە گریاوم دەنگم دەرنایەت. ئەو وشانەی کە لە شیعرەکـەخستوومانتەتە نـاو کەوان، ناوی چوار دێن لە ناوچەی «زەهاو» لە سەر رێی جارانی جافەکۆچەری‌یەکـان. مەولەوی زۆر دڵی بەند بووە بەو دێهاتەوە، وە لەم شیعرەی‌دا ئیشارەتی بۆ کردوون.

[١]

## رویْ فکر بەخت

رویْ فکـر بـەخت سـیای ویْم مـەکـەرد:
پەی چێش هەر پەستی پەریْ مـن ئـاوەرد(١)

یـــاران گشت کـەیف وەش سـەفا فـراوان
یـــەك یـەك وە عـــەلای مـەقامان یـاوان(٢)

گـــرد ســـەرشار مـــەی لەقـــا نـماوە
هـەر مـن بـەستەی خـاك چـەم ئـەو دمـاوە(٣)

جــــەو فکـرەدا بـیم یـەك هـام دەرد ویْم
ریْزە بـــــلووریْ قـــەدیمش دا پـــیْم(٤)

ئـــاما وە جـــواو ریْزەی قـــەدیم ســـاڵ
بــە زوبـان حــاڵ فـەسیحتەر جــە قـاڵ(٥)

---

[١]

(١) رۆی: رۆژیْ. واتە: رۆژیْ لە رۆژان بیرم لە بەختی رەشی خۆم ئەکردەوەکە بۆچی هەر نشستی بۆ من هێنا؟.

(٢) یاوان: گەیشتووە. واتـە: بیرم لەوە ئـەکـردەوەکـە چـۆن وا یـاران هـەموو دڵشـادن‌و گەیشتوونەتە پایەی بەرز؟.

(٣) سەرشار: مەست. لەقا: «لقاء»، گەیشتن. نـما: پیشاندەر. بـەستە: بـەسراو. واتـە: وە چۆن ئەوان هەموو سەرخۆشی شەرابی گەیشتن بە یارن، وە هەر من بەسراومـەتەوە بـە خاکەوەو بۆ دواوە ئەڕوانم؟.

(٤) پیْم: بووم. ریْزە: وردە. بلوور: شووشە. واتە: لە بیر کردنەوەدا بووم، هـاوڕیْیـەکـی هاودەردم پارچە شووشەیەکی کۆنی دایە دەستم.

(٥) جواو: جواب، دەنگ. قاڵ: قسەی دەم. واتە: پارچە شووشەکۆنەکە بە زوبانی حاڵ، فەسیحتر بوو لە قسەی دەم، هاتە دەنگ.

وات: مــن ســەنگێ بــیم کــەفتەی هــەواران
بــێ قــەدرو قــیمەت نــارەوای شــاران(۱)

گـــرتم نـــە گــەردەن بــێ بــاکو شــادان
بــەڵای پـیك سـەخت کـوورەی ئـوستادان(۲)

ورد بـــیم جـــۆشـــم وەرد تـــاویامەوە
تـــا وە روتـــبەی بــەرز ســەر نــیامەوە(۳)

عـــاڵەمـــێ تـــازە دیـــم هــوەیدا بـــی
شــەخسێ عــەجیوتەر جــەمن پــەیدا بــی(۴)

بــیم وە بــلووریێ پــڕ جــە ســەفاو نــوور
لایــق وە ســوحبەت بــەزم سـەلمو تـوور(۵)

گــا جــای «مــاء الورد» عــەتر عــەبیر بـیم
بــۆ بــەخش دەمــاخ شــا تـا وەزیـر بـیم(۶)

---

(۱) کەفتە: داکەوتوو. هەوار: مەنزڵگەی کوێستانی. واتە: وتی من بەردێکی بێ قیمەت بووم لە هەوارە کۆنێك کەوتبووم.
(۲) پیك: ئاسنێکی ئەستووری درێژە بەردی پێ ئەشکێنن. واتە: بە دڵشادی وە بێ ترس نارەحەتی بەر پیك دانو خستنە کورەی وەستایانم قبووڵ کرد.
(۳) سەر نیامەوە: سەرم نایەوە. واتە: بە پیکەکە ورد بوومو لەکوورەکەدا کوڵامو توامەوە تا گەیشتمە پایەیەکی بڵند.
(۴) هوەیدا: ئاشکرا. واتە: دیم عالەمێکی‌تر دەرکەوتو شەخسێکی عاجیاتی‌ترم لێ دەرچوو.
(۵) سەلەمو توور: دوو پاشای کۆنی ئێران بوون کە هەمیشە شەڕیان بووە. واتە: بە شووشەیەکی پرشنگداری وا شایانی کۆڕی بەزمی سەلەمو توور بێ.
(۶) «ماء الورد»: گوڵاو: واتە: جار جار گوڵاویان تێ ئەکردمو بۆنی خۆشم ئەدا بە لووتی پادشاو وەزیرانا.

گـا مـاوای سـەهبای کـۆنـەی پـڕ تـەئسیر
نەشئە بەخش حاڵ پەی بـوڕنـاو پـەی پـیر[١]

نـە جـەرگەی یـاران شـۆخ دیـدە مـەس
مـەکـەردم گـەردش مـەشیم دەس وە دەس[٢]

جـەو بـێ قـیمەتی وە قـیمەت یـاوام
وە پـایەی روتـبەی عـالی سـەر ساوام[٣]

دەورەی دووبارەی رای حەق هەر کەس دیش
بـۆی بـاخچەی ئـەبەد مـەیۆ نـە بینیش[٤]

جـەو بـۆنـۆ ئـەو نـوور هـەڵای تـاقی‌یەن
نـە رێزەی مـندا بـەرقش بـاقی‌یەن[٥]

مـەعدوومی سـەرشار بـەزم دڵ رێشـی
تا تۆیچ چـون یـاران تـەسدیع نـەکێشـی[٦]

---

(١) بوڕنا: لاو. واتە: جار جاریش کۆنی کاریگەریان تێ ئەکردم کە دڵی پیرو لاو ئەژینێتەوە.
(٢) مەشیم: ئەچووم. واتە: لەکۆڕی یارە چاو مەستەکانا ئەگەڕامو دەسەو دەسیان پێ ئەکردم.
(٣) یاوام: گەیشتم. سەرساوام: سەرم هەڵسوی. واتە: لەو بێ قیمەتی‌یەی جارانەوە بووم بە شتێکی بە نرخو گەیشتمە پایەی بڵند.
(٤) دیش: دیتی. واتە: هەرکەس خولی دووهەمی رێی حەقی خۆی ببینێ، هەمیشە بۆنی باخچەی نەمری لە لووتی دێ. ئەم شیعرە ئیشارەتە بۆ ئەو فەرموودەی حەزرەتی عیسا کە فەرموویەتی «لَنْ يَلِجَ مَلَكوتُ السَّمٰواتِ مَنْ لَمْ يُولَدْ مَرَّتَيْنِ». واتە: هەرکەس دوو جار لە دایك نەبووبێ پێ نانێتە بارەگای پایە بەرزیو لە خوا نزیك بوونەوە. جاری یەکەمیان لە دایك بوونی عادەتی‌یە، جاری دووهەمیشیان ئەوەیە رێگای راست بدۆزێتەوەو بکەوێتە سەر خوا پەرستی کە وەك ئەوەیە جارێکی‌تر هاتبێتە دنیاوە.
(٥) جەو بۆنۆ: بەو هۆیەوە. تاقی‌یەن: تەحقیقە، راستە هەیە. بەرق: تیشك. واتە: جا بە هۆی ئەوەوەکە من خولی دووهەمی رێگای راستی خۆم دیوە، هێشتا ئەو تیشکەم تیا ماوە.
(٦) مەعنای ئەم شیعرە دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

نــــە گـــری وە گـــەردەن چـــی هـــانە ڕێت‌دا
پــــا نــــەنیەی وە ســـەر وجـــوود وێت‌دا[١]

کـــەی مـــەشی نـــە ســیلك یـــاران هـەم دەم
کـــەی ڕوتـــبەی عـــالی مـەوینی وە چـەم[٢]

هــــەرکەس «تَــــوَلُّدْ» دووبـــــارەش نـــیەن
ئـــەڵبـــەت ســـەعادەت ســتارەش نـــیەن[٣]

هـــانە ئـــەشکەنجەی پـــەستی نـــەنگەدا
تـــا مـــەنزڵ گـــێرۆ نـــە ســـای ســـەنگەدا[٤]

**[٢]**

## ڕا جەعفەر ئاباد[٥]

ڕا جــــەعفەر ئــاباد ســـارای گـــەرم مـــەیل
مەنزڵ شیراز، شـار سـەودای عـەشق لەیـل[٦]

(١) پا نەنیەی: پێ نەنێیت.

(٢) مەشی: ئەچی. سیلك: ڕیز. واتە: ئەی مـەعدوومی کـە سـەرخۆشـی شـەرابـی دڵ برینداریت، تۆیش تا وەك یاران زەحمەت نەکێشیو، هەر چیت بێتە ڕێ پێی ڕازی نەبیو دەس لە خۆت هەڵنەگری، چۆن ئەچیتە ڕیزی هاوڕێکانت، وە چۆن پایەی بڵند بە چاوی خۆت ئەبینی؟.

(٣) «تولّد»: لە دایك بوون. سەعادەت ستارە: ئەستێرەی بەختیاری. واتە: هەر کەس بۆ جاری دووهەم لە دایك نەبێتەوە بێ گومان نابێ بە خاوەنی ئەستێرەی بەختیاری.

(٤) ئەشکەنجە: جەڕو مەنگەنە. گیرۆ: ئەگرێ سا: سێبەر. واتە: لە ناو جەڕو مەنگەنەی عەیبو عارا ئەمێنێتەوە تا ئەمرێو ئەچێتە گۆڕ.

[٢]

(٥) مەولەوی بەم قەسیدەیە قسە لەگەڵ «خواجە حافظی شیرازی» ئەکا، وە دیوانەکەی ئەگرێتەوە بە نیازی ئەوەکە بزانێ بۆچی نامەی یار دیار نیە.

(٦) جەعفەر ئاباد: گەڕەکێکە لە شیراز. سارا: «صحرا»، دەشت. واتـە: ئـەی کـەسێ کـە

**دەس‌ودیــــم وە ئــاو روکــن ئــاباد شــەوق**
**ئــیمام مــیحراب ســەر «مُـصَلّا»ی زەوق[١]**

**خواجەی سەر حەڵقـەی بـەزمەکـەی «أَلَسْتْ»**
**دەمــاخ وە نــەشئەی بـادەی فـەنا مـەست[٢]**

**خــــەیلێوەن ئـــازیز، شـــای نــەونەمامان**
**پــەی شــیفای زامــان نــامەش نــەیامان[٣]**

**هــیچ نــەبەردەن نـام خـەستەی دەردەکـەش**
**نــەکـەردەن خـەیاڵ مـەینەت وەردەکـەش[٤]**

---

☞

ڕێگای گوزەرت جەعفەر ئابادەکە دەشتی گەرمی ئارەزووی یارانە، وە ئەی کـەسێ کـە مەنزڵت شاری شیرازەکە کەڵکەڵەی عەشقی لەیلە. مەبەسی ئەوەیە ئەی حافیزی دڵدارکە کەڵکەڵەی دیتنی یارت ئەکەیتە سەر، وە بە دەشتی گەرمی خۆشەویستی‌دا ئەڕۆی بۆ لای.

(١) دەس‌و دیم: دەس نـوێژ. روکـن ئـاباد: سـەرچـاوەو کـانیاوێکـە لە شـیراز. «مـصلا»: گەڕەکێکە لە شیراز. واتە: ئەی کەسێ کە بە ئاوی روکـن ئـابادی سـۆزی دڵداران دەس نوێژت گرتووە، وە لە میحرابی مصلای ئارەزوویانا پێش نوێژیت کردووە. مەبەسی ئەوەیە ئەی کەسێ کە پێویست‌یەکانی خۆشەویستیت جێ‌بەجێ کردووەو سەر قافڵەی دڵدارانی. مەولەوی لەم دوو شیعرەدا ئیشارەت بۆ چەند شـیعرێکـی حـافیز ئـەکـا کـە نـاوی ئـەو شوێنانەی کۆکردووەتەوە تیایانا، وە بە بۆنەی ئەوەوەکە حافیز شیرازی‌یەو ئەو شوێنانەش لە شیرازان، ناویانی هێناوە.

(٢) «الست»: ئیشارەتە بۆ ئایەتی ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ﴾ فەنا: «فنا فی الله»، توانەوە لە خۆشەویستی خوادا. واتە: ئەی کەسێ کە لە ڕۆژی پرسیارەکەی خوادا لە ناو موسوڵمانانا سەرحەڵقە بووی، وە ئەی کەسێ کە مەست بووی بە نەشئەی بای توانەوە لە خۆشەویستی خوادا.

(٣) واتە: ئازیزم دەمێکە یار نامەی بۆ نەناردووم تا زامەکانمی پێ چاك بێتەوە.

(٤) واتە: بە هیچ جۆرێ ناوی منی گرفتاری دەردو مەینەتی خۆیی نەهێناوەو بیری لێم نەکردووەتەوە.

یادش گوزەرگای دڵ جە ویر بەردەن
مەیلش ڕای خاتر فەرامۆش کەردەن(١)

ساتێ وە ساڵێ جە لام ویەردەن
هەرەس وە ماڵم ماچی دڵ سەردەن(٢)

دڵ بێ ئارامەن دایم مدۆ چڵ
من هەر مواچوون پەی دڵ وەشی دڵ(٣)

من تاڵەم وە تام تاڵی تاڵ وەردە
گەرد بەدبەختیم وە ڕوودا مەردە(٤)

نام نە سەر زوان شیرینش تاڵم
نام پەی خاترش گەردەن خەیاڵم(٥)

نەدارۆ تاقەت تەحریرم خامەش
مەپێچۆ وە هەم جە دەردم نامەش(٦)

---

(١) واتە: یادی، ئەوەی لە بیر چووەتەوەکە بە دڵما تێپەڕێ، وە مەیلی، ڕێگای دڵی منی خستووەتە پشت گوێ. مەبەسی ئەوەیە نایەڵێ هیچ نەبێ یادی بگاتە خەیاڵم، وە دڵم ئارەزووی بکا.

(٢) هەرەس: کە لەکوێستانا بەفر زۆر ئەبارێ و کۆمەڵ ئەکا، بەهار بنەکەی فش ئەبێ و لە جێگەکەی خۆی ئەخلیسکێ و کۆمەڵێ خاکو بەرد لەگەڵ خۆی تل ئەدا، ئەوە پێی ئەڵێن هەرەس. گەلێ جاریش وا ئەبێ ئەو هەرەسە دێت بەسەر ئاواییەکا وە چەند ماڵی لێ وێران ئەکا. واتە: لەتاو دووری یار هەر سەعاتێکم بە ساڵێ لێ بەسەر چووە، ئەی هەرەس بە ماڵم وابزانم یار دڵی سارد بووتەوە.

(٣) مواچوون: ئەڵێم. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دواییدێ.

(٤) تاڵە: «طالع»، بەخت. تاڵ وەردە: تاڵ دراوە: واتە: دڵم لە تاناوا ئارامی نەماوە هەمیشە چڵ ئەدا، وە لە ناچاریدا بۆ دڵخۆشی دانەوەی خۆم ئەڵێم بەختم بە دەرمانی تاڵی تاڵدراوەو تۆزی بەدبەختی نیشتووە لە ڕووم، وا هەواڵم ناپرسی.

(٥) نام: یاوەکو. واتە: یا من تاڵم بە سەر زوبانی شیرینیەوە، وە ئەگەر ناوم بێنێ ناو دەمی تاڵ ئەبێ، وە یان خەیاڵم تۆزاوییە وە ئەگەر بێت بە خەیاڵما تۆزاوی ئەبێ.

(٦) واتە: قەڵەمەکەی توانای نووسینی نیە بۆ من، وە خۆیشی لەبەر نەگبەتی من کاغەز دەق ناکا تا بۆمی بنێرێ.

مـــاوای دڵگـــەرمیش جـــە حـــەد بـــەرشیەن
لایـــــق وە مـــــەنزڵ یـــــاد ئـــەو نــیەن[(١)]

خـــاترم یـــەند خـــار مـــەینەت هـــا تـــێش‌دا
پـــای مـــەیلش زەحـــمەت بـویەرۆ پێش‌دا[(٢)]

ســـــەد دەلیـــل مـــاروون نــیەن فـــەراقـــەت
جە من های تامڵ، جـە ئـەو کـۆن تـاقەت؟[(٣)]

بـــۆ بـەشق ئـەو جـام، ئـەو بـەزم، ئـەو جـەم
بــــێ مـــەیلی ئـــازیز نـــەوینی وە چـــەم[(٤)]

مـــــزانـــــی چـــــەنیم چـــــەم هـــا وە راوە
ئـــەر وەی زوو مـــەیۆ پـــەیکێ جـــە لاوە[(٥)]

مـــــاوەرۆ نـــــامەی جـــــام جـــەمینەکـــەم
دیـــدەی دنـــیاو دیـــن، دنـــیاو دیـــنەکـــەم[(٦)]

یـــەك غـــەزەڵ مـــەتڵەع «مـژدە ئـەی دڵ» بـۆ
باوەر، بـەڵ پـەی دڵ تـەسکین حـاسڵ بـۆ[(٧)]

---

(١) واتە: دڵم کە جێگای ئەوە گەرمای لە ئەندازە دەرچووەو بۆ ئەوە ناشێ ببێ بە جێگای یادی ئەو چونکە ئەی سووتێنێ.
(٢) بویەر: تێپەڕە. واتە: دڵم ئەوەندەی دڕکی مەینەت تیایە زەحـمەتە پێی ئارەزووی ئەوی پیا بڕوا چونکە لەوانەیە بریندار بکا.
(٣) ماروون: دێنمەوە. فەراقەت: فەراغەت، دەس بەتاڵ. تامڵ: سەبرو چاوەڕوانی. واتە: چەند دەلیل دێنمەوە بۆ دڵم کەوا یار دەسی ناگا نامە بنوسێ، لێی بوەستەو سەبر کە، کەچی ئەو هەر ئەڵێ لەکوێ ئەتوانم خۆم راگرم.
(٤) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.
(٥) مزانی: ئەزانی. مەیۆ: دێت. پەیك: فروستادە.
(٦) ماوەرۆ: دێنێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «ماوەرۆ» نووسراوە «باوەرۆ» واتە: بێنێ.
(٧) مەتلەع: یەکەم شیعری قەسیدە. مژدە ئەی دڵ: ئیشارەیە بۆ شیعری یەکەمی ☜

وەر بــــۆ نــەیشەڵڵا لمــێش تــێکــەڵ بــۆ
خــواجـە تـۆ پـیرت بـا هــەر مـوجمەڵ بـۆ[١]

چ حـــاجەت ســەریح تــۆ بــواچــی پــێم
مـــن زووم شـــناسا بــەخت ســیای وێم[٢]

☞
قەسیدەیەکی حافیزی شیرازی کە ناوەرۆکەکەی مژدەی هاتنی یارە. ئەو شیعرە بەم جۆرەیە:
مژده ای دل که مسحیا نـفسی مـی‌آید     که ز انفاس خوششش بوی کسی می‌آید
باوەر: بێنە. واتە: خواجە حافیز! ـیا خوا هەرگیز وەك من بێ مەیلی ئازیز بە چاوی خۆت نەبینێ ـ تۆ خۆت ئەزانی من چەند چاوەڕوانی نامەی یارم، بـۆیـە سـوێـندت ئـەدەم بـە عەشقی ئەو پیاڵە شەرابەکە خواردووتەتەوەو، ئەو کـۆڕی ئـاهەنگەی کـە تـیایا بـەشدار بووی‌و، ئەو کۆمەڵەی لەگەڵیانا بوویت، ئەگەر ئەزانی بەم زوانە فرستادەیەك دێت‌و نامەی یارە ناوچاو وەك ئاوێنەکەمم بۆ دێنی ـکە چاوی دنیاو دینمە، بەڵکو هەر دنـیاو دیـنمە ـ قەسیدەیەکم بۆ بێتەوەکە سەرەتاکەی «مژده ای دل» بێ، بەڵکو دڵم تۆزێ ئۆقرە بگرێ.
(١) وەر بۆ: وە ئەگەر بێتوو. نەیشەڵڵا: خوانەخواستە. لمێش: لمێکی. موجمەل: کورت. واتە: وە ئەگەر بێتوو خوانەخواستە ئەو شیعرەی کە بۆم دێتەوە بێ گەرد نەبێ‌و موژدەی هاتنی یار بە ڕۆشنی نەدا بەدەسمەوە، تۆ سەری پیرەکەت، حافیز! بە قسەیەکی کورت ئەو خەبەرە ناخۆشەم بدەرێ با کەم دڵم سوێی پیابێتەوە. مـەولەوی لەگـەڵ ئـەم مـەعنایەدا مەعنایەکی تریشی مەبەس بووە، کە ئەوەتە «نەیشەڵڵا» لە «نە»و «یشاءالله» دروست بووبێ وە لە جیاتی «لم» بخوێنرێتەوە «لەم» کە حەرفی نەفیە، واتە: وە ئەگەر بێتوو لە «یشاءالله» کەدا «لەم» یەك تێکەڵ ببێ‌و ببێ بە «لم یشاء الله»... مەبەسی ئەوەیە ئەگەر هـاتوو خـوا موقەددەری نەکرد کاغەزی یارم بۆ بێت... تاد.
(٢) بواچی: بڵێیت. شناسا: ناسی. واتە: پێویست نیە بە ئاشکرا ئەو خـەبەرە نـاخۆشـەم بدەیتێ چونکە من زۆر بەختی ڕەشی خۆم ناسیوەو ئەزانم نامەی یارم بۆ نایەت.

**[٣]**

## ڕەفیق مەحرەم[١]

ڕەفـــێق مـــەحرەم عـــیجزو ســـروورم
حـــەکـــیمەکـــەی ئـــێش زام نـــاسۆرم[٢]

ئـــاویارەکـــەی ســـەوزەی ئـــارەزووم
دانـــا بـــە گـــردین راز کـــۆنـــەو نـــۆم[٣]

دەمـــاخ وە نـــەشئەی ســـەر بـــەرزان کـــەیل
مورشید میراو سەر جۆی بادەی لەیل[٤]

ئـــەنیس مـــەجلیس عـــەیش‌و نـــیشاتم
دەسگـــیر راگـــەی هـــات‌و نـــەهاتم[٥]

جـــڵەو کـــێش زەوق ئـــاهووی رەوێڵم
بـــەزم‌ئـــارای مـــەجلیس کـــەمەن وە پـــێڵم[٦]

---

**[٣]**

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ جەنابی شێخ «سراج‌الدین»ی تەوێڵە ﷺ نووسیوە.

(٢) واتە: ئەی هاوڕێی مەحرەمی خۆشی‌و ناخۆشیم، وە ئەی تیمارکەری برینی ناسۆر کەوتووم.

(٣) ئاویار: ئاودێر. دانا: ئاگادار. واتە: ئەی ئاودێرەکەی پەلە دەغڵی هیوام، وە ئەی شارەزای هەموو رازێکی کۆن‌و تازەم.

(٤) واتە: ئەی کەسێ کە لووتت پڕ بوو لە بۆنی خۆشی پایە بەرزی بە خواگەیشتن، وە ئەی رێ پیشاندەرێ کە وەك مێراوی جۆگەی شەرابی خۆشەویستی وای.

(٥) ئەنیس: ئولفەت پێوەگیراو. واتە: ئەی هاودەمی مەجلیسی خۆشیم، وە ئەی دەسگیرم لە رێگای هات‌و نەهاتدا.

(٦) رەوێڵ: گەلە. پێڵ: کەلەکە. واتە: ئەی راکێشەری جڵەوی ئارەزووی گەلە ئاسکەکان کە مەنسووبەکانن ئەیان هێنیتەوە سەر رێگای راست، وە ئەی رازێنەرەوەی مەجلیسی ئەوانەی کەمەندیان بەستووە بۆ عیبادەت. لە تەریقەتی نەقشبەندی‌یا ئوسووڵەن سۆفی‌یەکان دەستەو ئەژنۆ دائەنیشن وە قایشێك لە پشتیانەوە دێنن‌و لە سەر ئەژنۆیان توندی ئەکەن.

وه مـــەرگت یـــەند خـــەم جـە لا بـیەن جـەم
لاو هــون گـــرتەن پـــای شـــەرم مـەحکەم(١)

زەنـــجیر مـــەینەت پـــای گـــوریز بـــەستەن
مـــارەکـەی دووریت ریشـــەی دڵ گـەستەن(٢)

ســـامان ســـام کـــەردەن دەردەکـــەی فـــیراق
بـــۆی تـــاڵی دووریـــم مـــەیۆ نـــە مـەزاق(٣)

جـــــەو ســــاوه ئـــــازیز لێم نــــادیارەن
ســــەیر کـــائینات نـــە دیـــدەم خـــارەن(٤)

ئـــــامۆشـــــۆی یـــــانەم کـــــەردەن ویـــانە
یـــــەکســـانەن جـــە لام قـــەومو بـــێگـــانە(٥)

ئـــــیلتیجام بـــــە تـــــۆن جـــای هـــانامەنی
نـــــە بـــــەیدای هـــیجران رەهـ نـــومامەنی(٦)

---

(١) واته: قەسەم به مەرگت ئەوەندە خەمو خەفەت کۆ بووەتەوە لام، وە ئەوەندە گریاوم لە جیاتی فرمێسك خوێن لە چاوم هاتووە، ئێستا لافاوی خوێن پێی شەرمی بـەستووم‌و ناتوانم بجۆڵێمەوە.
(٢) گوریز: ڕاکردن. گەستەن: گەستووە. واته: زەنجیری مەینەت پێی ڕاکردنی بەستووم‌و ماری دووریت ریشەی دڵی گەستووم.
(٣) مەیۆ: دێت. واته: دەردی دووری لەگەڵ زەوی تەختی کردووم‌و ئێستا بـۆنـی تـاڵی دووری لە دەمم دێ.
(٤) واته: لەو کاتەوە ئازیزم لێ دیار نیە، هەرچی سەیری خـەڵك بکـەم وا ئـەزانـم دڕك ئەچێ بە چاوما.
(٥) ویانە: بیانوو. واته: ئامۆشۆی ماڵم کردووە بە بیانوو بۆ دەرنەکەوتن، ئەگینا قـەومو بێگانە وەك یەکن لە لام.
(٦) ئیلتیجا: پەنا. هانا: دەسەو دامێن بوون. بەیدا: «بیداء»، دەشت. واته: پەنام بە تۆیـەو دەسەو دامێنی تۆ بووم، چونکە تۆی لە دەشتی دووری‌یا ڕێگام پیشان ئەدەی.

یــەکــجار تــەن خــەستەی زارو رەنــجووریم
دڵ رێزە رێزەی کـــــارد مـــــەهجووریم(۱)

گــرمەی کــوورەی دەرد کــۆی تــاقەت تــاوان
بــۆی سـفتەی جـەرگم وە گـەردوون یـاوان(۲)

هـــەر رۆ جـــەیحوونێ مـــەڕێزۆ نـــە چـــەم
ســـارای دڵ بـــیەن وە هـــووناو چـــەم(۳)

هـــەر ســـاتێ دەردێ ســـزا مـــدۆ پـــێم
یــەك ئــان زیــندەگــیم حـەرام بـیەن لێم(۴)

دەخـــیل تـــا هـــاڵا تـــەن نـــەویەن وە گـــەرد
ســـفتەش نـــەبەردەن وە نـــاڵەکـــەی دەرد(۵)

رجـــا کـــەر «احـــمد» لوتــفش بــۆ چــەنیم
خــەجاڵەتــی بــەرز «کــریم» نــەیۆ پێم(۶)

---

(۱) واتە: لەشم بە هۆی نەخۆشی‌یەوە یەکجار ناڕەحەتە، وە دڵم بە چەقۆی دووری پارچە پارچە بووە.

(۲) واتە: گرمە گرمی کوورەی دەردم کێوی سەبرو بوردەباریمی تواندووەتەوە، وە بۆنی جگەری سووتاو بە هەموو لایەکا بڵاو بووەتەوە.

(۳) مەڕێزۆ: ئەڕێژێ. واتە: هەر رۆژێ ئەوەندەی چەمی جەیحوون فرمێسك لە چاوەکانم ئەڕژێ، وە تەختانی دڵم بووە بە چەمی خوێناو.

(۴) مدۆ: ئەدا. واتە: هەرتاوێك دەردێك سزام ئەدا، وە وام لێ لێ هاتووە بە یەکجاری ژیانم لێ حەرام بووە.

(۵) هاڵا: هێشتا. سفتە: سووتاو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «نەبەردەن» نووسراوە «نەوەردەن» واتە: نەخواردووە.

(۶) واتە: دەخیلتم تا لاشەم نەبووە بە تۆزو، دەرد خۆڵەمێشەکەی بە دەم ناڵی ئەسپی خۆیەوە نەداوە بە با، تکا بکە بەڵکو پێغەمبەرﷺ لوتفی لەگەڵم بێ‌و شەفاعەتم بۆ بکا، بەڵکو خەجاڵەتی حوزووری خوا نەبم لە قیامەتا.

وەرنـــە هــا مــردم، تــۆ بــای ســڵامــەت
بـــا هـــەر بـــمانۆ تــا رۆی قـيامەت(١)

[٤]

## رەمەزان تلوع(٢)

رەمـــەزان تـــلوع ســوبح شــادی شــەن
شــەوال شــام شــووم نــا مــرادی شـەن(٣)

دەردیـــنە شــەوال، ئــای زام ســەختە مــن
تــاڵە شــووم شــەوال، ئــای بـەد بـەختە مـن(٤)

غــورە، غـورەی ئـەو سـەفاش پـەی غـەیری
ئـازیز قـیبلەی مـن، وەفـاش پـەی غـەیری(٥)

هـای مـوغەننی تـار حـەنجەرەی وەش تـەرز
وە ســەر پــەنجەی نـاز بـاوەرە ئـەو لەرز(٦)

---

(١) بای: بێت. واتە: ئەگەر وا ناکەی وا ئـەوا مـن مـردم، تـۆ سـەلامەت بـی، بـا دەردو مەینەتەکەیشم تا رۆژی قیامەت بمێنێتەوە.

[٤]

(٢) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لە شەوێکی جەژنی رەمەزانا وتووە.

(٣) واتە: رەمەزان، کاتی دەرکـەوتنی بـەربەیانی شـادیەتی، چـونکە رۆژی جـەژن لە رۆژەکانی خۆی نیەکەچی بە ناوی ئەوێشەوە دەرئەچێ، شەشەڵانیش ئێوارەی نەگبەتی بە ئاوات نەگەیشتنیەتی، چونکە رۆژی جەژن لە رۆژەکانی ئـەوەکـەچی خـەڵکـی لێـیان دابڕیوەو داویانە بە رەمەزان.

(٤) دەردینە: دەرداوی. تـاڵە: «طـالع»، بـەخت. واتـە: ئـای دەردەدار شـەشەڵانو، ئـای گرفتاری زامی سەخت خۆم! ئای چارە رەش شەشەڵانو ئای بەدبەخت خۆم! هۆی ئەم بەدبەختی‌یەی ئەمو شەشەڵانیش لە شیعری پاشەوەدا باس کراوە.

(٥) غورە: سەرەتای مانگ. واتە: سەری مانگ هی شەشەڵانە، کەچی خۆشی‌یەکەی بۆ بێگانەیەکە رەمەزانە، ئازیزیش قەبیلەی منە، کەچی وەفای بۆ بەدکارانە.

(٦) باوەر: بێنەرە. واتە: کاکەی گۆرانی بێژ تارەکەت بە دەستی ناز هەڵگرەو فووی پیاکەو ئاوازێکی خۆشمان بۆ لێدە.

مــــن ئـــاسا یـــاد کـــەر جـــەرگەی ویـــەردە
یـــــاران مــــــەرحـــــووم دەرد دڵ وەردە(١)

بـــــــەو لەرەی دڵ ســـــۆز وە جگـــــەرەوە
مـــــەزموون ئـــــەوان تـــەکـــرار کـــەرەوە(٢)

ئـــاخ، مـــنو شـــەوال هـــەردوو هـام فـەردیم
هـــەر دوو گـــرفتار ئـــێش یـــەك دەردیـم(٣)

غـــوڕەی ئـــەو قـــبیلەی مـــن وە یـەك تـارەن
وە نـــــام ئـــــێمـــــەو کـــــام ئـــەغیارەن(٤)

## [٥]

## ریازەت کێشان(٥)

ریـــــازەت کـــێشـــان.. ریـــازەت کـــێشـــان
ســـــەییدان خـــــاس ریـــازەت کـــێشـــان(٦)

---

(١) واتە: بە عادەتەکەی خۆم کۆمەڵی هاوڕێیانی کۆچ کـردووی دەردی دڵ خـواردوو بێنەرەوە یاد.

(٢) دڵ سۆز: دڵ سـووتێن. ئـەوان: شـیعرەکـانی پـێشـوو. واتـە: بـەو لەرە دڵو جـەرگ سووتێنەی دەنگت ناوەرۆکی شێعرەکانی پێشەوەمان بۆ دووبارەکەرەوەکە بریتی‌یە لەم دوو شیعرەی پاشەوە.

(٣) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٤) تار: «طرح»، جۆر. واتە: ئاخ، منو شەشەڵان هەردووکمان هاوڕێی یەکین گرفتاری یەك دەردین، سەرەتای ئەوو قەبیلەی من وەك یەك وان، بە ناو هـی ئـێمـەن، کـەچی لە راستی‌دا خێرو بێریان بۆ بێگانەیە.

**[٥]**

(٥) مەلەوی ئەم قەسیدەی بۆ خوا حافیزی کردن لە فەقێکانی هاوڕێی وتووەکە لە ئێرانەوە هاتووە بۆ عێراق بۆ خوێندن.

(٦) ریازەت کێشان: ئەهلی تەسەووف ئوسوولیانە بـە هـەموو جـۆرێ نـەفسی خـۆیـان

جـــماعەت، قـەومان رای خـەیر ئـەندێشـان
جەرگەی هامسەران، دڵرێشـان، خـوێشـان[١]

هــا هـەوای تـەحسیل دڵ وە جـۆش ئـاوەرد
نســـیو عـــەزم ســـەیر وڵاتـــانش کـــەرد[٢]

ئـــەر جـــارێ راگـــەم غـــەڵەت کـــەردەبۆ
رام وە ســـەر ئـــاداب هـــیچ نـــە بـــەردەبۆ[٣]

هـــەرکەس خـــاترش جـــە مـــن ئـــێشـــا بـــۆ
یـــا خـــود رەنـــجێوەش پـــەرێم کـــێشـــا بـــۆ

گـــــــەردەنم ئـــــازاد بکــــەران ئـــــارۆ
گـــرد وە دڵ روخســـەت بـــدەران ئـــارۆ[٤]

---

☞

ئەزیەت ئەدەن بۆ ئەوەی لە خراپە پاك ببێتەوە، بۆ نموونە چل شەوی خشت، رۆژێ بە دەنکە خورمایەك قەناعەت ئەکەن، بە وانە ئەڵێن ریازە ئەکێشن. جا چونکە فەقێکانیش لە پێناوی خوێندنا هەموو جۆرە مەینەتێك قوبووڵ ئەکەن مەولەوی بە ریازەت کێشی ناوی بردوون. واتە: ئەی ریازەت کێشەکان، ئەی لە ناو ریازەت کێشەکانا تایبەتیو لە هـەموو گەورەتر. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «سەیدان» نووسراوە «سەیران» واتـە: گـەڕۆکـە تایبەتی‌یەکانی دەستەی ریازەت کێشەکان، چونکە فەقێ بـەم‌لاو بـەولادا ئـەگـەڕێن بـۆ خوێندن.

(١) رای خەیر ئەندێشان: ئەوانە بیر لە رێ خێر ئەکەنەوە.

(٢) هەوا: ئارەزوو. تەحسیل: خوێندن. نسیو: «نصیب»، بەختو چارە. واتە: ئـارەزووی خوێندن دڵمی هێناوەتە جۆش، وە بەختم عەزمی کرد کە بڕۆم بۆ سەیری وڵاتان.

(٣) راگەم: رێگام. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٤) بکەران: بکەن. واتە: ئەگـەر جـارێك رێگـام لێ تـێك چـووبێو نـەچووبمەوە سـەر ئوسووڵو پەیڕەوی کۆمەڵ، یان یەکێك دڵی لێم ئێشابێ، یان رەنجێکی کێشابێ بۆم، ئێوە ئەمڕۆ گەردنم ئازاد بکەنو هەمووتان بە دڵ ئیزنم بدەن بڕۆم.

عـــەزمم پـەرێ سـەیر عـێراقـەن ئـارۆ
بـــنیشدێ وە خـــەیر فـیراقـەن ئـارۆ[١]

دنـــیا فـــانی‌یەن هـــەر مـــبۆ مـەردەن
لازمـــەن گـــەردەن ئـــازادی کـەردەن[٢]

[٦]

## ڕۆشنی دیدەم[٣]

ڕۆشـــنی دیـــدەم، ســـەرمایەی ژیـــنم
مـــەزەی بـــەزم کـــەیف دڵەی خـەمینم

ســا کــە مــن بــێ تـۆ نـەسپەردم ئـەڕوا
سـەر نـەنیا نـە سـای ئـەڵحـەد بـێ پـەروا[٤]

چـــۆن واچـــوون وەفــام هــانە تـۆی دڵدا
وەفـــام هـــەم جـــەرگم بـدەن وە چـڵدا[٥]

تـاقیق مــن جـە سـەنگ سـەرسەخیم بـاڵان
مـــەزرەعەی خـــارج ئـینسانیم کـاڵان[٦]

---

(١) پەرێ: بۆ. بنیشدێ: دانیشن.
(٢) مبۆ: ئەبێ. واتە: دنیا بەقای بۆ نیەو مردن لە ڕێدایەو پێویستە گەردنی یەکتر ئازاد بکەین.

[٦]

(٣) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە لاواندنەوەی مناڵێکیا وتووەکە ناوی موحەممەد بووە.
(٤) نەسپەردم: نەم سپارد. ئەڕوا: «ارواح»، گیان. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.
(٥) واچوون: بڵێم. واتە: من کە پاش مەرگی تۆ گیانم نەسپاردو بێ ترس سەرم نەنایەوە لە ژێر سایەی بەردی ئەلحەدا، چۆن بۆم هەیە بڵێم بە وەفام، ئەی خوا وەفاو جەرگم بدا بە چڵی داری مەینەتا.
(٦) تاقیق: «تحقیق»، دیار. کاڵان: کێڵاوە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری

وەرنــە مــن وەی تـەور کـێشـان سـزاو دەرد
ئــەگـەر سـەنگ بـیا مـەکـەردش وەگـەرد[١]

دەك ئــــەجەل وە دام هـــــیجران بـــەستەبۆ
ســـەرتاپاش وە ئـێش زامـان خـەستەبۆ[٢]

پـێم نـە نـۆشـا مـەی پـیاڵەی مـەردەن
ئیسته من، سـەر ژان، دڵ سـەردان کـەردەن[٣]

[٧]

## ریشێ چەنی من[٤]

ریشــــێ چـــەنی مــن نــەیۆ وە حـوزوور
مــــبۆ بـــتاشووش تـــا وە نــەفخ ســـوور[٥]

---

☞

دوایی‌یەوە.

(١) بیا: بوایە. واتە: دیارە سەرسەختی من لە هی بەرد زیاترە، وە من کێڵگەیەکم کێڵاوە لە سنووری توانای ئادەمیزاد بە دەرە، ئەگینا ئەم هەموو دەردو سزایەکە من کێشاومە ئەگەر بەرد بی‌کێشایە لە ژێر باریا وردو خاش ئەبوو، وە ئەبوو بە تۆز.

(٢) بەستەبۆ: ببەسرێتەوە. مەعنای ئەم شیعرەش بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٣) واتە: دەك خوایە ئەجەل بە داوی دووری ببەسرێتەوەو سەرتاپای بە ئێشی زام گرفتار بێ، وا شەرابی مەرگی پێ نەنۆشاندمو سەری بەم جۆرە هێنامە ژانو دڵی سارد کردمەوە.

[٧]

(٤) مەولەوی جارێکیان لە سەردەمی فەقێ‌یەتیدا، بە پێچەوانەی ئوسووڵی فەقیەکانی ئەو سەردەمە، ریشی ئەتاشێ، هاوڕێ کانیشی ناڕەزایی پیشان ئـەدەن لەم ریش تـاشینەی، ئەویش بەم شیعرە بیانوویان بۆ دێنێتەوە.

(٥) نەیۆ: نەیەتە. بتاشووش: بتاشم. نەفخ: فوو پیاکردن. سوور: شاخێکە مەلائیکەیەکی تایبەتی ـکە ناوی ئیسرافیلە ـلە قیامەتا دوو جار فووی پیا ئەکا، لە جاری یەکەمیانا هەموو زیندوویەك ئەمرێنێ وە لە جاری دووهەمیانا هەرچی مردووە زیندووی ئەکاتەوە. واتـە: ریشێك لەگەڵ مندا نەیەتە حوزووری خوا، ئەبێ تا ئیسرافیل فوو ئەکا بە شاخەکەیا هەر ئەبێ بیتاشم.

## [١]

## زیلەی تەڵمیتبار(١)

زیـــلەی تـــەڵمـیتبار کـــۆچ نـــەوهاڵان
تــەئسیرش نــیەن ئــیمساڵ چــون ساڵان(٢)

یـــەقینەن ســـەر خـــێڵ نـازك نــەمامان
نــەکــەردەن هــەوای هــەوارگــەی دامـان(٣)

بــەڵێ یــە نــامەی دڵ پــێ ئــێشـاکــەش
یەکـزەی دەروون حـەسرەت کـێشـاکـەش(٤)

ئــەو سینە سیم وەنگ، ئـاینەی جـەم رەنگ
مــنمانۆ هــەوەس نــە دڵ دای خــەدەنگ(٥)

---

[١]

(١) مەلەوی ئەم غەزەلەی بۆ دۆستێکی نووسیوەکە پایز داهاتووەو ئەو هەر لەکوێستان ماوەتەوە.

(٢) زیلە: هەراو دەنگە دەنگ. تەڵمیتبار: کۆچەری‌یەکان دوو جێغ بـەمدیوو بـەودیوی وڵاخەوە ئەبەستن، پشتی وڵاخەکە وەك تەختانی لێ‌دێ، جێگەو بانی لەسەر رائەخەن‌و منداڵ‌و ژنی لەسەر سوار ئەکەن، بەوە ئەڵێن تەڵمیتبار. نەوهاڵ: تازە پێ‌گەیشتوو. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٣) دامان: داوێن. واتە: ئەمساڵ وەك ساڵان دەنگی کۆچ‌و باری یاران نـایەت، وا دیـارە سەرقافڵەی نەونەمامە شۆخەکان ئارەزووی گەرمەسێری نەکردووەو لەکوێستان ناگەڕێتەوە.

(٤) واتە: بەڵێ راستە نایەتە خوار، ئەوەش نامە دڵ بریندارەکەی کە ئەو خـەبەرەی تـیا نووسیوە، ئەمەش کزەی دەروونی من کە بە هۆی ئەوەوە زەحمەتم کێشاوە، وە نیشانەی نەگەڕانەوەی ئەوە.

(٥) سیم وەنگ: لە زیو چوو. منمانۆ: ئەنوێنێ. دای: دانی. واتە: ئەو خۆشەویستەکە وەك زیو سپی‌یەو وەك ئاوێنەکەی جەمشید رۆشنە، ئارەزووی وایە تیر بنێ بە دڵمەوە، بۆیە ئەم نامەیەی بۆ نووسیم.

حەسرەتا حەسرەت، های یە چێش کەردی
چون جێ ویەردی پێش‌دا ویەردی(١)

نم مدۆ مادەی نامش ئەو نامە
ئاو دەندان ئاسا، دەندان خامە(٢)

نەمەندەن قووەت سەرمایە تێش‌دا
هەرسێ بێ نە را هۆر مەگنۆ پێش‌دا(٣)

پووش ئایریچم جای نەسیم نیەن
هۆر کەردەو بەردەیم تا وە لاش شیەن(٤)

پایز زەڕ، یەخ جام، چارشێوێ هەی تەم
دێرەن سوارەن نەوعەرووس خەم(٥)

---

(١) حەسرەتا: داخەکەم. جێ: لێرەوە. ویەردی: تێپەڕیت. واتە: ئای داخ بە جەرگم ئەوە چیت کرد؟ تۆ کە لێرەوە تێپەڕیت بە ناو دڵی منا تێپەڕیت، ئیتر چۆن دڵت هات تیری پێوە بنێیت؟.

(٢) مەولەوی لێرەدا وا دائەنێت کە یەکێك پێی وتووە مادەم ئەو نایەتەوە لەکوێستان، تۆ بۆ هەوڵێ نادەی بۆ چاری ئەم دەردی دووری‌یە. ئەمیش لە وەراما ئەڵێ یا ئەبێ نامەی بۆ بنووسم، یا یەکێك هەڵم گرێ‌و بمبا بۆ لای. هیچ کامیش لەمانە لە تواناادا نین، وە دیت هۆی لە توانادا نەبوونی ئەم دوو چارەیە لە سێ شیعرا روون ئەکاتەوەکە یەکێکیان ئەم شیعرەیە تیایا ئەڵێت: ناتوانم نامەی بۆ بنووسم چونکە هەرچەند لەکاغەزەکەدا ناوی بێت قەڵەمەکەم سوێی پیا دێتەوەو لە درزی نووکەکەیەوە فرمێسك ئەڕێژێ، وەك چۆن کەسێك ناوی شتێکی خۆشی لا بەرن ئاو ئەزێتە دەمی و لە نێوانی دانەکانیەوە دەرئەچێ.

(٣) هەرسی: فرمێسك. هۆرمەگنۆ: هەڵ‌ئەکەوێ. واتە: لەبەر ئەوە قەڵەمەکەم هێزو پێزی تیا نەماوە، وە ئەگەر بێت‌و کاتێك کە بەسەر کاغەزا ئەڕوا، دڵۆپە فرمێسکێکی خۆی بێتە رێی لێی هەڵ‌ئەکەوێ.

(٤) هۆرکەردە: هەڵ‌کردن. شیەن: بەسەرچووە. واتە: وەك ناتوانم بۆی بنووسم، کەسیش ناتوانی هەڵم گرێ بمبا، چونکە لەبەر سۆزی یار بووم بە پووشێکی ئاگر تێ‌چوو، وە بای نەسیم ناتوانێ هەڵ‌کاو بمبا.

(٥) دێرەن: درەنگە. نەوعەرووس: نەوبووك. واتە: مادەم نە پێم‌کرا کاغەزێ بنووسم، وە

مـــوتریب، یـــەکـــارەن، مـــەر ســـیا ســـەنگی
مـــن بـــەی حـــاڵەوە، تـــۆ وەی بـــێ دەنگـــی

جـــە تـــەنخوای نـــەی بـــەزم خـــەم وەیـــلانەوە
هـــۆردەر ئـــەی چـــەند فـــەرد وە دیـــلانەوە:[١]

بـــــــە وەردەی زامدا دڵ تـــــاقەت بـــــێزا
هـــەرچـــی بـــی یـــەکســـەر وە چـــەمدا ڕێزا[٢]

ئـــەر هـــەڵای ڕەمـــەق مـــەندەن وە تـــەنش
بـــێ مـــەیلیت لیـــباس کـــەردەن بـــەدەنش[٣]

چون خەیاڵ وە ماچ پات خـۆش حـاڵ مـەبی
کاش جەکۆن ئەو بەخت لەب تەب خاڵ مەبی[٤]

---

☜

نە لە تواناشا بوو کەس بمبا بۆ لای، ئەبێ لە جیاتی خۆم خەمو خەفەتەکەم بنێرم. کەواتە: ئەی پایز تۆ لە گەڵای زەردی وەریوی درەختەکان لێرە بەندێك بهۆنـەرەوە بـۆ سـەری، تۆیش ئەی سەهۆڵ ببە بە ئاوێنە بۆ ئەوە لە پێشیەوە رات گرن، ئەی تەمو مژی شاخەکان تۆیش ببە بە چارشێوو سەری داپۆشە.

(١) وەیلانەوە: بلاوێنـەرەوە: دیـلان: نـقامێکـی کـۆنـی کـوردی‌یە لەکـاتی بـووك بـردنا ئەوترێ. واتە: کاکەی ئاهەنگ گێڕ لە جیاتی شمشاڵ ئەم ئاهەنگی بووك سوارکردنە دەس کە بە لاواندنەوەی خەمو بە نقامی دیلان ئەم چەند شیعرەم بۆ بڵێ:

(٢) وەردە: خوراو. بێزا: بێزرا. ڕێزا: داوەری. واتە: سەبرو تاقەتی دڵ نەماو بەو شوێنانەدا کە تیری یار کون کونی کردبوو هەمووی ڕۆیشتو گشتی بوو بە فرمێسكو لە چاویەوە دارژایە خوار.

(٣) ڕەمەق: نیوەگیان. واتە: ئەگەر هێشتا نیوەگیانێك لە لەشیا مابێ هی ئەوەیە بێ‌مەیلیت وەك بەرگ دەوری داوەو نایەڵێ ئەو نیوەگیانەش دەرچێ، ئەگینا دەمێك بوو مردبوو.

(٤) کاش: خۆزگە. واتە: مادەم خەیاڵی بە ماچ کردنی پێت دڵشاد ئەبێ، کوا خوا ئەوەی لەگەڵ بکردایە بهاتیتایەتە خەوی تا پێت ماچ کاو کە ڕاچنی لێوی هەڵزرێ وەك تا دار، یان کوا بەختی بووایە لێوی بهاتایە بۆ لات بۆ ماچ کردنی پێت وە لە ڕێگادا تلۆقی بکردایە.

یـــەند دیـــان وەو را تـــۆ مـــەی نـــەپێش‌دا
دیـــــدەی دڵ نـــیگا نـــەمەندەن تـــێش‌دا(١)

مەعدووم خـەم مـایەی فـیکرەکـەت بـەردەن
یـا پـەی دڵ وەشـی وێت غـەڵەت کـەردەن(٢)

تـــۆو ئـــێستە تـــەشریف ئـــازیز گـیانی
ســـفتەن‌و تـــەئسیر ئـــاو حـــەیوانـــی(٣)

(١) دیان: روانیویە. مەی: دێیت. واتە: چاوی دڵی ئەوەندەی روانیوە بۆ ئەو رێگایەی تۆی پیا دێیت، هێزی بینینی خۆی هەموو خەرج کردووەو هیچی تیا نەماوە.
(٢) مەولەوی لەم شیعرەوە دیسانەوە ئەگەڕێتەوە سەر قسەکردن لەگەڵ خۆی. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٣) واتە: ئەرێ ئەوە مەولەوی! خەم فکرو هۆشی لا نەهێشتووی، یان هەر بۆ دڵخۆشی دانەوەی دڵی خۆت وا خۆت هەڵئەخەڵەتێنی‌و بە تەمای دیتنی دۆستی؟ ئەگینا تۆو هاتنەوەی دۆست ئەوەندە دوورن لە یەکەوە، وەك سووتاو بە ئاوی حەیات زیندوو بکرێتەوەکە نە دەسی کەس ئەکەوێ، وە نە سوودیشی هەیە.
سەرنج: خوێنەر، بێ‌گومان، لەم قەسیدەدا هەست بەوە ئەکا کە تا رادەیەك بەزۆر نووسێنراوە بە یەکەوە، وە مەعناکان وشکی‌یەکیان تیایە. لە راستیدا لە تێکڕای چەند نووسخەوە ئەم قەسیدەیە بەم چەشنەکۆ کراوەتەوە. ئێمە بێ‌گومانین لەوەدا کە ئەم قەسیدەیە لە ئەنجامی خەراپ نووسینەوەو نەگونجاوی شێوەی نووسینی کۆنی کوردی‌یەوە چەند هەڵەی تێ کەوتووە. لە بەر ئەوە هیوامان وایە ئەگەر کەسێك نوسخەیەکی‌تر شك ببا ـ چ بۆ ئەم قەسیدەیەو چ بۆ قەسیدەکانی‌تر ـ بۆمانی بنێرێ، بەڵکو خوا یار بێ ئەگەر جارێکی‌تر لە چاپمان دایەوە لەمەی ئێستا راست‌ترو پوخت‌تر بێ.

## [٢]

### زووسانەن(١)

زووســـانەن وەی رەنگ وە گـــەردوون یـاوان
گـــێجـــیای لوولگـــێج کـــلێڵەی کـــاوان(٢)

بـــەنا بـــاشی بـــورج بـــەرزە دیـــاران
ســفید کـــاری کـــەرد تـــاقچەی مـوغاران(٣)

چ شـــیرین زەڕگـــەر تـــۆف هـــەوای ســـەرد
گـــۆشـــوارە نـــە گـــۆش نـــەونەمامان کـەرد(٤)

پـــەی نـــیگای بـــاڵای مـەحبووب بێ گـەرد
یـــەخ ئـایـنە گـرت، تـەم چـارشێو ئـاوەرد(٥)

ئـــەی مـەحبووب خـاس، وەی بـینای تـەمام
مـــناڵو پـــەی بـەزم سـاقیو شـیشەو جـام(٦)

---

[٢]

(١) گێجیا: خول خواردوو. لوول گێج: گەردە لوول. کلێڵە: بەفری لا شان. واتە: زستانە، بۆیە وا بەفری باگێژداوی لا شانی شاخە بەرزەکان گەیشتووەتە ئاسمان.

(٣) بورج: قەڵا. دیار: وڵات، مەبەس شاخەکانە. موغار: ئەشکەوت. واتە: باش وەستای قەڵای شاخە بەرزەکان ـکە دەستی قودرەتی خوایە ـ دەرگای ئەشکەوتەکانی سپیکاری کردووە.

(٤) زەڕگەر: زەڕەنگەر. گۆشوارە: گوارە. واتە: ماشەڵڵا تۆفی هەوای سارد کـە بـووە بـە زەڕەنگەرو ئیش لە گەڵای دارەکانا ئەکاکە وەك زێڕ زەرد هەڵگەڕاون، گوارەیەکی چەند جوانی کردە گوێی نەونەمامەکان. مەبەسی ئەوەیە چەند جوان گەڵای زەردی بە لقو پۆپی درەختەکانا شۆڕ کردووە.

(٥) نیگا: تەماشا کردن. واتە: تۆفی زستان بۆ تەماشا کردنی باڵای نەونەمامی گووراە لە گوێ کردوو، سەهۆڵی بۆ گرتووە لە باتی ئاوێنەو تەمی بۆ کردووە بە چارشێو.

(٦) مناڵۆ: ئەناڵێنێ. واتە: ئەم خۆشەویستە جوانەو کۆشکە سپیکاری کراوە هاواریـانەو داوای کۆڕی مەی خواردنەوە ئەکەن.

ساقی، باك نیەن جە سەردی «دەی»، دەی
هەوا وەش كەردەن نەشئەی نۆشای مەی[١]

ئاخر سەر مەشقەن پەرێ مەی خواران
واردەی ویەردەی ویاردەی یاران[٢]

چون نە دڵ شنۆی مەزەی مەی داران
بدیە چۆن وە تۆی لۆنگێ مەویاران[٣]

زوانەكەی سۆز، دەسەكەی ناڵە
بكیانۆ، رێزۆ، رەحمەت پیاڵە[٤]

رەحمەت وە رووی خاك رستگاران‌دا
پیاڵە وە دەم ئینتیزاران‌دا[٥]

دێرەن با ئێمەیچ نەی گوزەرەوە
جامێ وە دەس نێین، دەس وە سەرەوە[٦]

---

(١) دەی: یەكەم مانگی زستانە. واتە: كاكەی مەی گێڕ زوو كە دەس كە بە مەی گێڕان، ترست نەبێ لە سەرمای زستان، نەشەی مەی‌خوادنەوەی تاقمەكانی پێش ئێمە هەوای خۆش كردووە.

(٢) واردە: خواردوو. ویەردە: پاشماوە. ویاردە: بەجێ هێڵراو. واتە: چونكە خوادنەوەی پاشماوەی بەجێ هێڵراوی یارە مەی‌خۆرەكان ئەبێ بە سەرمەشق بۆ ئێمەی تازە مەی خۆر.

(٣) داران: هەیانە. بدیە: بڕوانە. لونگ: بەرماڵی سەرشانی هەژار. مەویاران: بەسەر ئەبەن. واتە: سەیركە چونكە مەزەی مەی لە دڵیانایە، لە قەبرا بە تۆی كفنێ رائەبوێرن.

(٤) بكیانۆ: بنێرێ. رێزۆ: بڕێژێ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێكەوە دێ.

(٥) واتە: مادەم كە ئەوان مردوونو ئێمەش بە رێوەین، با زمانی سۆزی خۆشەویستی رەحمەت بنێرێ بۆ گۆڕی رزگار بووەكان، وە دەسی ناڵە پیاڵەی مەی بڕێژێتە دەمی ئەوانەی چاوەڕوانن. لە شیعری یەكەمی ئەم دوو شیعرەدا بە هونەری بەدیع «لفو نشر» هەیە، وە وای لێ دێتەوە «زوانەكەی سۆز بكیانۆ رەحمەت، دەسەكەی ناڵە بڕێزۆ پیاڵە».

(٦) واتە: كاكەی مەی‌گێڕ زووكە، با ئێمەیش بەم رێ‌گوزەرەی ژیاندا پیاڵەیەك بگرین بە دەستمانەوەو، دەستی تەسلیم بوون بنێنە سەر سەرمانو خۆمان بدەین بە دەس مەرگەوە.

[١]

## سەردار زومڕەی[١]

سـەردار زومـڕەی مـوسیبەت کـێشـان
فەرمان فەرمای مـوڵك دەروون پـڕ ئـێشـان[٢]

بـادەی خـەم وەردەی مـەرگ نـاکـامان
زام نـاسۆر کـەفتەی دەروون پـڕ زامـان[٣]

پـەردەی دڵ وە نـێش مـەودای خـەم پـارە
چـار نـەبردەی دەرد دڵەی بـێ چـارە[٤]

وەخـتێ سـەیل چـەم دەروون پـڕ خـاران
تـاو مـەوەست چـون تـاو ئـەوەڵ بـەهاران[٥]

بـۆی کـزەی کـەواو جـەرگم چـون جـاران
هەم، وەی، تەم مەوست ئەو رووی سـتاران[٦]

---

[١]

(١) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لە لاواندنەوەی زانایەکی گەورەدا نووسیوە، وە بـۆ بـاوکی زانایەی ناردووەکە خەبەری مەرگی کوڕەکەی بۆ مەولەوی ناردبوو. داخەکەم نـەمزانـی زاناکەکێیە.

(٢) زومرە: تاقم. فەرمان فەرما: حوکمڕان. لە هەندێ نوسخەدا لە جـیاتی «مـوسیبەت» نووسراوە «فەلاکەت».

(٣) واتە: ئەی شەرابی مەرگی مناڵی ناکام چەشتوو، وە ئەی لە ناو دەروون زامارانـدا زام بە ناسۆر کەوتوو.

(٤) پارە: لەت لەت. واتە: ئەی کەسێ کە دڵت بـە ئـێشـی تـێغـی خـەفەت لەت بـووەو چارەت بۆ دەردی دڵی بەسەزمانت نەدۆزیوەتەوە.

(٥) تاو مەوەست: تاوی ئەبەست. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٦) کەواو: کەباب. هەم: خەفەت. وەی: هاوار. ستاران: ئـەستێرەکـان. واتـە: کـاتێك کـە لافاوی فرمێسکی دەروون بریندارەکان وەك بارانی بە تاوی نیسان ئەڕژا، بـۆنـی کـزەی کەبابی جەرگی منیش رووی ئاسمانی بە تەم دائەپۆشی.

بـۆ پـڕووز جـەرگ قـرچـەی پـارچـەی دڵ
بـۆی هـوون جـۆشـیای دەروون پـڕ چـڵ(١)

ئێد چون تۆف سەخت تەم وست ئـەو کـوران
ئـــەو وێنـــەی لافـــاو بـــاڵای تـــۆ رەوان(٢)

هـــەناسەی ســـیای ســـەرد دڵســـۆزی
بـــەرد مـــدا وە بـــەرد «بـــرد العـــجوز»ی(٣)

یـــانێ نـــامەکـــەی خـــەم ئـــینشا کـــەردە
مـــەرقووم قـــەڵەم وە خـــەم شـــەق وەردە(٤)

شـــــۆڵە داوە گـــــڕ شـــــەرارەی نـــــارم
دەمـــــیاو جـــــۆش دا دڵەی خـــــەمبارم(٥)

مـــن وەر جـــە ئـــامای نـــامەی زگـــاریت
زووتـــەر جـــە خـــەبەر کـــۆس دیـــاریت(٦)

---

(١) جۆشیا: هاتووە جۆش. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٢) وست: خست. کووان: کێوەکان. رەوان: ساف رەو. واتە: بۆ پرۆزی جەرگم و قرچەی پارچەی دڵی سووتاوم وەك تۆفی سەخت شاخەکانیان بە تەم داپۆشی، بۆنی خوێنی لێشاو کردووی لەشیشم کە هەمیشە لە تاو ئازار چڵ ئەدا، وەك لافاوی باڵای تۆ ساف ئەڕۆیشت. لە ئەدەبی کۆنا هەیە تەشبیهی باڵای دۆست کراوە بە لافاو لە مەنگی و خۆش رەوی‌دا.

(٣) بەرد «ی دووهەم»: سەرما. «برد العجوز»: بـرجـی پـیرەژن، حـەوت رۆژی ئـاخری زستان. واتە: هەناسەی ساردم کە لە دڵێکی رەشی سووتاوەوە دەر ئەچێ، ئەوەندە سارد بوو بەردی ئەدا بە سەرمای برجی پیرەژن‌دا، وە ئەو لە چاویا هیچ نەبوو.

(٤) مەرقووم: نووسراو. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی دا دێ.

(٥) شۆڵە: «شعلە»، بڵێسە. شەرارە: بزیسك. دەمیا: دەماندی. واتە: مەبەسم لەم بـەیانی وەزع ناخۆشی‌یەم ئەوەیە نامەکەت کە خەفەت دای نابوو، وە قەڵمی بە هۆی خـەمەوە لەت بوو نووسیبووی، بڵێسەی بە گڕی ئاگری دەروونم سەندو دڵی خەمبارمی دەماندو هێنایە جۆش.

(٦) وەر: بەر، پێش. زگاری: عاجزی. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

خـــاترم چــەند رۆ خــەستەی خــەمان بـــی
چــەمانم چـــون تـاف سـاف چەمان بـی(١)

جـــە ئـــامای نـــامەت چـــەمەریم بـــەرز بـی
شـــادیم شـــێویـــا، شینم سـەد تـەرز بـی(٢)

شـــەمع شـــام شـــووم مـــاتەم هـــۆر گـــرِیـــا
تـای تـەل سـەمتوور شـادیو زەوق بـرِیـا(٣)

شای شـادیم شکـیا، سـوپای خـەم جـەم بـی
بــــەیداخ دەمـــاخ شـــێوەی مــاتەم بـــی(٤)

دەخـــیل بـــیم وە نـوتق خـەمان لاڵ کـەردەم
لاڵام جـــە خـــەیاڵ خـەم غـارەت بـەردەم(٥)

نـــامەرد، یـــە وادەی شـــین بـــێ شـــۆمـــەن
هـــیچ کـــۆســـم نـیەن، یـە کـۆس نـۆمـەن(٦)

---

(١) واتە: من خۆم بەر لە هاتنی نامەکەت کە ئەو خەبەرە ناخۆشەت تیا نووسیبوو، وە بەر لەگەیشتنی خەبەری کۆس کەوتنت، چەند رۆژ بوو دڵم خەفەتبار بوو، وە چاوم وەك چەم فرمێسکی سافی لێ ئەرژا.

(٢) چەمەری: شیوەن. شێویا: تێك‌چوو. واتە: نامەکەت هات هاوارو شیوەنم بەرزبووەو شادیم تێك‌چوو، وە شینو گریانم بوو بە سەد جۆر.

(٣) شام: ئێوارە. هۆرگریا: هەڵگرا. لەکوردستانا عادەت بوو یەکەم شەوی پاش مردنی کەسێك شەمعێك یان قوتیلەیەکیان لە جێگای شوردنەکەیا دائەگیرساند، ئەیان وت رۆحیانەتەکەی سەر لەو شوێنە ئەدا وە ئەگەر ببینێ هیچیان تیادانەگیرساندووە دڵگران ئەبێو ئەڵێ کوتوپڕ لە بیریان چوومەتەوە. جا مەولەویش ئەڵێ: بە هاتنی نامەکەت چرای ئێوارەی نەگبەتیو خەفەتم داگیرساو تاڵی سازو سەمتووری خۆشیم پچڕا.

(٤) شکیا: شکستی خوارد. واتە: شای شادیم بەزیو سوپای خـەفەت کـۆمـەڵی کـردو بەیداخی بێ دەماخیم داگیرایە خوار بۆ نیشانەی خەمباری.

(٥) نوتق: دەنگ. غارەت: تالان. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە دوو شیعری پاشەوە.

(٦) بێ‌شۆ: لە ئەندازە بەدەر چوو. یە: ئەمە.

سا دەی، هەی پەی کەی هەر یەك جە لایێ
باوەرین ئەو ساز شیوەن سەدایێ(١)

خەیاڵ غەمگین بی، نوتق ئاما وە دەنگ
ئێد موات وە سۆز زایڵەی سەد رەنگ:(٢)

ناکام ئەییام کامەرانیم رۆ
بەر نەوەردەی باغ نەوجوانیم رۆ(٣)

شاب شێخ عەشق یەکتای فەردم رۆ
وە ناکام مەردەی دڵ پڕ دەردم رۆ(٤)

کەنگەرەی ئەیوان کاخ دینم رۆ
تورەی لای تەلای رای یەقینم رۆ(٥)

حەللال عوقدەی راگەی شەرعم رۆ
رەهنومای تەریق جادەی وەرعم رۆ(٦)

---

(١) باوەرین: بێنین. واتە: کە نامەکەت هات´دەسەو داوێنی زمانم بووم کە خەم لاڵی کردبوو، وە لاڵامەوە لە خەیاڵم کە خەم بە تاڵان بردبووی، پێم وتن نامەردینە ئێستە من وادەی زاریو شینی بێ ئەندازەمە، وە تا ئێستا هیچ کۆسم نەکەوتووە ئەمە یەکەم جارەکۆسم بکەوێ، کەواتە ئێتر ئێوە خۆتانتان بۆ کەی هەڵگرتووە، با هەرکاممان لە لایەکەوە دەنگێك دەربێنین لە سازی شیوەنو زاری.
(٢) موات: ئەیوت. واتە: خەیاڵم خەفەتبار بوو هیچی پێ نەوترا، بەڵام نوتقم هاتە دەنگو بە سۆزێکی سەد جۆری ئەمڵاواندنەوەی خوارەوەی وت.
(٣) ئەییام: رۆژان. بەر نەوەردە: بەر نەخواردوو. واتە: ئای، رۆژی کامەرانی نەگەیشتووەکەم رۆ... ئای، بەری درەختی جوانی نەخواردووەکەم رۆ...
(٤) شاب: لاو. ناکام: ناوەخت. واتە: ئای، لاوە بێ هاوتاکەم رۆ کە لە عەشقی خوادا پیر بووبوو.
(٥) کەنگەرە: هیلالی. کاخ: کۆشك. تورە: مۆری شاهانەکە لە سەر لیرەی عوسمانی لێ ئەدرا. واتە: ئای، هیلالییەکەی هەیوانی کۆشکی دینم رۆ... ئای، مۆرەکەی سەر لیرەی رێی خواناسیم رۆ...
(٦) حەللال عوقدە: گرێ کەرەوە. وەرع: خۆ لە گوناه پاراستن.

کــــێ نــــە تــــەفاسیر قــورئان بــدۆ دەم
کــێ بــۆ ئــەحادیس رەســوول کــەرۆ جــەم

کێ وە «صرف»و «نـحو» خـاتر کـەرۆ مـەحو
کـێ وادەی تـاعەت دەم بـدۆ نـە «صَـحو»[1]

هــەنی کــێ «آداب» وە ئــاداب وانــۆ
کــێ عــیلم «مَــنطِق» جـە «مَـنطِق» زانـۆ[2]

«مُــطَوَّل» پــەی کــێ تــوول دۆ عــیبارەت
بــا «مُــختَصَر» بــۆ وە بــێ ئــیشارەت[3]

کــێ وە قــووەی عـیلم زەکـای حـەق بـینی
دەم بــدۆ نــە «کــونە» عـیلم «چـەقمینی»[4]

---

(١) «صَحو»: هۆشیاری. مەولەوی لەم شیعرەوە بە پێی پلەکانی خوێندنی فەقێ ناوی هەندێ لەو عیلمانەو لەو کتێبانە دێنێ کە لە حوجرەدا ئەخوێنرێن، بۆ پیشاندانی پایەی زانستی شێخی کۆچ کردوو. واتە: ئیتر کێ بێ دڵی خۆی بفەوتێنێ بە خەریك بوونی «صرف»و «نحو»ەوە، وەکێ لە خواپەرستی‌دا ئاگای لە خۆی بێو دەم لە هۆشیاری بدا. مەولەوی بۆیە شانازی بەم سیفەتەی شێخی کۆچ کردووەوە ئەکا، چونکە هەندێ لەوانەی کە ئیدیعای پایەی بڵند ئەکەن لە خوا ناسینا، جاروبار لەکاتی عیبادەتا ئەکەونە «شطحات» وتن کە لە نێوانی زانایانی دینا گفتوگۆیەکی زۆری لە سەر پەیدا بووە ئاخۆ حوکمی چیە.

(٢) هەنی: ئیتر. «آداب»: عیلمێکە باسی شێوەی موناقەشەکردن ئەکا. ئاداب: ئوسووڵ. وانۆ: بخوێنێ. «منطق»: عیلمێکە ئامانجی جوێ کردنەوەی بیری راستە لە بیری چەوت. «منطق»ی «دووهەم»: قسە. زانۆ: بزانێ. واتە: ئیتر کێ بێ بە پێی ئوسووڵ عیلمی ئاداب بخوێنێو لە قسەی خەڵکا عیلمی «منطق» بزانیو راستو چەوتیان لە یەك بکاتەوە.

(٣) «مطول»: کتێبێکی گەورەیە لە عیلمی بەلاغەدا شەرحی «تلخیص المعانی» یە مەلای زۆر زانا ئەیڵێتەوەو فەقێی زیرەك ئەی‌خوێنێ. دۆ: بدا. واتە: ئیتر کتێبی «مطول» بۆ کام زانا درێژە بدا بە جوملەکانی، دەسا مادەم ئەو نەما با کورت بێتەوەو ئیشارەتی تیا نەبێ بۆ سەرچاوە زانیاری‌یەکان. وشەی «مختصر» ئیشارەتە بۆ شەرحێکی تری کورتی «تلخیص المعانی» کە مەلاکانی پلەی دووهەم ئەیڵێنەوەو فەقێی پلەی دووهەم ئەی‌خوێنێ.

(٤) زەکا: «ذکاء»، زیرەکی. کونە: «ماهیت»، چی‌یەتی. چەقمینی: کتێبێکە لە عیلمی

فـــەقێ بـــێ تـــەدریس، مـــەدرەسە بـــێ زەوق
مــزگی بـــێ ئــیمام، جـەماعەت بـێ شـەوق

عـــالمان بـــێ فکـــر، شـاعیران مـاتەم
نـــازك خـــەیاڵان غـــەرق دەریـــای خـــەم

مـــیرزام چـــون بـــێ وەخت وە نـــاکـام دڵ
وەر جـە مـن تـەشریف بـەردی وە تـۆی گـڵ

شـــاد بـــی وە حـــووران خـــاسەی جـــینانی
تـــەمەننای وێت بـــی لەقـــای ســوبحانی(١)

مـــەنزڵ مـــوبارەك، بـــێ هـــەمتات یـــار بـــۆ
شەفا خوات رەسوول خاسەی مـوختار بـۆ(٢)

بێ زەحمەت جـە هـەوڵ مـەحشەر ئـازد بـی
وە لوتـــف ئـــیزەد رەحـــمانی شـــاد بـــی

---

☞

فەلەکیاتدا فازلی رۆمی نووسیویە. واتە: کێ بێ بە هێزی زیرەکی حەق بینین چەقمینی بزانێ و بزانێ فەلەکیات لە راستیدا چیە.

(١) حووران: حۆری یەکان. جینان: بەهەشت. ئەم شیعرە شیعری پاشەوە تەواو ئەکا. واتە: خوا شادت بکا بە حۆری یە تایبەتی یەکانی بەهەشت، تۆ خۆت حەزت ئەکرد بە حوزووری خوا بگەی.

(٢) بێ هەمتا: مەبەس خوای گەورەیە. شەفاخوا: شە فاعەتکەر.

## [٢]

## سەرشار سەهبای[1]

سەرشار سەهبای بەزم موناجات
مەلجەی ئیلتیجای ئەرباب حاجات[2]

جای رجای جەرگەی پادشاو دەروێش
بارگاو پەنا، پەی بێگانەو خوێش[3]

ئاهووی خوتەنی فەیز ئیلاهی
نافەی ناف راهی جە مەه تا ماهی[4]

شکۆفەی وەش‌بۆی رەیحانەی رەسوول
نەوباوەی نەمام «طَـیِّبه»ی «بەتوول»[5]

سەرو سایەدار نیشاندەی وەلی
یەعنی یادگار «مُرتَضیٰ علی»[6]

---

[٢]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەی لە سەر قەبری «باوە یادگار» وتووە کە یەکێکە لەئیمام زادەکان.
(٢) موناجات: پاڕانەوە، مەلجە: ملجأ، پەنا پێ براو.
(٣) جا: جێ. جەرگە: کۆڕ، تاقم. پەی: بۆ.
(٤) خوتەن: ناوچەیەکە لە تورکستان بە ئاسکی میسك هەڵگر ناوبانگی دەرکردووە ناف: ناوك. راهی: ناو دەرکردوو. واتە: ئەی ئاسکەکەی خوتەن ـ مەبەس لێی فەیزو بەرەکتی خوایە ـ کە ناو بانگی بۆنی خۆشی میسکی ژێر ناوکت لە ئاسمانەوە تا بنی ئەرزی گرتووەتەوە.
(٥) شکۆفە: گۆپکەی تازە دەرچووی درەخت. نەوباوە: خەلفی نوێ. تەیبە: پاك. بەتوول: ئافرەتێکە حەیزی پیانەیەت، لەقەبی حەزرەتی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە ﷺ. واتە: ئەی گۆپکەی بۆن خۆشی رێحانەی پێغەمبەر، وە ئەی تازە خەلفی درەختی پاکی حەزرەتی فاتیمە.
مەولەوی دانانی سیفەتی «طبیە»ی بۆ «نەمام» لە ئایەتی ﴿كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُها ثابتٌ وَ فَرْعُها فِي السَّماءِ﴾ وەرگرتووە.
(٦) سایە: سێبەر. نیشاندە: دەس‌نێژ. وەلی: دۆست، مەبەس لێی حەزرەتی عەلی‌یە، کە ☜

وه ڕەوزەتـــانا هـــەر نـــوور واران بـــۆ
تـــا دەفــع زوڵمـــەت دیـــدەی یـــاران بـــۆ[١]

هـــەوای ســـایەتان هـــەر مـــەمدوود مـــانۆ
سەبوون بـووردەی جـورم نـەك زەرەر سـانۆ[٢]

نـــاپوختەكـــاریو شـــەرمەساری مـــن
خـــەجڵەت غـــەفڵەت گـــوناهكـــاری مـــن

كـــەفتەن وه هـــەمدا یـــەند زۆر ئـــاوەردەن
ڕووی ڕجـــام وه پـــای بـــارەگـــات كـــەردەن

تـــۆ چـــون جـــه ئـــەولاد ئـــەمجاد مـــەولای
پەی ڕجا وه جـا، پـەی هـیممەت ئـەولای[٣]

زاریو زگـــــاریو زوێری كـــــەردم
وه بـــــارگەی پـــاكت پـــەنا ئـــاوەردم

---

☞

لەقەبی «ولی‌الله»یە. لە وشەی «یادگار»دا بە پێی عیلمی بەدیع «توریە» هەیە، چونكە مەعنای نزیكی مەبەس نیەكە ئەوەتە لەگەڵ «باوە یادگار» قسە ئەكا، بەڵكو مەبەس «یادگار»ی بە مەعنا «بیرخەرەوە»یە.

(١) ڕەوزە: قەبر. واران: باران. لەم شیعرەوە وا دەرئەكەوێ كە مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە سەردەمی كوێری‌دا وتووە.

(٢) مەمدوود: درێژ. مانۆ: بمێنێتەوە. سەبوون بوردە: ئەوەی بای سەبوون بردبێتی. سەبوون بایەكی گەرمە لە هەركەس بدا ئەی پڕووكێنێ. جورم: گوناه. سانۆ: بێنێ. واتە: یاخوا هەوای سایەتان هەر فراوان بێ بۆ ئەوەی سەبوون بردوانی گوناه لە بەریا بحەسێنەوەو زەرەر نەیەنن.

(٣) ئەمجاد: جەمعی مەجیدە بە مەعنای خاوەن شكۆ: مەولا: مەبەس حەزرەتی عەلی‌یە چونكە لە حەدیسا وتراوە «من كنت مولاه، فهذا علي مولاه» واتە هەركەس من خۆش ئەوی عەلی‌یش خۆش بوێ بێ. وەجێ: بەجێ. ئەولا: «اولیٰ»، شایانتر.

ئـــامام ســـەر نـــیام وە بـــارەگـــاوە
غــەریو، مــوو ســفید، وە رووی ســیاوە[١]

تــەن مــەعسیەت بــار، دەروون پـڕ جـە دەرد
دیدە تەڕ، لەب خوشك، دڵ گەرم، نەفەس سەرد

هــای چــەند پــلەی ســەخت هـانە ڕێمـەدا
جـــە رووی ئـــیلتیفات بـــدیە پـێمـــەدا[٢]

بـــەڵکـــم جـــە رووی ئـــەو ئـــیلتیفاتەوە
مـــــەولام حـــازر بـــۆ وە نـــەجاتەوە

دەس شـــای مـــەردان مـــەدەدکارم بـــۆ
پـــلە ئـــەو پـــلە ئـــەو دەس‌وارم بـــۆ[٣]

مــەعسیەت نــیەن چــون هــیچ ســەدمەتێ
خــەیلێ مــەلوولم، یــا پــیر هــیممەتێ[٤]

هـــیممەتت بـــاعیس رســـتگاری بـــۆ
یـــار بـــۆ، دیـــار بـــۆ، یـادگاری بـــۆ[٥]

---

(١) سەرنیام: سەرم نا. غەریو: غەریب.
(٢) ڕێمەدا: ڕێم دا. بدیە: بڕوانە. پێمەدا: پێم‌دا.
(٣) مەدەدکار: یارمەتی دەر. دەس وار: وەك دەس. واتە: بەڵکو دەسی شای مەردان کە حەزرەتی عەلی‌یە، یارمەتیم بداو لە پلەکانی ڕێگە سەختەکەما وەك دەستم وابێ بۆم‌و سەرم خاتە سەر.
(٤) سەدمەت: مەینەت. واتە: بۆیە ئەپاڕێمەوە چونکە گوناه وەك هیچ مەینەتێکی‌تر وانیە.
(٥) یادگاری: بۆ یادگار بشێ، وە لە وانە بێ کە لە پیاوێکی گەورەی وەك «باوە یادگار» بوەشێتەوە.

[٣]

## ساقی ئاوەردەی(١)

ســـــاقی ئـــــاوەردەو گـــــرد کـــیاستێنــین
وریـــــا بــــــەردێن و کـــــردە ئـاستێنـــین(٢)

حــــــاڵ «مــــاضی» ئــاسا هــــا نــــەگــوزەردا
مـــــوقیم مـــــوسافر رەنگ نـــــەسەفەردا(٣)

کـــاروان ســــەرای کــۆن دەور دنـــیای دوون
جــــە بـــارگەی یـاران وە چــۆڵ مـــەوینوون(٤)

قــافڵە کــۆچ کـــەردەن، بـەرزەن دەنگ زەنگ
وڕان حوجرەی خان وجوود سەنگ بە سەنگ(٥)

هـــــۆســـــای تـــای شـــاوڵ دانش وە مشـــتی
بــــــەناباشی بـــــورج دیـــــواران گشـــتی(٦)

---

[٣]

(١) مەولەوی لەم قەسیدەدا گلەیی لە بێوەفایی دنیا ئەکا.

(٢) کیاستێن: رەوانەکراو. وریا: خوراو. بەردێ: بەردوو. ئاستین: بەجێ هێڵ. واتە: کاکەی ساقی ئێمە بە زۆر هێنراوینە ئەم دنیا، وە لێیەوە رەوانە ئەکرێین، چیمان خواردبێ هەر ئەوەمان دەس کەوتووەو بردوومانە بۆ خۆمان، چیشمان دروست کردبێ لە پاشمان بەجێ ئەمێنێ بۆ نەوەو میراتگر.

(٣) «ماضی»: رابوردوو. موقیم: نیشتەجێ. واتە: ئێستامان بە رێوەیە تێئەپەڕێ وەك لەمەو پێشمان تێپەڕی، نیشتەجێیشمان وەك سەفەر وایە چونکە هەر دەقیقەیەك لە ژیانمان بڕوا نزیك ئەبینەوە لە رۆژی مەرگ.

(٤) دوون: بێ قابیلەت. واتە: ئەبینم ئەم دنیایەکە وەك کاروان سەرایەکی بێ قابلەت وایە، بارو بارگەی یارانی تیا نەماوە چونکە رویشتوون و مردوون.

(٥) وڕان: رووخاوە. سەنگ: بەرد. واتە: کاروانی یاران کوچی کردووەو دەنگی زەنگی بەرز بووەتەوەو حوجرەی خانی لەشمان بەرد بە بەردی رووخاوە.

(٦) هۆسا: وەستا. شاوڵ: ئاسنێکی سەر سووچە وەستا بەنا لە سەر دیوارەوە بە

قـــەدەم رەنـــجەکـــەر وە لای کـــارەوە
بـــنچینەم وە تـــەرح مـــەی هـــۆردارەوە(١)

عـــــەمارەتێوەن بـــیناش بـــاقی بـــۆ
ئاو مەی، خـاك دوردی، بـەناش سـاقی بـۆ(٢)

## [٤]

## سەر حەڵقەی(٣)

ســـەر حـــەڵقـــەی فـــیرقەی نـــازك خـەیاڵان
دیـــــباچەی کـــیتاب ســـاحێب کـــەماڵان(٤)

جـیلوەی جـەلای دۆس تـەدریج پـەی یـاران
مـــبۆ، تـــا وە قـــەدر تـــاقەت بـــویاران(٥)

---

☞

پەتێکەوە شۆڕی ئەکاتە خوار بۆ ئەوەی راستی وە چەوتی دیـوارەکـەی بـۆ دەرکـەوێ. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(١) رەنجەکەر: ئەزیەت بدە. هۆرارەوە: هەڵ دەرەوە. واتـە: ئـەی وەسـتا بـەنا کـە تـاڵی شاوڵی خواناسینت بە دەستەوەیە، وە باش وەستای بەرز کردنەوەی هەموو دیوارێکی، زەحمەت بکێشە تەشریف بێنە بۆ سەر ئیش، وە بە مـەی رەنگـی خـانووەکـەم بـڕێژەو بنچینەکەی دیاری بکە.

(٢) واتە: چونکە تەنها ئەو کۆشکە ناروخێ‌و ئەمێنێتەوەکە مـەی کـرابـێ بـە ئـاوی قـوڕ گرتنەوە بۆی، وە خەڵتەی شەرابی بۆ کرابێ بە قوڕ، وە مەی گێڕ بیناکەی دروست بکا.

**[٤]**

(٣) مەلەوی ئەم شیعرانەی لە وەڵامی دۆستێکیا وتووە گلەیی لەوەکردبووکە مورشیدەکەی زۆر تەئسیری تێ ناکا، ئەمیش هۆی ئەوکەم تەئسیری‌یەی بۆ روون ئەکاتەوە.

(٤) سەرحەڵقە: لە تەریقەی نەقشبەندی‌دا ئوسووڵەن سوفی‌یەکان حەڵقە ئـەبەستن بـۆ «خەتم» ئەوکەسەی کە دۆعا تایبەتی‌یەکانی خەتمەکە ئەخوێنێ پێی ئەڵێن «سەرحەڵقە». دیباچە: سەرەتای کتێب.

(٥) بویاران: رابوێرن. واتە: بۆیە تەئسیری پیر کەم‌کەم دەرئەکەوێ بۆ مریدان، تا ئەوانیش ئەوەندەی توانای خۆیان وەر گرن.

گـــــا وه «تَــبَسُّمْ» «بَــيْضا» بــێزەوه
گـــا وه «تَكَــلُّمْ» شـــەهد ئـــامێزەوه(١)

تــــەبەسسوم وه نـــاز زوڵمــــەت زەداوه
تــــەكـــەللوم وه راز وەحشـــەت فـــزاوه(٢)

ئـــەر دەس پــەی نـیقاب تــەمام بــەردەوه
جــە روخســارەی وێش پــەردەش دردەوه(٣)

فــەنا پــەی عـــاڵەم پـــا مــنیۆ ئــەو پــێش
بـــاقی ئـــەو مـبۆ، وێش مــمانۆو وێش(٤)

[٥]

## سەرلەتەرەی خەم

ســــەرلەتەرەی خـــەم خــول ئــاوەردەوه
تــای كــرژ مــەینەت دووبــاد كــەردەوه(٥)

---

(١) گا: گاه، جارجار. «تبسم»: زەردەخەنه. «بيضا» بێز: سپی لەبەر چاو خەر. شەهد ئامێز: تێكەڵ بە هەنگوێن.

(٢) زەدا: لابەرو پاك كەرەوە. فزا: زیاد كەر. واتە: زەردەخەنەكەی لەگەڵ نازێكی وادا ئەبێ كە تاریكی برەوێنێتەوە، وە قسەكردنەكەی بە شتی وا ئەبێ كە دەردی دووری زۆرتر بچەژێنی بە دڵی دڵدار بە عادەتی یارانی بێ باك، یان زۆرتری دوور خاتەوە لە بێگانە.

(٣) نیقاب: پەچە. دەردەوە: دادڕی. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٤) ممانۆ: ئەمێنێتەوە. واتە: ئەگینا ئەگەر ئەو دۆستە بە یەكجاری پەردە لە رووی خۆی هەڵماڵی و خۆی دەرخا بۆ مورید، هەموو عالەم ئەفەوتێنێ و تەنها خۆی ئەمێنێتەوەو بەس.

[٥]

(٤) سەر لەتەرە: سەرە تەشی. گرژ: بادراو. دووباد: دووبارە بادراو. واتە: سەر تەشی خەم و مەینەت كەوتەوە خول خواردن و تاڵی بادراوی مەینەتی جارێكی تریش بادرایەوە.

مـــوقەددیمەی خـــەم تـــاڵی مـــەزاقـــەن
دەك وە خـــەیر نـــەیۆ وادەی فـــیراقـــەن(١)

[٦]

## سەر وە بان عەین

ســـەر وە بـــان عـــەین عـــەینم خـــەم وەردەن
هوون چون چەشمەی عەین نە عەین سەرکەردەن(٢)

یـــەند دەردو ئـــاهم عـــەین کـــەردەن بـــێ نـــوور
وەختەن هەشت کەم بۆ نە پەنجەی مەشهوور(٣)

[٧]

## سیاییم ئاوەرد

ســـــیاییم ئـــــاوەرد، ســـفیدیم پـــێ رەشت
هـــــەفتم کـــــەردەوە گـــرێم دا لە هـــەشت(٤)

(١) مقدمە: نیشانەو سەرەتا. نەیۆ: نەیەت. واتە: نیشانەی ئەوەش کە سەرە تەشی خەم کەوتووەتەوە خول خواردنو سەرەتای خەم دەرکەوتووە، ئەوەتەکە دەمم تاڵە، دەك سا خوا بە خێری نەهێنێ وا دیارە وادەی جیا بوونەوەمە لە دۆستان.

[٦]

(٢) عەین «ی یەکەم»: خۆی ـ نەفس ـ. عەین «ی دووهەم»: ئەژنۆ. عەین «ی سێهەم»: ئاو. عەین «ی چوارەم»: چاو. واتە: سەرم دانەویوە بە سەر ئەژنۆم خۆیدا، وە خوێن وەك سەرچاوەی ئاو لە چاوەکانمەوە سەری کردووە.

(٣) واتە: داخو دەرد بە ئەندازەیەك رووناکی چاومی کەم کردووە، لە وانەیە رۆژی رووناکم لێ ببێ بە شەو، وە هەشت رکاتی نوێژی نیوەڕۆو عەسر نەمێنێ لە ناو پێنج فەرزەکاندا، چونکە بە شەوا تەنیا نوێژی مەغریبو عیشاو بەیانی هەیە، ئەو دوو نوێژەکە هی رووژن، کە رۆژ نەما خۆ دیارە وەختەکەیان ناگوێزرێتەوە بۆ شەو.

[٧]

(٤) واتە: رەشی گوناهم هێناو دەفتەری سپیو پاکی کردەوەی خۆمم پێ رەش کردەوەو، حەوت دەرگاکەی دۆزەخم کردەوە بۆ خۆمو هەشت دەرگاکەی بەهەشتم لە رووی خۆما داخست.

[٨]

## سفیدیم ئاوەرد

سـفیدیم ئـاوەرد، سـیاییم پـێ ڕەشت
هـەفتم کـەردەوە ڕوو نـیام لە هـەشت[١]

[٩]

## سازش نە مابەین[٢]

سـازش نـە مـابەین ئـارو پـووش کـەمەن
وەرنـە هـانامەن نـەفەس یـەك دەمـەن[٣]

[١٠]

## سەنگی سەنگ

سـەنگی سـەنگو خـاك نـە سـەر دۆشـم بـۆ
مـەر ئـەوسا مـەیلت فـەرامـۆشـم بـۆ[٤]

---

[٨]

(١) واتە: ڕەنگی سپیم هێناو مووە ڕەشەکانی خـۆمـم پـێ سـپی کـردو دەرگـای گـرێی حەوتەمی عومرم کردەوەو ڕووم کردە گرێی هەشتەم.

[٩]

(٢) جارێکیان دۆستێك بە مەولەوی وتووەکە فوویەك لە ئاگر بکا، ئەویش بـەم شیعرە وەرامی داوەتەوە.

(٣) سازش: گونجان. واتە: من لەشم وشك بـووەتەوە وەك پـووش وە دەروونـیشم وەك ئاگری گەرمە، ئەگەر فوو بکەم خۆم گڕم تێ ئەچێ، چونکە ئاگرو پووش پێکەوە نـایان کرێ، ئەگەر وا نەبوایە بۆچی فووم نەئەکرد، فوو کردن هەناسەیەکی تێ ئەچێ.

[١٠]

(٤) سەنگی: قورسایی. دوش: کۆڵ. واتە: مەگەر کاتێك لە بیرم بچێتەوەکە قورسایی بەردو خۆڵی قەبر بنیشێتە سەر کۆڵم.

[١][١]

## سەد پەرێم

سەد پەرێم دایم خەم بەستەن کەڵەك
ئاخ هەر یەکجار داخ تۆ سەوزەن فەڵەك[٢]

مەیێکی ناکاو جە نیمەڕادا
نیگای ئارەزوو وە تەمەنادا[٣]

کام سەر، شام تەمای تاج "کەی"ت نەکەرد
سوبحدەم وە تاج سەر "نەی"ت نەکەرد[٤]

کێ بی کێ مەجلیس شادی نیاوە
پۆس کەللەش وە دەف تۆ دەنگ نەداوە؟[٥]

مەعدووم، ئەر زەڕەی شێوەی فاماتەن
بە فام قەرینەی لوات ئاماتەن[٦]

---

(١) ئەم چوار شیعرە (سەد پەرێم، سوبحەن، سەدای های هیلال، سەد دووری) لە تیپی «صاد»دا بوون، چونکە لە ڕێزمانی کوردیدا «صاد»مان نیە، ئێمە هێنانمانە ئاخری تیپی سین. (بڵاوکەرەوە، ناشر).

[١]

(٢) واتە: هەرچەند خەمو مەینەت کەڵەکی فرو فێڵی بۆ ناومەتەوە، بەڵام فەڵەك داخی تۆ یەگجار سەوزە، چونکە ئەگەر تۆ نەبی بە سەرباری ئازارم خەم لە عۆدەم نایەت.

(٣) مەیێکی: ئەبەستی. تەمەننا، «تمنّا»: هیوای شتی دوور. واتە: هەر کاتێ ئادەمیزاد ئارەزووی شتێکی ئاسان بکا بەر لەوەی بگا بەو ئارەزووەی، تۆ لە ناوەڕاستی ڕێگادا جێبەجێ بوونی ئەبەستی بە مەرجێکی واوەکە نەیەتە دی.

(٤) شام: ئێوارە. سوبح دەم: دەمی بەیانی. نەی: رم. واتە: کام سەر بوو تۆ لە ئێوارەدا تەماعی لەسەر نانی تاجی کەیت نەنایە بەری‌و بۆ سبەینێ خۆیت نەکرد بە تاج بە سەر نووکی رمەوە؟

(٥) نیاوە: نایەوە. پۆس: پێس. واتە: کێ بوو ئاهەنگی شادیی گێڕاو پاشان پێستی کەللەی بە دەفی تۆوە دەنگی نەدایەوە؟

(٦) فاما: تێگەیشتن. فام: عەقڵ. واتە: مەعدوومی ئەگەر ئەوەندەی تۆزێ نیشانەی تێگەیشتنت پێوەبێ، ئەبێ بە عەقڵ ئەوە بزانی کە هاتنە دنیا نیشانەی مردنە.

ئـــــەی را رای خـــــەتەر راو یــــارانــــەن
ســـــفیدیش غــــوبار کــــەللەی یــارانــەن(١)

بــورکەش چــای دیــدەی پــڕ هــووناو دڵ
مــیل، بــاڵای بـێ گـیان وامـەندەی خـجڵ(٢)

ها سـەف پـێکـان پـۆس کـەللەی هـام دەمـان
کــەلله بــڕ پــەی پـۆس کـەللەمان تـەمان(٣)

هــۆردەر چـــەنی ســـۆز دەروون پـــڕ نـــێش
فەریاد ئەو سـاقیو ئـەو نـەیچیو دەروێش(٤)

ســــەدای دەفـو نـــەی بـــەیۆ نـــە گــۆشت
نەشئەی مەی بـەخشۆ حـەیات وە هـۆشت(٥)

بــــویەر جــە ســای تــەرز دەفـو نــەیەوە
وە زات مــــــەستی نــــەشئەی مــــەیەوە(٦)

---

(١) سفیدی: سپیەتی. واتە: ئەم رێگای دنیایە رێگایەکی مەترسیدارە بۆ رێبـواران، وە تۆزە سپییەکەی تۆزی کەللەی یارانەکە مردوون.

(٢) بورکە: چاڵاو. میل: ئەو دارەی کە جاران لە سەر رێگـا دایـان ئـەچەقاند بـۆ ئـەوەی رێبـوار رێ ون نـەکـا. وامـەندە: دامـاو. واتـە: چـاڵاوەکـانی رووی زەوی چـاڵی چـاوی مردووەکانە پڕە لە خوێناوی دڵیان، دارە داچەقێنراوەکانیش باڵای داماوی بێ گیانیانە.

(٣) سەف پێکان:ریزی بەستووە. واتە: پێستی کەللەی هاوڕێیانی ریـزکراوەو، سـەربڕ چاوەڕێی ئێمەشە سەرمان ببڕێو کەللەمان بگۆڕێتەوە.

(٤) مەولەوی لێرەدا دوا بە دوای ئەو قسانەی لەگەڵ خۆیو فەڵەكدا کردی، بـە خـۆی ئەڵێ: مادەم فەڵەك ئەمەکردەوەیەتی لەگەڵمان، بە سۆزی دەروونی دەردەدارتەوە بانگی مەیگێڕو شمشاڵژەنو دەروێشی دەفـژەن بکە.

(٥) بەیۆ: بێت. بەخشۆ: ببەخشێ. واتە: با دەنگی دەفی دەروێشو شمشاڵی شمشاڵژەن بێتە گوێت، وە نەشەی مەیەکەیش هۆشت بژێنێتەوە.

(٦) واتە: بەو ئازایەتیەوەکە پەیدا ئەبێ لە سەرخۆش بوون بە نەشەی مـەی، لە سـایەی شێوەی لێدانی دەفـو شمشاڵا تێپەڕە.

**تاكەی كەنۆ دەست چەرخ چەپ ئەندێش**
**پۆس كەللەت ناكاو پەی پۆس كەللەی وێش**(١)

**[٢]**

**سوبحەن**

**سوبحەن، بۆی گوڵان میاونۆم نەسیم**
**وێنەی وای رەحمەت خەزانەی كەریم**(٢)

**سەحراو دەشتو دەر بەهەشت منمانۆ**
**مۆرەی هەوای وەش وە شەشدەر شانۆ**(٣)

**جە هەر تەرەفدا موینوون گوڵزار**
**رەنگ رەنگ مەدرەوشۆ بە وێنەی دڵدار**(٤)

**لالە گەردەن كەچ تۆی دیدە رەشتەن**
**گۆیا عەكس یار وە رووشدا وەشتەن**(٥)

**چەمەن هام لیباس سەوز رەنگ پۆشان**
**وەفراو چون ئەسرین دیدەی من جۆشان**(٦)

---

(١) كەنۆ: هەڵكەنێ. واتە: ئیتر بزانین كەی دەستی گەردوونی نیاز خراپ پێستی كەللەت ئەگرێو ئەیكا بە پێست بۆ كەللەی تەپڵەكەیو ئەی كوتێتەوە.

**[٢]**

(٢) میاونۆم: پێم ئەگەیەنێ. وا: با.

(٣) منمانۆ: ئەنوێنێ. واتە: نەسیم هەموو لایەك وەك بەهەشت ئەنوێنێ، وە نەردی هەوای خۆش بە هەر شەش قوژنەی دنیا هەڵئەخا.

(٤) موینوون: ئەبینم. مەدرەوشۆ: ئەدرەوشێتەوە.

(٥) لالە: گوڵێكی ناو چاو رەشە. رەشتەن: رەشتووە. وەشتەن: باریوە. واتە: لالە گەردنی كەج كردووەو ناوچاوی خۆی رەشتووە، ئەڵێی عەكسی یاری بە روودا باریوە.

(٦) چەمەن: چیمەن. جۆشان: هاتووەتە جۆش.

جــــەمادو نـــــەبات گـــــرد شـــــادیشانەن
جــــەماڵ رۆژ عــــید ئـــازادیشـــانەن(١)

تـــــەمام رووی دنـــیا جـــە شـــادی کـــەیلەن
دڵ نــــــــەبۆ پــــەشێو فـــیراق لەیـــلەن

ســــەهلەن بـــــەهارم دۆزەخ ئـــــاسا بـــــۆ
بــــــەهەشتم بــــێ دۆس دۆزەخنـــما بـــۆ(٢)

وەر نــــــــەدۆزەخدا یــــــارم دڵبــــــەر بــــۆ
پەی من ئار نە تـۆی گـوڵشـەن وەشـتەر بـۆ(٣)

دڵ دوو زەنــــــــجیرەی زوڵف نـــــیگارەن
وە ســـەیر ســـەوزەو ســـەحراش چ کـارەن(٤)

[٣]

## سەدای های هیلال(٥)

ســـەدای هـــای هـــیلال هـــام فـــەردان مـــەیۆ
زەمـــزەمەی تـــەکـــبیر هـــام دەردان مـــەیۆ(٦)

---

(١) جـەماد: دارو بـەرد. نـەبات: ئـەوەی بـڕوێ. واتـە: دارو بـەردو درەخت هـەموویان شادییانە، وە بە بۆنەی رۆژی جەژنی ئازاد بوونەوە لە جەوری زستان خۆیان جوان کردووە.
(٢) واتە: شتێکی ئاسانە لە بەر دووری لەیل بەهارم لێ ببێ بە دۆزەخ، وە بەهەشتم وەك دۆزەخ وابێ.
(٣) ئار: ئاگر. وەشتەر: خۆشتر. واتە: ئەگینا ئەگەر لە دۆزەخدا دولبەر یـارم بـێ، ئـاگـر خۆش‌تر ئەبێ لام لە ناو باخچەی گوڵ.
(٤) واتە: دڵم بەسراوە بە دوو زەنجیری زوڵفی یارەوە، ئیتر چییەتی بە سەیری سەوزەو سەحراوە.

[٣]

(٥) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی جەژنی رەمەزانەوە وتووە.
(٦) واتە: دەنگی «ئای ئەوە مانگ... ئەوە مانگ»ی هاوڕێیانو، ناڵەی «الله اکبر»، کردنی برادەران دێت.

یـــەکــــێ هـــام رەفـــێق دۆس دڵ دۆزەن
یـــەکـــێ مـــەست کـــەیف جـــەژن پـیرۆزەن[١]

مـــن نـــەبوون شـــادیم جـــێ بـــێزار بـــیەن
گـــەرد وە ســـەر مـــن، کـــەس دیـار نـیەن[٢]

شـــــەوم تـــاڵەی شــــووم، هـــیلالم قـــامەت
شـــەفەق هـــوون دڵ، مـــەنزڵگـــە زامـــەت[٣]

تـــــەکـــبیر نـــــەوای زام مـــــەهجووری
دەســـــم هـــەم ئـــاغۆش زام رەنـــجووری[٤]

جـــەژنو جـــەژنانەم هـــەر یـــەك جـــەردەیێ
بـــەردەوە پـــەی هـــەرد، مـــوتریب پـــەردەیێ[٥]

لەرزەی ریشـــەی دڵ، ســـەمتووری دەســـتوور
وەزن تـــەبع تـــار پـــڕ ســـۆزەی ســـەمتوور[٦]

---

(١) دڵ دۆز: ئەوەی دڵ ئەدووریێ بە خۆیا. واتە: سەیری خەڵك ئەکەی یەکێك هاوڕێی دۆستێکە دڵی دووری‌وە بە خۆیا، یەکێکی تریش بە خۆشی‌و ئاهەنگی جەژنی پیرۆز مەست بووە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «دڵدۆزەن» نووسراوە «دڵسۆزەن».
(٢) واتە: من نەبێ شادیم لێ بێزار بووەو هیچ نایەت بەلامەوە، هەی قوڕ بە سەرم‌کەسم نیەو بێ کەس کەوتووم.
(٣) واتە: لە جیاتی شەوی جەژن چارەی رەش، وە لە جیاتی مانگی یەك‌شەوە بالای چەمیوە، وە لە جیاتی ئاسۆی سووری ئێوارەی جەژن خوێنی دڵ، وە جیاتی مەنزڵگەی شەوی جەژن زەحمەت شك ئەبەم.
(٤) نەوا: ئاوازە. هەم ئاغوش: هاوباوەش. واتە: لە جیاتی اللهاکبری بە یانی جەژن هاورمە لە تاو ئێشی زامی دووری، وە لە جیاتی ئەوەی دەس بخەمە دەسی خەڵك بۆ جەژنە پیرۆزە دەسم باوەشی کردووە بە زامی گرفتاری‌دا.
(٥) پەردە: نقام. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٦) واتە: جەردە، جەژنو جەژنانەمی فراندووە بۆ کێو، سا توخوا کاکەی گۆرانی بێژ

واچـــه بـــەو مـــەقام ئـــەڵوانـــاتەوە:
هەی داد.. هـەی بـێ داد مـەعدووم واتـەوە[١]

خــەستەی خــار خــەم، خــەم خـەیاڵ وێم
وەكـــــزەی دەروون تــــەن زوخـــاڵ وێم

بـــێ ئــــەبرۆی هــیلال نــەو نــیهاڵ وێم
نـــــیەت نـــا دروست، عــید بــەتاڵ وێم[٢]

[٤]

**سەد دووری**[٣]

سەد دووری چون دڵ مـەعدوومی دڵ تـەنگ
مـــارۆ ئــەو فـریاد دڵەی سـەخت سـەنگ[٤]

ســـــزان ئـــــەر گـــێرۆ تــەم دڵەی كــاوان
هــــەور نـــەو وە جـــان رێزۆ هــووناوان[٥]

---

☞

نقامێكم بۆ بڵێ ببێ بە مایەی لەرزینەوەی ریشەی دڵەكەم كـە هـەمیشە وەك سـەمتوور دەنگی لێوە دێ، وە ئاوازەكەی لە سەر شێوەی تار بێ‌و پڕ بێ لەو جۆش‌و سۆزەی كە لە سەمتوور هەستی پێ ئەكرێ.

(١) ئەلوانات: رەنگاو رەنگت. واتەوە: وتیەوە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوە پێكەوە دێ.

(٢) نەونیهاڵ: تازە داچەقێنراو. واتە: بەو نقامە رەنگاورەنگەتەوە پێی بڵێ هەی داد هەی بێ‌داد مەعدوومی دیسانەوە وتیەوە: ئای برینداری دڕكی خەفەت خۆم... ئای هەمیشە بیر لە خۆم كەرەوە خۆم... ئای بە هۆی كزەی دەروونەوە لەش بوو بە خەڵووز خۆم... ئای لەبەر نەبوونی مانگی یەكشەوەی برۆی یاری نەونەمام، رۆژوو دانەمەزراوو جەژن بەتاڵ خۆم...

[٤]

(٣) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی سەفەر كردنی دۆستێكیەوە وتووە.

(٤) مارۆ: دێنێتە: مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێكەوە دێ.

(٥) سزان: شایانە. گێرۆ: دابگرێ. رێزۆ: بڕژێ.

بـــەڵام، تـــاقەتێ، هـــای هـــەورە ئـــامان
هـــا نـــە سـەفەردا شـــای نـــەونەمامان(١)

نـــازکیش چـــون نـــاز جـــە حـــەد بـەرشیەن
خـــاترداریش کـــەر وێنـــەی کـــەس نـیەن(٢)

وێش چـــۆن حـــەوسەڵەی وەشتو تـەم دارۆ
یـــادش نـــە دڵدا زەحـــمەت مـــویارۆ(٣)

پـــەی بـــار خـــاتر ئـەو شـیرین شـێوە
چ حـــاجەت وەی تـــەم، وەی سـەیل ئـێوە(٤)

وەســـەن دووی بـەدەن جـە گـیان جیای مـن
وەســـەن سـەیل چـەم بـەخت سـیای مـن(٥)

---

(١) واتە: ئەی هەور هـەرچـەند دووری یـار بـەردی رەقـیش دێنـێتـە دەنگ، وەك مـنی خەفەتباری هێناوەتە دەنگ، وە حەقە ئەگەر تەم دڵی شاخەکان دابگرێو تۆش لەگیانتەوە خوێناو ببارێنی، بەڵام تۆ کەمێك خۆت راگرەو باران مەبارێنە چونکە یار بە رێوەیە.

(٢) واتە: ناسکی یار وەك نازەکەی، زۆر زیاد لە ئەندازە دەرچووە، دڵی راگرە ئەو وەك کەس نیە.

(٣) دارۆ: هەیەتی. مویارۆ: تێئەپەڕێ. واتە: یار، وا لەوێ یادی بە زەحمەت بە دڵی منا تـێئـەپەڕێ کـە تـەمی مـەینەت دایگـرتووە، ئـیتر خـۆی چـۆن حـەوسەڵەی بـبێ تـەم دایبگرێو بارانی بەسەرا بباریێ؟

(٤) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٥) واتە: ئەی هەور ئەگەر هەر سووری لەسەر باران باراندنو تەم کردن بـە سـەر یـارا، ئەوا بۆ باری دڵی ئەو پێویست ناکا خۆت تەمو بارانی بنێرێتە سەر دووکەڵی لەشی لەگیان جیا بووەوەی منو لافاوی چاوی چارە رەشم بەسە.

## [١]

## شێخ دەوڵەمەند(١)

شـــێخ دەوڵەمـــەند بـــەهرەی ســـەرمەدی
یـــاگـــەی حـــەقیقەت جـیلوەی ئـەحمەدی(٢)

جـــە شــــەو هـــەوارگـــەی فـــەنا ویـــەردە
پـــای هـــەردەی بـــەقا یـــاتاغگە کـــەردە(٣)

«مُـــتَّصِف» بـــە وەســـف شـــەئنیو ســـیفاتی
«مُشَـــرَّف» بـــە فـــەیز «تَـــجَلّا»ی زاتـــی(٤)

خـــــــەلیفەی ســـــەدای «أُدن» شـــــنەفتە
بـــــەڵەد نـــــە ســـــارای ئـــەتوار هـــەفتە(٥)

---

[١]

(١) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەڵامی نامەیەکی شێخی «سراج‌الدین»اﷺ وتـووەکـە گلەیی کردبوو لێی بۆچی نامەی بۆ نانووسی.

(٢) بەهرە: خوا داو. سـەرمەدی: نـەبڕاوە. واتـە: ئـەی شـێخـێ کـە لە بـەشو بـەهرەی نەبڕاوەدا دەوڵەمەندی، وە جێگای دەرکەوتنی نووری راستەقینەی پێغەمبەری.

(٣) شەو هەوارگە: ئەو شوێنانەیەکەکۆچەری بە ناچاری ئـەیکەن بـە مـەنزڵ. یـاتاغگە: جێگای یاتاغ. واتە: ئەی شێخێ کە عالەمی فەوتانت بەجێ هێشتووەو لە عالەمی مانەوەی هەمیشەیی دا جێگات گرتووە.

(٤) واتە: ئەی شێخێ کە ئەوسافی فیعلیو زاتیت هەیە، وە بەرەکتی دەرکەوتنی نووری زاتی خوا لێی داوی. ئەوسافی فیعلی ئەو سیفەتانەن کە مەعنای کردن بگەیەنن وەك رێ پیشان دانو یارمەتی دان، ئەوسافی زاتیش ئەو سیفەتانەن کە لە شەخس خۆی‌دا هەن، وە لەو لا نادەن وەك زانینو توانا.

(٥) «أدن»: نزیك بەرەوە. مەبەس لەوەیەکـە خـوا لە شـەوی مـیعراجـا بـە پـێغـەمبەری فەرمووە لێی نزیك ببێتەوە. ئەتوار هەفتە: حەوت حاڵەتە.

ئەهلی تەسەووف ئەڵێن مرید ئەبێ بە حەوت حاڵدا تێبپەڕێ تا ببێ بە مورشیدی کامل، حەوت حاڵەگەش ئەمانەیە: تەسفیەی رۆح، سرِ، خەفی، تەسفیەی قەلب، ئەخفا، نەفس،

واســـیتەی راگـــەی بـــەین عـــیلمو عـــەین
ساحیب جـەناحەین یـەعنی «ذی‌النّـورَین»(١)

پـــیر پـــاك جـــە گـــەرد خـــاك نـــاسووتی
مەنزڵگـەی سـەر بـەرز سـەر مـەلەکـووتی(٢)

دڵ وە نـــەوای بـــەزم جـــەبەرووت ئـــاوا
ســـێراو ســـەراو لاهـــووتی مـــاوا(٣)

«جِسْـــماً لَـــدَیْنٰا، رُوْحاً لَـــدَیْهِ»
دائـــیرەی تـــەمام «مِـــنْهُ اِلَـــیْهِ»(٤)

---

☞

تەبیعەت. واتە: ئەی شێخێ کە جێ‌نشینی ئەو پێغەمبەرەی کە بانگی «نزیك بـەرەوە»ی بیستووە لە خوا، وە لە مەیدانی ئەو حەوت حاڵەدا شارەزای کە بەسەر موریدا تێ‌ئەپەڕێ.

(١) واتە: بۆ خواناسین دوو رێگا هەیە: رێگـای زانست کـە هـی زانـایانە، وە رێگـای لە حەقیقەت گەیشتن کە هی ئەهلی تەسووفە، وە بە هۆی تۆوە رێگای یەکەمیان ئەبەسرێ بە رێگای دووهەمەوە، وە زانایان شارەزای رێگای دووهەمیش ئەبن، وە تۆ خاوەنی دوو باڵی کە عیلمی زاهیرو باتینە. مەولەوی نەزاکەتێکی جوانی کردووە لە دانانی سیفەتی «ذی النورین»دا کە لەقەبی حەزرەتی عوسمان خەلیفەی سێهەمە بۆ شێخی «سراج‌الدین» کە ئەویش ناوی «عوسمان» بووە.

(٢) ناسووت: جیهانی ئادەمیزاد. مەلەکووت: جیهانی مەلائیکەتان. واتە: ئەی شێخێ کە گەردو خۆڵی جیهانی ئادەمیزادت پێوە نەماوە، وە لە سەرووی جیهانی مـەلائیکەتانەوە جێگات بۆ خۆت درووست کردووە.

(٣) نەوا: ئاوازە. جەبەرووت: هێزی خوا. سێراو: تێراو. لاهـووت: خـوایـی. واتـە: ئـەی شێخێ کە ئاوازەی بەزمی تەئسیری خوا ئاوەدانە، وەکانیاوی فەرمانی خوات کردووە بە جێگەی خۆت‌و لێی تێراو بووی.

(٤) واتە: ئەی شێخێ کە بە لەش لای ئێمەو بە دڵ لای خوای، وە دائیرەی مەعنوی‌یات لە خۆتەوە دەس پێ ئەکاو لە خۆتا دوایی دێ.

بـێ تـەلوین نـە سـای تـەمکین‌دا مـەکـین
«رَوَّحَ اَللّــــهُ رُوحَــــهُ، آمــــین»[١]

نـــامەی رۆح ئـــەفزای شـــیرینت یـــاوا
دڵ وە مـــەردومەك دوو دیـــدەش ســـاوا[٢]

تـــۆی دەروون وە نـــوور ســـەفا دا پـــەرداخ
بـــۆی ئـــاشنایم دا نـــە رووی دەمـــاخ[٣]

دەرگـــای حـــوقەی لاڵ دانـــەت شکـــاوان
جـــە رووی لوتـــفەوە ئـــینەت فـــەرماوان:[٤]

یـــا کـــاغەز بـــڕیـــان، یـــا مـــەڵا مـــەردەن
یـــا خـــۆ عـــارتەن دۆس وە یـــاد کـــەردەن

غـــەمگین مـــەنیشە غـــەم بـــدەر وە بـــاد
فـــەڵەك نـــمازۆ کـــەس وە خـــاتر شـــاد[٥]

ئـــەوەڵ مـــن کـــێنـــان، وجـــوودم جـــەکـــۆن
واچـــوون دۆســـەنان شـــەرت قـــەبووڵ تـــۆن[٦]

---

(١) تەلوین: رەنگ کردن، مەبەس گۆڕینی وەزعە. تەمکین: جێ گرتن. مەکین: جێ گرتوو: واتە: ئەی شێخێ کە لە سێبەری دامەزراوی‌و نەگۆڕانی وەزعدا جێگـات گـرتووە، خـوا گیانت تواناترو بەهێزتر کات.

(٢) مەردومەك: بیبیلەی چاو. واتە: نامە گیان بەهێزکەرەکەت گـەیشت، دڵم هـێنـای بـە بیبیلەی چاوەکانیا.

(٣) واتە: بە تیشکی خۆشی ناوی دڵی بوژاندمەوەو بۆنی ئاشنایی کرد بە لووتما.

(٤) حوقە: سندووق. لاڵ: لەعل. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە دوو شیعری پاشەوە.

(٥) واتە: دەرگای سندووقی دەنکە لەعلت شکاندووەکە لە رووی لوتفەوە فەرمووتە فەرمووتە یا کاغەز براوە تا لێی بنووسی بۆنم یا مەلا مردووە تـا بـنووسی، یـا عـەبت لێ دێ یـادی دۆستانت بکەیتەوە؟ وە فەرمووتە بە خەفەتباری دامەنیشەو خەمت بدە بە بـا، چـونکە فەلەك کەس بە دڵشادی ناهێڵێتەوە.

(٦) کینان: کێم. کۆن: کوێیە. واچوو: بڵێم. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

ئـــەر وە بـــێگـــانە، وەر خـــوێشـــم زانـــی
تـــۆ حـــەساوەنی وە هـــەر چـــیم وانـــی(١)

دووەم چـــون کـــەسێ گـــەدایـــی کـــێش بـــۆ
یـــــاد «تَـــواضُـــع» خـــەسڵەت وێش بـــۆ(٢)

ئـــــەر بـــارۆ نـــە دڵ «تَـــواضُـــع» کـــەردەن
هـــەر عـــادەت وێش وە جـــا ئـــاوەردەن(٣)

بـــەڵام هـــەر کـــەسێ شـــێخـــی مـــیسالەن
عـــادەت ئـــیستیغناو شـــێوەش جـــەلالەن(٤)

ئـــەر جـــار جـــارێ نـــام چـــون مـــنێ بـــەرۆ
«خَـــــرقُ العـــــادَة»ێ زاهـــێر مـــەکـــەرۆ(٥)

ئـــــەر رازیت وە یـــــاد خـــەستەی دڵگـــیری
یـــا شـــێخ تـــۆ دایـــم نـــەقش «ضَـــمیر»ی(٦)

---

(١) زانی: بزانی. حەساوەنی: حسێبی. وانی: بخوێنیتەوە. مەولەوی بەم شیعرانە وەڵامی گلەیی شێخ ئەداتەوەو ئەڵێ: یەکەم من چیم تا بڵێم دۆستی تۆم‌و نامەت بۆ بنووسم، شەرت ئەوەیە تۆ بە دۆستی خۆتم پەسەند کەی، چونکە هەر تۆ حەسێبی بە دۆستم دانێی یا بە بێگانە.

(٢) کێش: پەیڕەو. «تواضع»: خۆ بەکەم دانان. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دوایی‌یەوە.

(٣) بارۆ: بێنێ. واتە: دووەم، ئەگەر هەژارێکی وەك منی خۆ بەکەم زانیو بی‌یەوێ نامە بنووسێ‌و خۆی بەکەم بداتە قەڵەم، ئەوە شتێکی سەیری نەکردووە، چونکە رەوشتی خۆی هیناوەتە دی.

(٤) شێخی: شێخەکەی من. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٥) بەرۆ: ببا. «خرق العادة»: شتێ لە عادەت بە دەر. واتە: بەڵام هەرکەس وەك شێخەکەی من وابێ‌و بێ ئیتحیاج بێ لە خەڵك‌و خۆی نەداتە قەرەیان، ئەگەر جار جارێ ناوی یەکێکی وەك منی بیر بکەوێتەوەو نامەیەکم بۆ بنووسێ، ئەوە شتێکی کردووە لە دەسی کەس نەیەت.

(٦) «ضمیر»: دڵ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

چ حـــاجەتەن دەس پــەی قــەڵەم بــەروون
یـــادم نــمەشی چــەنیت یــاد کــەروون(١)

پەی کەسێ خاسەن نـامەی جـە حـوب کـەیل
تـازە بســانۆ «وُضــو» جـە جـۆی مـەیل(٢)

خـــۆ مـــن هـەر جـە زوو وە مـەیلت مـەستم
هـــەر جـــان فـیداکـەی رۆکـەی «أَلَسْت»م(٣)

سـێـیەم، خـەمگینیم جـە دەس خـەجڵەتـەن
خەجڵەتـم جـە دەس سـەختی غـەفڵەتـەن(٤)

یـــاران وێنـــەی ســاف مـــەی وەکــامەوە
ویــەردەن، چـــون دورد هـەر مـن مـامەوە(٥)

گـــیای پـــەژموردەی تـــەژنەکـەی بـێ شـۆم
چـــــەمەڕای وارای هـــەور لوتــف تــۆم(٦)

---

(١) نمەشی: ناچێت. چەنیت: چۆنت. واتە: یا شێخ ئەگەر رازیت منی گرفتاری دەردی خەفەتباری یادت بکەمەوە، ئەوە بزانەکە تۆ هـەمیشە لە دڵما نـەخش کـراوی‌و لە یـادم ناچی، ئیتر هیچ پێویست نیە دەس بەرم بۆ قەڵەم نامەت بۆ بنووسم.

(٢) بسانۆ: بگرێ. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەی‌دایە.

(٣) واتە: بۆ کەسێ باشە نامەی پڕ لە رازی خۆشەویستی بنووسێ کە تازە لە سەرچاوەی خۆشەویستی دەس‌نوێژی گرتبێ، خۆ من هەر لەکۆنەوە سەرخۆشی خۆشەویستی تۆم‌و لە ئەزەلەوە گیان فیدام.

(٤) واتە: هۆی سێهەم نامە نەنووسینم ئەوەتە لەبەر خەجاڵەتی خۆم خەفەتبارم‌و توانای نووسینم نیە، بۆیەش خەجاڵەتم چونکە زۆر بێ ئاگام لە خواو قەبرو قیامەت.

(٥) واتە: یاران وەك شەرابی پاك بەسەرچوون، هەر من ماومەتەوە وەك خڵتەی بنی کووپە.

(٦) پەژموردە: سیس بوو. واتە: من وەك گیایەکی سیس بووی لە رادە بەدەر تـینووم لێ هاتووە، چاوەڕوانی بارانی لوتفی تۆم.

تــۆ دەس وە ڕەشــحەی ڕەحــمت پــەیاپەی
مـن وەی پـڕخـاوی حـەیفەن یـە تـاکـەی[١]

تـــــەنیای حـــەقیقی نـــەردیٚ بشـــانۆ
مـــنو تــۆ جــە دەس مــنو تــۆ ســانۆ[٢]

تــۆ بــیٚ تــۆ لوتــفت پــەی مــن زیـاد بـۆ
مـن بیٚ مـن ڕۆحـم وە خـزمەت شـاد بـۆ[٣]

[٢]

## شەماڵ ئەڕجووم[٤]

شەماڵ ئەڕجـووم هـەن هـەی وە فـیدات بـام
وە ســـەرگەرد بـــاڵ شـــانای هـــەوات بـام[٥]

جــەستە خـــەستەی خـار خـەم خـەڵاتـەنان
بـــــەیدا پــــیٚو گــــیٚڵ دوور وڵاتـــــەنان[٦]

---

(١) ڕەشحە: نم. واتە: نمی نەبڕاوەی ڕەحمەت بە دەس تۆوەیەو منیش بەم جۆرە خەوم لیٚ کەوتووە، بۆچی چەند دڵۆپیٚك ناپرژێنی لە دەمو چاوم تا هۆشم بیٚتەوە بە خۆما؟
(٢) بشانۆ: بوەشیٚنیٚ. سانۆ: بسیٚنیٚ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پیٚکەوە دیٚ.
(٣) واتە: هیوام وایە تەنیای ڕاستەقینەکە خوایە، زاری هەڵدا منو تۆ لە من ـ منو تۆ ـ ڕزگار بکا، بەڵکو تۆ هەر لە خۆتەوە لوتفت لەگەڵ من زیاد ببیٚو منیش بە بیٚ ئاگای خۆم ڕۆحم بگاتە خزمەتت.

[٢]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ دۆستیٚکی نووسیوەکە ناوی «مەلا خەیاڵ» بووە لە «پاوە» دانیشتووە.
(٥) ئەرجوو: تکا. باڵ شانا: باڵ ڕاوەشاندن. مەعنای ئەم شیعرەو سیٚ شیعری پاشەوەی پیٚکەوە دیٚ. لە هەندیٚ نوسخەدا لە جیاتی «هەی» نووسراوە «خیٚز» واتە: هەڵسە.
(۶) گیٚڵ: گەشت. خەم خەڵاتـەنان: خـەمم بـە خـەڵات دراوەتـیٚ. لە هـەندیٚ نـوسخەدا نووسراوە «هەردە پیٚوگیٚڵ» وە لە هەندیٚکی ترا نووسراوە «بادە پیٚوگیٚڵ».

شـــاخو داخو زاخ چـــۆڵو هـــۆڵو کـــاو
سەر بەردو سەر هەرد ساراو سـەر سـەراو(١)

تـــەی کـــەر وە پـــڕتـــاو مـــدارات نـــەبۆ
چـون دووی هــەناسەم شـەوان تـا بـە ڕۆ(٢)

ســەر بــەر کــەر نــە ســەر کـۆی ئـاتەشگاوە
بــدیە وە مــەسکەن «خــانەگــا»و «پـاوە»(٣)

زار زارو خـــاس خـــاس وە زار بـــناڵە
جـا گـیر نـە سـەر ئـەوج قـوللەی «قـەزاڵە»(٤)

تـا جـە هــەر کـۆ بـۆ تـەمان مـوان جـەم
نــەو جــەمدا زاری مــەکــاران وە چــەم(٥)

ســـا مـــاچان یـــاران ئـینە چـێش بـیەن
«قـــەزاڵە» نـــاڵاش چـــون جـاران نـیەن

(١) زاخ: وردە بەردی لێژایی شاخەکان: کاو: بەرزایی.

(٢) پـڕتاو: پـەلە. مـدران: وەستان. دوو: دووکـەڵ. واتـە: شـەماڵ بـە قـوربانی خـۆتو باڵوەشاندنت بم بە ئاسمانەوە، لەشم بە دڕکو داڵی دووری بریندار بووەو خەمو خەفەت بووە بە خەڵاتمو دەشتی دوور وڵاتان ئەپێوم، تکام وایە تـۆ بـە پـەلە هـەڵکـەی وە وەك دووکەڵی هەناسەم چۆن گەیشتووەتە هەموو لایەك تۆش بە شەوو بە ڕۆژ نەوەستی هەموو لایەکم بگەڕێیت.

(٣) ئاتەشگا: شاخێکە لە نزیکی پاوەوە. بدیە: بڕوانە. خانەگا: دێیەکە لە نزیکی پاوەوە لە هەورامانی لهۆن. مەعنای ئەم شیعرەو چوار شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٤) قەزاڵە: شاخێکەکەوتووەتە پشتی خانەگاوە، تاقی کراوەتـەوە هـەروەختێ بـای بـبێ ئەی بە هەورو بارانی لێ ئەبارێ.

(٥) موان: ئەبن. مەکەران: ئەکەن. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «تـا جـە هـەر کـۆ بـۆ» نووسراوە «تا جە سەر هەرکۆ» واتە: لەسەر هەرکێوێکەوە.

یەکسان دڵ بەی ڕەنگ پەریشان جەستەن
هەر کۆ هەن نەشئەی مەعدوومی خەستەن(١)

ئانا جە گرۆی جەرگەی هام سەران
«خەیاڵ» گرۆی دانەی دڵبەران(٢)

چ خێزەن نامەرد مەر نمەزانی؟
وەلای ویتەوە تۆی دۆس گیانی!(٣)

مەعدوومی خەم کێش خەم زەدەی خەمبار
زەرد دەرد سەخت دووری باڵای یار

یەن دەرد بێ حەد جەلاش جەم بەستەن
تەسدیع جە گەردەن ئەزرائیل وستەن(٤)

---

(١) یەکسان: یەگجاری. هەرکۆ هەن: لە هەر کوێ بێ. واتە: لە سەر شاخی ئاتەشگاوە سەر دەربێنەو سەیرێکی خانەگاو پاوە بکەو لووتکە قەزاڵە بکە بەجێی خۆت‌و بە عاجزی‌یەوە دەس کە بە ناڵینێکی بە سۆز، جا لە هەر کێوێك‌دا تەم هەبێ دێت‌و لەوێ کۆ ئەبنەوەو دەس ئەکەن بە گریان، دۆسانیش ئەڵێن ئەبێ ئەم ناڵە ناڵەی قەزاڵە هی چی بێ، بێ گومان بۆنی مەعدوومی پێوەیە وا یەگجاری دڵی بەم‌جۆرە لێ‌هاتووەو لەشیی پەرێشانە.
(٢) گرۆ: «ی یەکەم»: گروه، کۆمەڵ. گرۆ «ی دووهەم»: لە «گرەویدە»ی فارسی وەرگیراوە، کەسێکە دڵی بەسرابێ بە شتێکەوە. واتە: مەلا "خەیاڵی" دۆستم کە دڵی بەسراوە بە دانەی خاڵی دولبەرانەوە، لەناو کۆڕی ئەو دۆستانەدایە.
(٣) نمەزانی: نازانی. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٤) ئەزرائیل: «عزرائیل»، فریشتەی گیان کێشان. وستەن: خستووە. واتە: پێی بڵێ هەی بە نامەردت نەکەن، ئەوە چیتە، خۆ تۆ لای خۆی دۆستی گیانی بە گیانی مەعدوومیت، ئەوە نازانی ئەو دۆستە خەفەتبارە خەم لێی داوە خەم هەڵگرتووەت کە بە هۆی دەردی دووری‌یەوە زەرد هەڵگەڕاوە، ئەوەندەی مەینەت بە سەرا کەوتووە پێویستی بەوە نەماوە کە عیزرائیل خۆی ماندوو بکا بڕوا گیانی بکێشێ.

عـــەلاوە ئـــەو بـــار وێش وەنـــەش بـــارەن
خوسووس جە یاگـێش جـاکـەش دیـارەن[١]

بـــەو دەردان ســـەخت گـــرد کـاری‌یەوە
هـــەر ئـــێد مــواچـــۆن وە زاری‌یــەوە:[٢]

دڵ ســـفتەی بـــریان زوخـــاڵی‌یــە وێم
خـــەم وە خـــەم خـــەیاڵ خـــەیاڵی‌یـە وێم[٣]

مــــەتەرسوون بـــمروون جـــە داخ یـــاران
هـــەر بـــتلوون وە دەرد چـــون دەردەداران[٤]

## [٣]

## شەماڵ، دارانەن[٥]

شـــەماڵ، دارانـــەن.. شـــەماڵ، دارانـــەن..
زەردی رەنگ نـــە رووی وەڵگ دارانـــەن[٦]

---

(١) یاگێ: جێگا. واتە: سەرەڕای ئەو بارەی سەرشانی، خۆیشی لێ بووە بە بـار، وە بـە تایبەتی وای لێ‌هاتووە ئەگەر سەیری جێگـاکـەی بکـەی خـۆی نـابینێ تـیایا، وە تـەنها جێگەکەی دیارە.

(٢) گرد: گشت. مواچان: ئەڵێن. واتە: بەو هەموو دەردەکاریانەوە هەر ئەمە ئەڵێن بـە دەم گریانەوە. وتراوەکەی لە دوو شیعری پاشەوەباس کراوە.

(٣) بریان: گۆشتی سوورەوەکراو. زوخـاڵی: خـەڵووز رەنگ. واتـە: ئـای لە مـن کـە دڵـم سووتاوەو وەك گۆشتی سوورەوەکراوی وام لێ هاتووەکە لەسەر ئاگـر دانـەگـیرابێ تـا سووتابێ‌و وەك خەڵووزی لێ هاتبێ. ئای خەم بە سەر خەماکەوتوو خـۆم... ئـای هـەر تاوێك خەیاڵێك کردوو خۆم. (٤) بمروون: بمرم. بتلوون: بتلێمەوە.

[٣]

(٥) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لە پاوە وتووە لەکاتی هاتنە خوارەوەی جافدا لەکوێستانی «داڵەهو»وە بۆ دەشتی زەهاو.

(٦) وەڵگ: گەڵا. واتە: ئەی شەماڵ سەرە هاتووەتە سـەر درەخـتەکـان وە رەنگـی زەرد نیشتووە لە رووی گەڵا دارەگان.

تـــەمەن، گـــەردەلوول، بـــادەن، بـــارانـــەن
بـــێزیـــای وارگـــەی ســـەر کـــۆسارانـــەن[١]

هـــەوای ســـیاماڵ وێنـــەی جـــارانـــەن
پـــەی ســـەمت زەهـــاو زەردەو یـــارانـــەن[٢]

هـــەو هـــەوو بـــەو بـــەو تـــەڵمیت بـارانـەن
گـــەرمی بـــەزم نـــەزم ســـەر هـــەوارانـەن[٣]

«نَـــظارە»ی رای راز شـــەکـــەر وارانـــەن
فـــەسڵ ســـەیر ســـەید مـــیرشکارانـــەن[٤]

چ خـــێزەن نـــامەرد مـــەر جـــە خـــاوەنی
بـــێ خـــۆف جـــە لوای رای زەهـــاوەنی[٥]

شـــۆ وە لای ئـــەو شـــۆخ جـــەمین پـــەڕەی گـــوڵ
دەوای دەرد ســـەخت پـــەی دەرمـــان دڵ[٦]

---

(١) بیزیا: دڵی لێ بێزران. وارگە: هەوارگە.
(٢) سـیماڵ: دەوار. سـەمت: لا. «زەردە»و «یاران»: دو دێن لە نـاوچەی زەهـاو. واتـە: دیسانەوە وەك جاران دەوار نشینەکان ئارەزووی چوون ئەکەن بۆ زەهاوو زەردەو یاران.
(٣) هەو هەو: هۆ هۆی خوڕین لە وڵاخ. بەو بەو: وەرە وەرە. واتە: دەنگە دەنگی لە وڵاخ خوڕینی کۆچەریەکان دێت، وە ئاهەنگی ئاوازەو گۆرانی سەر هەوارەکان گەرمە.
(٤) «نظارە»: روانین. میرشکار: سەرکردەی تیپی راوچی‌یان، مـەبەس لەو راوچـی‌یانەیە کە بە بنەو بارخانەوە ئەچن بۆ راو. واتە: وادەی بە رێدا لاکردنەوەی جوان چاکەکانە بۆ قسە، وەکاتی تەماشای راوە ئاسکی راوچی‌یە پۆشتەو پەرداخەکانە.
(٥) لوا: رۆیشتن. واتە: هەی شەماڵی نامەرد ئەوە چیتە، خـەوت لێ کـەوتووە، وا هـیچ ترسی ئەوەت لە دڵدا نیەکە دۆست کوێستانی بەجێ هێشتووەو رێگای زەهاوی گرتووەتە بەر.
(٦) شۆ: بڕۆ: دەرمان: تیمار کردن. واتە: بڕۆ بۆ لای ئەو دۆستەکە دەرمانی تیمار کردنی هەموو دەردێکی سەختی دڵە.

مـــــدیۆ وە فـــــیرقەی زەلیـــــلان خـــــێڵ
دیـار نـیەن مـەعدووم لۆنگ خـەم وە پـێڵ(١)

مـــــەپەرسۆ حـــــاڵم، ئـــــێدش دەر جـــواو
واچـــە ئـــەو فـــەقیر سـفتەی دڵ کـــەواو(٢)

ئـــــانا دەور مـــــدۆ وە «شـــــاهۆ» کـــــۆوە
وە ســـــــزای دووری دیــــدار تــــۆوە(٣)

هـــــەریەك چـــەنی یـــەك وادەشـــا کـــەردەن
وادەشـــــان راســـەن تـــا وە رۆی مــــەردەن(٤)

ئـەو، تـا سـایەی بـەرد، ئـەو تـا بـۆ وە گـەرد
ئەو تەم‌و ئەو خەم، ئەو سـەردی، ئـەو دەرد(٥)

خـــــۆلاســـــەی کـــەلام نـــوور دیـــدەی دڵ
شـــیفای ئـــێش‌و نـێش زامـان پـێ حـاسڵ(٦)

---

(١) مدیۆ: ئەڕوانێ. لۆنگ: بەرماڵە شڕ. پێڵ: شان. واتە: کـە سـەیری تـاقمی هـەژارانـی خێڵەکە ئەکا من نابینێ کە بەرماڵی خەمم کردووتە شانم.
(٢) واچە: بڵێ. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.
(٣) واتە: کە ئەحواڵی پرسیم وای وەرام بدەرەوە بڵێ ئەو هەژارە دڵ وەك کەباب برژاوە، لە تاو دەردی دووریی تۆ هەر خول ئەخوا بە دەوری کێوی شاهۆ دا.
(٤) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٥) واتە: مەعدوومی‌و شاهۆ گفتیان کردووە بە یەك، وە ئەو گـفتەیان نـاشکێنـن تـا ئـەم ئەچێتە ژێر سێبەری بەردی ئەلحەدو ئەو لە ڕۆژی قیامەتا ئەبێ بـە تـۆز، بـڕیاریان داوە شاهۆ تەم‌و سەرمای لێ نەبڕێ‌و مەعدوومی خەمی لە دڵ دەرنەچێ‌و لەشـی بـێ دەرد نەبێ. مەولەوی کە ئەڵێ «تا شاهۆ ئەبێ بە تۆز» ئیشارەت بۆ ئەو ئایەتە ئەکا کە ئەڵێ ﴿وَتَكُونُ الْجِبالُ كَالْعِهْنِ الْمَنْفُوشِ﴾ واتە: شاخەکان وەك لۆکەی شی‌کراوەیان لێ دێ.
(٦) مەعنای ئەم شیعرەش لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

سـەوزەی حـەیاتم رسـتەی وەفـای تـۆن
ئـەر وەفـات نـەبۆ زینـدەگـیم جـە کـۆن؟(١)

[۴]

## شەماڵ داخان

شـــەماڵ داخـــان.. شـــەماڵ داخـــان..
شەماڵ، یـا کـۆگـەرد، گـرد یـاگـە داخـان..(٢)

شـــانە شـــانای تـــای تـــوڕەی وەر زاخـــان
مـــڵەمـــای بـــاڵای نـــەوتووڵ بـــاخان(٣)

هـــانام تـــۆ خـــودا، پـــەنام ئـــاوردەن
هـــا، نـــام خـــودام ســـا پـــەوکە بـــەردەن(۴)

جـــە وێ بـــەرگ گشت، کشت هـــەوادەرنـــی
هـــەوای زامـــەت کـــەر، زام دەواکـــەرنی(٥)

---

(١) رستە: رواو. واتە: بەکورتی ئازیزەکەم کە دەرمانی هەموو دەردێکمی، پەڵە سەوزەی ژیانم بە ئاوی وەفای تۆ رواوە، ئەگەر تۆ وەفات نەبێ من چۆن ئەژیم.

[۴]

(٢) داخان: کێوەکان. کۆگەرد: کێو گەڕ. واتە: ئەی شەماڵی سەرکێوەکان کە هەموو ئەو شوێنانە ئەگەڕێیت کە جاران یاران تیا دائـەنیشت، وە ئێـستا بـوون بـە جێگـای خـەمو مەینەت، چونکە ئەو رۆژانەمان ئەخەنەوە یاد.

(٣) شانا: وەشێن. وەرزاخان: گیای لای پاڵی تاشو بەردەکان. مڵەما: نەرمکەر. واتە: ئەی شەماڵ کە ئەچی بۆ ناو گیای لاتاشو بەردەکانا، وەك شانە بچی بە ناو زوڵفی لوولی یاری باڵابەرزا، وە لقە تازە رواوەکانی ناو باخەکان نەرم ئەکەیتەوە.

(۴) هانا: هاوار. پەوکە: بۆیە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەیو نیوەی یـەکـەمی شیعری پاشتر پێکەوە دێ. (٥) وێ: خۆت. کشت: کشتو کاڵ.

بـــدیە وە مــــدرای ســـەیل ئـــەسر چـــەم
فـیدای بـاڵات بـام هـەی شـەماڵ تـۆ هـەم[١]

ئـــەر نـــیمە شـــەو بـــۆ، وەر نـــیمە شـەو بـۆ
نـــیمە خـەو، پـڕ خـەو نـە نـیمە خـەو بـۆ[٢]

وێت دەر وە نــــەرمی نـــــە تـــۆی یـــەمانی
نـــەو تـــوڕەی مـــانی ئـــاو حـــەیوانـــی[٣]

ســـا ئـــەوسا نـــە خـــاو چـــون بــێدار مـەبۆ
جـە ئـەو سـات ئـەو سـات ئـاشکار مـەبۆ[٤]

مـدیۆ، مـدیەی چـێش، شـەماڵ چـێش مـدیۆ
مـەپەرسۆ چـێشـەن هـای شـەماڵ جـەنۆ؟[٥]

---

(١) بدیە: بڕوانە. مدرا: وەستان. ئەسر: فرمێسك. واتە: تۆ خـوا هـاوارم بـۆ هـێناوی سەیرێکی وەستانی لافاوی فرمێسکی چاوەکانم بکە... بۆیە ناوی خوا دێنم چونکە تۆ خۆت کردووە بە جلو بەرگ بۆ هەموو شتێ، وە باوەشێنکەری کشتو کاڵیو ئارەزووی زەحمەت دانی دڵداران ئەکەیو تیماری زامەکانیشیان ئەکەی... بەکورتی چونکە دەردو دەرمان هەموو لە خۆتەوەیە. مەعنای نیوەی دووهەمی ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٢) وەر: پێش. نەنیمەخەو بۆ: نیوەخەو نەبێ.

(٣) یەمانی: جۆرە قوماشێکە. مانی: هونەرمەندێکی بەناوبانگ بووە نەخشی زۆر جوانی کێشاوە. واتە: بەقوربانت بم شەماڵ ئەوەشم بۆ بکە بڕۆ بۆ لای یار، وەخت نیوەشەو بێ، وە یار لە پرخەی خەوا بێ تازە خەوی لێ کەوتبێ، گوێ مەدەرێ بە ئارامی لە ژێر لێفە یەمەنییەکەوە خۆت بدە لە زوڵفە لوولەکانی کە ئەڵێی مۆری توغرایەو مانی نەخشی کێشاوەو بە سەر ئاوی حەیاتەوەیەکە روویەتی.

(٤) خاو: خەو. سات: سەعات. واتە: جا ئەوکاتەکە لە خەو خەبەری ئەبێتەوە، لەو سەعادتەدا لە جوانی ئەو یارە سەرسام ئەبی وەك ساعەتی قیامەتت هاتبێتە بەر چاو.

(٥) مدیە: روانین. واتە: ئەڕوانێ، چۆن روانینێ؟ بۆچی ئەڕوانێ؟ لێت ئەپرسێ ئەڵێ: ئەوە شەماڵ دیسانەوە چی رووی داوە وا هاتووی؟

بـــديه وه ســهختی ســزای ئــێش‌و نــێش
هه‌نی واچوون چێش، شه‌ماڵ واچی چـێش(١)

ئــه‌ر هــه‌ر مـواچـی، واچــه: چـێش واچـوون
واچوون ئێد واچه: وه ســه‌ر گــه‌ردت بــوون(٢)

رام گـــنا نـــاکـــام وه نـــاکـــام داریٚ
چه‌نی؟ چه‌نی خـار، چـه‌نیٚ خـار؟ خـاریٚ(٣)

ئــیبتیدا مـــه‌عرووز پــه‌ی نـــه‌زه‌ر، وه خـــه‌و
ئــه‌ر ویــنۆ گـــه‌ردیٚ ده‌رد ســـه‌ختی ئــه‌و(٤)

ئه‌ر ســه‌د جـاریٚ بـۆ نـه‌و نـه‌مام، نـه‌و ده‌شت
فـــه‌رقیٚ نـــمه‌بۆ پـــه‌ی لوای بـــه‌هه‌شت(٥)

---

(١) هه‌نی: له‌مه زیاتر. واته: شه‌ماڵ چیت پیٚ‌بڵێم تا تۆیش به‌وی بڵێیت، خۆت سه‌یری سزای ئێش‌و ئازارم بکه‌و حاڵی ببه‌كه چۆنی وه‌رام بده‌یته‌وه.

(٢) مه‌عنای ئه‌م شیعره به‌سراوه به شیعری پاشه‌وه‌یه‌وه.

(٣) رام گنا: رێم که‌وته. ناکام: به بیٚ مه‌به‌ست بوون. چه‌نی «ی یه‌که‌م»: چۆن. چه‌نی «ی دووهه‌م»: له‌گه‌ڵ. واته: ئه‌گه‌ر هه‌ر ئه‌ڵێی بڵیٚ چی بڵێم؟ ئه‌ڵێم ئه‌مه بڵیٚ: به‌قوربانت بـم به‌رێکه‌وت رێم‌که‌وته لای دڵدارێکی وا دڵێکی به مراد نه‌گه‌یشتووی هه‌بوو، ئه‌گه‌ر پرسی: چۆن بو؟ بڵیٚ: دڕکی خه‌م‌و مه‌ینه‌تی پێوه بوو، وه ئه‌گه‌ر پرسی: دڕکه‌که‌ی چۆن دڕکیٚ بوو؟ بڵیٚ: دڕکێکی وابوو له باس کردن نه ئه‌هات.

(٤) وینۆ: ببینیٚ. مه‌عنای ئه‌م شیعره به‌سراوه به شیعری پاشه‌وه‌یه‌وه.

(٥) نمه‌بۆ: نابیٚ. بۆ ئه‌وه‌ی به باشی له مه‌عنای ئه‌م دوو شیعره بگه‌ین ئه‌بیٚ له پێشا ئه‌وه بزانین که خوا له ئایه‌تێکا فه‌رموویه‌تی: ﴿اَفَلا يَنْظُرُونَ اِلَى الْاِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾. واته: ئه‌وه خه‌ڵك سه‌یری وشتر ناکه‌ن چۆن دروست کراوه، تا له‌وه‌وه باوه‌ڕ به گه‌وره‌یی خوا بکه‌ن، وه ئه‌م ئایه‌ته یه‌که‌می ریزه ئایه‌تێکه‌که چه‌ند شتێکی تیا پیشان دراوه بۆ سه‌یر کردن‌و بیر کردنه‌وه به هۆیانه‌وه له گه‌وره‌یی خوا. هه‌روه‌ها له ئایه‌تێکی‌ترا فه‌رموویه‌تی: ﴿وَ لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ حَتّٰى يَلِجَ الْجَمَلُ فى سَمِّ الْخِياطِ﴾. واته: کافره‌کان ناچنه به‌هه‌شت تا وشتر نه‌چیٚ ☜

تــــەمام دەوایـــــی جـــە دەســـتت پـــێتـــەن
هـــــەنی نـــــەوەشی بــــە دەست وێتـــەن(١)

[٥]

## شەرارەی کوورەی

شـــــەرارەی کـــوورەی دەروون پـــڕ جـــۆش
دیگ چـــەمەی چـــەم ئـاوەرد وە خـــرۆش(٢)

ســـەر کـــەردەن هـــووناو نـــە رووی روخســـارم
کـــەردەن وە شـــەتاو جـــەستەی خـــەمبارم(٣)

وەلوەلەی لوولەی پـــێشـــەی ئـــازای چـــاك
یـــاوا وە ســـەرین نـــۆ پـــەردەی ئـــەفلاك(٤)

---

☞

بەکونی دەرزی دا. جا کە ئەمەمان زانی ئەتوانین بە باشی لە مەبەسی مەولەوی بگەین. مەولەوی بە شەماڵ ئەڵێ: بڵێ بە یار، وشتر کە یەکەم شتە پیشان دراوە بۆ ئەوەی سەیری بکرێ بە هۆیەوە بیر لە گەورەیی خوا بکرێتەوە، ئەگەر بێتوو بە خەو ئەوەندەی تۆزێك لە مەینەت باری دۆستەکەت ببینێ، ئەوەندە باریك و لاواز ئەبێ، ئەگەر مەسەلەی بەکونی دەرزی‌یاچوونەکە لە جیاتی جارێ سەد جار بێ، پیایا ئەڕوا، وە ئیتر لە دەشتی مەحشەرا جیاوازی نامێنی لە نێوانی کافرو موسوڵمانا بۆ چوونە بەهەشت.

(١) نەوەشی: نەخۆشی. واتە: هەموو دەرمانێك لە دەستی خۆتایەوە بە خۆتە، هەروەك نەخۆش خستنیشت بە دەستە، کەواتە فریای کەوەو چاری کە...

[٥]

(٢) دیگ: مەنجەڵ. چەمە: سەرچاوە. خرۆش: کوڵ. واتە: بڵێسەی تەنووری دەروونی بە جۆشم مەنجەڵ ئاوی سەرچاوەی چاومی هێنایەکوڵ و فرمێسکی بە خوڕ لێ ڕژاند.

(٣) واتە: خوێناو لە چاومەوە لێشاوی کردووەو لەشی خەمبارمی وەك شەتاو لێ کردووە.

(٤) وەلوەلە: ئاوازە. پێشە: ئێسقان. چاك: لەت لەت. واتـە: دەنگـی شـمشاڵی ئـێسـقانی تێك شکاوی لەشم گەیشتووەتە ئاسمانی حەوتەم و عەرش و کورسی.

پـەرێم مـەگـرەوان ئـینس‌و جـینن‌و حـوور
نـاڵە مـەکـاران جـە دەرگـای غـەفوور[١]

مـەلالان یـەك‌یەك پـەرێ رزگـاریم
پـەرێ سـارێشـی زامـان کـاریم[٢]

تـۆ نـە تـۆی حـیجاب ئـیستیغنا مـەدهۆش
نە حـەجلەی خـاوگای راحـەتی خـامۆش[٣]

نـەیاوان هـێمـان وە لات فـەریادم
نـەزانـات وە دەرد دادو بـێدادم[٤]

سـا گـۆش دەر سـاتێ وەی زیـرو بـەم‌دا
بـویەر وە بـاڵیـن ئـەهل مـاتەم‌دا[٥]

تـا لێت مـەعلووم بـۆ سـەختی هـیجرانت
بـزانـی وە دەرد خـەستەی زامـانت

بـەڵکـم رەحـم خـەیر بـاوەری وە دڵ
سـاتێ پـەی دەروون تـەسکین بـۆ حـاسڵ[٦]

---

(١) مەگرەوان: ئەگرین. واتە: ئادەمیزادو جنۆکەو حۆرییەکانی بەهەشت بۆ ئەگرین‌و ئەپاڕێنەوە بۆم لە قاپی خوا.
(٢) واتە: هەموویان ئەلاڵێنەوە بەڵکو رزگار ببم‌و زامەکاریگەرەکانم سارێش ببن.
(٣) حیجاب: پەردە. حەجلە: پەردەیەکە دائەدرێتەوەو بووکی تێ ئەچێ. خاوگا: جێگەی خەو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری دواییەوە.
(٤) هێمان: هێشتا. واتە: کەچی تۆ لە ناو پەردەی بێباکی‌دای‌و ئاگات لەکەس نیە، وە لەسەر جێگای رابواردن‌و نووستنی خۆتا خۆت مات کردووە، هێشتا هاوارو فوغانی منت پێ نەگەیشتووەو پێت نەزانیوە.
(٥) زیروبەم: ئالەتێکی موسیقایە. بویەر: رابوورە. باڵین: ژوورسەر. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٦) باوەری: بێنی. واتە: مادەم بە حاڵی منت نەزانیوە، تاوێك گوێ بگرە لە سازو

چـــینە زیـــاتەر، شـــای نـــەو نـــەمامان
بـــێ ئـــینسافی‌یەن جـــەفای بـــێ ســـامان(1)

[٦]

## شی ئەو سەفاو سەیر(2)

شـــی ئـــەو ســـەفاو ســـەیر دیـــدەن یـــاران
لوا ئـــــەو دووری‌و ئـــــەو وەســـڵ یـــاران(3)

ئـــێد نـــە ئـــەو دەورەن هـــەر مـــاماو مـــەویەرد
ئەم جار وە راســی چــەپگەرد شــانا نــەرد(4)

وەخت تـــــەماشای ســـــەوزەی شـــــەتاوان
ســــەیر شکـــۆفـــەی پـــای لارە کـــاوان(5)

---

سەمتووری هاوارو ناڵەم، وە بەلای جێگەی خەفەتبارانا تێپەڕە، تا بزانی دەردی دووریت چەند ناڕەحەتەو تێبگەی ئەوەی کە بە زامی تۆ بریندار بووە لە چ حاڵێکدایە، بـەڵکـو بەزەییت پیا بێتەوەو کارێ بکەی تاوێ بحەسێتەوە.

(١) چینە: لەمە. واتە: شای تازە پێگەیشتووەکان ئینساف نیە لەمە زیاتر سزای بدەی.

[٦]

(٢) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە بەغداوە نووسیوە بۆ کاك ئەحمەدی خەسرەو چاوەش «ئەحمەدی پرێسی» کە لە شارەزوور بووە.

(٣) شی: بەسەرچوو. واتـە: ئـەو کـەیفـو ئـاهەنگەی جـارانـی چـاو پـێ کـەوتنی یـاران بەسەرچوو، وە ئەوە نەماکە لە یار دوور بکەوینەوەو بە تەما بین پێی بگەینەوە.

(٤) ماما: ئـەهات. واتـە: ئێـستا زەمـانی ئـەوسا نـیەکـە نـاخۆشـیمان بـەسەرا ئـەهاتو تێ‌ئەپەڕی، ئێستا گەردوون بە یەگجاری زاری ناخۆشی هەڵداوە، وە جارێکی‌تر خۆشی نابینینەوە.

(٥) شکۆفە: گۆپکەی درەخت. پا: داوێن. لارەکاوان: لێژایی شاخە بەرزەکـان. مـەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

مــەدارە نــەو بــەزم شکــۆفــان جـەم جـەم
هــــەنی شکـــۆفـــە دیــدەنی وە چـــەم(۱)

مــەوج دەجــلەی چــەم تــوغیان کــەردەوە
گـــێج هــــوون دڵ جــۆش ئــاوەردەوە(۲)

ئــەو ســارای بــەغداش ئاوەردەن وە تــەنگ
ئــێد کــەردەن ســارای کــەربەلا رەنگ رەنگ

ئــەو جــە ئــەندازەی کــەشتی بــەرشی یــەن
ئــێد بــۆی هــوون مــدۆ، رای گــوزەر نــیەن(۳)

ئـــەر نـــامە نـــامان قـــاسید نــەیاوان
بـــینایی دیـــدەم مـــەگــێرە تــاوان(۴)

راویـــار مـــاتەم، گـــرد دەروون تــەنگەن
قـــافڵەم تـــا قـــام قــیامەت لەنگــەن(۵)

---

(۱) واتە: بەهاران لەکاتی تەماشا کردنی سەوزایی گوێ شەتاوەکانو سەیری گـۆپکـەی درەختی داوێنی چیاکانا، لەکاتێکا کە گۆپکەی درەخت کۆمەڵ کۆمەڵ هەڵ ئەتۆقێن، تۆ بە هۆی خەمباریتەوە لە بەر دووری دۆستان، سەیری ئەو گۆپکانە مەکەو لەزەت لە دیمەنی بەهار وەرمەگرە.

(۲) توغیان، «طغیان»: سەرکردن. گێج: ئاوی تەنوورەکردوو. مەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(۳) واتە: شەپۆلی فرمێسکی چاوەکانم وەك ئاوی دەجـلە هـەڵساوە، وە خـوێنـی دڵم هاتووەتەکوڵ، ئەویان دەشتی بەغدای داگرتووەو لەوەدا نەماوە کەشتی بگەرێ، ئەمیشیان سەحرای کەربەلای سوور کردووە، وە لەبەر بۆنی خوێن رێی هاتو چۆ کردن بڕاوە.

(۴) قاسید: نامەهەڵگر. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی دا دێ.

(۵) راویار: رێبوار. قام: بەرپابوون. واتـە: ئـازیز گـلەییم لێ مـەکـە ئـەگـەر نـامەمتان بـۆ نــەهاتبێو فـروستادە نـەگـەیشتبێتـە بـەرەوە، چـونکە رێبـوارەکـان هـەموو دڵتـەنگو خەفەتبارن، وەکاروانم هەمیشە شەلەو درەنگ ئەگاتەجێ.

[٧]

## شیفای ئێش‌و دەرد(١)

شـــيفای ئـــێش‌و نـــێش ئـەی زامـان سـەخت
«ضيا»ی ديدەو دڵ مـەعدوومی بـەدبەخت(٢)

دەســــتەی وەنــــەوشەی پــەل دێزت یــاوا
بۆش بـۆی وەفـای لەیـل نـە دەمـاخ سـاوا(٣)

گــــــەرد دەرد رێش دەروون بـــــەردەوە
عــــەشقەكـــەی قـــەديم تـــازە كـــەردەوە(٤)

ســـــەودای وەنــــەوشەی پـــەل‌دێز بـــاخان
هـــەوای گـــوڵاڵان ســـەر كـــاوان زاخـــان(٥)

پـــەی كـــەسێ خـــاسەن ئـــەوەڵ دەردش بـــۆ
ئـــيبتيدای خـــێزيـــای دوود سـەردش بـۆ(٦)

كـــــەرۆ مـــــەشق عـــەشق وێنـــەی مـــناڵان
گـــــا ســــەير كـــاوان، گـــا بـــۆی گـــوڵاڵان

نـــەك چـــون مـــن ســـەرعی ســـادار مـــەردە
لافــــــاو دەردان دڵ وێران كـــــــەردە(٧)

---

[٧]

(١) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ شێخی «ضياالدين»ﷺ نوسیوە لە وەرامی ئەوەدا كە ئەو چەپكەیەك وەنەوشەی بۆ ناردبوو.

(٢) ئەی: ئەم. «ضيا»: رۆشنی، ئیشارەیشە بۆ لەقەبی «ضياءالدين».

(٣) واتە: چەپكە وەنەوشە پەل سەوزە تۆخەكەت گەیشت، بۆنە خۆشەكەی بۆنی وەفای لەیلی‌دا لە لووتم. مەبەس لە لەیل شێخی «ضياءالدين» خۆیەتی.

(٤) واتە: تۆزی دەردی دڵە بیمارەكەمی لابرد.

(٥) سەودا: ئارەزوو. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری پاشەوە پێكەوە دێ.

(٦) خێزیا: هەڵسان.

(٧) سەرعی، صرعی: فێ‌دار. سادار: كەسێكە هەر لە خۆیەوە لە هۆشی خۆی بچێ.

کوورەی عەشق دڵ هەر یەند جۆش وەردەن
گوڵاڵەم چون وێم فەرامۆش کەردەن(١)

[٨]

## شادی گەرد خەم(٢)

شادی گەرد خەم چۆن نەدۆ وە باد
خەم چۆن وە یاگەی شادی نەبۆ شاد(٣)

ئازیز، وە کەرەم من تەڵەب کەردەن
من دەرد دووری تەوانام بەردەن(٤)

دڵ چۆن وەش نەبۆ، گیان چۆن نەتاوۆ
لەیل ئینتیزار بۆ، مەجنوون نەیاوۆ(٥)

---

☞

واتە: ئارەزوو کردنی وەنەوشەی پەل دێزی ناوباخەکانو حەز کردن لە گوڵی سەربەرزایی‌و زەردو ماکان بۆ کەسێ باشەکە سەرەتای دەردەدار بوونو هەڵسانی دووکەڵی هەناسەی سەردی بێ، وە وەك منالان تازە فێری دڵداری ببێ‌و تاوێك بۆ شاخەکان بڕوانێ‌و تاوێك بۆنی گوڵ بکا، نەك وەك منی فێداری بێ‌هۆشی مردوو کە لافاوی دەرد دڵی وێران کردووم.

(١) واتە: من تەنووری عەشقم ئەوەندە بە تاوە، لە تاوا گوڵیشم وەك خۆم لە بیر چووەتەوە.

[٨]

(٢) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی ئەوەوە نوسیوەکە جارێکیان دۆستێکی ناردبووی بە دوایا بچێ بۆ لای.

(٣) نەدۆ: نەدا. واتە: شادی چۆن گەردی خەم نەدا بە با، وە خەم شاد نەبێ بە جێگە ناخۆشەکەی جارانی شادی.

(٤) واتە: من کە دەردی دووری توانای لێ سەندووم، ئازیز بە لوتفی خۆی بانگی کردووم.

(٥) نەتاوۆ: نەتوێتەوە. واتە: جاران مەجنوون ئەبوایە چاوەڕوانی لەیل بوایە، ئێستەکە لەیل چاوەڕوان بێ‌و مەجنوون نەگاتە بەرەوە، ئەبێ دڵ یەکجار شاد بێ‌و گیان لە خۆشی‌دا بتوێتەوە.

بــێ ئــەمری فــەرمان ئــازیز تــا وەکــەی
های دەروێش، نەی چی، مەی چی، دەف، مەی، نەی[(١)]

بــەڵ بــاڵ بــەیداخ تــاقەت ئــەو پــا بــۆ
بــۆی تــەئسیر بــەزم بــەدرەقەی را بــۆ[(٢)]

دەف ئــــاسا بــــەو ســــۆز نــاڵەو ســەداوە
روو ئــەو یــاران بــوو، پشت ئــەو دمــاوە[(٣)]

دەس گێروو نە سەر سەدای نــەی پــەی پــەی
تــا وە ئــینتیهای ئــەو ســەر ســەدای نــەی[(٤)]

چون پیاڵەی ســاف دەروون جــە مــەی کــەیل
بنمانوو خاس خاس عەکس چیهرەی لەیل[(٥)]

---

(١) واتە: تاکەی بێ فەرمانی ئازیز بکەم و نەچم بۆ لای، دەروێش دەسم دامێنت زووکە بدە لە دەفەکەت، کاکەی شمشاڵژەن تۆیش شمشاڵەکەت بنێ بە دەمتەوە، با ساقیش دەس بکا بە مەیگێڕان.

(٢) ئەوپابۆ: راست بێتەوە. بەدرەقە: رەوانەکردن. واتە: بەڵکو باڵی بەیداخی تاقەتم راست بێتەوەو بۆنی کار تێکردنی ئەم ئاهەنگە لەگەڵما بکەوێتە رێ.

(٣) واتە: بەڵکو بە هۆی سۆزی ناڵەو دەنگی دەفەوە هێزم بێتەوە بە بەراو وەك دەف روو بکەمە یاران و پشت بکەمە دوواوە.

(٤) دەسگێروو: دەس بگرم. واتە: وە لەسەر ئاوازی نەیەکە چین چین هەڵپەڕم تا لێ ئەبێتەوە.

(٥) بنمانوو: بنوێنم. واتە: وە عەکسی رووی لەیلم تیا دەرکەوێ وەك لە پیاڵەی سافی پڕ لە مەیدا دەرئەکەوێ.

## [٩]

## شووراى عاشووران[١]

شووراى عـاشووران ديسـان بـەزمش بـەست
«موحەڕڕەم» ئاما «مەحرەم» شى نـە دەست[٢]

ئــەو خــەريك نــە چــۆڵ شـار عــەدەمدا
مــن نــە «كــەربەلا»ى ســاراى مــاتەمدا[٣]

ئــەو «يــەزيد» مــەرگ وە ئــەسير بــەردە
مــن زادەى «زيــاد» خــەم يــەقير كـەردە[٤]

بـــــازاڕەن، وادەى مـــــامەڵەن، ســـــاقى
هـــەى بگــرە فــانى، وەى بــدەر بــاقى[٥]

---

[٩]

(١) مەلەوى ئەم قەسيدەشى لە لاواندنەوەى عەنبەر خاتوونى خێزانيا وتووەكە وا ديارە لە مانگى موحەڕڕەمدا مردووە.

(٢) عاشوورا: رۆژى دەهەمى مانگى موحەڕڕەم كە يادى كوشتنى حەزرەتى حوسەينە. موحەڕڕەم: يەكەم مانگى ساڵى هيجرى. واتە: وا ديسان قەرەباڵغى سەنگ كوتانى رۆژى عاشوورا پەيدا بووەوەو مانگى موحەڕڕەم هات، وە من مەحرەمەكەى خۆم لەكيس چوو كە خێزانمە.

(٣) كەربەلا: شارێكە لە ناوەڕاستى عێراقدا حەزرەتى حوسەينى تيا شەهيد كراوە. واتە: عەنبەر خاتوون لە دەشتى چۆڵى شارى فەوتاوىو نەبوونىدا داماوە، منيش ئەوەندە خەفەتبارم ئەڵێى لە سەحرايەكى خەفەتاكەوتووم كە ئەوەندەى كەربەلا، لە رۆژى كوشتنى حەزرەتى حوسەين دا، خەمو خەفەتى تيايە.

(٤) يەزيد: كوڕى مەعاويە، ئەوەى لەشكرى كردە سەر حەزرەتى حوسەينو كوشتيان. زادەى زياد: ئەوەى لە زيادكەوتووەتەوە، مەبەس «عبدالله»ى كوڕى زيادەكە فەرماندارى لەشكرەكەى يەزيد بوو. يەقير: گير خواردوو. واتە: ئەو مەرگ بە ديل بردوويەتى كە وەك يەزيد وايە منيش خەمگيرى پێخواردووم كە وەك «عبدالله»ى كوڕى زيادە.

(٥) ساقى: مەبەس لێى خوايە. واتە: خوايە ئەم جيهانە وەك بازاڕ وايە جێگاى مامەڵەكردنە، شتى فەوتاومان لێ وەربگرەكە ژيانى ئەم دنيايەيە، وە لە بەرامبەريا شتى نەبڕاوەمان بدەرێ كە ژيانى هەميشەيى بەهەشتە.

رۆ، «حـــوسەین»ئـاسا فـەردا کـە رۆ بـۆ
داخۆم سـەر جـە کـۆ، لاشـەم جـە کـۆ بـۆ(١)

[١٠]

## شەریك ناڵەی(٢)

شـــەریك نـــاڵەی شـــەوان بـــێداریـم
مـــەڵهـــەمەکـەی ئـێش زامـان کـاریم

مـــەحرەم حـــەرەم کـەعبەی مـەقسوودم
رەهـنومای تـەریق یـاگـەی سـجوودم(٣)

بـــە مـــەرگت دایـــم خـدێم زاریـیـەن
رەفـــێقـم نـاڵەی شـەو بـێداریـیـەن(٤)

خـــەریکم نـــە گـێج بـەحر مـوشکوڵدا
هـــەر دەردەن مـــەیۆ مشـــۆ وە دڵدا(٥)

---

(١) واتە: هەی رۆ... سبەینێ کـە رۆژ بـووەوە ئـاخۆم مـنیش وەك حـەزرەتی حـوسەین سەرم بکەوێتە کوێ‌و لاشەم بکەوێتە کوێ.
مەولەوی لەم قەسیدەیەدا ئیشارەتی بۆ کارەساتەکەی حەزرەتی حوسەین کرد کە لە رۆژی دەی موحەڕڕەمی ساڵی ٦٠ی هیجریدا، «عبدالله»ی کوڕی زیاد، فەرماندەی لەشکری یەزید لە دەشتی کەربەلا داگەمارۆی داو سەری بڕی‌و سەرەکەی نارد بۆ شام بۆ یەزید.

[١٠]

(٣) واتە: وەك چۆن حەرەمی کەعبە بە تایبەتی نەبێ بۆ کەس ناکرێتەوە، ئامانجەکانی منیش هەر تۆ پێیان ئەزانی شارەزایانی، وە تۆ رێگای جێگای سوجدە بردنم پیشان ئەدەی. مەبەستی لە سەردانەواندە بۆ خۆشەویستی.
(٤) حدێ: خوو.
(٥) مشۆ: ئەچێ. واتە: لە گێژی دەلیای گیروگرفتا گیرم خواردووە، هەر تاوێ دەردێکی تازە دێ‌و ئەچێ بە دڵما.

## [۱۱]

### شنەفتم دووربا(۱)

شنەفتم دووربا لەیل زوکامشەن
دیشوار بالای نەونەمامشەن(۲)

هەنارەکەی دڵ پڕ جە دانەی ئێش
پیشیای کوورەی نار عەشق ویش(۳)

بە مەودای موژگان سۆراخش کەرۆ
وە گەرمی نیشان دەماخش دەرۆ(۴)

## [۱۲]

### شنەفتم گیانم(۵)

شنەفتم گیانم بالا تووڵ نەی
ئیرادەت کەردەن چەنی خەستەت بەی(۶)

---

**[۱۱]**

(۱) مەلەوی ئەم چەند شیعرەی بۆ دۆستێکی ناردووەکە هەڵامەتی بووە، دەرمانی تیا پیشان ئەدا بۆ هەڵامەتەکەی.

(۲) دیشوار: گیرو گرفت. واتە: بیستوومە لەیل، دوور بێ لێی، هەڵامەتیەتی وە باڵای نەونەمامی نارەحەتە.

(۳) پیشیا: پیشاو. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(۴) موژگان: برۆ. سوراخ: کون. دەرۆ: بدا. واتە: دڵەی وەك هەنارم کە پڕە لە دەنکی ئێش‌و ئازار، لە ناو تەنووری ئاگری عەشقی خۆیا بپیشێنێ، وە بە تێغی برژانگی خۆی کونی‌کاو بۆنەکەی هەڵمژێ چاك ئەبێتەوە. بەکورتی هەنارێ بپیشێنێ‌و کونی بکاو بۆنی پێوە بکا.

**[۱۲]**

(۵) مەلەوی ئەم چەند شیعرەی بە بۆنەی ئەوەوە نوسیوەکە دۆستێکی نیازی بووە لەگەڵیا بڕوا بۆ سەفەرێك، ئەمیش ئەوەی زۆر پێ خۆش بووە.

(۶) گیانم: گیانەکەم. نەی: قامیش. بەی: بێیت. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «خەستەت» نووسراوە «هاوڕێ» مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوە پێکەوە دێ.

مــەگــەر پــای تــەدبیر بـەدبەختی ڕێش بـۆ
گیان هەوای سوحبەت جـەستەکـەم پـێش بـۆ

وەرنــــە شــــێتــــە وێم، دڵ وەشــی دڵەن
گیان جە تـەن بـەرشی ئـاماش مـوشکوڵەن(١)

(١) شێتە: شێتۆکە، نەفام. بەرشی: دەرچوو. واتـە: ئـازیزە بـاڵا وەك قـامیش بـەرزەکـەم بیستوومە ویستووتە لەگەڵ منی دەردەداری خۆتا بێیت، بەڵام مەگەر قاچی تەگبیر کردنی بەدبەختی شکابێ، تۆ کە گیانمت لایە بتەوێ بێ بە هاوڕێی لەشم، ئەگینا قوڕ بەسەرم مەگەر بەم جۆرە هیوایانە هەر دڵی خـۆم خـۆش کـەم، چـونکە گـیان لە لەش دەرچـوو زەحمەتە جارێکی‌تر بگەڕێتەوە بۆ لای.

## [١][1]

## «ضیا»ی دڵ[2]

«ضـــــیا»ی دڵ نـــامەت وە لای دڵ ڕێشـــان
یـــاواو ڕەنگـــین کـــەرد بـــەزم دەروێشـــان[3]

شـــنەفتم پـــەرێت ڕاس گـــێڵا چـــەپ گـــەرد
بـــــە وەســـــڵ لەیـــلا شـــادمانت کـــەرد[4]

دڵ وە نـــزیکی هـــەر یـــەند مـــەسروور بـــی
جە سـزای مـەینەت ڕای دووری دوور بـی[5]

پـــەرێ تـــۆ ڕاحـــەت، پـــەرێ مـــن زامـــەت
وەردەبـــــێم هـــەردوو تـــا ڕۆی قـــیامەت[6]

تـــۆ نـــە تـــۆی بـــاخچەی وەســـڵ دڵبـــەردا
مـــن نـــە پـــێچ گـــێج دەریـــای خـــەتەردا[7]

---

(١) شیاوی وتنە کە پیتی ضاد لە کوردی‌دا نیە، بەڵام بە بۆن ئەوەوە کە ناتوانین وشـەی «ضیا» بگۆڕینە سەر شێوە نووسینی کـوردی، بـەم بـۆنـەوە، هـەر بـە «ض» هـێناومانە. (بڵاوکەرەوە، ناشر).

**[١]**

(٢) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ شێخ «ضیاءالدین»ﷺ نوسیوە لە وەرامی نامەیەکی ئەوا کە مژدەی هاتنەوەی دۆستێکی تیا بووە.

(٣) واتە: ئەی ڕووناکی دڵم، نامەکەت کە بۆ مـنی دڵ بـریندارت نـووسیبوو گـەیشت، وەکۆڕی ئاهەنگی هەژارانی خۆش کرد.

(٤) گێڵا: وەرگەڕا. واتە: بیستم گـەردوونی چـەپ گـەرد بـۆ تـۆ ڕاست دەرچـوو، وە بـە وەسڵی یار دڵشادی کردی.

(٥) واتە: دڵم بە نزیك کەوتنەوەی لە لەیل یەگجار شـادمان بـوو، وە دوور کـەوتەوە لە چەشتنی سزا بە بۆنەی ڕێگای دووری تۆوە.

(٦) وەردەبێم: بخۆین. واتە: یاخوا تا ڕۆژی قیامەت تۆ هەر ڕەحەت بی‌و من مەینەت بچێژم.

(٧) واتە: تۆ لە باخچەی وەسڵی یارا ڕابوێری‌و من لە گێژو تەنوورەی دەلیـای خـەتەردا وەختم بەرمە سەر.

**[١]**

## فەڵەك بێ فرسەت

فـەڵەك بـێ فـرسەت.. فـەڵەك بـێ فـەرسەت
ئەی چەرخ چەپ گەرد، بێ سەبرو فرسەت(١)

غـــەددار بـــەدكار، بـــێوادەو بـــەینەت
پـڕ جـــەورو ســتەم بـێ مـیهرو مـۆبـەت(٢)

فـــەڵەك، وە بـــەختم چ نـــەردێ شـــانای
نـــامەی حـــەیاتم وە هـیچ نـەوانــای(٣)

مـــــەزرەعەی شـــادیم دای وە فـــەنادا
پــووشەكــەی جـەستەم وە سـۆزەی بـادا(٤)

ئـــازیزم جـــە مـــن بـــێگـانەكـەردی
شــەرت دۆســیمان جـە بــەین لابـەردی(٥)

عـــەهدو مـــۆبـــەتت نـــە ویـــرش بـەردەن
نـــە مـــەرهەم زام، نـــە دەوای دەردەن(٦)

---

**[١]**

(١) بێ فرسەت: ماوە نەدەر. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «بێ سەبرو فرسەت» هـەر «فەڵەك بێ فرسەت» دووبارەكراوەتەوە.
(٢) وادە: وەعدە، بەڵێن. بەینەت: بەین، میانە. میهر: خۆشەویستی.
(٣) نەوانای: نەتخوێنـدەوە. واتـە: ئـای فـەڵەك چ نـەردێكت هـەڵدا بـۆ بـەختی مـن، لاپەڕەی مێژووی ژیانمت بە هیچ نەخوێندەوەو گوێت نەدایە.
(٤) واتە: كێڵگەی شادیو خۆشەویستیمت فەوتاند، لەشی وەك پووش باریك بوومتدا بە دەم باوە.
(٥) واتە: ئازیزمت لێ كردم بە بێگانەو مەرجی دۆستایەتیت لە نێوانمانا نەهێشت.
(٦) واتە: بەڵێنو خۆشەویستیت لە یادی دۆست بردووەتەوە، ئێستا نە مـەڵهـەم ئـەنێتـە سەر زامەكەم وە نە دەرمانی دەردم ئەكا.

فــــیراقش فـــەرقم تـــا وە پــەنجەی پــام
ڕەنگو ریشـــەو پــۆس جـیا کـەرد تـەمام[١]

لافـــاو ئـــەسرین نـــە چـــەم هــۆر ڕێزا
وەڵگـــەکـەی ســەر تـەڵ حـەیاتم ڕێزا[٢]

هـــەر ئـــازام پــەی وێش شــینو زاریشــەن
لاڵەو نـــاڵەی ســـەخت زام کـــاریشەن[٣]

تـــۆ بــێ وەفـــاییت جــە حـــەد بــەرشیەن
بـــاکت جــە فــەریاد مــەزڵوومــان نــیەن

یـــەند ئـــازارم دای بـــێ ئــەڕوام کــەردی
وەسەن جەفاو جەور بێ مـەیلیو سـەردی[٤]

شـــوهرەی مـــەجنوونیم لوان وە عـــاڵەم
کـافر مــەگــرەوۆ پـــەی شـــوومی تـاڵەم[٥]

ڕەحـــمێ کـــەر ئـــازیز جـــە هـیجر حـاڵت
مـــانوو پـــەی تــەواف ئـــاسانەی مـــاڵت[٦]

---

(١) فەرق: تەوقەسەر. واتە: دووری ئەو یارە ڕەگو ریشـەو پێستی لەشمی لە تـەوقی سەرمەوە تا پەنجەی پێم هەموو لە یەك کردووەتەوە.

(٢) هۆرڕێزا: هەڵسا. تەڵ: لق. ڕێزا: وەری. واتە: لافاوی فرمێسك لە چاومەوە هەڵساو گەڵای سەر تەلی ژیانمی وەراند.

(٣) واتە: ئێستا هەر ئەندامێکی لەشم بۆ خۆی شین ئەکاو لە تاو ئێشی زامی سەخت ناڵەو هاواریەتی.

(٤) واتە: ئەوەندەت ئازار دام گیانت لا نەهێشتم، ئیتر با بەس بێ سزادانو بێوەفایی کردن.

(٥) شوهرە: «شهرت»، ناوبانگ. لوان: ڕۆیشتووە. مەگرەوۆ: ئەگری.

(٦) واتە: ئازیز ڕەحمێکم پێ بکە با لە تاو دووری تۆ نەمرم، بەڵکو بمێنمەوە بۆ زیارەت کردنی بەردەرگای ماڵەکەت.

[٢]

## فەسڵ نەو پایز(١)

فــــەسڵ نـــەو پـــایز تـــازەکـــەردەن مـــەیل
شەماڵ هەرزان کـەرد رشـتەی نـەو سـوەیل(٢)

گـــێج ســـەر کـاوان جـە سـەردی بـین کـەیل
بـــۆ مـــدان چـون بـۆی بـێ وەفـایی لەیـل(٣)

ئـــــازیز تـــــاقەت شـــی ئـــاخر نـــەفەسەن
رەحـــمێ کـــەر ئـــامان ئـــیستیغنا وەسـەن(٤)

بـــــەر کـــــەنار کـــزەی دەروون پـــڕ داخــــان
پـــەی تـــۆ تـەسدیعەن سـەردی لەیـلاخان(٥)

جـــــە قـــــەتازەی خـــێڵ دیـــدە سـیاوان
بـــــاقی هـــــەوارگـــەی گـــەرمیان ئـــاوان(٦)

---

[٢]

(١) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ دۆستێکی نووسیوەکە پایز داهاتووەو ئەو هەر لەکوێستان ماوەتەوە.

(٢) رشتە: رەنگ کراو. واتە: پایزی نوێ مەیلی تازەکردووەتەوەو هاتووەتەوە، شەماڵیش گەڵای ئەستێرەی سیوەیل زەرد کردووی وەراندووەو هەرزانی کردووە لە بن دارەکانا. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «شەماڵ» نووسراوە «رزان» بە مەعنای داوەرین.

(٣) مدان: ئەدەن. واتە: چاڵو شیوی شاخەکان پڕ بوون لە سـەرما، وە وەك بـێوەفـایی لەیل چۆن بۆنی دێ، ئەوانیش بۆنی سەرمایان لێ دێ.

(٤) شی: چوو. واتـە: ئـازیز دوا هـەناسەمەو تـاقم نـەماوە، کـەم بـێ پـەروا بـە لە گـەڵم رەحمێکم پێ بکە.

(٥) بەر کەنار: بیخەرە لاوە. واتـە: چش گـوێمـەدە بـە کـزەی دەروونـی دۆسـتە داخ لە دڵەکان، ئەگەر لەبەر خاتری ئەوان ناگەڕێیتەوە، هیچ نەبێ لەبەر ئەوە بگەڕێرەوە کەکوێستان ساردەو ناڕەحەتە بۆت.

(٦) ئاوان: ئاوەدانە. مەعنای ئەم شیعرە شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

گـــــەرمەسێر دڵ مـــەعدوومی نـــەبۆ
وارگــەش خـاڵی‌یـەن قـیبلەم دوور جـەتۆ(١)

کـۆچــێ کــەر وە خــەیر مـەنزڵ وە مـەنزڵ
تـــا قـــەدیم وارگـــەی گـــەرمیان دڵ(٢)

نـــەیاوایـــی، هـــای ســاقی زۆر ئـاوەرد
تـەفاوت نـە بـەین وەسـف ئـازیز کـەرد(٣)

نـــمەدۆ نـــە چـــەم تـــار دڵەی تـەنگ
بـــێ وەفـــایی دۆس سـەفاو وەفــا رەنگ(٤)

چـون تـەمام نـە تـەم غـەفڵەتـەنان گـوم
سا مەی، نەك وە جام، های وە خوم وە خوم(٥)

تــا یـــەکســـەر مـایەی خـامیم بســانۆ
چــون جــەماڵ جــەلال جــە لام بـنمانۆ(٦)

---

(١) وارگە: هەوارگە. واتە: هەوارگەکانی گەرمیان هـەموو ئـاوەدان بـوونەتەوە بـەریزی یارانی چاورەش، هەر گەرمیانی دڵی من چۆڵ چونکە تۆی تیا نیت.
(٢) واتە: کەواتە ئازیز بە خێر کۆچ بکەو مەنزڵ بە مەنزڵ بکەوە رێ تا ئەگـەیتە دڵم کـە هەواری گەرمەسێری خۆتە.
(٣) نەیاوایی: تێنەگەیشتن. مەولەوی لێرەوە رووی قسە وەر ئەچەرخێنێ و ئەڵێ: کاکەی مەیگێر تێنەگەیشتن زۆری بۆ هاوردووم بۆیە جیاوازیم خستە نێوانی سروشتەکانی یار کە باسی بێوەفایی ئەوم کرد، ئەگینا دڵدار فەرق نەکا لە نێوانی هیچ سروشتێکی یـاراو هەمووی پێ خۆش بێ.
(٤) نمەدۆ: دیاری نادا. تار: تاریك. واتە: لە بەر ئەوەیەکە تێنەگەیشتن زۆری بۆ هێناوم، وا وەفاو بێوەفایی یار لە چاوی تاریکی دڵەی خەفەتبارما وەك یەك نانوێنن.
(٥) خوم: کووپە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٦) خامی: تێنەگەیشتوویی. بسانۆ: لێ‌بسێنێ. جـەماڵ: سـروشتی مـیهرەبانی. جـەلال: سروشتی بێوەفایی. واتە: کاکەی مەیگێر لەبەر ئەوەکە بە تەواوی لە دەلیای نەزانیندا

[٣]

## فەڵەك مشناسووت

فــەڵەك مشـــناسووت كــارت چــەپ گــەردەن
دەست درازەن پـــەی زامـــان كـــەردەن(١)

چــــێش مـــبۆ ئــەی زام نـــە دڵ نـــەدەری
مـــــەحرووم وڵات قـــیبلەم نـەكـــەری؟(٢)

پـــەی تـــۆ دیـــدەنی شـــەم دیـــدارەكـــەش
پەی تۆ گـۆش‌دای راز شـەكـەر وارەكـەش(٣)

بـــەڵام بـــا وەس بـــۆ ئـــەی تـــاڵەی شـــوومە
بــــازەم دڵ وەشـــــم وەی بـــەرو بـــوومە(٤)

پـــــەی فــــێنكـــی دڵ هـــەراســـانەكـــەش
كـــــافی‌یەن تـــەواف رای ئـــاسانەكـــەش(٥)

---

☞

خنكاوم، دەس‌كە بە مەی دەرخوارددانم، بەڵام بەكووپە نەك بە پێك، بەڵكو بە یەگجاری هۆیەكانی تێ‌گەیشتنم لێ بسێنێ، وە سروشتی بێ‌وەفایی لەیلم وەك وەفاو میهرەبانی لە لا بنوێنێ.

[٣]

(١) مشناسووت: ئەت‌ناسم. درازەن: درێژە.
(٢) نەدەری: نەدەی. واتە: چی ئەبێ ئەم زامە نەكەی لە دڵم، وە بێ بەشم نەكەی لە وڵاتی یار؟
(٣) شەم: شەمع، مۆم. گۆش‌دا: گوێچكە شل كردن. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێكەوە دێ.
(٤) بازەم: لێم‌گەڕێ. واتە: چش با چاو پێ‌كەوتنی شەمعی رووی یارو، گوێ شل كردن بۆ قسەی وەك شەكر شیرینی، بۆ تۆ بێ، بەڵام با ئەم چارە رەشی‌یەی منیش بەس بێ، بێڵە لێرە بمێنمەوە، چونكە دڵم خۆشە بەم وڵاتە.
(٥) واتە: زیارەت كردنی رێگای بەرماڵیان بەسە بۆ فێنك بوونەوەی دڵم كە بە هۆی ئەوەوە ماندوو بووە.

ئازیز، کام هوون بی دیدەم پێ نەڕەشت؟
یا کام زوخاو بی دەروونم نەچەشت؟(١)

یا دڵ کام مەینەت زامت نەکێشا؟
وە کام قیمەی دەرد جەرگم نەئێشا؟(٢)

وەسەن کۆن تاقەت، بڕیان سەبووری
مەتاوون کەروون گفتوگۆی دووری(٣)

ئاخر ئازیزم تەوانام چۆنەن
تەوەن نیەنان، دڵ گۆشت و هوونەن(٤)

ئایر دان بەو تەور مۆبەت سەرای دڵ
مەیلەکەت مەندەن بێ مەسکەن خجڵ(٥)

[٤]

## فەریادم وە تۆن

فەریادم وە تۆن.. فەریادم وە تۆن
هانا هەی ئازیز فەریادم وە تۆن(٦)

---

(١) واتە: گیانەکەم کام خوێن بوو چاوم پێ نەڕشت و بە چاوما نەهاتە خوار، وەکام زوخاو بوو دەروونم نەی چەشت؟

(٢) واتە: یان دڵم مەینەتی کام زامی دەستی تۆی نەکێشاو، کام دەرد بوو جەرگم نەبوو بە قیمە لە ژێرباو پێیەوە ئێشی نەکرد؟

(٣) کۆن: کوا. بڕیان: بڕاوە. مەتاوون: ناتوانم.

(٤) تەوەن: بەرد. واتە: ئاخر ئازیز چۆن بتوانم قسە بکەم، خۆ من بەرد نیم، دڵم گۆشت و خوێنە، گۆشت و خوێنیش هەر ئەوەندەی لە تواناد هەیە.

(٥) خجڵ: داماو. واتە: بە جۆرێك ئاگرت ناوە بە دڵمەوە کە جێگەی خۆشەویستی تۆیە، کوڵ و کۆت دامراندووەتەوە، خۆشەویتیت لەبەر بێ جێگەی داماوە.

[٤]

(٦) فەریاد: هاوار.

دەردم گـــرانـــەن، ئـــەڵوەدام بـــێ شـــۆن
شـــیفام ئـــینتیزار مـــەیل بـــاڵای تـــۆن(١)

رەحـــمێ کـــەر وە دڵ خـــەستەی زارەکـــەت
بـــدیە وە روخســـار بـــێ قـــەرارەکـــەت(٢)

زەردم، زایـــیفم، بـــێ خـــوردو خـــوابـــم
ســـەر گـــەردان وێڵ بـــێ ســـەبرو تـــابم(٣)

خـــۆراکـــم خـــەفەت، ژیـــنم مـــەینەتەن
وە مـــەرگت حـــەیات وە لام زەحـــمەتەن

مـــەر تـــۆ وە رەحـــمەت بـــێ پـــایان وێت
وە لوتـــــف کـــــەرەم نـــــومایان وێت(٤)

جـــامێ جـــەو بـــادەی وەســـڵ دیـــدارت
جەو قەهقەهەی مەی شیشەی روخســـارت(٥)

بـــە وێنـــەی جـــاران ســـا پـــێم دەرەوە
عـــیسەوی ئـــاسا ئـــیحیام کـــەرەوە(٦)

(١) ئەڵوەدا: «الوداع»، ماڵاوایی. مەیل: لاکردنەوە. واتە: دەردم گرانەو ماڵاوایی کردنمی بۆ بەجێ هێشتنی دنیا لە ئەندازە دەرچووە، وە چاك بوونەوەم چاوەڕوانی لاکردنەوەیەکە لە باڵای تۆوە. مەبەسی ئەوەیەکە ئەگەر لایەك بکەیتەوە بە لاما چاك ئەبمەوەو نامرم.

(٢) واتە: رەحمێ بکە بە دۆستە نەخۆشەکەت کە هەمیشە خەفەتبارە بۆت، وە بڕوانە بە رووی خۆشەویستەکەتا کە ئارامی لێ بڕاوە بۆت.

(٣) بێ خورد: ئەوەی هیچی پێ نەخورێ. خواب: نووستن. تاب: توانا.

(٤) نومایان: ئاشکرا. مەعنای ئەم شیعرە بە دوو شیعری پاشەوەی بەسراوە.

(٥) قەهقەهە: قاقای پێکەنین. مەبەسی لە قرمەی دەمی کووپەی شەرابە لەکاتی شەراب لێ داکردنیا.

(٦) عیسەوی ئاسا: بە شێوەکەی حەزرەتی عیسا. واتە: مەگەر تۆ بە رەحمەتی نەبڕاوەی

## [٥]

### فەڵەك(١)

فــەڵەك، كــام تــیر بــی نــەدات نـە دەروون
جــە كــام زامــانت شكــایەت كــەروون(٢)

چــــون بــێ حــەدەن زام دەس تــۆ كــەردە
روو كـــــەروون ئــەو لای دۆس ویــەردە(٣)

ئــازیز، تــۆ هــەرچـەند بـێ مـەیلی كـەردی
وە بێ مـن تـەشریف ئـەو حـوزور بـەردی(٤)

مـــــن تـــەنیایی تـــۆ مـــدۆ ئـــازارم
جــــە نــــامایی وێم خــــەجاڵەت بــارم(٥)

---

☞

خۆت و بە لوتفی ئاشكرات وەك جاری جاران جامێكم بدەیتێ لە شەرابی وەسڵی باڵات و لە قرمەی شووشەی شەرابی رووت، وە وەك حەزرەتی عیسا چۆن مردووی زیندوو ئەكردوە، تۆیش من زیندوو بكەیتەوە. لە شێعری یەكەم و سێهەمی ئـەم سێ شیعرەدا ناكۆكی‌یەك هەیە لە نێوانی «مەرتۆ»و «پێم دەرەوە»و «ئیحیام كەرەوە» دا، رەنگە هەڵەی ئەوانە بێ كە نوسخەكۆنەكانیان نووسیوەتەوە. راست كردنەوەی ئەم ناكۆكی‌یە بەوە ئەبێ شیعری ئاخری بەم جۆرە بوایە:

بە وێنەی جاران پێم بـدەریوە　　　　عیسەوی ئاسا ئیحیام كەرەیوە

**[٥]**

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە سەر قەبری دۆستێكی وتووەكە نەمان توانی بزانین كێیە، وە مێژووی مردنی تیا باس كردووە بە پێی حەرفی ئەبجەد.

(٢) نەدات: نەتدا. شكایەت: شكات.

(٣) ویەردە: بەسەرچوو. واتە: لە بەر ئەوەكە زامی تۆ كردوو ئەوەندە زۆرە لە ژمارە نایەت، واباشە روو بكەم بە لای دۆستێكی كۆچ كردووەوە.

(٤) مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٥) نامایی: نەهاتن. واتە: ئازیز هەرچەند تۆ بێ‌مەیلیت كردو بێ من تەشریفت برد بۆ

☜

ئـای بـێ وەفـا وێم مـن راحـەت وەش رەنگ
تۆ دڵ تەنگ، بێ رەنگ، نەسای سەرد سەنگ[(١)]

ئـەی جـەستەی خـەستەم رەویـەش نـەفاما
دڵ وە زیـــــارەت مـــەزارت ئـــاما[(٢)]

دەروون وە ســـــۆزش ئـــایر نـــماوە
زوان پـــەی تـەئریخ پـڕ جـە دۆعـاوە[(٣)]

بـــە ئـامین جـــە شـــەڕ دۆزەخ ئـازاد بـــی
وە ســـەیر رەحـــمەت ئـەبەدی شـاد بـی[(٤)]

---

☞

حوزووری خوا، من لە بەر ئەو بێمەیلی‌یەی تۆ عاجز نیم، لەوە دڵ گرانم کە تۆ تەنیایت، وە شەرمەزارم چونکە لە گەڵت نەهاتم.

(١) واتە: ئای بێ‌وەفا خۆم، ئێستا من رەحەتم‌و رەنگم خۆشە، تۆیش دڵ گرانی‌و لە ژێر سێبەری بەردی قەبرا رەنگ لە رووت بڕاوە.

(٢) مەزار: زیارەتگا، قەبر. واتە: ئەم جەستە بریندارەی من رەوشتی نەفامی تا لە گەڵتا بێ بۆ ئەو دنیا، وا دڵم هاتە سەر قەبرەکەت بۆ زیارەت.

(٣) واتە: دەروونم بە سۆزێکی ئاگرینەوەو زمانم بە دەم دۆعا کردنەوە بۆت، ئەم شیعرەی دواوەیان وت کە ژمارەی حەرفەکانی نیوەی یەکەمی، ساڵی مردنت ئەگرێتەوە.

(٤) واتە: خوا بۆ قەبووڵ کردنی دوعای ئێمە لە شەڕی دۆزەخ ئازادت بکا، وە دڵت خۆش بکا بە تەماشا کردنی رەحمەتی نەبڕاوەی خۆی. نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە بە پێی حەرفی ئەبجەد، وە لە سەر شێوەی نووسینی کۆنی کوردی «بە آمین جە شر دوزخ آزاد بی» ئەکاتە ١٢٥٨ کە ئەبێ ساڵی مردنی ئەو دۆستەی مەولەوی بووبێ.

[١]

## قیبلەم تۆم نە دڵ...(١)

قــیبلەم تــۆم نــە دڵ.. قــیبلەم تــۆم نــە دڵ
تــا رۆی قــیامەت هــەر تــۆم ها نـە دڵ(٢)

فــیدای شــێوەت بـام جـەمین پـەڕەی گـوڵ
دڵ جــــە تـــاسەی تــۆ دایــم مــدۆ چــڵ

مــاتم وێنــەی سـەنگ، زەردم چـون خـەزان
دایــــم پــێچ مــدەو چــون مــاران گــەزان

گــەستەی مــار خـاسەن سـاتێ دوو سـاتەن
ئـەر نـەمرۆ زیـندەی رووی سـەر بسـاتەن(٣)

ئـــــەما مـــن دەردم چـــــون دەردەداران
دایم هـەر وە سۆن چـون گـەستەی مـاران(٤)

جــە هــیجران تــۆ هــەر ســات مــەرگمەن
قەترە قـەترەی زووخ نـە رووی جـەرگمەن(٥)

---

[١]

(١) ئەم قەسیدەیەم تەنها لە نوسخەکەی «شێخ جافری سید سادق»دیوە، شێوەی لەوە ناچێ کە هی مەولەوی بێ، بەڵام هەر نووسیمەوە چونکە بە هی ئەو درابـوە قـەڵەم، وە ئەگەر راست بێ هی ئەو بێ، ئەبێ لە سەرەتای شیعر وتنیا وتبێتی.

(٢) تۆم نە دڵ: تۆ لە ناو دڵمای.

(٣) واتە: ماران گەستە حاڵی زۆر باشترە لە من، چەند ساعەتێك ئازار ئەچێژێ، پاشان یا ئەمرێ یا چاك ئەبێتەوەو وەك جارانی لێ دێتەوە.

(٤) واتە: بەڵام من هەمیشە وەك ماران گەستە وامو سوێم پیا دێتەوە.

(٥) زووخ: کیم.

کـــاشکی هـــەر ڕۆ یـــەك سیا مـاریٚ
هەردوو پام مەگەست چەند جار نەك جاریٚ[١]

ســەر مـنیام وە ســای گـڵکـۆی تـازەوە
چـــەنی حـــەسرەتان بـــیٚ ئـــەندازەوە[٢]

نەك بەی تـەور دیـدەم مـەردەی زیـندە ڕەنگ
هەر ساتیٚ سەد جار سەر مـدۆم وە سـەنگ[٣]

پـــەشێوو مـــەلوول ئـــیمان هـــەردەنان
ڕویٚ تـا سـەد جـار پـەی تـۆ مـەردەنان[٤]

فـــیدای وەفـــات بـام یـا وەفـات نـیەن
یـــا خـــود بـــەدکاران مـــانیعت بـیەن

قـسیلەم تــۆ خـوداو گشت پـەیغەمەران
ئــەگــەر مــەیلت هــەن وێنــەی دڵبـەران

بکــــیانە پــــەرێم گــــاهیٚ پــــەیامیٚ
بــــنویسە وە لام دۆعــــاو ســــەلامیٚ[٥]

---

(١) کاشکی: خۆزگە. ڕۆ: ڕۆژ. مەگەست: بگەستایە.
(٢) سەر منیام: سەرم ئەنا. گڵکۆ: کۆمەڵە گڵی سەر قەبر. واتـە: بـەداخـەوە لە سێبـەری کۆمەڵە گڵی قەبری تازە هەڵکەنراوا دانرامایە.
(٣) واتە: نەك وەك ئێستا کـە بـەسەر زیـندووم‌و لە ڕاستیدا وەك مـردوو وام، وە داخ‌و خەفەت هەر سەعاتیٚ سەد جار سەرم ئەدا بە بەردا.
(٤) ئیمان هەردەنان: ئیمانم لا نەماوە داویەتە هەرد، مەبەسی ئەوەیە لە بـەر نـاڕەحەتی ئاگای لە هیچ نەماوە. ڕویٚ: ڕۆژیٚ. مەردەنان: مردووم.
(٥) لەو نوسخەدا کە ئەم قەسیدەمان لیٚ‌وەرگرت، لە پاش ئەم شیعرەوە دوو شیعری‌تر هەبوو کە لە مەعنادا جیاوازی‌یەکی وایان نەبوو لەم شیعرەو شیعری پێشەوەی. لەبەر ئەوە لەویٚدا هەڵمان گرت‌و لێرەدا پیشانی ئەدەین، وە لامان وایە دانەر ویستبێتی یا ئـەو دوو ☜

بـــا وەس بـنیشوو مـــاتو پـــەشێو حـــاڵ
بـــا وەس بکـــێشـــوو هـــەناسان کـــاڵ

پـەی چێش بـێ مـەیلیت کـەردەن وە پیشە
گـاهێ تـۆیـچ پـەی مـن ئـاهێ بکێشە

بـــاقی «والسّـــلام»، قـیبلەی مـیحرابـم
بـــڵێســـەش بـــەرزەن جـەرگ کـەبابم

[٢]

## قوربان! قوربانەن(١)

قـــوربان! قـــوربانەن، جـــەژنەن، شـادی‌یەن
دەس نـــە گـــەردەنەن، رۆی ئـازادی‌یـــەن(٢)

هەی دەس بۆس دەس بۆس وەش نـیگارانـەن
خـــەیر پـا بـۆس پـا بـۆس خـاتر دارانـەن(٣)

کـۆن کـوشتیو بـاردێی گـوڵ جـەمینانەن
هـەی سـەر، هـەی ئـەرواح دڵ خـەمینانەن(٤)

---

☞
شیعرەکە هەڵگرێو ئەمانیان لەجێ دانێ، یا بە پێچەوانەوە. ئەمەش دوو شیعرەکە:

سا ئەر زەرەی مەیل دڵداری پێتەن ... دیـدەم چـەمەڕای دەلیلی ڕێتـەن
یـــا دەڵاڵەتـــێ، یـــا وە پـەیامێ ... بکـیانە پـەرێم دوعـاو سـەلامێ

[٢]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی جەژنی قوربانەوە وتووە.

(٢) قوربانەن: چەژنی قوربانە. (٣) دەس بۆس: دەس ماچ کردن.

(٤) کوشتی: حەیوانێ بۆ سەربڕین ئامادەکرابێ. باردێ: بهێنن. واتـە: وادەی ئـەوەتەکـە یارە جوانەکـان بـپرسن کـوا حـەیوانی قـوربانی؟ بـیهێنـن بـا سـەری ببڕین، دڵدارانـی خەفەتباریش بڵێن فەرموون ئەوە سەرو گیانمان لەبەر دەستانایە.

هەرکەس گیان وە کەف پەی نیگارێوەن
هەریەك قوربانی وەفا دارێوەن(١)

سیوای سەودایی هەراسانەکەت
مەحرووم جە کەفتەی پای ئاسانەکەت(٢)

نە پەی چەم سورمەی گەرد پالاتەن
نە پەی گیان قوربان بەژن بالاتەن(٣)

مەرد پەی «ئۆسا دەی» بێ درێغەکەت
«بسم الله» تەکبیر دەس بە تێغەکەت(٤)

پەی قوربان کەردەی ناڵە نەی رەنگ بەی
چێش مبۆ ئەر بەی؟ وەی پەی من ئەر نەی(٥)

سا تۆیچ من وەرە، وە قوربانی کە
من وە قوربانی رای رەببانی کە(٦)

---

(١) مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٢) سیوا: بێجگە. کەفتە: کەوتن. واتە: هەرکەس بگری گیانی خۆی ناوەتە سەر دەستی بۆ جوانێك، وە خۆی کردووە بە قوربانی بۆ یارێك، منی نەخۆشی گرفتارت نەبێ کە بێ بەش بووم لەکەوتن لە بەر قاپی‌یەکەتا.

(٣) واتە: نە چاوم، تۆزی کەوشەکانتی دەس ئەکەوێ بیکا بەکلەی خۆی، وە نە بۆ گیانم ئەلوێ کە ببێ بە قوربانی بەژنو باڵات. مەولەوی لێرەدا ئیشارەت بۆ ئەوە ئەکا ئوسووڵەن حەیوانی قوربانی پێش سەربڕینی چاوی ئەڕێژن.

(٤) ئۆسا دەی: وەستا دەی دەس پێ بکە. واتە: مردم بۆ ئەوە بفەرمووی بە قەساب خۆی ئامادەکاو کێردەکەی بگرێ بە دەستی‌یەوەو دەس‌کا بە «بسم الله»و «الله اکبر» کردن بۆ سەربڕینم. ئوسووڵ وایە لەکاتی سەر بڕینی حەیوانی قوربانی‌دا قەسابەکە ئەڵێ «بسم الله و الله اکبر».

(٥) مبۆ: ئەبێ. واتە: چی ئەبێ ئەگەر منی ناڵە وەك قامیشی، رەنگ وەك بەی زەرد، بکەی بە قوربانی؟ هاوار بۆ من ئەگەر نەیەیت.

(٦) وەرە: بەرخ. رەببانی: خوایی. واتە: ساتۆش منی بەرخ بکە بە قوربانی رێگای خوا پەرستی.

ئەوسا تـۆیـچ پـەی ویت خـەیریت کـەردەبۆ
مـــنیچ کـــەمتەر زووخ دەردم وەردەبــۆ[١]

مــــەعدوومی بـــەدبەخت نـــاتەمامەنی
راســـەن بـــێ دەوڵەت خـــەیاڵ خــامەنی[٢]

قـــوربانی مشـــیۆ جـــە عـــەیب بـــەری بـــۆ
فـــــیدایـــی پـــەسەند رای دڵبـــەری بـــۆ[٣]

تـــۆ پـــا شکســـتەی بـــەرد هـــەردەی دەرد
چەم کۆر مەینەت، تـەن زایـف، رەنگ زەرد[٤]

خـــەیاڵێت کـــەردەن جـــە رووی نـــادانـــی
چ لایـــق وە تـــۆن روتـــبەی قـــوربانی[٥]

---

(١) واتە: ئەگەر ئەوە بکەیت خێرێك ئەکەی بۆ خۆت و کارێك ئـەکـەی مـنیش کـەمتر زووخ و کیمی دەرد بچێژم.

(٢) لێرەوە مەولەوی دەس ئەکا بە وەرام دانەوەی خۆی و ئەڵێ: هەی بەدبەخت تۆ زۆر ناتەواو و بێ کارەی، وە خەیاڵت خاوە.

(٣) مشـــیۆ: ئـــەبێ. واتــە: قـــوربانی ئـــەبێ عـــەیبی پـــێوە نـــەبێ و لە رێی دڵداری دا پێشمەرگەیەکی پەسەند کراو بێ.

(٤) تۆ بە بەردی شاخ و هەردی دەرد قاچەکانت شکاون، وە چاوت لەبەر مەینەت کوێر بووە و لەڕو لاوازی و رەنگت زەردە، ئیتر چۆن بۆ قوربانی دەس ئەدەیت؟

(٥) واتە: لە رووی بێ عەقڵی یەوە ئەم خەیاڵەت کردووە، کەی تۆ لایـقی ئـەوەی پـایەی قوربانیت بدرێتێ.

[٣]

## قیبلەم کەردەنی(١)

قـــیبلەم کـــەردەنی..قـــیبلەم کـــەردەنی
جـە نـامەت بـەی تـەور ئـیزهار کـەردەنی(٢)

نـــــویسیابێ لێش تـــۆ دڵ ســـەردەنی
دڵ هــەر یــەکــێوەن تــۆ وێت بــەردەنی(٣)

دوو حـــاڵەن جـــە لات زەنـــجیرت کـــەردەن
ئەر گەرمی گەرمەن، وەر سـەردی سـەردەن(٤)

ئـــیتر تــۆ جـــە کــەس مــەپەرسە خـــەبەر
بـــینایيم، نـــەزەر وە حـــاڵ وێت کــەر(٥)

راســـتش هــەر ئـێدەن ئـیزهارم کـەردەن
قـــەسەم بــەو کــەسە نــەزاو نــەمەرگەن(٦)

شەرتم شەرتێوەن مـەجنوون شـەرت کـەردەن
لەیـــل مـــن تـــۆنـــی تـــا وەرۆی مـەردەن(٧)

---

[٣]

(١) مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی لە وەڵامی دۆستێکیا نووسیوەکە نامەی بۆ نوسیبوو، وە گلەیی لێ کردبوو تیایدا کە دڵی ساردە.

(٢) کەردەنی: کردووتە. ئیزهار کەردەنی: دەرت بڕیوە.

(٣) نویسیابێ: نووسرابوو. لێش: لێی. بەردەنی: بردووتە.

(٤) وەر: وە ئەگەر. واتە: دڵم دوو حاڵی هەیەو هەردوو حاڵەکەی بەسراوە بە خۆتـەوە، ئەگەر تۆ بە سۆزی بۆ من، ئەوا ئەمیش گەرمە، وە ئەگەر بێ مەیلی، دیارە ئەمیش ساردە.

(٥) واتە: کە ئەوەت زانی ئیتر لەکەس مەپرسە، سەیری دڵی خۆت بکە حاڵی من ئەزانی وە تێ ئەگەی بە وەفام یا وەفام نیە.

(٦) نەزا: کەسێك لەکەسێك پەیدا نەبووبێ. نەمەرگ: ئەوەی هەرگیز نەمرێ، مەبەس خوایە.

(٧) واتە: شەرتم هەر یەك شەرتە، لەو جۆرەیەکە مەجنوون لەگەڵ لەیلی کـرد، تـۆیش لەیلی منی تا ئەو رۆژەی ئەمرین.

تـــۆ خـــواجـــەمەنی، مـــن کـــەمتەر غـــوڵام
پـــەی تـــۆ غـــوڵامـــم، بـــاقی «والسّـــلام»(١)

[٤]

## قوربان، ئەر چەندێ

قـــــوربان، ئـــەر چـــەندێ نـــامام وە لاتـــان
چـــــەم رۆشـــــن نـــەوی وە گـــەرد پـــاتان(٢)

هـــەی رۆ نـــەواچـــان ئـــەو غـــەم پـەروەردە
ئـــەڵبـــەت مـــەیلمان نـــە دڵ بـــەر کـــەردە(٣)

خـــەیر وەڵڵا تـــا گـیان نـە تـۆی قـەفەس بـۆ
کـــەمکەم ئـــامۆشـــۆی ئـامای نـەفەس بـۆ(٤)

حـــــەیاتم وە مـــــەیل بـــــاڵای یـــارانـــەن
مـــەیلم هـــەر ئـەو مـەیل هـەردە جـارانـەن(٥)

---

(١) خواجە: خاوەنی بەندە. غوڵام. بەندە.

[٤]

(٢) نامام: نەهاتم. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٣) نەواچان: نەڵێن. واتە: قوربان لەبەر ئەوەکە ماوەیەکە نەهاتووم بۆ لاتانو تۆزی ڕێگاتان چاومی ڕۆشن نەکردووەتەوە، نەفەرموون ئەڵبەتە ئەوە پەروەردەی دەستی خەمە مەیلی ئێمەی لە دڵ دەرکردووە.

(٤) قەفەس: مەبەس لەشە یا قەفەزەی سنگ. مەعنای ئەم شیعرەش لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٥) هەردە جاران: جارانی پێشوو. واتە: نەوەڵڵا هەرگیز وا تێ نەگەی کە مەیلم کەم بووەتەوە، تا گیانم لە قەفەزەی لەشما مابێ و کەمکەم ماوەی هەناسە دانم ببێ، هەر بە خۆشەوستی باڵای یاران ئەژیمو خۆشەویستیم هەر خۆشەویستیەکەی جارانە.

[٥]

## قوولەی بایەقوش(١)

قـــوولەی بـــایەقوش ســـوب وە هـــەردەوە
زام کـــۆنـــەو نـــۆم تـــازە کـــەردەوە(٢)

[٦]

## قسەیێ ئەکەم(٣)

قســـەیێ ئـــەکـــەم بـــە رێو جـــێ وێ
کـــە لەیـــلێ نـــەوو، بـــا بـــەییجێ وێ(٤)

---

[٥]

(١) وا مەشهورە بایەقوش لە هەر لایەك بخوێنێ نیشانەی وێران بوونی ئـەو شـوێنـەیە. مەولەویش جارێکیان گوێی لە خوێندنی بایەقوشێك بووە بە شاخێکەوە، بەو بونەوە ئەم شیعرەی وتووە.

(٢) مەبەسی ئەوەیە بە هۆی خوێندنی بایەقوشەوە رۆژانی رابردووی کەوتەوە یاد کە لە ئەنجامی خوێندنی بایەقوشەوە رێو شـوێنـی یـاران هـەمووی تـێك چـوو، وە بـوو بـە هەوارگەی کۆن.

[٦]

(٣) ئەحمەد پرێسی دوو خوشکی بووە: «لەیلێ»و «بەهیجە»، مەولەویش حەزی لە لەیلێ کردووە بیهێنێ، بەڵام ئەو شـووی کـردووە بـە یـەکـێکـی تر، ئـەنجا مـەولەوی ئـەیەوێ بەهیجەی خوشکی بێنێ، وە بۆ خوازبێنی ئەم شیعرە ئەنووسێ بۆ کاکەی.

(٤) واتە: کە لەیلم دەس نەکەوت ئەم خوشکەکەتم بدەرێ. ئەحمەد پرێسییش لە وەراما بۆی ئەنووسێتەوە:

قسەیێ ئەکـەی بـێ رێو جـێ بـێ    تۆ کە مەجنوونی چۆن بەییجێ بێ؟

واتە: مەجنون ئەبێ لە لەیلێ بەولاوەکەسی نەوێ ئیتر تۆ چۆن داوای بەهیجە ئەکەی؟

## [۱]

## كۆن ئەو دڵ(۱)

کـــۆن ئـــەو دڵ دیـــدەش بـــەرایـــی بـــدۆ
وه گـــــەرمیاندا بــــدیۆ وه بـــــێ تــــۆ(۲)

کۆن ئەو چـەم بـێ تـۆ بـەو رەنگ دڵشـاد بـۆ
ســـەیر مــەنزڵگـــەی ئـــێڵاخش یـــاد بـــۆ(۳)

داخ پـــەی تـــۆ چ تــەور بـێ رەحـمی کـریان
ئـــێڵات پـــەی ئـــێڵاخ بـاز ئـیزنش دریـان(۴)

هـــەوای وەرکـــاوان چـــەنی تـــۆ وەش بـــی
ســـەدای شـــەتاوان چـــەنی تـۆ وەش بـــی(۵)

تـــای چـــین چـــنوور پـــای تـــاف بـــەفراو
هـــەر وه تـــۆ مـەکـەفت نـە دەورەی کـڵاو(۶)

هـــەر گـــوڵ پـــەی دەمـاخ بـۆ عـەنبەرین بـی
دەســـتش هـەر وه دەس تـۆوه شـیرین بـی(۷)

---

[۱]

(۱) مەولەوی ئەم قـەسیدەشی لە لاونـدنەوەی «عـبدالرّحـمان»ی کـوڕی مـەحموودی یاروەیسا وتووە.

(۲) بدۆ: بدا. واتە: لەکوێیە ئەو دڵەی بەرایی بدا بڕوانێ بۆ گەرمیان کە تۆی تیا نەبێ.

(۳) واتە: لەکوێیە ئەو چاوە ئەوندە دڵی خۆش بێ تەماشاکردنی کوێستانی لە یاد بێ.

(۴) ئێڵات: عەشایر. باز: دیسانەوە. واتە: داخی بەجەرگم چ بێ رەحمی‌یەکیان لەگـەڵ کردووی، بە بێ تۆ ئیزنی چوونەکوێستانیان داوەتەوە بە عەشایرەکان.

(۵) وەرکاوان: پێ‌ینی شاخەکان. سەدا: هاژە.

(۶) مەکەفت: ئەکەوت: واتە: هەر بە تۆ ئەکەوت لە داوێنی تاڤگەی بەفراوەکـانا چڵێ چنوور بکەیتەوە بە دەوری کڵاوەکەتا بیکەی بە سەرتا.

(۷) واتە: هەر گوڵێکی بۆن خۆش، وەختێ جوان ئەبوو دەسی بە دەسی تۆوە بێ. ئەش گونجێ «دەسش»، نەبێت «دەسەش» بێ، واتە: وەختێ جوان ئەبوو چەپکەکەی بە دەسی تۆوە بوایە.

ئـیسه کـێن پـەی سـەیر دڵ نـە ئـاهەنگ بـۆ
وە بێ تـۆ دیـدەم مـەر دڵ جـە سـەنگ بـۆ(١)

کـــاڵای مـــاتەمیت پـــەی ئـــاڵەم ســـەندەن
دەشتان گشت زیندان هـەر بـەندان بـەندەن(٢)

هـــەوارگـــە مـــاتەم، گـــوزەرگە بـــێ رەنگ
شۆنەکـەم پـڕخـەم، سـەیرانگـە دڵ تـەنگ(٣)

خـــوێشـــان پـــەرێشـــان پـەڵاس نـە گـەردەن
تـــو خـوا بـازەشان چـون تـۆشـا مـەردەن(٤)

بـــێ تـــــۆ کـــاروبار بـــەرتەرەف مـــەندەن
ســـەرکار پـــاشا بـــێ مـــەسرەف مـــەندەن(٥)

بـــەزم هـــام فـــەردان بـــێ زەوقـــەن بـــێ تـۆ
نـــەزم هـــام دەردان بـــێ شـەوقەن بـێ تـۆ(٦)

---

(١) واتە: ئێستا کێیە ئارەزووی لە تەماشا کردن بێ، ئازیز مەگەر دڵ بەرد بێ بە بێ تۆ ئەو ئارەزووە بکا؟.

(٢) ئاڵەم: عالەم. هەربەندان: جێگاکانی بەستنەوەی وڵاخ. بەند: دەرگا داخراو. واتە: بـە مردنت جل‌و بەرگی مەینەتت بۆ عـالەم کـڕیوە، وە دەرو دەشت هـەمو وەك زیـندانـیان لێ‌هاتووەوکەس ناگەڕێ پیایاناو دەرگای تەوێڵەی وڵاخەکان داخراوەوکەس ناچێ بۆ راو.

(٣) شۆن: شوێن. واتە: هەوارگەکان ماتەم دایگرتوون‌و رێگـا رەنگـی تـیا نـیە، چـونکە ئەوانەی پیا ئەڕۆن هەموو رەش پۆشن، جێگاکەی منیش پڕە لە خەم.

(٤) پەڵاس: جلی ئەستوور کە هەژاران لە بەری ئەکەن. بـازەشان: لێ‌یـان گـەڕێ. واتـە: کەس‌و کارت هەمویان خەفەتبارن‌و پەڵاسێکیان داوە بە شانیانا، توخوا لێ‌یان گـەڕێ بـا خەفتبار بن چونکە تۆیان مردووی.

(٥) بەرتەرەف: خراوە لا. واتە: بە هۆی نەمانی تۆوە ئیش‌و کار هەمووی پەکی‌کەوتووەو سەرکارەکانی مەحمود پاشا بێ مەسرەف ماونەتەوە.

ئەمە ئیشارەتە بۆ ئەوەکە «عبدالرّحمان» خەزانەداری پاشا بووە.

(٦) بەزم: ئاهەنگ. نەزم: گۆرانی.

پـات وە تـۆی پـەردەی پـێواری کـێشـان
جـەکـام هـامدەمێ خـاترت ئـێشـان؟(١)

[٢]

## کام سارا؟(٢)

کـام سـارا سـەدڕەنگ نـوور پـێدا وەشـتەن؟
کشتش کشت دەشت هەر هەشت بەهەشتەن(٣)

فـەزای سـایەی عـەرش دانـای جـەلیلەن
یـا بـارەگـای پـاك «سـیّد خـلیل»ەن؟(٤)

ئـەسرار پـەردەی غـەیب مـەحرەم پـەیك
سـایەی خـودایـی، «سـلام عـلیك»(٥)

کـردەم نـالایق ئـەر وە سـڵاوەن
روو زەردیـم مـوحتاج وە یـەك جـواوەن(٦)

---

(١) پێوار: خاك.واتە: پێت کێشاوەتە ژێر پەردەی خاکەوە، نازانم دڵت لەکێ ئێشاوە وا ئەمەت کرد؟.

**[٢]**

(٢) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە سەر «سید خلیل» وتووە کە یەکێکە لە ئیمامزادەکان وە لە نزیکی قەڵای شیروانە نێژراوە. بە بۆنەی ئەوەوە وتوویەتی کە لەگەڵ جەنازەی قادر بەگی کوڕی کەیخەسرەو بەگی جاف چووە بۆ ئەوێ. ئەو قادر بەگە بە گولەی وێڵ کوژرابوو.

(٣) وەشتەن: باریوە. کشت: زەرعات. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دوایی‌دا دێ.

(٤) دانا: زانا. جەلیل: مەبەسی خوایە. واتە: چ دشتێکە ئەم دەشتەکە سەد جور نووری پیا باریوەو سەوزەگیای وەك سەوزەگیای دەشتی هەر هەشت بەهەشتەکە وایە، تەختانی بەر عەرشی خوای گەورەیە، یا بارەگای پاکی سەیید خەلیلە؟

(٥) پەیك: فروستادە. مەولەوی لێرەوە رووی قسەی ئەکاتە سەیید خەلیل‌و پێی ئەڵێ: سەلامی خوات لێ بێ ئەی فروستادەی مەحرەم بە نهێنیەکانی ئەودیوی پەردەی عالەمی غەیب، وە ئەی سێبەری خوا بەسەر خەڵکەوە.

(٦) واتە: هەرچەند بەکردەوەم شایانی ئەوە نیم رووم بێ سەلامت لێ بکەم، بەڵام خەجاڵەت‌باری‌و روو زەردیم پێویستی بە وەرام‌دانەوەیەکە لە تۆوە.

هــەر یــەك شــەفیعێش پــەی وێش ئـاوەردەن
مــن خــەجاڵەتــی وێم شــەفیع کــەردەن[١]

یــــەکــــێ جــــە دۆســـان بـــەو زام نـــۆوە
ســـــەر نــیان وە خـــاك ئــاسانەی تــۆوە[٢]

مـــیهمان غـــــەریو کــــەرەم‌سەرای تــۆن
مــوحتاج وە ڕێزەی سـفرەی ڕجـای تـۆن[٣]

درێغــــی مــەکــەر، ئــامان ســەد ئــامان
مـــەفەرما مــیهمان بــێ تــۆشــە ئــامان[٤]

یــا خــەلیل، دەخــیل کـێ عـادەت کـەردەن
تـــۆشـــە وە دەرگـــای کـــەریمان بـەردەن؟[٥]

[٣]

## گزەی چزەی

کـــــزەی چـــــزەی زام گـــرپەی گـــڕەی دڵ
داخ دووری دۆس دوور کــــەفتە مــــەنزڵ[٦]

شـــــــەرارەی ئـــــاهیر دڵەی پــــڕ دەردم
تـەپ‌و دووی دووکـەڵ هـەناسەی سـەردم[٧]

---

(١) شەفیع: تکاکار.
(٢) واتە: یەکێ لە دۆستەکانمان بە زامی تازەوە لە سەر خاکی بەر دەرگـای تـۆ سـەری داناوە.
(٣) غەریو: غەریب. ڕێزە: وردەنان. واتە: میوانێکی غـەریبە لە دیـوەخانی بـە دەس‌و دەهەندەی تۆدا، وە موحتاجی وردەنانی سەر سفرەی تکاکردنی تۆیە بۆی.
(٤) مەفەرما: مەفەرموو. ئامان: هاتووە. (٥) تۆشە: توێشوو. بەردەن: بردن.

[٣]

(٦) دوور کەفتە مەنزل: ماڵ دوور کەوتووە.
(٧) ئاهیر: ئاگر. تەپ‌و دوو: بەرز بوونەوە. مەبەسی هاوار کردنە لە دەستی ئەمانە.

جــە شــەرارەی نــار دڵەی پــڕ جــە خــەم
سۆچیا تــەمام هــەر هــەفت پــەردەی چــەم[(۱)]

بــۆی کــزەی کــەباب ســۆز ســینەی ڕێش
قــرچــەی بــرێشــتەی جــەرگ جــەفاکــێش[(۲)]

جــــۆش ســــەماوەر دیگ دڵەی تــــەنگ
لوولەی فــوارەی فــرمێسك ســەد ڕەنگ[(۳)]

واژاوش چــون تــاف ریشــەی هــەستیم بــەرد
ریشــەی کــۆتــەرەی جــەرگم بــەراوەرد[(۴)]

دڵ جــــە دەروونــدا کــــەردەن وە بــــوریان
وە مــەرگت قــەسەم تــاسەی تــۆم کــریان[(۵)]

[۴]

## کام حاڵەت

کــام حــاڵەت بــاروون وە ســەر خــامەدا
تەن چون تای "نـەی"ەن نـە تـۆی جـامەدا[(۶)]

(۱) سۆچیا: سووتا. هەفت پەردەی چەم: حەوت پەردەی چاو، زانایانی پزیشکی کۆن ئەڵێن چاو حەوت پەردەی هەیە.

(۲) برێشتە: برژاو. واتە: قرچەی جەرگی جەفاکێشی برژاو.

(۳) دیگ: مەنجەڵ. واتە: هاتنەکوڵی مەنجەڵی دڵەی تەنگم وەك سەماوەر...

(۴) واژاو: ئاوی سەرکردووی گوێ حەوز. هەستی: بوون. بەراوەرد: دەری هێنا.

(۵) بوریان: بوریانی، قاورمە. تاسە: بیرو ئیشتیاق. کریان: کراوە.

[۴]

(۶) باروون: بێنم. نەی: دەزوو. واتە: باسی کام حاڵی ناخۆشم بێنم بەسەر نووکی قەڵەمداو بینووسم؟ لەشم لە ناو جلەکانما وەك تاڵە دەزووی لەڕو لاواز بووە.

پـــێچـــیان بـــێ جـــان ڕەمـــەق ڕەمـــیدەم
ســـەرگەردان نـــە گـــێج بـــەحرەین دیـدەم(۱)

ئــەر ڕەقـــیب چـــون خـــەس نـــەیۆ وە دیـدەم
پـــێم وەشـــەن گـــێجـاو گـــێج دەریـای خـــەم(۲)

[۵]

## کۆرپە ئەگریجان

کـــۆرپـــە ئـــەگـــریجان تـــووك تـــاوس تـــار
ســـەوزە کـــڵافـــان چـــون ڕشـــتەی زەنـار(۳)

پـــەخش بـــیەن وە بـــان قـــورس قـــەمەردا
گـــا وە ڕووی مـــیحراو، گـــا وە حـــەجەردا(۴)

---

(۱) پێچیان: پێچراوە. جان: گیان: ڕەمەق: دواهەناسە. ڕەمیدە: هەڵاتوو. واتە: لەشم وەك تاڵی دەزوو پێچراوەتەوەو نیوەگیانێکم بوو ئەویش هـەڵات، وا ئـێستا لە گـێژی دەلیـای فرمێسکی چاوەکانما سەرگەردان بووم.

(۲) خەس: پڵو پووش. واتە: لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر بەدکار وەك پڵو پووووشی سەر دەلیا، نەکەوێتە بەر چاوم، پێم خۆشە هەر لە گێژاوی دەلیای خەما سووڕ بخۆم.

[۵]

(۳) تار: ڕەنگ. ڕشتە : هۆنراوە. زەنار: پشتێنێکی تایبەتە بۆ مەسیحی‌یەکان بەستوویانە بە پشت. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(۴) قەمەر: مانگ، مەبەس ڕووی یارە. میحراو: میحراب، مەبەس برۆی یارە. حـەجەر: «حـجرالاسـود»، بـەردێکـە لە دیـواری کـەعبەدا لە ئـەنجامی مـاچ کـردنی زۆردا ڕەش بووەتەوە، مەبەس لێی خاڵی ڕەشی ڕووی یارە. واتە: مووی ئەگریجە تازە ڕواوەکانی یار کە وەك پەڕی تاوس بە هەزار ڕەنگ ئەدرەوشێتـەوەو لەکـڵافـەی لوول دراوی سـەوزو زەناری هۆنراوە ئەچێ، بە سەر تۆپی ڕووی خڕو جوانیا بڵاو بووەتەوە، وە تاوێك بە سەر برۆیا ئەکەوێ‌و تاوێکی‌تر بەسەر خاڵی ڕەشی ڕوویا.

هــەر لادێ ســـەد جــار دڵەی پـر جـە دەرد
بـــەو زەنـــارەوە تـــەوافش مــەکــەرد[1]

(١) واتە: دڵەی دەردەدارم هەر تاوێ سـەد جار ئـەچوو بۆ تـەوافی ئـەو ئـەگـریجانە هەرچەند وەك زەناری ملی ئاگر پەرست وابوو.

[١]

## گەرد ئالوودەن(١)

گـــــەردئالوودەن دەور مـــــەزار لەیـــــلیٚ
ئـــاوپاشیو مـــاڵاش لازمـــەن خـــەیلیٚ(٢)

خـــادمی تـــوربەت نـــازك ئـــەندامـــان
پـــەی دیـدەو موژگان مـەعدوومی ئـامان(٣)

ئـــاوپاشی، ڕەویـــەی دیـــدەی نـــم دیـــدەم
مـــاڵاش، وەزیـــفەی مـــوژەی نـــمیدەم(٤)

گـــەردیٚ نـــیٚ وە ڕووی یـــانەی نـــۆشـــەدا
یـا خـەوشیٚ وە حـەوش عـەنبەر بـۆشـەدا(٥)

پـــاس نـــازکی لەیـــل یـــاگـــەی ویٚشـــەن
جـــای مـــوشاهەدەی قـــەیس دڵ ڕیشـــەن(٦)

---

[١]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەشی لە لاواندنەوەی عەنبەر خاتوونی خێزانیدا وتووە.

(٢) گەردئالوودە: تۆزاوی. مەزار: زیارەتگا، گۆڕ. ئاوپاشی: ئاوڕشێن. واتە: دەورو پشتی قەبری لەیل تۆزاوی‌یە، زۆر پێویستە ئاوڕشێن بکرێو گسك بدرێ.

(٣) توربەت: خاك، قەبر. موژگان: برژانگەکان. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٤) نمیدە: چەماوە. واتە: خزمەت کردنی قـەبری یـاران جـوان چـاك، بـۆ چـاوو بـرۆی مەعدوومی هاتووە، چاوی فرمێسکاویم ئاوڕشێنی بکاو برژانگی چەماوەم گسکی بداو بیماڵێ.

(٥) نیٚ: نەیەت. خەوش: پلو پووش. واتە: بۆ ئەوەی تۆز نەنیشێتە سەر ماڵی تازەی، وە حەوشی بۆن خۆشی خەوشو خاڵی تیاکۆ نەبێتەوە.

(٦) واتە: باسی ناسکیو نازاری لەیل شتێکە لە جێی خۆیایەتی، چونکە جێگـای چـاو پیٚ‌کەوتنی مەجنوونی دڵ بریندارە. ئەشگونجیٚ «نازکی» نەبیٚ «نازگەی»بیٚ، واتە: پاسی جێگەی نازەکەی لەیل...تاد.

بـەڵ بـاڵای ئـاڵاش وە سـەد خـەم‌و چـەم
باز وینوون بێ خەم وەی چەم یا ئەو چـەم(١)

مـەعدووم تـاو یـاو دووری زۆر ئـاوەرد
تـاویاو بـینای قسـەی پـەشێو کـەرد(٢)

مـاخۆلیـای یـاو ئـینە خـدێشـەن
وەرنـە ئـەی خـەیاڵ پـەرێشـان چـێشـەن(٣)

فـەسڵ وەسـڵ بـەزم خـاسەی نـەدیمان
خـاوێ بـی ویـەرد، دیـمان نـە دیـمان(٤)

بـەتاڵەن هـەوای دۆس کـۆچ کـەردە
مـەحاڵەن ئـامای عـومر ویـەردە(٥)

بـنیش نـە گـێجـاو دەریـای بـێ پـەی‌دا
نـە گـۆشـەی حـوجرەی سـەفینەی مـەی‌دا(٦)

---

(١) ئالا: جوان‌و رازاوە. خەم‌و چەم: لار بوونەوەو چەمینەوە. واتە: بـەڵکـو دیسـانەوە یـا بەچاوی وە یا بە چاوی دڵ، بە سەد سەر دانەواندن‌و چەمینەوەوە باڵای رازاوەی جوانی یار ببینم.
(٢) یاو: تای تێ‌و لەرز. تاویاوە: توایەوە. واتە: مـەعدوومی تـاوی تـێ زۆری بـۆ هـێناو توایەوەو دەسی کرد بە قسەی بێ رێ‌و جێ.
(٣) ماخولیا: نەخۆشی‌یەکە هەر کەس تووشی ببێ لە هیچ شوێنێ ئوقرە ناگرێ، مەبەس سەر لێ شێوانە. خدی: خوو. واتە: سەر لێ شێوانی نەخۆشی تا ئەمە خوویەتی قسە بە پیاو ئەبزرکێنێ، ئەگینا لەم قسە بێ‌جێ‌یانەم چیە؟
(٤) فەسل: سەردەم. نەدیمان: هاورێ‌یانی رابواردن. خاو: خەو. واتە: رۆژانـی گـەیشتن بەکۆڕی ئاهەنگی برادەران خەوێ بوو بەسەر چوو، دیمان‌و نەمان‌دی.
(٥) هەوا: ئارەزوو. ئاما: گەڕانەوە. واتە: خەیاڵێکـی پـووچە ئـینسان ئـارەزووی دۆسـتی کۆچ کردوو بکا، وە مەحاڵە تازە عومری بەسەرچوو بگەڕێتەوە.
(٦) بنیش: دانیشە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

رووت رووت ئەو جـیلوەی سـتارە کـەر راس
بـا خـودا وە «اخـلاص»، نـاخودا مـەناس(١)

تـــا بـــاد مـــراد نـــە پـــێوارەوە
کـــەی بـــدۆت ئـــاخر ئـــەو کـــەنارەوە(٢)

[٢]

## گۆشەی ئاتەش خان(٣)

گـۆشـەی ئـاتەش خـان دڵەی پڕ جـە ئـێش
پـــزیسکەی داخـــان ئـــایر وەردا تـــێش(٤)

دوود مـــاردومان دوود نـــە فـــەرقم بـــەرد
هـــەوای کـــەڵڕەمـــان خـــۆ پـامالْم کـەرد(٥)

---

(١) رووت «ی یـەکـەم» رووی خـۆت. رووت «ی دووەم» بـە تـەنها. سـتارە: ئـەستێرە. ناخودا: کەشتی‌یەوان.

(٢) پـێوار: وشـکـانی. بـدۆت: بتدا. واتـە: تـازە ئـیتر لە سـووچێکـی ژووری کـەشتی سەرخۆشی‌دا دانیشە لە ناو گێژاوی دەلیای بێ بنی قەزاو قەدەری خوادا، وە رووت تەنها بکەرە تیشکی ئەستێرەی ئاسمان کە بریتی‌یە لە شوکرانە بژێری خوا بۆ ئەوەی رێ دەر کەی، وە لەگەڵ خوای خۆتا دڵ پاك بەو کەشتی‌یەوان مەناسە، تا بزانین کەی بای بە هیوا گەیشتن لە وشکانەوە هەڵئەکاو کەشتی‌یەکەت ئەخاتە گەڕو ئەتداتە قەراخ ئاوو رزگارت ئەکا لەو دەردو بەڵایە.

[٢]

(٣) مەولەوی ئەم غەزەلەی لە وەرامی دۆستێکیا نووسیوەکە دەعوەتی مەولەوی کردبوو لەگەڵی بڕوا بۆ راو.

(٤) ئاتەش‌خان: ئاگردان.داخ: شاخ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٥) دوو: دووکەڵ. فەرق: کەللە سەر. واتە: پزیسکی شاخەکان ئاگری بەردایە سووچی ئاگردانی دڵم، وە دووکەڵی تفەنگە ماردومەکان دووکەڵی لەکەللەی سەرم دەرکردو کردی بە تۆز، وە ئارەزووی رەوگەکەڵەکان بە یەگجاری تەفرو توونای کردم.

پــــێچ مـــــدەو چـــەنی زامــــان کــاری
نـــە پــای ئــامام هــەن نــە رســتگاری(١)

فەڵەك کـەی بـەرشوون بـێ خـەم نـە دەسـتت
چێشم کـەرد، کـەی بـیم وە بـاوە کـوشتت(٢)

ئەر چون غەمزەی دۆس پڕ جـە ئێش و دەرد
چون فرسەت بازان پێش دەستی یەش کـەرد(٣)

ســــارێش مـــبۆ زام دووری تــۆ کـــەردە
مـەکـەرمێ سـەیران چـەن وەخت ویـەردە(٤)

وەر فـــرسەت نــەدا فــەڵەك وێنــەی وێش
تـۆ سـڵامـەت بـی ئـەر مـن نـەبوو چـێش(٥)

---

(١) واتە: بە دەم زامی کاریگەرەوە تل ئەخۆم، وە نە پێی هاتنم هەیە بێم بۆ لاتان، وە نە بە مردن رزگار ئەبم لە مەینەت.
(٢) بەرشوون: دەرچم. واتە: فەڵەك کەی بێخەم لە دەستت دەرچم، مـن چـیم کـرد وا ئەوەندە لەگەڵم خراپ بووی ئەڵێی باوکتم کوشتووە.
(٣) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.
(٤) مەکەرمێ: ئەکەین. واتە: ئەگەر هـاتوو فـەڵەکـی سـتەمکار، بـە چـەشنی غـەمزەی دۆستی پڕ لە ئێش و دەرد کە جار جار بەزەیی بـە دڵدارا دێتـەوە، جـارێ لە جـاران وەك هەڵباز دەس پێشخەری یەکی کردو پێش ئەوەی من رزگار بیم ئەو رزگاری کردم، ئەوکاتە زامی دووری تۆ سارێش ئەبێ و لە جیاتی ئەو هەموو ماوە بە سەرچووە سەیران ئەکەین و رائەبوێرین.
(٥) واتە: وە ئەگەر بە عادەکەی خۆی مۆڵەتی نەدام، گوێ مەدەرێ خۆت سلامەت بی برۆ بۆ راوی خۆت قەیدی چیە با منت لەگەڵ نەبم.

## [٣]

### گوم بی(١)

گــوم بـی چـون خـورشید ئـەو نـە پـڕتـەودا
گــوم بـی ئـەهل عـیلم نـە شـۆڵەی ئـەودا(٢)

نــــار مـــەکـــەرد وە ســـەر دڵ ســـازانـــەدا
نــــادر بــــی جــــە نــــاو هــــام رازانـــەدا(٣)

بـنویس وە هــوونـاو دڵ نـە پـەڕەی جـەرگ:
«نــادر شــێخ عـلی» پـەی تـەئریخ مـەرگ(٤)

## [٤]

### گێج ئاڵانی

گـــێج ئـــاڵانـــی هـــا بـــە دۆشـــەوە
وە قـــولاب چـــەنگ ئـــاهێر نـــۆشـــەوە(٥)

---

**[٣]**

(١) مەولەوی ئەم چەند شیعرەی لە لاواندنەوەو مێژووی وەفاتی شێخ عەلی تەوێڵەیی‌دا وتووەکە خەلیفەی شێخ عوسمان «سراج‌الدین»ﷺ بووە.

(٢) واتە: شێخ عەلی وەك خۆر گوم بوو لە تیشکی خۆیا، وە ئەهلی عیلمیش، کە وەك ئەستێرە وان لە تاریکی گومڕایی‌دا، لەشەفقی ڕۆژی ئەوا گوم بوون.

(٣) نار: ئاگر. نادر: نایاب. واتە: ئاگری بەردایە دڵی ئەو پیاوانەی خواکە دڵی خەڵك ڕێك ئەخەن، وە لە ناو هاوڕێ‌یان‌دا هاوتای نەبوو.

(٤) واتە: لە مێژووی مردنیا بە خوێناوی دڵ لە پەڕەی جەرگم بنووسە «نادر شێخ علی» کە بە پێتی ئەبجەد ئەکاتە ١٢٧٥.

**[٤]**

(٥) گێج ئاڵانی: ماری لە خۆ ئاڵاوی سڕ. دوش: کۆڵ، سەرشان. چەنگ: لار. واتـە: یـار قژێکی وەك ماری لە خۆ ئاڵاوی سڕی پێوەیە بـە سـەر شـانیا بـڵاوی کـردووەتەوە، بـە داوێنێکی لوولی واوە ئاگر بەر ئەداتە دڵی دۆست وەك قولاپی چەماوە لە ئاگرا سوورەوەکراو.

دوو ئـــەبرۆی ســـیای مـــژان چـــرپـــدە
نـــە رای بـــەندەگـــیش قـــەترانـــی دیـــدە[١]

[٥]

## گەرمی کورەی[٢]

گەرمی کـورەی مـەیل قـەیس چـۆڵ گـەردەن
تـــەئسیر نـــە تـــۆی دڵ لەیـــلێ ئـاوەردەن[٣]

بـــەڵ نـــە تـــاو رەقـیب وە دەرد مـەشهوورەن
وەرنـە دەردو لەیـل هـەی نـە یـەك دوورەن[٤]

---

(١) چریدە: چڕو پڕ. قەترانی: رەش. واتە: دوو برۆی رەشـی ئـەو یـارە بـرژانگ پـڕە لە رەشیدا گەیشتوونەتە رادەیەك چاوە قەترانی‌یەکانی بوون بە خزمەتکاریان.

[٥]

(٢) جارێکیان لەیلێی خوشکی ئەحمەد پرێسی نەخۆش ئەبێ، کاکیشی بەو بۆنەوە ئەم دوو شیعرە ئەڵێ:

لەیـلی شیفای زام مـەجنوون بـەختانەن    شـــیرینش دەوای فـــەرهاد رەخـــتانەن
حەیف نیەن فەڵەك چەواشەی چەپگەرد    شـــیفا وە ئـــازار، دەوایـــی وە دەرد؟

واتە: لەیلێ شیفایە بۆ زامی ئەوانەی بەختیان وەك بەختی مەجنوون وایەو عاشقی بوون، وە شیرینی‌یەکەی دەرمانە بۆ ئەوانەی چەرخیان وەك فەرهاد بۆ رێ کەوتووە. جا توخوا هەی گەردوونی سەرلاری چەپگەرد حەیف نیە شیفا تووشی ئازارو دەرمان تووشی دەرد بکەی؟

مەولەویش بۆ وەرامی دانەوەی شیعرەکان ئەحمەد ئەم دوو شیعرە ئەڵێ:

(٣) واتە: گەرمی کوورەی مەجنوونی چـۆڵ‌گـەردە، کـاری کـردووتە سـەر دڵی لەیـلێ‌و نەخۆشی خستووە، ئەگینا لە خۆیا نەخۆشی نیە.

(٤) واتە: بەڵکو لە تاو بەدکار وا ناوبانگی نەخۆش کەوتنی دەرچووە، ئەگینا دەردو لەیل لە یەك دوورن.

[٦]

## گۆشەی سیاماڵ(١)

گـــۆشـــەی ســـیاماڵ هـــۆرداو دیـــاوە
چـــون مـــانگ نـە گـۆشـەی هـەور سیاوە(٢)

بـــە خـــودا قـــەسەم پـاسەم ئـومێدەن
«حُـــورٌ مَـــقْصُوراتٌ فِـــی اَلْـخِیام» ئـێدەن(٣)

[٧]

## گەر زەڕەی

گـــەر زەڕەی شـــعوور هـــەیە پـێتـەوە
کـــە وتـــیان خـــودا ئـــەبڕێتـــەوە(٤)

[٦]

(١) مەولەوی جارێکیان ئەڕوا بۆ دیدەنی مەحمود پاشای جاف، کە ئەگاتە بەرەوە خانمێکی جوان لای دەوارەکە بەرز ئەکاتەوە سەیرێکی مەولەوی‌و هاوڕێ‌کانی ئەکا، مەولەویش کە ئەمە ئەبینێ ئەم دوو شیعرە ئەڵێ:

(٢) سیاماڵ: رەشماڵ، دەوار. هۆردا: هەڵدایەوە. دیاوە: روانی. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) پاسەم: وەهام. واتە: گۆشەی دەوارەکەی هەڵدایەوەو وەك مانگ لە سووچی پەڵە هەوری رەشەوە دەرکە وێ، روانی، قەسەم بە خوا هیوام وایە خوا ئەمەی مەبەس بووبێ کە لە قورئانا تەعریفی حۆری‌یەکانی بەهەشتی کردووەو فەرموویەتی ﴿حُورٌ مَقْصُوراتٌ فِي الْخِيامِ﴾. یەعنی: بەهەشتی‌یەکان چەند حۆری‌یەکیان هەیە هەمیشە لە ناو خێوەتان‌و هەرگیز لێی دەرناچن.

[٧]

(٤) واتە: ئەگەر تۆسقاڵێ هەست‌و تێ‌گەیشتنت پێوە بێ، لەکاری خوادا قسە ناکەی چونکە وتیان خوا ئیتر هیچی تیا نامێنێ‌و ئەبێ ئادەمیزاد پێی رەزامەندبێ.

**[١]**

## لوای بینایی(١)

لوای بـــــینایی دیـــدەی دەروێشـــان
ئــاسان کــەرد جــە لام مـوسیبەت کـێشـان(٢)

خــەم، خــەفەت، مــەینەت، هــەناسان ســەرد
هــەر کــام مــەیۆ ،بـۆ، سـەفاییش ئـاوەرد(٣)

ئــــەر کـــەفتەو مـــەحشەر دیـــن جـــەماڵت
وەر نـــــمەدۆ دڵ دامـــــنەی خـــــەیاڵت(٤)

نـــاپەیدای تـــەوەن دوور بـــێ ســـەفەرەن
ســـەفەر بێ لەشکـر، لەشکـر بـێ سـەرەن(٥)

مـــەیدان نـــە دیـدەی ســوپایی تــارەن
شــۆڵەی تـاس کــڵاو تـۆ نــە پــێوارەن(٦)

---

**[١]**

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە لاواندنەوەی قادر بەگی کەیخەسرەو بەگی جافا وتووەکە بەگوللەی وێڵ کوژراوە.

(٢) لوا: ڕۆیشتن. واتە: ڕۆیشتن و مردنی قادر بەگ کە بینایی دیدەی هەژاران بوو، هەموو دەردو مەینەتێکی لا ئاسان کردم، چونکە لە هەموویان سەخت‌تر بوو.

(٣) مەیۆ: دێت. بۆ: بێت. واتە: ئیتر لەمەو پاش خەم و خەفەت و مەینەت و هەناسە سارد هەکامێکیان دێت بێت ترسم لێی نیە.

(٤) کەفتەو: کەوتەوە. دین: دیتن وەر نمەدۆ: بەرنادا. واتـە: هـەرچـەند چـاو پـێکـەوتنی جوانیت کەوتەوە ئەو دنیا، بەڵام دڵم داوێنەی بیر لێ کردنەوەت بەرنادا.

(٥) ناپەیدا: دیارنەبوو. تەوەن: بەرد. واتـە: ئـەو کـەسەی کـە دیـار نـیەو کـەوتووەتە ژێر بەردی ئەلحەد، بە بێ ئەوە چووبێ بۆ سەفەر دوور کەوتووەتەوە لێمان، وە بـێ لەشکـر سەفەری کردووەو لەشکرەکەی بێ سەفەر ماوەتەوە.

(٦) تار: تاریك. شۆڵە: شوعلە، تیشك. تاس‌کڵاو: کڵاوی ئاسنین کە لە جەنگا ئەکـرێتـە سەر. واتە: لەبەر ئەوەکە تاس‌کڵاوەکەی تۆ کەوتووەتە ژێر خاك و دیار نیە تـا دنـیا روون بکاتەوە، مەیدانی جەنگ لە رووی لەشکرا تاریك بووە.

تـــا فــەڵەك مــەودای نــەی تــۆ شــاردەوە
داوودی ڕەواج پــــــــەیدا کـــــــەردەوە[١]

تـــا شـــێر بـــەیداخ تــۆ ئــاما وە بــەر
نە گۆشــەی بــێشــەی نــەی فــەوج لەشکــەر[٢]

دلێران «یــــا شـــێر ئــــامان» مــــوانــــان
شــێران وێنــەی شــێر بــەیداخ مــنمانان[٣]

ئـــیسە عـــام کـــەردەن مــەرگت دلێری
شـــێر بـــەیداخـــان مـــنمانان شــێری[٤]

وەهـــار نـــەوگوڵان نــە تــۆی خــاك بــەر کــەرد
جە بەدبەختی من تـۆ وە تـۆی خـاك بـەرد[٥]

---

(١) مەودا: تیژی. نەی: ڕم. داوودی: جۆرێکی بە نرخی کراسی زرێیە. واتە: تا مابوری ڕمی تیژت هەموو کراسێکی زرێی ئەسمی، لە بەر ئەوەی لیباسی زرێ کەڵکی هیچی نەئەگرت‌وکەس نەی ئەکرِی، بەڵام هەرکە تۆ نەمایت‌و ڕمە تیژەکەت نەما لە ناوا، کراسی زرێی داوودی ڕەواجی پەیدا کردەوە.
(٢) شێر بەیداخ: ئیشارەتە بۆ ئەوەکە جاران ئاڵای جافەکان وێنەی شێرێکی پێوە بـووە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٣) موانان: ئەخوێنن. منمانا: ئەنوێنن. واتە: تا لە سووچی دارستانێ کۆمەڵە ڕمی تـیپی لەشکرەکەتەوە شێری بەیداخەکەت دەرئەکەوت، قارەمانان هەموو «ئامان هەی شێر» یان بوو، وە سەریان بۆ دائەناواندی، وە وەك وێنەی شێری سەر بەیداخەکە بێ گیان‌و هیچ لێ نەهاتوو بوون.
(٤) واتە: کەچی ئێستا مردنی تۆ ئازایی بڵاو کردووەتەوەو شێری سەر بەیداخـەکـان لە وێنەیەکی ڕووت بەولاوە نین، خۆیان بە شێری ڕاستەقینە ئەزانن.
(٥) واتە: بەهار گوڵی نوێی لە ناو خاك هێنـایە دەرەوە، کـەچی لە بـەدبەختی مـنا تـۆی خستە ناو خاك کە گوڵی منی. لەم شیعرەوە وا دیارەکە قادر بەگ لە بەهارا کوژراوە.

وادەی خــــاو نـــیەن، وادەی شکـــــارەن
دەشتەکەی پـای هـەرد «شـاکـەڵ» دیـارەن[(١)]

بـــــەو هــیلال نـــاڵ کـــومەیت خـــۆش دەو
مـــانگ شـادیو زەوق هـەردان بکـەر نـەو[(٢)]

حـــەلق جـــەیرانـــان تـــەشنەگـــی بـێ شـۆن
ئـــینتیزار ئـــاو ســـاف تـــێغ تـــۆن[(٣)]

تـــاریك بـــی شـــەوگار شـــەو زیـــندەداران
گـــیریا تــــەمام بــــەدر روخســـــاران[(٤)]

شـــێویـــا یــــانەی دەروون پـــڕ خـــاران
کـــنیا دەســـتەی زوڵف شـیرین نـیگاران[(٥)]

ســیاماڵ مـــاتەم، ســـەر کـــۆمـــار دڵ تـەنگ
تـــەڵەبـــە پـــەشێو، مـــەدرەسە بـــێ دەنگ[(٦)]

---

(١) شاکەل: دێیەکە لە ناوچەی شیروانە لە قەزای «کفری». واتە: وادەی خەوی مەرگ نیە، وەختی راوە، هەستە دەشتی داوێنی هەردەکان شاکەل دیارەکە جێگای راوتە.

(٢) کومەیت: ئەسپی کوێت. خۆش‌دەو: باش غارکەر. نەو: نوێ. واتە: هەستە سوار بە بچۆ بۆ راو، وە بە نەخشی ناڵی ئەسپەکوێتە خۆش غارەکەت کە لە مانگی یەك شەوە ئەچێ، هەردەکان نیشانە بکەو، مانگی شادیو زەوقیان تازەکەرەوە.

(٣) حەلق: قوڕگ. جەیران: ئاسك. تـەشـەنەگـی: تـینوویەتی. واتـە: تـینوویەتی قـوڕگی ئاسکەکان لە رادە دەرچووە، چاوەڕوانی ئاوی سافی تێغی تۆن کە بـدەی لە گـەردنیانو خوێنیان بڕێژیو قوڕگیان تەڕ ببێ.

(٤) شەو زیندەداران: ئەوانەی شەونشینی ئەکەن. بەدر: مانگی چواردە. واتە: بـە هـۆی مەرگتەوە شەوی شەونشینی کەران تاریك بوو، چونکە تۆ مایەی رووناکی شەویان بووی وە تۆیش نەمای، وە بە تەوای مانگی چواردەی رووی نازداران گیرا.

(٥) کنیا: هەڵکەنرا. واتە: خانووی ئەو دۆستانەی کە بۆ تـۆ پـڕە لە دەرك وێران بـوو، وە نازداران لە بەر مردنی تۆ ئەوەندە گریان چەپکی زوڵفی خۆیانیان لە بن هەڵکێشا.

(٦) سەرکۆمار: سەرۆکی هۆز. واتە: بە هۆی مـەرگی تـۆوە نـاو دەوارەکـان تـەعزیەیەو سەرۆك هۆزەکان خەفەتبارنو فەقێکان پەشێونو حوجرەکانیان دەنگی خوێندنی لێوە نایەت.

هـــیچ دیـــار نـــیەن کـــەست جـــەویر بـــۆ
مشـــێو گـــەرمیان خـــاکش دڵگـــیر بـــۆ(١)

هەر ساڵێ چەند وەخت سەر هەرد لەیلاخ
وە بۆی هام دەمیت دەماخ مەکەرد چاخ(٢)

دڵەی گـــەرمیان نـــەو چـــەند وەخـــتەدا
مـــەسۆچـــیا وە جـــۆش دووری سەختەدا(٣)

ئـــاخر گـــەرمیان ســـارێش کـــەرد زامت
بـــی وە هـــامدەمت تـــا رۆی قـــیامت(٤)

دەرد گـــــــەرمیان وە ئـــــــێلاخ یـــــاوا
گـــــەرمیان وە حـــــاڵ ئـــێلاخ دڵ تـــاوا(٥)

مـــەرگ بـــێ وادەت عـــەجەب رەنگـــێ رەشت
شین وست ئەو دنیا، شـادی ئـەو بـەهەشت(٦)

دنـــــیا شـــــینشەن نـــــیەنی تـــــێش‌دا
بـــەهەشت شـــادیشەن مـــەگـــێڵی پێش‌دا(٧)

---

(١) مشیۆ: ئەشێ. واتـە: لەوە نـاچی کـەست لە بـیر بـێو نـیازت هـەبێ سـەرکەوی بـۆ کوێستان، وا دیارە ئەمساڵ گەرمیان خاکی دڵگیرە بۆیە وا بە جێی ناهێڵیت.
(٢) چاخ: قەڵەو. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٣) نەو: لەو. مەسۆچیا: ئەسووتا. واتە: سەر هەردی کوێستانەکـان هـەر سـاڵی چـەند مانگێك دەماخی خۆیان بە هاوڕێیەتی تۆ قەڵەو ئەکردەوە، وە لەو چەند مانگەدا لە تاو جۆشی سەختی دووری تۆ ئاگری تێ بەر ئەبوو، وە ئەسووتا.
(٤) قیام: زیندوو بوونەوە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.
(٥) تاوا: توایەوە. واتە: ئاخری گەرمیان زامی دووریتی سارێژ کردو گرتیتیە لای خۆی تا رۆژی قیامەت، کوێستانیش تووشی دەردەکەی جارانـی گـەرمیان بـووە، وە ئـەوەندەی بەزەیی بەکوێستانا هاتەوە دڵی توایەوە بۆی.
(٦) وست: خست. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٧) نیەنی: نیت. مەگێڵی: ئەگەڕێیت. واتە: مەرگی ناوەختت رەنگێکی سـەیری رشت،

نـــازاران پـــڕ داخ تـــۆ تـــەشریفت بـــەرد
حـــووران وە پـــەرداخ تـــۆ تـــەشریفت بـــەرد[١]

هــــەر یـــەند رۆ رۆم کـــەرد رۆم نـــەبڕیـــاوە
ئـــای رۆم بـــڕیـــاوە، رۆم نـــە بـــڕیـــاوە[٢]

تـــاکـــەی چـــەنی شـــین رۆ وە ســـەر بـــەروون
بـــا وە ســـــۆز دڵ دۆعـــــایێ کـــەروون[٣]

ئـــەر ئـێمـــە مـــەحرووم دیـــنت بـیم یـــەکســـەر
تـــۆ شـــاد بـــی وە دیـــن خـــوداو پـــەیغەمبەر[٤]

[٢]

## لوقمەکەی ماساو[٥]

لوقـــمەکـــەی مـــاساو قـــووڵ دەریـــای مـــەیل
لوخت ســـای کـــۆڵەی ســـارای دەرد لەیـــل[٦]

---

☞

شینی خستە دنیاو بەهەشتی پڕ کرد لە خۆشی. ئێستا دنیا شین‌و زاری‌یەتی چونکە تۆی تیا نیت، بەهەشتیش شادی‌یەتی چونکە تۆی پیا ئەگەڕێت.

(١) واتە: جوانان دڵیان پڕە لە داخ‌و خەفەت، حۆری‌یەکانیش خۆیان رازاندووەتەوە، چونکە تۆ ئەم دنیات بەجێ هێشت‌و چووی بۆ بەهەشت.

(٢) رۆ «ی یەکەم‌و سێهەم»: رۆ رۆ. رۆ «ی دوهەم»: رۆژ. واتە: ئەوەندە رۆ رۆم کرد رۆژم دوایی هات، کەچی رۆ رۆم هەر نەبڕایەوە.

(٣) کەروون: بکەم. واتە: تا کەی رۆژم بە شین کردنەوە بەرمەسەر، با بە سۆزی دڵەوە دوعایەك بکەم. دوعاکە لە شیعری پاشەوەدا دێت.

(٤) بیم: بووین. واتە: هەرچەند ئێمە تێکڕا لە دیتنت بێ‌بەش بووین، قەیدی نیە، خوا بکا تۆ شاد ببی بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەرﷺ.

[٢]

(٥) مەولەوی ئەم پارچە هەڵبەستەی لە وەڵامی «یونس» ناوێکی ئاشنایا وتووە.

(٦) ماساو: ماسی. لوخت: رووت‌و قووت. کۆڵە: کوولەکە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

یــاوا پــێم نــامەی وەش تــەحریرەکــەت
ئینشای دەروون سـۆز پڕ تـەئسیرەکـەت[(١)]

حـــاسڵش نـــەبۆ فـــەرامـــۆشـــیمان
وادەی بـــەزم گـــەرم بـــادە نـــۆشـــیمان[(٢)]

چـــەنی هـــام فـــەردگەرد جـــیایی شـــیەن
مـــن‌و تـــۆ جــە بــەین مـــن‌و تـــۆ نـــیەن[(٣)]

ســـاقی جـــام وە دەم ئـــەی یـــەك مـــەڕێزۆ
نـــەشئەی مـــەی نـــە دڵ ئـــەو یـــەك مـــەخێزۆ[(٤)]

بەڵ نەی تەن ئـەی گـیان تـۆنـی کـەری عـەزم
مەی نۆشـــی‌و، جـەستەی مـن زەمـین بـەزم[(٥)]

---

(١) واتە: ئەی پارووی دەمی ماسی ناو دەلیای قووڵی خۆشەویستی، وە ئەی بە رووت‌و قووت داکەوتوو لە سێبەری دارکوولەکەی چەشتنی دەردو مەینەتی لەیل‌دا. مەولەوی لە شیعری یەکەم‌دا ئیشارەتی بۆ حیکایەتەکەی حەزرەتی «یونس» کرد کە قەومەکەی فڕێیان دایە ناو دەلیاو ماسی قووتی داو پاشان هەڵی هێنایەوەو فڕێی دایە گوێ ئاو، ئەویش بە رووتی لە سێبەری دارکوولەکەیەکا لێی راکشا.

(٢) حاسڵ: پوختە. واتە: پوختەی نامەکەت ئەوەبوو لەکاتی ئاهەنگی گەرمی مەی خواردنەوەدا لە بیرت نەچین. مەولەوی لە شیعرەکانی لە مەو پاش‌دا وەرامی قسەکانی ئەو ئەداتەوە.

(٣) شیەن: نەماوە. واتە: لەگەڵ هاوڕێیەکی وەکو تۆ دا تۆزی جیایی نەماوە، وە لە نێوانی من‌و تۆدا من ـ من‌و تو ـ تۆ نیە.

(٤) مەڕێزۆ: دائەکا. مەخێزۆ: هەڵئەستێ. واتە: من‌و تۆ ئەوەندە یەکین، مەی‌گێڕ مەی ئەکاتە دەمی یەکێکمان، ئەوی‌ترمان نەشەی خواردنەوەی لە دڵی بەرز ئەبێتەوە.

(٥) واتە: گیانەکەم بەڵکو تۆی لە لەشی منا نیازی مەی خواردنەوە ئەکەیت، وە لاشەی من جێگای ئاهەنگی خواردنەوەیە.

چون کەوت ئەو دەورەی پیاڵەی بێ گەرد
نە رووی ئەی زەمین نەقش ئەی چەند فەرد:(١)

بەزمەن، یاران مەست، بادەی باقی‌یەن
مەعدووم ئەرزەکەی بەزم ساقی‌یەن(٢)

یا باڵای ساقی وەی لادا خەمێ
یا جام جەو باقی پەی زەمین نمێ(٣)

[٣]

## لە سەدای نەبات(٤)

لە سەدای «نەبات» لە چریکەی «فەرەج»
لە سەر مەلاو شێخ نەماوە حەرەج(٥)

(١) واتە: چونکە لە گێرانی پیاڵەی شەرابی بێ گەردەوە نەخشی ئەم دوو شیعرەی پاشەوە کەوتە سەر زەوی کە جەستەی منە.
(٢) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.
(٣) خەمێ: لار بوونەوەیەك. واتە: ئاهەنگی خواردنەوەیە... یاران سەرخۆشی شەرابی خۆشەویستی هەرگیز نەبڕاوەن، مەولەویش مەیدانی بەزمی مەیگێڕە... سا توخوا کاکەی مەیگێڕ لایەك بەم‌لادا بکەرەوەو پەرداخێکمان بدەرێ... تۆیش ئەی پەرداخی مەی لەو پاشماوەیەی بنەکەت دڵۆپێ بڕێژە بەسەر زەوی‌یەکەدا کە جەستەی مەعدوومی‌یە.

[٣]

(٤) مەولەوی رۆژێکیان لە هەڵەبجە بە لای زەماوەندێکا تێ‌ئەپەڕێ، سەیر ئەکا ژنێکی دەنگ خۆش «نەبات» ناو گۆرانی بۆ ژنانی هەڵپەرکێ‌کەر ئەڵێ، لەولاشەوە پیاوێکی دەنگ خۆشی «فەرەج» ناو گۆرانی بۆ پیاوان ئەڵێ... لایان ئەوەستێ‌و دەس ئەکا بە سەیر کردنیان، وە بۆ پاساودانی ئەو سەیر کردنەی نامەحرەم ئەم شیعرە ئەڵێ:
(٥) واتە: لە خۆشی دەنگی «نەبات»و چریکەی «فەرەج» دا مەلاو شێخ هەموو شێت بوون، وە هەرچی بکەن گلەیی‌یان لێ ناکرێ، چونکە شێت تەکلیفی لە سەر نیە.

## [۱]

## من پێسەم زانا[١]

مـــن پـــێســـەم زانـــا تـــۆ پـــڕ مـــەیلەنی
دەروون جـــە بـــادەی مـــۆبـــەت کـــەیلەنی[٢]

دووی کـــوورەی دووریت مشـــۆ وە تـــوونْدا
بـــەردت دان وە پـــای وەفـــای مـــەجنوونْدا[٣]

ئـــیسە دیـــدەکـــەم ئـــێد دیـــاری‌یەن
ئـــەر چـــێوێت کـــەم بـــۆ وەفـــاداری‌یـــەن[٤]

ئـــامۆ شـــۆی وە گـــەرم یـــاران گـــیانی
وە بـــار خـــاتر نـــازك مـــزانـــی[٥]

بـــۆی بـــێ وەفـــاییت چـــون بـــۆی وەر زاخـــان
مـــدۆ نـــە دەمـــاخ بـــەختان قـــوڵاخـــان[٦]

شـــەرت بـــۆ تـــا وەی دەرد دڵەی تـــەنگەوە
ســـەر بـــنیەو وە ســـای ســـیا ســـەنگەوە[٧]

---

### [۱]

(١) مەولەوی لەم قەسیدەیەدا گلەیی لە بێ وەفایی دۆستێکی ئەکا.

(٢) پێسەم زانا: وامزانی. واتە: من وام زانی تۆ زۆر بە وەفای، وە دەروونت پڕە لە بادەی خۆشەویستی.

(٣) مشۆ: ئەچێ. واتە: وامزانی لە تاو دووری دۆستان دووکەڵی کوورەی شەوق‌و سۆزت تووناو توون ڕۆیشتووە، وە ئەوەندە بە وەفای بەردت داوە بە قاچی وەفای مەجنوونْدا، وە وەفای ئەو لە چاو هی تۆدا هیچ نیە.

(٤) چیوێت: شتێکت. واتە: ئێستا دەرکەوتووە ئەگەر شتێکت کەم بێ هەر وەفایە، وە هیچ وەفات نیە.

(٥) واتە: هاتوچۆ کردنی گەرمی دۆستان بە باری سەر دڵی ناسکت ئەزانی.

(٦) قوڵاخ: بەرەڵڵا. واتە: بۆنی بێ وەفاییت وەك بۆنی زەردوماکان ئەدا بە لووتی ئەو دۆستانەدا کە بەختیان وێڵ بووە.

(٧) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

هــــەنی پـــــێشـــانی ڕەنگ وە خـــەزان دەر
پـــای ئـــاسانەکـــەت نـــەگـــێڕۆ نـــە زەر[١]

دیـــدەی کـــۆر هـــیجر بـــاڵای بـــێ خـــەوشت
نـــەوینۆ ســـورمەی گـــەردەکـــەی کـــەوشت[٢]

جـــــە شـــــنۆی نـــاڵەی شـــەو ســـۆز زاری
ســـــەگ ئـــاسانەت نـــە بـــۆش بـــێداری[٣]

چـــەم نـــم نـــەدۆ تـــۆز حـــەریم چـــون جـاران
هـــــەرزان کـــەرۆ بـــاد دەوا پـــەی یـــاران[٤]

جە ســای دووی دەروون ســەودایــی بــێ شــۆ
نەڕەنجۆ سەفحەی لای ســەوزەی وەش بــۆ[٥]

دایـــــم هـــــەوای پـــــار پـــڕ بـــەینەتت بـــۆ
نـــــەوینی کـــەسێ جـــای مـــەینەتت بـــۆ[٦]

---

(١) پـێشـــانی: نـــاوچاو. زەڕ: زێڕ، ئـاڵتـوون. واتـە: شـەرت بـێ تـا بـەم دەردەی دڵەی خەفەتبارمەوە ئەچمە ژێر خاك، ناوچاوی لە خەفەتا زەرد بووم کە وای لێهاتووە ڕەنگی زەرد ئەبەخشێ بە گەڵای پایزان، جارێکی‌تر بەردەرگاکەت نەگرێتە زێڕ. مەبەسی لەوەیە سەر نەنێتە سەر خاکی بەردەرگایان.

(٢) واتە: مەرج بێ تا ئەمرم جارێکی‌تر چاوم کە لە دووری باڵای بێ عەیبی تۆ دا کـوێر بووە، خۆڵی ژێر کەوشەکەت لە جیاتی کلە بە خۆیەوە نەبینێ.

(٣) واتە: وە ئەبێ سەگی بەردەرگات لە نـاڵەی شـەونخوونی مـن خـەبەری نـەبێتـەوە، مەبەسی ئەوەیە ئەبێ لە تاو دووری نەناڵێنێ.

(٤) حەریم: حەوش. باد: با. واتە: وە ئەبێ چاوم فرمێسك نەڕێژێو تۆزی حەوشەکەت ئاوڕشێن نەکا، بۆ ئەوەی دەرمان هەرزانکا بۆ یارانو ئەو تۆزە بێنێ بە رووماناا.

(٥) نەڕەنجۆ: نەڕەنجێ، ئازاری پێ‌نەگا. واتە: وە ئەبێ لە سێبـەری دووکـەڵی دەروونـی نەخۆشی لە ئەندازە دەرچووما تەختی رووی لای زوڵفی بۆن خـۆشت ئـەزیەت نـەبێ. مەبەسی ئەوەیە لە بەر دەردی دووری هەناسە هەڵناکێشێ لە رووبا.

(٦) واتە: با تۆیش هەمیشە ئارەزووی دیتنی دۆستی بە وەفات بێو کـەس شك نـەبەی سکاڵای دەردو مەینەتی خۆتی لا بکەی.

بــــڵێســـــەت بـــــەرزان بگـــــێرۆ پـــەرێم
هــەر بــواچـــی ئـاخ پـەی داخـداری وێم[١]

مـــــن وێڵ وێڵ گـــێڵوو هـــەردەو هـــەردەوە
هــــەرد دەرد بـــۆ بـدۆم وە دەم دەردەوە[٢]

تـــا رێزۆ وە خـــاك دڵ چـــون پــڕ داخـــان
چەند داخ شین وە خاك، ئێدیش بان داخان[٣]

[٢]

## ماتەمی و وەهار[٤]

مـــاتەمی و وەهـــار؟ بـــێ شـــەوقی و نـــەوگوڵ؟
مەلوولی و گـوڵزار؟ بـێ زەوقـی و بـوڵبـوڵ؟[٥]

سوب بـۆی وەش نـەسیم چـون هـەردەجاران
نـــــمەدۆ نـــــە کــــاخ دەروون یـــــاران[٦]

---

(١) بواچی: بڵێی. واتە: وە با بڵێسەی گەرمی دڵت لووتکەو بەرزاییەکان بگرێ لە تاو دووریم، وە هەر ئاخ هەڵبکێشی بۆم.

(٢) بدۆم: بمدا. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بەشیعری پاشەوەیەوە.

(٣) رێزو: داوەرێ. شین: رۆیشتن. واتە: منیش بە وێڵی بە هەردەکانا بگەڕێم و دەرد بمدا بە دەم دەردی ترەوە تا دڵم وەك دڵی دۆستە دڵ پر لە داخەکان بوەرێتە خاك، قەیدی نیە هەزاران داخ براونەتە گڵ، با داخەکانی دڵی منیش بچنە سەر ئەو داخانە.

[٢]

(٤) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە لاواندنەوەی ئەمنە خانی کچی قادر بەگی کەیخەسرەو بەگی جافا وتووە کە خێزانی بارام بەگی جاف بووە، وە لە ساڵی ١٢٩٠ی هیجری‌دا مردووە.

(٥) واتە: ئەمانە موناسەبەتیان بەیەکەوە نیە، نازانم چۆن یەکیان گرتووە؟.

(٦) واتە: بۆنی خۆشی نەسیم ئێستا وەك جاران بە بەیانیانا نادا لە کۆشکی دەروونی یاران.

داخــۆ نــەی ســەروەخت فــەزای وەهـاردا
کــام تــەم نــە ســەر هــەرد قـەزا دیـاردا[۱]

ســەدای «هــای دێـای خـەمان» هـەرزانـەن
ســـــەڵای واوەیــلای بــادام تــەرزانـــەن[۲]

مەر گـوڵشـەن حـوسن شـای گـوڵ ئـەندامـان
جـە وەیشـوومەی مـەرگ خـەزانش ئـامان[۳]

ئـەو بــاڵای ئــاڵای تــەرز ســەهی ســەرو
پــــێوە هــێلانــەی دڵان چــون تــەزەرو[۴]

کــــــنیاو خــــەمیاوە وە دەم رێشــــەوە
تــەزەرو ئــاسا نــیشت وە ســای وێشـەوە[۵]

---

(۱) داخۆ: ئاخۆ. واتە: ئاخۆ لەم دەمی بەهارە فراوانەدا کـام تـەم دیـاریی داوە بـە سـەر هەردی قەزاو قەدەرەوە.

(۲) دیبا: پارچە. واتە: هاواری «هەی پارچـەی خـەفەت» بـە زۆری ئـەبیسرێو دەنگـی شینو زاری کردنی یارەکان کە باڵایان بەرزە وەك لقی بادەم، دنیای پڕ کردووە. مەبەسی ئەوەیە بە هۆی مردنی ئەمنە خانەوە ئەبێ دۆستان بەرگی عازیەتی لەبەر کەن، لەبەر ئەوە فرۆشیار جلی رەشیان بەزۆری هێناوە بۆ فرۆشتن.

(۳) مەر: تمەز. گوڵشەن: باخچە. وەیشوومەن: بای سارد. واتە: تمەز ئـەمە هـەموو هـی ئەوەیە باخچەی جوانی یار کە شای نازارە لەش وەك گوڵەکانە، بـە هـۆی بـای ساردی مەرگەوە پاییزی هاتووەو گەڵاکانی وەریوە.

(۴) سەهی سەرو: دار سەروی سێبـەر. تـەزەرو: کـۆتـرەباریکە. مـەعنای ئـەم شـیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(۵) کنیا: هەڵکنرا. خەمیاوە: چەمی‌یەوە. واتە: باڵای رەنگاورەنگی کە وەك دار سـەروی سێبەر هەڵچووەو دڵی دۆستان وەك کۆترەباریکە هیلانەیان پێوەکردوە، بە دەم دەردەوە هەڵکنراو کەوتو وەك باڵندەی تەزەرو «کۆترەباریکە» لە سێبەرەکـەی خـۆیـا نـیشتەوە. مەشهوورە ئەم باڵندەیە لە سەر دارەوە سەیری سێبەری خۆی ئەکاو رێك دێتە سـەری ئەنیشێتەوە.

تای بەڕەزای شەنگ عەنبەر بـۆی شـەو ڕەنگ
پەخش بی نە ڕووی تاش ئەڵحەد سەرای سەنگ(۱)

ئـەو کـۆی نـەزاکـەت وە نـاز پـەروەردە
لەتـافەت جـە بـەرگ حـەریر ڕەم کـەردە(۲)

نـە تـۆی جـامەی خـاك حـاڵاتش چـۆن بـۆ
دەك چەرخـە بـەختت هـەر نـیل گـوون بـۆ(۳)

بـاڵ چـەم هـوردا نـەرگس نـەی دەمدا
چ خـێر بـی تـۆ چـەم نـیای وە هـەمدا(۴)

چێش بی خێڵ‌خـانەی وێت جـە یـاد بـەردی
ڕووی تەڵمیت ئەو خێڵ حۆری‌یان کـەردی(۵)

راسـەن هـەمرازی حـۆری‌یـان وەشـەن
پەی عەشرەت دووریت دەردێ سەرکەشەن(۶)

---

(۱) بەڕەزا: گیایەکە بە لا پاڵی بەردو تاشەوە ئەڕوێ. شەنگ: جوان. واتـە: تـاڵی زوڵفـی جوان‌و ڕەش‌و بۆن خۆشی وەك بەڕەزای سەر بەرزان بە سەر تـاشە بـەردی ئـەڵحـەدی قەبرەکەیا بڵاو بووەوە.

(۲) کۆ: کۆگا. ڕەم کەردە: هەڵاتوو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(۳) تۆ: ناو. نیل گوون: نیل ڕەنگ، مەبەسی لێڵە. واتە: ئاخۆم ئەو خانمەکەکۆگای ناسکی بوو، وە بە ناز پەروەردەکرابوو، وە ناسکی‌یەکەی لە ڕادەیەکـا بـوو لە پـەڕەی ئـاوریشم تەرێزی ئەکرد، ئاخۆم ئیستا حاڵی لە ناو کراسی خاك‌و خۆڵا چـۆن بـێ. دەك چـەرخـی فەڵەك خوا هەمیشە بەختت تاریك کا وا ئەم پەنەت دا.

(۴) نیای: نات. واتە: لەم دەمی بەهارەدا کە نێرگس باڵی چاوی خۆی داو پشکووت، تۆ چ خێرت بوو وا چاوت نا بە یەکدا؟.

(۵) واتە: چی‌بوو وا جێگای خێڵەکەی خۆتت لە بیر بردەوەو ڕووی بارگەت بەرەو خێڵی حۆری‌یەکان وەرچەرخاندو ڕۆیشتی بۆ بەهەشت؟.

(۶) واتە: بەڵێ، ڕاستە هاوڕێیەتی حۆری‌یەکـان خـۆشـە، بـەڵام دووریشت دەردێکـی سەختە بۆ عەشرەت‌و کەس‌و کارت.

بـــارێ تــۆو ســەفاو ســەیرانو گــوڵ گــەشت
هەمسایەی حــۆریو ســەردەشت بــەهەشت[١]

عـــــەشرەت وە پـــــێچش وە زامــــــەتەوە
وەو زام تـــــــا قــــــام قــــیامەتەوە[٢]

[٣]

## مایەی ئێشو نێش[٣]

مــایەی ئــێشو نــێش گشت زامـان سـەخت
بـــازووی تـەوانـای بـەرگەشتەگـی بـەخت[٤]

راسەن خـۆ فـەڵەك چـەواشـەی چـەپ گـەرد
پــەی دووری بـــاڵات شـــانا مـــۆرەی نـەرد

بــــەڵام گــــیانەکــەم حــەیفەن پــەرێ تــۆ
بێ شەرتیت بەی تەور نــە عـام مـەشهوور بـۆ

مــــن بــیم خــرِیــدار کــاڵای بــاڵاکــەت
مــن بــیم وە ســەرگەرد گــەرد پــاڵاکــەت[٥]

---

(١) باری: ئیتر. واتە: ئیتر تۆ بۆ خۆت رائەبوریری‌و گەشت‌و سەیران ئەکەی‌و هاوماڵی حۆرییەکانی لە تەختانی بەهەشتا.

(٢) پێچش: خۆ پێچ دان لە تاو ئازار. واتە: کەس‌و کارەکەیشت بە دەم ئێش‌و ئازارەوە هەر خۆیان پێچ ئەدەن، وە تا رۆژی قیامەت بە دەم ئەو دەردەوە ئەناڵێنن.

[٣]

(٣) لەم قەسیدەدا مەولەوی گلەیی لە بێ وەفایی دۆستێکی دوور کەوتووەوە ئەکا. ئەم قەسیدەیە هەرچەند لە دیوانەکانا بە ناوی مەوەلەوی‌یەوە نووسراوە، بەڵام شێوەو ناوەرۆکەکەی لە هی «بولبول» ئەچێ کە قەسیدەیەکی تریشمان بڵاو کردەوە گلەیی تیا کردبوو لە مەولەوی چونکەکچی خۆی نەدابوویە.

(٤) بازوو: قۆڵ. بەرگەشتەگی: وەرگەڕانەوە. واتە: ئەی دۆستێ کە بووی بە بنچینەو هۆی هەموو ئێش‌و برینێکی نابار بۆ من، وە بووی بە قۆڵی بە هێزو بەختم ئەگێڕێتەوە.

(٥) بیم: بووم. خریدار: کڕیار.

باعیس گەرمی بازاڕت من بیم
جەلای ئاینەی روخسارت من بیم

من سکەم وە نام مەحبووبیت لێدا
من رەواجم دا وە شارو دێدا

ئاخر پەی ئەغیار جە من ویەردی
ئای بێ بەڵا بی، ئانە چێش کەردی؟(۱)

مسپارووت وە سۆز هەناسان سەرد
وە جۆش‌و خرۆش دڵەی پڕ جە دەرد(۲)

تەپ‌و دووی دووکەڵ هەناسەت بەرز بۆ
ناڵەت چون ناڵەم جە هەزار تەرز بۆ

هەر شەو سەیل هەرس وە رووی روخساردا
تۆف تۆفانش بۆ وە هەر دیاردا(۳)

خەدەنگ چل چەنگ شۆت وە جگەردا
پەنجەی بەدبەختیت بدەی وە سەردا(۴)

تا بەڵ نەو سەردەم بەیۆ وە یادت
رەنج بێ سامان بەردەی فەرهادت(۵)

---

(۱) ئەغیار: بێگانە. ویەردی: دەست هەڵگرت.
(۲) مسپارووت: ئەت‌سپێرم.
(۳) واتە: یاخوا هەموو شەوێ لاقاوی فرمێسك بە سەر دەم‌و چاوتا لافاو بکاو بە هەموو لایەکا بڵاو ببێتەوە.
(۴) چل چەنگ: ئەو تیرەی کە چل پەڕەی پێوەیە بۆ ئەوەی لەشی بریندار بە تەواوی داڕزێنێ. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.
(۵) بەیۆ: بێت. بەردە: براو. واتە: یاخوا تیری چل سەر بچێ بە چگەرتاو لە بەدبەختی‌یا بدەی بە سەری خۆتا، بەڵکو لەو وەختەدا رەنجی بێ‌کەڵك‌و براوی منت بێتەوە یادکە وەك

## [٤]

### مەرگت دێوەلوول[١]

مـــــەرگت دێوەلوول خـــــەمان دێونــــان
بـــونیاد خــــەرمان عــیرفان شـێونــان[٢]

جــە دیــدەو دەمــاخ، جـە گـۆش و گـەردەن
دووریت نــمەز کـام زامـدار تـەر کـەردەن[٣]

دیــدە پــەی روخســار خــورشید وارەکـەت
یــا دەمـاخ پـەی بـۆی عـەنبەر بـارەکـەت[٤]

گـۆش پـەی شـنۆی راز رێزەی شـەکـەر رێز
یا گەردەن پـەی بـەند حـەڵقـەی زوڵف دێز[٥]

---

☞

فەرهاد بە بێ سوود رەنجم بۆ دای. مەبەسی لەوەیەکە دەردەدار حاڵی دەردەدار ئەزانێ، وە تا ئەویش گرفتار نەبێ لە حاڵی ئەم نازانێ.

[٤]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەشی لە لاواندنەوەی عەنبەر خاتوونی خێزانیا وتووە.
(٢) دێوەلوول: گێژە ڵوکە. دێونان: ئاڵۆزاندووە. بونیاد: بنەڕەت. شێونان: تێك‌داوە. واتە: مردنی تۆ گێژەڵووکەی خەم و مەینەتی لە دڵم ئاڵۆزاندووەو، بنچینەی هەستمی تێك‌داوە.
(٣) دەماخ: لووت. نمەز: نازانم. واتە: نازانم دووریت لەم چوار ئەندامەی لەشما، چاوم و لووتم و گوێم و گەردنم، کامیانی زۆرتر بریندار کردووە. مەبەسی ئەوەیە بە هۆی مەرگی عەنبەر خاتوونەوە ئەو چوار ئەندامەی ئەوەندە بریندار بوون نازانی کامیان لە وی‌تریان بریندارترە.
(٤) خورشیدوار: رەنگ وەك رۆژ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٥) شنۆ: بیستن. ریزە: ورد. دێز: رەش. واتە: چاوم بۆیە بریندارە چونکە بینینی رووی وەك رۆژتی لێ براوە، وە لووتم لە بەر ئەوەکە بۆنی وەك عەنبەر خۆشتی پیا ناچێتەوە، وە گوێم چونکە قسەی شیرینت نابیسێتەوەکە وردە شەکری لێ ئەوەرێ، ملیشم بە هۆی ئەوەوە تا جارێکی‌تر زەنجیری زوڵفی رەشتی لێ نائاڵێ.

خـــێڵخـــانەی مـــەینەت یـەند ئـاماو شـیەن
وە ســـەفحەی دڵدا ســۆهـــان ســاو بـیەن(۱)

هـــیچ بـــەند نـــمەبۆ پـــای بـــەڵاش پــێوە
وەرنـــە هـــەی شـــاباز شـــۆخ شـــەم شـێوە

جـــە کـــۆ مـــەعدوومی ئـــەو تـــاقەت دارۆ
ســـاتێ وە بـــێ دیـــن بـــاڵات بـــویارۆ(۲)

قـــەزا وە ســـــەد تـــــەرز بـــەڵا بـــاریشەن
دڵ هـــەم هـــەر دەمـــێ تـــەرزێ زاریشـەن(۳)

چێش بی، هامدەردان دەروون جە خەم کەیل؟
ئـــەو بـــاڵاو چـــیهرەو خـــاڵو زوڵف لەیـل(۴)

تـــۆمـــەی ســـەرو گـــوڵ وەنـــەوشەو ســـونبوڵ
شـــاناش بـــاخەوان ئـــەجەل وە تـــۆی گـــڵ(۵)

تـــا دیســـان ئـــەر قـــەیس وە مـــودارا بـــۆ
نـــە کـــام وەهـــارا چـــەمەن ئـــارا بـــۆ(۶)

---

(۱) سۆهان: بڕبەن. ساو: ساف. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(۲) دارۆ: هەیەتی. بویارۆ: بڕێتە سەر. واتە: منیش بۆیە هێشتا ماوم چونکە کاروانی مەینەت ئەوەندە هاتو چۆی کردووە بە سەر تەختی دڵما، وەك چەقۆی ساف بووی لە هەسان چووەوەی لێ هاتووەو پێی بەڵا راگیر نابێ پێیەوە، ئەگینا ئەی شابازی شۆخی وەك شەمع پرشنگدار، من کەی توانای ئەوەم هەیە سەعاتێك بەرمە سەر بێ دیتنی باڵای تۆ؟
(۳) واتە: قەزاو قەدەر بە سەد جۆر بەڵا ئەبارێنێ بە سەرما، وە دڵم هەر تاوێ بە جۆرێ ئەکروزێنێتەوە.
(۴) نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە پرسیارەو نیوەی دووهەمی لە گەڵ دوو شیعری پاشەوەی دا وەرامی پرسیارەکەن، وە مەعنای هەر سیانیان پێکەوە دێ.
(۵) تۆمە: توو. سونبوڵ: رێحانە. شاناش: وەشاندن.
(۶) قەیس: مەجنوونی لەیلا. ئارا: رازێنەرەوە. واتە: هاودەردە دڵ پڕ لە داخەکـان چـی

## [٥]

## من خەریك ئێش

مـــــن خـــــەریك ئـــێش زام جـــیایی
نـــیشتەی گـــۆشـــەی تـــار مـــزگی تـــەنیایی[١]

گـــــا مـــــەشغوولْ زام، گـــا خـــەریك دەرد
گـــا رەفـــێق خـــەم، گـــا هـــەناسەی ســـەرد

گـا سـەر مـەكـەرۆ هـوون نـە چـەمەی چـەم
گـــاگـــا مـــەویەرۆ ســـێڵاو نـــە دیـــدەم[٢]

گـــا زام نـــاسۆر هـــیجران مـــدۆ چـــڵ
گـــا یـــاوۆ وە عـــەرش ئـــاهو نـــاڵەی دڵ[٣]

گـــا نـــێش دووری مـــدۆم ژار مـــار
گـــا تـــیر فـــیراق مـــەكـــەرۆم لە تـــار[٤]

---

☞

رووی داوە وا بەڵاو مەینەت لە ئاسمانەوە ئەبارێو دڵ بە سەد جۆر دائەگرێ. وەرامی پرسیارەكەی ئەمەیە ئەڵێ باڵاو روخسارو خاڵو زوڵفی لەیل كە یەكـەمیان تـووی داری سەروو دووهەمیان تووی گوڵو سێهەمیان تووی وەنەوشەو چوارەمیان تووی رێحانەیە، باخەوانی ئەجەل وەشاندنی بە ناو خاكا، تا ئەگەر قەیسی دڵداری بتوانێ خۆی بگرێ، بەڵكو لە بەهارێكا دیسانەوە بڕوێنەوەو چیمەنی رووی زەوی برازێننەوە.

[٥]

(١) نیشتە: دانیشتوو. تار: تاریك. مزگی: مزگەوت. واتە: من دەسم گیراوە بە ئێشو ئازاری زامی جیایی‌یەوە، وە لە سووچی تاریكی مزگەوتی تەنیایی دا دانیشتووم.
(٢) سەر مەكەرۆ: سەرئەكا. چەمە: سەرچاوە. مەویەرۆ: ئەڕوا. سێڵاو: لافاو.
(٣) ناسۆر: ئەو زامەی بووبێ بە تێراویو چاك نەبێتـەوە. مـەدۆ چـڵ: چـڵ ئـەدا. یـاوۆ: ئەگات.
(٤) مدۆم: ئەمداتێ. لەتار: پارچەپارچە...

نـــــه هـــــاوزوانـــــیٚ دڵداریـــــم کـــــەرۆ
نـــــه هـــــاوقەتاریٚ دەس‌بـــــاریم دەرۆ[١]

نـــه حـــــەکـــیمیٚوەن کـــەرۆ دەوای دەرد
نـــــه تـــــەبیبیٚوەن جـــــه دڵ لادۆ دەرد[٢]

ســــا ئـیسه ســـاقی جـــەمین جـام جـــەم
وادەی ئـــــــاماتەن وه بـــــان دیـــــدەم[٣]

دەوریٚ دەر وه جـــام بـــادەی پـــڕ جـــه مـەیل
بـەڵ دەروون جـه مـەیل بـاڵات بـبۆ کـەیل[٤]

جـــــه مـــــاسیوای تـــــۆ فـــارغ بـــۆ حـــاڵم
بـــــەڵ نـــــەدۆم ئـــــازار شـــووم خـــەیاڵم[٥]

یـــــەك دڵ بـــوو چـــەنی عـــەشق دیـــدارت
گـــیان کـــەروو فـــیدای دیـــدەی خـومارت[٦]

---

(١) دەس باری: دەس دانه بار. دەرۆ: بدا. واته: نه هاو زوانێکم هەیه دڵم بداتەوە، وە نه هاوکاروانێکم هەیه لە تەنگانەدا دەستێك بداتە بارەکەم.
(٢) کەرۆ: بکا. لادۆ: لابدا.
(٣) ئاما: هاتن. واته: ئێستا کاکەی مەیگێڕ کە ناوچاوت وەك ئاوێنەکەی جەمشید هەموو شتێکی تیا دەرئەکەویٚ، وادەی هاتنته، فەرموو بە سەر چاوم بێی.
(٤) واته: سووریٚ بخۆ بە سەرمانا بە جامی شەرابیٚ پڕ لە خۆشەویستی‌تەوە بەڵکو دەروونم پڕ ببیٚ لە ئارەزووی باڵات.
(٥) فارغ: خاڵی. واته: وە بەڵکو بەو جامی شەرابە وا سەرخۆش ببم دڵم لە تۆ بەولاوەکەسی تیا نەبیٚو خەیاڵی خراپ ئازارم نەدا.
(٦) واته: وە یەك دڵ ببمەوە لەگەڵ عەشقی دیداری تۆ داو گیانم بکەم بە قوربانی چاوی مەستت.

## [٦]

## موبارەکت بۆ[١]

مـــوبارەکت بـــۆ بـــەزم نـــەو وە خـــەیر
توخوا تەنخوای من خاس‌خاس بکەر سەیر[٢]

سـێر کـەر تـەماشای ئـەو جـەمین جـامان
وە خـــوسووس ئـــازیز شـــای نـەونەمامان[٣]

وەخت ئـــامۆشـــۆی ئـــاماو لواشـــەن
تـــەرزەکـــەی وە بـەرز دەورەی سـەماشەن[٤]

گـــرمەی نـــقارەو لرفـــەی شـــەروالان
خشـــپەی پـاموورەو زرنگـەی خـرخـاڵان[٥]

چـــریکەی ســـڕنـاو پـریکەی خـــەندە
پـــەشێوی زوڵفـــان ریشـــەی دڵ کـــەندە[٦]

---

[٦]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بو مەحموود جاف نووسیوە بە بۆنەی شایی‌و زەماوەندی ژن هێنانەوە وەك لە حسەین بەگی حەسەن بەگی جافم بیستووە ئەم زەماوەندە بۆ یەکەم ژن هێنانی مەحمود پاشا بووەکە ئەمنە خانی کچی قادر بەگی رۆستەم بەگی وەلەدبەگی هێناوە، وە لەو شایی‌یەدا ئافرەتێکی گۆرانی بێژی خەڵکی «کەرەند» کە ناوی «تاوس» بووە گۆرانی بۆ ژنان وتووە.

(٢) تەنخوا: لە جیاتی. واتە: ئەم شایی‌یە تازەت پیرۆز بێ‌و ببێ بە مایەی پیرۆزی بۆت، توخوا تۆ لە جیاتی من باش سەیری هەڵپەرکێ کەرەکان بکە.

(٣) سێر: تێر. جام: ئاوێنە. واتە: تێر تەماشای ئەو نازارانە بکەکە روویان وەك ئاوێنە رۆشنە، وە بە تایبەتی سەیری رووی دۆست بکەکە شای جوانە تازە هەڵچووەکانە.

(٤) واتە: چونکە لەم شایی‌یەدا وەختی هات‌و چۆیەتی، وەکاتی بەزمی سوورِ خواردنی سەماکردنیەتی.

(٥) نقارە: ئالەتێکی مۆسیقای میللی‌یە. لرفە: خشە. شەرواڵ: ژێر کراس. پاموورە: مووررووی پێ، خشڵێکە ئافرەت لە پێی ئەکا. خرخاڵ: بازنە.

(٦) خەندە: پێکەنین. کەندە: هەڵ‌کەن.

ئــیشارەی وە نــاز لەب خــەندەی وە نــەرم
نــمانای خــاڵان نــە تــۆی پــەردەی شــەرم[١]

سەر چــۆپـی وە نـاز قــۆڵ هــوردای دەسـماڵ
بــــریقەی شــیشەو لەرەی لیــمۆی کــاڵ[٢]

ورشــــەی ســـــتارە نــەو زوڵف بـــووم زەڕ
چـــون قـــەوس و قـــەزەح گـرتەن دەور وەر[٣]

جــەو بــەزم شــیرین مــنیش کــەر وە یــاد
بـــەزمتان جـــەم بــۆ دایـــم وە دڵشـــاد[٤]

مـــن وێم زووم زانــــان تــاڵەم پــەشێوەن
رەفـــێقـــم مـــەینەت، ئــەنیسم دێوەن[٥]

خـــودا وە تـــۆش دان ســـەیر نــەمامان
وە مـــن رەنگ زەردی و نــاڵەی بــێ ســامان

(١) نمانا: دەرکەوتن.
(٢) هوردا: هەڵتەکاندن. شیشە: موورووی مل.
(٣) ستارە: ئەستێرە. بووم: جێگا. قەوس و قـەزەح: هـەسوونە زێڕیـنە، «پـەلکەزێڕیـنە». وەر: خۆر. مەولەوی لەم شیعرە دا تـەشبیهی رووی جـوانـانی کـردووە بـە رۆژ، وە ژێر زوڵفیان بە زێڕ، وە ورشەی زوڵفی و بریقەی گوڵ و ئەستێرە زیوینەکان سەر زوڵف و زەردی تەنشتی گۆنایان بە هەسوونە زێڕینەکە لە پاش باران دەرئەکەوێ، بارانـەکـەش دڵۆپـەی ئارەقی ماندوو بوونی هەڵپەڕینیانە... واتە: ورشەی ئەستێرەی سەر زوڵفی یـاران کـە بـە سەر لاجـانگی زەردی وەك زێڕەوەیـە، وەك هـەسوونە زێڕیـنە دەوری رووی وەك رۆژ یانیانی گرتووە.
(٤) جەو: لەو. کەر: بکە. جەم: «جمع»، کۆمەڵ.
(٥) وێم: خۆم. تاڵە: «طالع»، بە خت. ئەنیس: هاودەنگ.

[٧]

## منارە، سەدای سەڵاش...[١]

مـــنارە، ســـەدای ســـەڵاش ســـەد تـــەرزەن
مـــزگی، جـــە شـــادی دەمـــاخش بـــەرزەن[٢]

مەی نـە خـوم چـون مـن نـە خـەم ئـەسیرەن
مـــــەیخانە ســـــەفاش خـــەیلێ دڵگـــیرەن[٣]

لوولەی تـــــەراویـــح وەش‌وەش مـــدۆ دەنگ
بـــێ ئـــاهەنگەن تـار تـەموورەی ئـاهەنگ[٤]

مـــەرحـــەبای لیـــباس تـــاعەت پـــۆشـــانەن
ئـــەلوەدای کـــاس‌کاس بـــادە نـــۆشـــانەن[٥]

---

[٧]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە مانگێکی رەمەزانا وتووە.

(٢) واتــە: مـنارەی مـزگەوتەکـان سـەد جـۆر سـەڵاو بـانگیان لێ بـەرز ئـەبێتـەوە، مزگەوتەکانیش لە خۆشی‌دا دەماخیان بەرزە.

(٣) خوم: کووپەی مەی. واتە: شەرابیش بە هۆی رەمەزانەوە لەکووپەدا ماوەتەوە، وەك من کە گیرۆدەی خەم بووم. مەیخانەیش خۆشی تیا نیە چـونکەکـەسی تـێ نـاچێ بـۆ خواردنەوە.

(٤) لوولە: شمشاڵ. تەراوێح: نوێژێکی تایبەتی بیست‌و سێ رکاتی‌یە بە رەمـەزانا پـاش نوێژی عیشا ئەکرێت، وە لە نێوانی هەر دوو رکاتێکیا دوعایەکـی تـایبەتی ئـەخوێنـرێ. ئاهەنگ «ی یەکەم»: خۆشی. تار، تەموورە: دوو ئالەتی مۆسیقای مـیللین. ئـاهەنگ «ی دووهەم»: شایلوغان. واتـە: شـمشاڵی تـەراویـح خـۆش خـۆش دەنگـی لێوە دێ‌و تـارو تەموورەی ئاهەنگ‌و رابواردن خۆشیی لێ براوە.

(٥) واتە: کاتی مەرحەباو بەخێر هاتنی ئەوانەیەکە جل‌و بـەرگی تـاعەت ئـەپۆشـن، وە دەمی ماڵاوایی کردن لە پیاڵەی مەی بۆ مەی خۆرەکان. وشەی «مـەرحـەبا»و «ئـەلوەدا» ئیشارەتن بۆ ئەوەکە لە نیوەی یەکەمی مانگی رەمەزانا لەکاتی نوێژی تـەراوێحا ئـەڵێن: «مرحبا... مرحبا أیا شهر رمضان». وە لە نیوەی دووهەمیا ئەڵێن: «الوداع... الوداع أیا شهر رمضان».

ساقی، سا سەد جار وە نازت نازوو
هوردەر وە گوڵبانگ سەدای «وَٱمْتازُوا»[١]

تورڕەت نە رووی خاڵ جەبین سەراوێز
پیاڵەت چون جام «کەچ دارو مەڕێز»[٢]

ستارەت نە شەو تورڕەی قەترانی
هوەیداو پەنهان شەمس پێشانی[٣]

هیلال نە پای شەو نەسیم بۆی نافدا
بنمان نەو شەفەق بادەکەی سافدا[٤]

هەی هیلال، هەی عید، خێزۆ جە یاران
وە رەغم گرۆی پەرهێزگاران[٥]

---

(١) نازوو: بنازم. گوڵبانگ: ئاوازی گەرمو بە جۆش. «وَٱمْتازُوا»: بە شێکە لە ئایەتی: ﴿وَٱمْتازُوا الْيَوْمَ اَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾. کە لە رۆژی قیامەتا بە تاوانباران ئەوترێ، وە مەعنای ئەوەیە ئەی تاوانباران ئەمرۆ ئێوە جوێ ببنەوەو لاکەون. واتە: کاکەی مەیگێر یاخوا سەد جار بنازم بەو نازەتا کە داوتە پێم، هاوارو بانگی ﴿وَٱمْتازُوا الْيَوْمَ...﴾ هەڵدە تا ئەوانەی رۆژوویان گرتووەو ئەوانەی نەیان گرتووە لە یەك جوێ ببنەوە. مەبەسی ئەوەیە رەمەزان دوایی بێنە، چونکە بە هاتنی چەژن دیاری ئەدا کێ خواپەرست بووەو کێ تاوانبار. لە شیعرەکانی پاشەوە دا چۆنیەتی دوایی هێنانی رەمەزان باس ئەکا.
(٢) تورڕە: «طُرّه»، زوڵف. سەراوێز: سەربەرەوخوار. کەچ دارو مەڕێز: جوملەیەکی فارسی‌یە بە مەعنای لاری بکەرەو مەیڕێژە. واتە: بۆ پیشاندانی مانگی شەوی چەژن زوڵفت بە سەر رووی خاڵەکەی ناوچاوتا دابدەرەوە، وە چاوە گەورەکانت بێنە سەر شێوەی ئاوڕدانەوە وەك پیاڵەی شەرابێ کە لار کرابێتەوە بەڵام نەهێڵرێ برێژرێ.
(٣) قەترانی: رەش. پێشانی: ناوچاو. واتە: قولاپە زیوینەکانی سەر زوڵفە رەشەکانت دەرخە وەك ئەستێرەی تاریکەشەو با رۆژی رووت دەرنەکەوێ.
(٤) ناف: میسکی بۆن خۆش. شەفەق: سوورایی قەراغی ئاسمان بە ئێوارانا. واتە: لە داوێنی ئەو شەوەدا کە زوڵفەکانتەو، شنەی بۆنی میسکی لێ دێ، لە سوورایی پیاڵەی شەرابی سافدا کە چاوتە، مانگی یەكشەوەمان پیشان بدەکە برۆتە.
(٥) خێزۆ: بەرزبێتەوە. واتە: با بەکوێرایی چاوی پارێزکەران هاواری «ئای ئەوە مانگ... ئەمشەو چەژنە» بەرز بێتەوە لە دۆستانەوە.

شـــادی دەر وە دڵ لای مـــەی خـــوارانْدا
خـــــەفەت دەر وە جـــــەرگ ڕۆزەدارانْدا[(١)]

[٨]

## مەیلت ئارەزووی[(٢)]

مـــــەیلت ئـــــارەزووی ئـــەغیار کـــەردەبێ
چێش خامەکـەت نـام مـەعدووم بـەردەبێ[(٣)]

بـــــێ مــنەت جــە مــەیل ئــامای نــامەتم
مـەمنوون جـە وەفـای ڕەشـحەی خـامەتم[(٤)]

پــەرسابێت چـۆنـی؟ ویێت غـەڵەت کـەردەن
مـــەر نـــــمەزانــــی دووریت چ دەردەن[(٥)]

گـــــەرمی بــــڵێســــەی دەروون دەمـــاخ
دێوەلوول ئـــــاخ دڵەی پـــڕ جــــە داخ[(٦)]

---

(١) ڕۆزە: ڕۆژوو. واتە: دڵی مەی‌خواردن خۆش‌کە بە بەرەڵلاکردنی توانای خواردنەوە، وە جەرگی ڕۆژووەوانەکان پڕکە لە خەفەت کە نایانەوێ هەرگیز ڕەمەزان دوایی بێ.

[٨]

(٢) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لەگەڵ نامەیەکی بێ نوختەدا لە وەڵامی نامەیەکی حەمە پاشای جافدا نوسیوەکە لە بارەی ئیشی کەسێکەوە بۆی ناردبوو. مەولەوی لە وەرامەکەیا بە حەمە پاشا ئەڵێ تۆ نەت‌ویستووە نامەم بۆ بنووسی، بەڵام ئیشی ئەم پیاوە ناچاری کردووی.

(٣) چـێش: کـەچی. واتـە: خـۆش‌ویـستنی تـۆ ئارەزووی بـێگـانەی کـردبوو، کـەچی قەڵەمەکەت ناوی هێنابووم.

(٤) ڕەشحە: پرژە. واتە: منەتی ئارەزووی هاتنی نامەت هەڵ‌ناگرم چونکە بە هۆی ئیشی خەڵکەوە بووە، بەڵام مەمنوونی وەفای پرژی قەڵەمەکەتم کە ناومی نووسی.

(٥) واتە: پرسیارت کردبوو کە چۆنم، بەڵام تۆ خۆت بە غەڵەتا بردووە، بۆچـی نـازانـی دووریت چۆن دەردێکە تووشم هاتووە؟.

(٦) دێوەلوول: گێژەڵووکە: مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

ئەو بەرد نم نە چەم دیدەی پڕ جە دەرد
ئێد مالآ رووی حەرف خەیاڵ بێ گەرد(١)

نە قەترەی ئەسرین مەندەن نە چەمدا
نە نوختە نە حەرف ئینشای ماتەمدا(٢)

عەرزە شاهیدەن خاس بدیە پێشدا
حەرف نوختەدار نەمەندەن تێشدا(٣)

[٩]

## مامۆسای سەر ئێڵ(٤)

مامۆسای سەر ئێڵ شیرین کەلامان
تەشریف خەیرت باوەر وە لامان(٥)

---

(١) بەرد: بردی. مالآ: ماڵیوە. واتە: گەرمی بڵێسەی ناو دەماخم تەڕایی نەهێشتووە لە چاوە پڕ دەردەکانما، وە گێژەڵووکەی ئاهوو هەناسە هەڵکێشانی دڵەی پڕ داخم رووی ئەو حەرفانەی ماڵیوەکە لە خەیاڵی ساف و بێ گەردمان.

(٢) ئەسرین: فرمێسك. مەندەن: ماوە. وات: لە بەر ئەوە نە دڵۆپەیەك فرمێسك لە چاوما ماوە، وە نە حەرفەکانی نامەکەم کە باسی خەفەتباریم ئەکا نوختەیان پێوەماوە.

(٣) عرزە: نامە. بدیە: بڕوانە. واتە: نامەکەم شایەتمە، باش سەیری بکە حەرفی نوختەداری تیانەماوە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «نەمەندەن» نووسراوە «مەوینی» بە مەعنای نابینی. ئەو نامەیەکە مەولەوی لەم قەسیدەیا ئیشارەتی بۆ کردووە بە زمانی فارسی نووسراوە، وە چەند دێڕێکی عەرەبیشی تیایە. نوسخەیەکیم لایە لەگەڵ چەند نامەیەکی تری نووسراوی مەولەوی‌دا.

[٩]

(٤) مەولەوی بەم قەسیدەیە یەکێ لە دۆستەکانی بانگ کردووە بڕوا بۆ لای بۆ رابواردن، وە باسی خۆشی شوێنەکەی خۆی بۆ کردووە

(٥) ئێل: خێڵ. باوەر: بێنە.

نــە شــنۆی بــەدکار، نــە بــۆی بــەدوازەن
وەحشـــی‌یان هــەم‌راز، تــەیران دەم ســازەن[١]

شــەتاوان چــون ســەیل دیــدەمەن جــاری
پــێچ مــــدان چـــەنی زامــان کــاری[٢]

تــۆ نــە ســەرگوزەشت ســزای دەرد لەیــل
مــن نــە حــیکایەت ئــازیز بــێ مــەیل[٣]

ســـاتێ پـــەی وێمـــا بــنیشمێ وە شــاد
بـــەو رازانـــــەوە خــەم بــدەین وە بــاد[۴]

تـــا فـــەڵەك دیســـان نــەی راگــوزەردا
بــوینمێ چــێشش هــا نــە ژێر ســەردا[۵]

(١) بەدواز: بەدخواز. واتە: نە شنۆی بەدکار هەیە لەم شوێنەدا کە منی تیام، وە نەبۆنی بەدخوای تیایە. هاودەنگ‌و هاوڕێمان باڵدارو گیاندارە کێوی‌یەکانن.
(٢) واتە: چەمەکان وەك ئاوی چاوم زۆرو رەوانن، وە بە زامی کاریگەری خۆیانەوە پێچ ئەخۆن. مەولەوی لەم قەسیدەیەدا خەیاڵێکی وردی بەکار هێناوە، وە بڕیاری داوە هەرچی پێچ بخوا لەبەر ئەوەیەکە ئازاری هەیە، وە چەمەکانیش بۆیە پێچ‌و لارن چونکە ئازاریان هەیە، ئەبێ ئەم ئازارە خەیاڵی‌یەی چەمەکان بەهۆی دوور کەوتنەوەی ئەو جوانانەوە بێ کە لە قەراغیا سەیرانیان کردووە.
(٣) مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(۴) وێما: خۆمان. بنیشمێ: دانیشین. راز: قسە.
(۵) وینمێ: ببینین. چێش: چی. واتە: تۆ سەرگوزەشتی دەردو ئازاری لەیلی خۆتم بۆ بگێڕەوەو منیش باسی ئازیزی بێ‌مەیلی خۆمت بۆ ئەکەم، وە سەعاتێ پێکەوە دائەنیشین بەو قسانە خەم‌مان ئەدەین بە با، تا بزانین فەڵەك لەم دنیایەدا چی‌تری لە ژێر سەرایە بۆمان.

## [١٠]

## مامۆستای شیرین(١)

مــامۆســتای شــیرین، شــۆخ دیــدە مــەست
جــە مــەکــتەبخانەی مــەدرەسەی «أَلَسْتْ»(٢)

دیــــدەش مـــەکـــتەبی قـــەدەر ســزادا
نــــیم نـــیگاش تـــالیم تـــفڵ قـــەزادا(٣)

ســـەرنووك مـــوژەش مـــەکـــەردش تـــەقریر
راســــتی پــــەی تــــیر تــــەدبیر تــــەقدیر(٤)

تـــۆ پـــەی تـــەعلیمش نـــە رای جـــەختەنی
ئـــەڵبـــەت یـــا ســـەرسەخت یـــا بـــەدبەختەنی(٥)

---

[١٠]

(١) مەولەوی بەم چەند شیعرە قسە لەگەڵ مامۆستایەك ئەکا کە دەرسی بە شۆخێك وتووە.

(٢) مەکتەبخانە: قوتابخانە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٣) مەکتەبی: قوتابی. نیمنگا: لاچاو. تالیم: «تعلیم»، فێرکردن.

(٤) تـەقریر: روون کـردنەوەی دەرس. واتـە: ئـەی مـامۆسـتای شـیرین ئـەم شـۆخـە چـاومەستەکـە تۆ دەرسـی پـێ ئـەڵێیت، چـاوی لە قـوتابخانەی رۆژی ئـەزەلا سـزای قوتابی‌یەکی ئەدا کە قەدەرە، وە تیری چاوی مناڵی قەدەری فێر ئەکرد کە چۆن تووشی خەڵك بێت، وە نووکی برژانگی دەرسی راست رۆیشتن‌و لانەدانی فێری تیری قـەدەر ئاراستەکردن ئەکرد.

(٥) جەخت: رەنجدان. واتە: کەچی تۆ ئێستا خۆت ئـەزیەت ئـەدەی بـۆ فـێر کـردنی، ئەڵبەت یا سەرسەختی یا بەدبەختی، ئەگینا تۆ لەکوێ‌و دەرس وتنەوە بە یەکێ لەوانە لەکوێ؟.

## [١١]

## مەجنونەکەی وێڵ[١]

مـــەجنوونەکـــەی وێڵ شـــەیدای بـــاڵای تـــۆ
ســـــەلام کـــــیانا وە خـــــاك پـــــای تـــۆ[٢]

وێش جـــــە تـــاو دەرد بـــار خـــەمان بـــەرد
جادەی مەینەت گرت، وێڵ بی هەرد ئەو هەرد[٣]

دڵ ئـــــــەمیرشەن جـــــە لات ئـــــەسیرەن
چـــــون تـــاوانکـــاران بـــەند زەنـــجیرەن[٤]

ئـــامان ســـەد ئـــامان خـــاس نـــیگاش دارە
وەرنـــــە ئـــــاروفتەن زوو مـــــبۆ پـــــارە[٥]

## [١٢]

## مەنزڵگەی دیدەم

مـــــەنزڵگـــەی دیـــدەم ئـــاوپاشی کـــەردەن
چـــەشمەنداز بـــەرز بـــێ تـــۆزو گـــەردەن[٦]

---

**[١١]**

(١) مەولەوی ئەم چەند شیعرەی بۆ دۆستێکی ناردووە بۆ دەربڕینی خۆشەویستی خۆی.

(٢) کیانا: ناردی. واتە: عاشقە مەجنونەکەت کە شەیدات بووە بە دوای باڵاتا وێڵ بووە، سەلام ئەنێرێ بۆ خاکی بەری پێت.

(٣) واتە: خۆی لە تاو دەردو ئازار نەیتوانی بێت، باری خەمی ناوەتە سەرشانیو ڕێگەی مەینەتی گرتووەتە بەرو کەوتووەتە هەردەو هەرد کردن.

(٤) واتە: دڵەکەی کە فەرمانڕەوایەتی، لای تۆ وێڵەو وەك تاوانباران زەنجیر کراوە.

(٥) ئاروفتە: دارزاو. پارە: پارچە. واتە: دەخیلتم چاك ئاگات لێ بێ ئەگینا داوەشاوە زوو دائەفرەقێو پارچە پارچە ئەبێ.

**[١٢]**

(٦) ئاوپاشی: ئاوڕشێن. چەشمەنداز: «چشم‌انداز»، جێگـای بـەرزی چـاو لێوە خـستن. مەعنای هەردوو شیعرەکە پێکەوە دێ.

شـــێوەت بـــا بـــەیۆ ئـــەر مـــەیلش بـــارۆ
بـــەڵام بـــویەرۆ ئـــەر بـــەد بـــویارۆ(١)

•••••••—●—•••••••

## [١٣]

## من کە دڵ دایم...(٢)

مـــن کـــە دڵ دایـــم نـــە واوەیـــلمەن
غـــەرق مـــوتاڵای خـــاڵ لەیـــلمەن(٣)

چ بـــاك تـــانەی تـــەوەن تـــاومەن
شـــەوق مـــوتاڵای رووی کـــتاومەن؟!(٤)

•••••••—●—•••••••

---

(١) بەیۆ: بێت. بارۆ: بێنێ. بویارۆ: رابوێرێ. واتە: مەنزڵگەی چاوم ئاورشێن کردووەو جێگەیەکی بەرزەو بۆ تەماشا لێوەکردن زۆر خۆشە، هیچ تۆزی تیا نیە. وێنەی ناسکت ئەگەر مەیلی هەیە بابێتە ناو چاوەکانم، وە ئەگەر شوێنەکەی لا خراپ بوو، وە ناخۆشی رابوارد رێگای ئەدەم بڕوا.

**[١٣]**

(٢) مەولەوی بەم دوو شیعرە بەربەرەکانێی دوو شیعری «مەلاقاسم» ناوێکیی کردووەکە وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| هەرگا من پـێکـیای پـەیکانی لەیـل وام | جە بێ‌مەیلی لەیل وەتەن دوجەیل وام |
| چ بـــاکـــی بـــەدی بـــەدکارانـــمەن | چ پـــەروای تـــانەی ئـــەغیارانـــمەن |

واتە: مادەم من پێکراوی تیری لەیل بم، وە لەبەر بێ‌مەیلی لەیل وەتەنم کێوی دوجەیل بێ، ئیتر باکم چیە لە خراپی ئەوکەسانەی خراپەم ئەڵێن، وە لەکوێ ماوەی موبالات کردنم هەیە بە تانەو تەشەری بێگانە؟.

(٣) واوەیل: هاوارو شین. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(٤) تەوەن‌تاو: بەرد توێنەرەوە. موتاڵا: «مطالعە»، چاو پیاگێڕان. واتە: من کە دڵم هەمیشە لەگریانو واوەیلادا بێ، وە غەرقی موتاڵای خاڵی روخساری لەیل بم، چ باکێکم هەیە لەو تانەو تەشەرانەی کە بەرد ئەتوێننەوە، وە لەکوێ ماوەی موتاڵای پەڕەی کتێبم هەیە؟.

## [١]

## نامەکەت پەی چێش(١)

نـامەکـەت پـەی چـێش؟ پـەرێ دەوای دەرد
یــاوا خــاس وانــام مــوتاڵەعــەم کــەرد(٢)

ئــاخ، داخــان نـیشات جـە بـێخ کـەندە وێم
رای تــــەدبیر کــــەس پــێ نــەمەدە وێم(٣)

ســــەرەتای زوخــاو نــە جــەرگم ســەردان
بــەیدێ پــێمــەوە یــاران، هــام فــەردان(٤)

هــــاوار یــــانێ هــای خــاڵۆم نــەشنەفتەن
جــە نــۆ کـۆســێ تـەر خـاستەرم کـەفتەن(٥)

دیــدەکــەم مــاچان بــێ وەفــاییش کــەرد
شەرتو عەهد بەین وەریـن جـە یـاد بـەرد(٦)

---

### [١]

(١) مەلەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەڵامی قەسیدەیەکی خاڵۆی کۆمـاسیدا نـوسیوە، کـە سکاڵای دەردی عەشقی بۆ مەولەوی کردبوو تیادا، وە سۆزی دڵی خۆی دەربڕیبوو، وە چاری لێ ویستبوو.

(٢) وانام: خوێندمەوە: واتە: نـامەکـەت گـەیشتو بـەباشی خـوێندنـمەوەو تـێ گـەیشتم بۆچیت نووسیبوو؟ داوای دەرمانی دەردت تیا کردبوو.

(٣) واتە: داخی بە جەرگم نارەحتی داری جمو جـووڵی لە بـن هـەڵکـەندووم‌و ڕێگـای تەگبیر کردنم بۆ کەس نەماوە.

(٤) بەیدێ: وەرن. واتە: برادەرینە، فریام کەون سەرەتا زوخاو سەری‌داوە لە جەرگم.

(٥) واتــە: هــەی هــاوار وا دیـارە هـێشـتا خـاڵۆی کـۆمـاسی نـەیزانیوە مـن بـەم نزیکیانە کۆستێکی گەورەترم کەوتووە، وا داوای چارەو تەگبیرم لێ ئەکا. لە شیعرەکـانی پاشەوەی دا باسی ئەو کۆستەکەوتووەی ئەکا.

(٦) ماچان: ئەڵێن. واتە: وا بڵاوەکە ئازیزم بێ‌وەفایی کردووەو گفتو پەیمانی نێوانمانی

زیـــاد بـــی سـەردی پـەی غـەم كـەیلەكـەش
كەم بی گەرمی تـاو كـوورەی مـەیلەكـەش(١)

هـــەوای دۆس نـــۆش وە دەروون ئـــاوەرد
سفتەكەی كۆنەش یەكـجار جـە ویـر بـەرد(٢)

دیـدەكـەم تـۆ مـەیل خـەستەت زەروور بـێ
ئـەی بـێ شـەرتی‌یە فـرە چـێت دوور بـێ(٣)

خـەیلێ واتـم خـەیچ ئـێش زامـم مـەرد
ئـــای كـــولناتەوە ئـینە چـێشت كـەرد(٤)

بـــــەزەییت نـــاما بـــەی زاریـــمەدا
وەی نـــاڵەی شـــەوان بـــێداریـــمەدا

وەی دڵەی پـــڕ ئـــێش پـــڕ زوخـــاومەدا
وەی هـــەناسەی گـــەرم تـــەوەن تـــاومەدا(٥)

---

☞

خستووەتە پشت گوێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «جە یاد بەرد» نووسراوە «گردش مەرد» واتە: هەمووی شكاند.

(١) واتە: ساردی ئەو زیاد بووە لەگەڵ منا كە دڵم بە هۆیەوە پڕە لە خـەفەت، وە تـینی گەرمای كوورەی مەیلی كەمی كردووە.

(٢) هەوا: ئارەزوو. سفتە: سووتاو. واتە: ئارەزووی دۆستی تازەی گرتووەتە دڵو دڵدارە سووتاوەكۆنەكەی بە یەگجاری لە یاد بردووەتەوە.

(٣) فرە: زۆر. چێت: لێت. لێرەدا مەولەوی بە هۆنەری «التفات» ڕووی قسەی لە خاڵۆی كۆماسی‌یەوە وەرئـەچەرخـێنێتـە سـەر دۆستو پـێی ئـەڵێ: ئـازیزم، تـۆ پـێویست بـوو گرفتارەكەی خۆت خۆش بێ، ئەم بێ‌شەرتی‌یە زۆر دوور بوو لێتەوە.

(٤) خەیچ: ئۆخەی. كولناتەوە: كولاندتەوە. واتـە: زۆرم وت ئـۆخـەی ئـێشـی زامـەكـەم دامردووە، ئای ئەوە چیت كرد واكولاندتەوە.

(٥) تەوەن‌تاو: بەرد توێنەوە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «دڵەی پـڕ ئـێش» نـووسراوە «جەستەی پڕ هوون»، وە لە جیاتی «هەناسەی گەرم» نووسراوە «هەناسەی سەرد».

مـــن دڵم وە تـــیر تـــۆ ئـــێشـــا، یـــا ئـــەو
مـن جـەفاو مـەینەت تـۆ کـێشـام، یـا ئـەو[1]

مـن وێم وە سـەرگەرد بـاڵات کـەرد، یـا ئـەو
مـن وێم فـیدای خـاك پـاڵات کـەرد، یـا ئـەو

جـــە بـــەدبەختی وێم وەنـــەش وارۆ ســـەنگ
زانـــام بـــێ مـەیلی ئـەمما نـەك وەی رەنگ[2]

مـــن هـــیچ بـــەر کـــەنار، ئـــەحواڵم مـەپرس
خـــۆ قـــیامەت هـــەن جـــە خـــودا بـترس[3]

خـــــــاڵۆ دەرد دڵ بـــــــێ نـــــیهایەتەن
شکـــــایەت نـــــیەن، یـــــە حـــیکایەتەن[4]

ئـــــاوایـــــی پـــەی غـــەیر، وێران مـــاڵە وێم
عـــــاڵەم شـــــیرین‌کام، مـــەزاق تـــاڵە وێم[5]

---

(١) واتە: بۆ دۆستێکی تازە بۆچی وات لێ‌هات؟ بۆچی من بووم دڵم تێشا بە تیری تۆ یا ئەو؟ وە من بووم دەردو مەینەتی تۆم کێشا یا ئەو؟.

(٢) وەنەش وارۆ: لێی بباریٚ. یاخوا لە بەر بەدبەختی خۆم بـەرد بـباریٚ لە بـەختم، مـن ئەزانم بێ‌مەیلی بەڵام نەم‌ئەزانی بەم جۆرەی .

(٣) بەرکەنار: بـخەرە لاوە، وشـەیەکـی فـارسی‌یە. واتـە: چش لە مـن گـوێم مـەدەریٚو مەبەستت نەبم، بەڵام خۆ قیامەت و لێ‌پرسینەوە هەیە بۆچی لە خوا ناترسی؟

(٤) یە: ئەمە. مەولەوی لێرەوە رووی قسەی ئەکاتە خاڵۆی کۆماسی و پێی ئـەڵێ: خـاڵۆ گیان دەردی دڵی من بڕانەوەی نیە، ئەم قسانەش کە ئەیکەم سەرگوزەشتەیە ئەیگێڕمەوە، شکاتی حاڵ نیە، چونکە رەوا نیە دڵدار شکات لە دۆستی بکا.

(٥) واتە: ئاوەدانی حاڵ و ماڵ هەر بۆ بێگانەکانە، منیش کە ئەو هـەموو مـافەم بـە سـەر یارەوە هەیە ماڵم وێران بووە، هەروەها هەموو کەس دەمی شیرینەو هەر من دەمم تاڵ و ناخۆشە.

نــاوەش پــێ حــەرام، وەش حــەرامـە وێم
شــادی پــێ نــوقسان، غــەم تـەمامە وێم(١)

هــــەڵۆ زەدەکــــەی تــــرسیاگــــە وێم
درۆ بــــۆ یــــا راس هــەوەسیاگــە وێم(٢)

چ وەخت ئــــامای ئــینشای فــەردت بــێ
چ وادەی داوای دەوای دەردت بـــــــێ(٣)

گــــلاراو مــــەرگ چــێگــەو چــۆگــەمەن
دەخـــیل تــەدبیرێ جــارێ نــۆگــەمەن(٤)

••••••━━●━━••••••

**[٢]**

## نەسیم مەحرەم(٥)

نــــەسیم مــــەحرەم مــــابەین یــــاران
مــــاچان وەهــــارەن ســەوزەن دیــاران(٦)

---

(١) واتە: شتی ناخۆشم بۆ حەڵاڵەو خۆشیم لێ حەرامە، وە شادیم کەمو کورتەو خەمو خەفەتم تەواوە.

(٢) ترسیاگ: ترساو. هەوەسیاگ: حەپەساو. واتە: ئای وەك چۆلەکەی هەڵۆ لێداو ترساو خۆم، وە بە راست بێ یا بە درۆ بێ حەپەساوو سەر لێ تێکچوو خۆم.

(٣) واتە: خاڵۆ گیان ئەم کاتی نارەحتیو بێ ئیستراحەتی یەی دڵ کەی بۆ ئەوە ئـەشیا تـۆ هەڵبەستی تیا دانێیتو بۆمی بنێری وە داوای تەگبیرم لێبکـەی بـۆ دەرمـانی دەرد؟. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «چ وادەی داوای» نووسراوە «چ وەختو وادەی».

(٤) چێگەو چۆگە: لێرەو لەوێ. نۆگە: نۆبە. واتە: ئێستا من خۆم گلاراوم پـێ کـەوتووەو ئەمدیو ئەودیو ئەکەمو ئەمرم، کەواتە جارێ نۆبەی منە تۆ تەگبیرێکم بۆ بکەی.

**[٢]**

(٥) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ «شێخ عەزیزی جانەوەرەی» نـوسیوە، وە وای بـڕیـار داوەکە ئەبێ نەسیم بۆی بەرێ

(٦) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

گـــیان وە بــــێ تــاقەت مــوینوون ئــارۆ
زاهــــیرەن هـــەوای لای ئـــازیز دارۆ(١)

ئـــامێتـــەی خـــەیاڵ ئــەو دڵ پــەسەندەن
ئـێڵاخـــیچ هــەڵای کــەمێ یەخ بـەندەن(٢)

زەحـــمەت وە خـــەیاڵ ئـەو ئـــازیز مــەدەر
وەر نەیۆ گیان، هیچ، بە وێت تـەشریف بـەر(٣)

چـــون یـــاوای پـەرساش بـەناڵە عـەرز کـەر:
دیم تەن سـفتەکـەی خـەستەی زام خـەتەر(٤)

دڵ دەروون هــــەر یــەك وە دەس خــامەیێ
ئــــینشا کــــەردەبێ تــــوغرا نــــامەیێ(٥)

دڵش کــــەردەبێ وە دوو «هــــو» مــەرقووم
دەروونش وە هـــــوون «مُــحِبُّكْ مَــعْدُومْ»(٦)

---

(١) واتە: ئەی بای نەسیمی بەیانیان کە مەحرەمی بۆ هاتو چۆ لە نێوانی دۆستانا، ئەڵێن بەهارەو دەستو دەر سەوز بووەو وادەی وەزینی تۆیە، منیش وام دێتە بەر چاو گیانم ئەمڕۆ بێتاقەت بێو ئارەزووی وابێ بچێ بۆ لای شێخ عەزیزی جانەوەرەیی.
(٢) ئامێتە: تێکەڵ. هەڵای: هێشتا. یەخ: سەهۆڵ. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دواییش پێکەوە دێ.
(٣) مەدەر: مەدە. نەیۆ: نەیەت. واتە: بەڵام لەبەر ئەوەکە گیانم تێکەڵ بووە لەگەڵ خەیاڵی ئازیز، وەکوێستانیش هێشتا ساردە، زۆر ئازاری مەدەو رای مەکێشە بۆ لای خۆت، ئەگەر بە ئاسانی لەگەڵتا هات ئەوە باشە، ئەگینا خۆت بە تەنیا بڕۆو ئەم نامەیەم بۆ بەرە.
(٤) یاوای: گەیشتی. واتە: کە گەیشتی هەواڵی منی لێ پرسیت، بناڵێنەو عەرزی بکەو بڵێ چاوم بە دڵدارە لەش سووتاوە نەخۆشەکەت کەوت کە برینێکی مەترسی لێ کراوی پێوەیە.
(٥) خامە: قەڵەم. واتە: دڵو دەروونی هەریەکێ قەڵەمێکیان بە دەستەوە بوو، وە نامەیەکی مۆر لە سەریان نووسیبوو. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «توغرا» نوسراوە «سۆزش» واتە: نامەیەکی بە سۆز.
(٦) دوو: دووکەڵ. مەرقووم: نووسراوە. واتە: دڵی، بە دووکەڵی هەناسەی بە سۆزی

ئــەر تــەسدیع نــەبۆ وە جــان فـیدای وێت
گــۆش دەر ســەوادش بـوانـوون پـەرێت:[۱]

وە نـــام دەرمـــان زامـــان مـــوشکوڵ
جە نـەوای بـوڵبـوڵ جـە ئـیستیغنای گـوڵ[۲]

«بَـــعْدْ» وە دیــدەت شـــای نــەو نــەمامان
هـــەر ئـــێد مـژنەوو وەهــارێ ئــامان[۳]

نـــاستەنش هــــەوای نــەو بــەهاران پــێم
تــــەماشای وەهــار حــاڵەتــەکــەی وێم[۴]

شـــەتاوم هــــووناو دیـــدەی پــڕ دەردەن
نــــەسیمم شــنۆی هــەناسەی ســەردەن[۵]

---

☞

خۆی لە سەر نامەکە نووسیبووی «هو». دەروونیشی بە خوێنی خۆی لە خواریەوە ئیمزای نامەکەی کردبوو، وە نووسیبووی «مُحِبُّكَ مُعْدُوم» بە مەعنا «خۆشەویستت: مەعدوومی» جاران ئوسووڵ وابوو لە سەری نامە ئەنووسرا «هو» کە ئیشارەتە بۆ ناوی خوا.

(۱) سەواد: رەشایی. بوانوون: بخوێنمەوە. واتە: بڵێ بە ئازیز ئەگەر سەرت نایەشێ گوێ شل‌کە بۆ ئەم گیان‌فیدای خۆتە با نووسراوی نامەکەت بۆ بخوێنمەوە.

(۲) مـوشکوڵ: گـیرپێوەخـواردوو. واتـە: بـڵێ لە بـاتی «بسـم الله الرّحـمن الرّحیم» لە سەرەتای نامەکەوە نووسیویە دەس ئەکەین بەم نامەیە بە بەرەکەتی ناوی کەسێکەوەکە دەرمانی ئەو برینە خەتەرناکانەیەکە پەیدا ئەبن لە ناڵەو فوغانی بولبول‌و لە بێ‌باکی گوڵەوە. جاران ئوسووڵ بوو لە سەری نامەوە جارجار «بسم الله» ئەنووسرا.

(۳) مژنەوو: ئەبیسم. واتە: لە پاش دەس کردن بە نامەکە، بڵێ ئازیزی شای نەونەمامان بە چاوت قەسەم هەر ئەوەندە ئەبیسم کە بەهار هاتووە. لە شـێوەی نـامە نـووسین‌و کـتێب دانانی کۆنا پاش تەواو بـوونی هـێنـانی نـاوی خـواو سـپاس کـردنی‌و سـەڵەوات دان لە پێغەمبەرو ئاڵ‌و ئەسحابی، ئەنووسرا: «وبعد».

(۴) ناستەنش: نەی‌هێشتووە. واتە: سەیری بەهاری ئەحواڵی خۆم ئارەزووی نەوبەهاری لا نەهێشتووم. لە دوو شیعری پاشەوەی‌دا باسی بەهارەکەی خۆی ئەکا چۆن بەهارێکە.

(۵) شنۆ: شنە.

غـــونچەی نـــەشکوفتەم زام کـــاری‌یەن
بـــوڵبـــوڵم نـــاڵەی دڵ ئـــەوگاری‌یەن(١)

«والحـــاصل» ســـەمووم بـای تـاڵەی سـستیم
پـــەژمورده کـــەردەن وەهـــار هـــەستیم(٢)

تـــا واچـــی خـــەرمان خـــەم وەکـــۆنـــانێ
وەکـــەیف دەمـــاخ دووری تـــۆنـــانێ(٣)

خـــوسووس چـــون خـــەبەر مـــیاونانێ
گـــوڵان، بـــوڵبـــوڵان، مـــلاونانێ(٤)

مـــن وێم مـــوینوون خـــاتر زیـــزەنان
مـــەحرووم بـــۆی گـــوڵ رووی ئـازیزەنان(٥)

مکـــیانۆ رەحـــمەت حـــەسرەت وەکـــۆکـۆ
رەحـمەت پـەی جـەناب دەرد دووری تـۆ(٦)

کـــوورەی ئـــارەزوو جـــۆش ســـەختشەن
ئای بـێ مـەیل، ئـاوێ، دەخـیل وەخـتشەن(٧)

---

(١) نەشکوفتە: نەپشکووتوو. ئەوگاری: گرفتاری.
(٢) پەژمورده: سیس. واتە: بەکورتی بای بەدبەختیم بەهاری ژیانمی شین کردووە.
(٣) واتە: تا بڵێی خەرمانی خەم‌و خەفەتم کۆمەڵەو بە ئارەزووی دوژمنم کە بـریتی‌یە لە دووری تۆ.
(٤) میاونانێ: پێم‌ئەگەیەنن. ملاونانێ: ئەلاوێننەوە. مـەعنای ئـەم شـیعرەو دوو شـیعری پاشەوەی پێکەوە دێ. (٥) زیز: عاجز.
(٦) کۆکۆ: کۆمەڵ‌کۆمەڵ. واتە: بەتایبەتی لەو کاتەدا کە خەبەرم ئەدەنێ وا گـوڵ بـولبول ئەلاوێنێتەوە، من هەست ئەکەم کە خەفەتبارم‌و بێبەشم لە بۆنی گوڵ کە رووی یارە. لەبەر ئەوە، داخی نەلاواندەنەوەم لە لایەنی تـۆوە، بـەکـۆمـەڵ رەحـمەت ئـەنێرێ بـۆ دەردی دووریت، چونکە هیچ نەبێ کە دوور بی لێم خەفەتی ئەوە ناخۆم بۆچی نام‌لاوێنیتەوە.
(٧) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «ئای بێ‌مەیل ئاوێ» نووسراوە «ئاخ پەی سێڵاوێ». سێڵاو: لافاو.

ئـــاخر نــەك ئــێمــەیچ داخ نــە دڵێنــمێ
ســۆچــیای ئـــایر چـــون تــۆكــڵێنــمێ(١)

تــۆ پــەی نیشتمان، مـن پـەی سـەودای تـۆ
هــــەردوو بــــناڵیـــــن وە گـــریەو رۆ رۆ(٢)

[٣]

**نامەی نەفتینت(٣)**

نـــامەی نـــەفتینت یـــەك رۆ بـــاد ئـــاوەرد
كــڵپــەی بــڵێســەی كـوورەم زیـاد كـەرد(٤)

دەلاڵەت جـــۆشـــۆ چـــون رۆی ئـــازادی
گــەرمەی گــەرم نــەزم بــەزم پڕ شـادی(٥)

---

(١) نەك: بە مەعنا «بۆچی نە» یـە، ئیستفهامی ئینكاریـیە. سـۆچیا: سـووتاو. تـۆكـڵ: توێكڵ. واتە: كوورەی ئارەزووی دیدارت جۆشی سەندووە، ئای دەخیلم ئاوی وەسڵی پیاكە، وەختیەتی، با دامرێتەوە، ئاخر بـۆچـی ئـێمـەیش داخ لە دڵ نینو وەك تـوێكـڵی سووتاومان لێ نەهاتووە؟

(٢) نیشتمان: مەبەسی لە دڵی مەولەوی یەكە جێگای خەیاڵی دۆستە. واتە: كەوابـوو بـا هەردووكمان دەس كەین بە گریانو ناڵین، تۆ بۆ دڵی من كە جێگای خەیاڵتەو مـنیش بـۆ ئارەزووی تۆ.

[٣]

(٣) مەولەوی ئەم قەسیدەیەشی لە وەڵامی قەسیدەیەكی ئـەحمەد بـەگـی كـۆمـاسیدا نووسیوەكە باسی شاییو زەماوەندێكی گـەرمی تـیا نـووسیبوو بـۆ مـەولەوی، وە داخو حەسرەتی پیشان دابوو كەوا مەولەوی لەو شاییەدا نەبووە.

(٤) نەفتین: نـەوتاوی. واتـە: رۆژێكـیان «بـا» نـامەی نـەوتاویتی هـێنـاو دای بـە رووما، لەوەوە كڵپەی بڵێسەی كوورەی دەروونم زیاتر بوو.

(٥) دەلاڵەت: میهرەبانی. جۆشۆ: دێتەكوڵ. واتە: نامەكەت مـیهرەبانیو خـۆشـەویستی لێوە هەڵئەقوڵی، وەك رۆژی جەژن كە رۆژی گەردن ئازایی كردنی خـەڵكـە لە یـەكـتر،

سەدای «لاو هەی لاو»، زڕەی زەڕ زەنجیر
سڵسڵەو بانیسەر، بەندزریٚو لاگیر(١)

زیلەی گوارەو زرنگەی زەنگڵەی زەڕ
لەرزەی نەونەمام، لەرەی لیمۆی تەڕ(٢)

شەوق زەرقو بەرق، فەرق زەڕ کڵاو
ورشەو پرشەی خووی کوڵم بۆ گوڵاو(٣)

شەوقە تەقەی گەرم، چەپڵەو چیڵەی نەرم
چریکەی وە ناز، تریکەی وە شەرم(٤)

---

☞

وەکۆڕی گەرمی گۆرانی وتنو هەڵپەڕکێی پڕ زەوقو شادییە. لە شیعرەکانی پاش ئەم شیعرەدا مەولەوی وەسفێکی جوانی دیمەنی هەڵپەڕکێ ئەکا بۆ ئیشارەت بەو شاییو هەڵپەڕکێیەی خاڵۆی کۆماسی باسی کردبوو لە نامەکەیا، وە خەفەتباری خۆی پیشان دابوو کە مەولەوی تیا نەبووە.

(١) لاو هەی لاو: گۆرانیەکی کۆنە لە سەر ئاوازەی هەڵپەڕیون. زەڕزەنجیر: زەنجیری ئاڵتوون کە ئافرەتان ئەیدەن لە خۆیان. سڵسڵە: خشڵێکە ژنان ئەیدەن لەبەر شەدە. بانی سەر: پێنج لیرەیی یا پێنج قەرانی کە ژنان ئەیان دووری بە ناوەڕاستی کڵاوا. بەندزریٚ: هۆنراوەیەکی زیوە شەدەی پێ قایم ئەکرێ. لاگیرە: هۆنراوەیەکیتری زیوە تاکە تارانی پیاکراوە ژنان ئەیدەن لەملاو لەولای کڵاوزەڕ یا سەروێچ.

(٢) زیلە: زڕە. زەنگڵە: ئەو زریٚو لیرانە بەربوونەتەوە بە گوێ زێڕینی سەر سوخمەوە. لیمۆی تەڕ: مەبەسی مەمکی کچە هەڵپەڕکێکەرەکانە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «گوارە» نووسراوە «تەڵای گۆش» واتە: ئاڵتوونی گوێچکەکە هەر گوارە ئەگرێتەوە، وە لە هەندێکی ترا نووسراوە: «تیتەی گۆش» بە مەعنا خشڵی گوێچکە. وە لە هەندێ نووسخەی ترا یەکسەر شیعرەکە بەم جۆرە نووسراوە:

زێڵەی زایڵەی زرنگەی پۆیلەی هەی    کەوانەی دیانەی زنگڵەو لەرەی بەی

زایەڵە: دەنگ. پۆیلە: ملەوانی مووروو شیلانو کارەبا. کەوانە: چەمینەوە. دیانە: قولاپ. بەی: مەبەسی مەمکی کچانی هەڵپەڕکێکەرە.

(٣) فەرق: تەوقەسەر. زەڕکڵاو: کڵاوزەڕ کە لیرەو تاکە تارانی پیا دووراوە. خوو: ئارەق.

(٤) چیڵە: پێکەنین. چریکە: ئاوازی بەرزی مەقام وتن. تریکە: پێکەنینی پڕو ناسك.

سـَـــەمای دەســــماڵان، ڕەمـــای نـــەوهاڵان
نـــــەمای مـــەلالان، نـــمای وەش‌حـــاڵان[(١)]

چفەی گـەردەن کـەچ، مـەرگ مـن چـێش واچ
خـــاین وە خـــەفەت، نـــەزان جگـــەر پـاچ[(٢)]

---

(١) سەما: لەرە. دەسماڵ: دەسەسری دەسی سەرچۆپی کێش. ڕەما: ڕاکـردن. نـەوهاڵ: ئەونەمام، مەبەسی مناڵانی بەرگەڕەکەکە بە دەوری هەڵپەڕکێ‌کەرانا دێن‌و دەچن. نـەما: نەمان. نما: خۆنواندن.

(٢) چفە: چپە، قسەی نهێنی لە ژێر لێوەوە. گەردەن کەچ: ئەوەی ملی لار کردووەتەوە بۆ چپەکردن. چێش واچ: چی وت. جگـەر پـاچ: جگـەر لەتکـەر. واتـە: دیـمەنێ‌کـی‌تری هەڵپەڕکێ مل لار کردنەوەی هەڵپەڕکێ‌کەرانەو چپەکردنیانەکە لەولاوە ئەم‌و ئەو لە یەك ئەپرسن تۆمەرگی من چی‌یان وت، وە پیاوی بەدکار خەفەت دای ئەگرێ‌و ئەوەی نەزانێ چپەکەرەکان چی‌یان وتوە جگەری لە داخا لەت ئەبێ. لە هەندێ نووسخەدا ئەم شێعرە بەم جۆرە نووسراوە:

چـفەی بـێ‌وادە نـیازان نـازان     بن‌دەسی دادەنگ بازن نە بازان

نیازان نازان: ئەوانە نیازی نازکـردنیان هـەیە. بـن دەسـی: لە بـن دەس کـوتان بـۆ داوای بێ‌دەنگ بوون. بازن نەبازان: ئەوانەی بازنگیان لە قۆڵایە. لە نووسخەیەکی‌ترا لە جیاتی «چفە» ڕاستەوخۆ نووسراوە «چپە» وە لە جیاتی «نـیازان» نـووسراوە «نـەزاکـەت» واتـە: ئەوانەی بە نەزاکەتەوە ناز ئەکەن. لە نوسخەیەکی‌تریشا هەر جیاتی «نیازان» نـووسراوە «تـەیاران» واتـە: ئـەوانـەی نـازیان تـەواوە، وە لە نـوسخەیەکـی‌ترا لە جـیاتی «دادەنگ» نووسراوە «نازك» وە لە جیاتی «بازن نە بازان» نووسراوە «بازان یا نازان» بە مەعنای بێڵن یا نەیەڵن، واتە: دیمەنێکی‌تری هەڵپەڕکێ ئەوەتە هەندێ لە هەڵپەڕکێ‌کەرەکان بە شێوەیەکی ناسم دەس ئەدەنە بن باڵی هەندێکی‌تریان، وە دوو دڵن لەوە ئاخۆ بێڵن یا نەیەڵن. مەعنا دۆزینەوە بۆ ئەم هەموو نوسخانە وە نەبێ نیشانەی ئەوەبێ کە هەموویان ڕاستن، کەم‌جار وا ڕێ‌ئەکەوێ مەولەوی خۆی شیعرەکەی بە چەند جۆر گۆڕیبێ‌و جۆرەکانی پێشەوەشی هێشتبێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەکە نوسخەی دەسنووسی مەولەوی خۆیمان چنگ نەکەوت ناچار بووین هەموو نوسخەکان داتێین هەرچەند هەندێکیشیان لە نووسینەوەی بە غەڵەت پـەیدا بـوون، خـۆیشـمان ئـەوەمانە پـەسەند کـردووەکـە لە شـیعرەکـانا نـووسیومانە، خوێندەواریش بۆی هەیە بە بیری خۆی کام مەعنا پەسەند ئەکا بیکا تـا هـەر کـاتێ کـە نوسخەی ڕاستەقینە پەیدا ئەبێ.

**لارەی قـــــەتارەی لاو شــــــەدە لاران**
**ئـــیشارەی کـــەمکەم پــەنجە وشــاران[١]**

**شـــاخەی شــریخەی خشــڵ نــمیە رەنگ**
**فڕەی فۆتەی شۆڕ، پاژنۆی گوڵەنگ چـەنگ[٢]**

**خشەو خشپەی خاس، ترپەی پەنجەی کەوش**
**عیشوەو نەزاکەت، کـریشمەی بـێ خـەوش[٣]**

**وە لیــمۆی ئــاڵای کــاڵای بــاڵای شــەنگ**
**قرچەو چۆقەی جەرگ، دڵ وە خەمان تەنگ[٤]**

**خـــەمیاو چــەمیای نــاز نــیمچە کـناچان**
**دەنگ هــەی شـــاباش نــەوجوان واچــان[٥]**

**شـــاباش شـــادی شــــەیدای شــاباشان**
**خاس‌خاس کزەی سۆز دەروون خاش خاشان[٦]**

---

(١) لارە: سەرلار کردنەوە. قەتارە: ریز. لاو: جوان. پەنجە وشاران: پەنجە وشاردن. واتە: دیمەنێکی تری هەڵپەڕکێ خۆ لار کردنەوەی‌ریزی جوانەکانەو ئیشارەکردنیانە بۆ یەك بە پەنچە وشاردینێکی سووك.

(٢) شاخە: دەنگ. نیمە رەنگ: کاڵ. فۆتە: سەرپۆش. پاژنۆ: ئەو کێشەی کە ئەکرێتە کۆڵو تا عاستی ئەژنۆ دا ئەگرێ. گوڵەنگ چەنگ: گوڵنگ لار.

(٣) عیشوە: ناز. کریشمە: روانین بە لاچاو.

(٤) واتــە: دیــمەنێکـی‌تری هــەڵپـەڕکـێ هـەڵقـرچـانو لەرزە لەرزی جـەرگی دڵداران‌و خەفەتبار بوونی دڵیانە، یان هەڵقرچانی جـەرگی دۆسـتە دڵتـەنگەکـانە، بـە هـۆی ئـەو مەمکانەوەکە بەربوونەتەوە بە پارچەی باڵای جوانی یارانا.

(٥) خەمیا: لاربوونەوە. چەمیا: خۆ چەماندنەوە. نیمچەکناچان: ئەو کچانەی کە هـێشـتا پێ‌نەگەیشتوون. واچان: ئەیڵێن.

(٦) خاش‌خاش: تێك‌شکاوو ورد بوو. واتە: دیمەنێکـی‌تری هـەڵپـەڕکـێ، لە خـۆشـی‌یا شاباش کردنی ئەو کەسانەیەکە شەیدای شاباش کردن بوون، وە سۆزو کـزەی هـەناسە هەڵکێشانی ئەوانەیەکە دڵیان بریندارە.

یـــــاران، یـــــاوەران، هـــــای دەردەداران
بـــەیدێ بکـــــەردێ مـــن ســـەنگەباران(۱)

جـــە نـــەحسی تـــاڵەو جـــە بـــەدئیقباڵیـــم
هـــەر کـــۆ فـــرسەتەن مـــن یـاگـــە خـاڵیـم(۲)

روو ئـــــەو شـــیوەنان دەی ئـــەجەل بـــۆرێ
نـــەو بـــەزم شـــیرین مـایەی هـەر شـۆرێ(۳)

تـــــا وەی رەنگ زەرد چـــــون خـــەزانـــەوە
ســـیم ســـاف هـــەرس کـــەس نـــەزانـــەوە(۴)

هـــــــــەرلایێ بـــــادەی شـــــەوقیۆم وەردا
یەکسەر سـەر چـون گـیان شـاباشم کـەردا(۵)

---

(۱) یاوەر: یارمەتیدەر. بەیدێ: وەرن. بکەردێ: بکەن. لەهـەندێ نـوسخەدا لە جیاتی «یاران، یاوەران» نووسراوە «عەزیزان، خوێشان».
(۲) تاڵە: «طالع»، بـەخت. یـاگـە: جـێگـا. لە هـەندێ نـوسخەدا لە جیاتی «نـەحسی» نووسراوە «سـەختی»، وە لە هـەندێکـیترا نـووسراوە «شـوومی». هـەروەها لە هـەندێ نـــوسخەدا لە جـــیاتی «هـــەرکۆ فـــرسەتەن» نـــووسراوە «نـــە هـــەرجـــا بـــەزمەن». لە نوسخەیەکیتریشا شیعرەکە تێکرا بەم جۆرە نووسراوە:

یەگشت جە شوومیو بێئیقباڵییەن    وادەی حـاسڵات یـاگـەم خـاڵیـیەن

(۳) بۆرێ: وەرەوە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «شیرین» نووسراوە «شادی». مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(۴) سیم: زیو. هەرس: فرمێسك.
(۵) وەردا: بخواردایە. کەردا: بکردایە. واتە: ئەی خوا مەرگم بدا، من لەم کۆڕو ئاهەنگو شادییەدا رووم لە شیوەنو زارییە، تا بەم رەنگە زەردەمەوەکە ئـەڵێی رەنگـی گـەڵای پایزە، وە بەم دڵۆپە فرمێسکەکەس پێنەزانیوانەمەوەکە ئەڵێی زیوی بێگەردن، هەر تاوێك پیاڵەیەك شەرابی شەوقم بخواردایەتەوە، سەرو گیانم بەجارێ بکردایـە بـە شـاباش بـۆ یاران.

خـــاڵۆ گــیان نــامان پــەی نــەو نــەمامان
گیان دان وە مۆبەت، پەی مـەعدووم ئـامان(١)

[٤]

## نەوای کەژاوەی...(٢)

نـــەوای کــــەژاوەی لەیـــلیٚ نــــازانــەن
ســـەرەتای تــەڵمــیت شــیرین رازانــەن(٣)

وەی رۆی دمـــای کـــۆچ مـەجنوون بـەختانەن
نـــاڵەی فــەرهادی زامــەت ســەختانەن(٤)

---

☞

لە هەندیٚ نوسخەدا ئەم شیعرە بەم جۆرەیە:
جەو دما بادەی مەشق عەشقش بوەردام     تـا گـیان یـەکسـەر شـاواش بکـەردام
واتە: پاشان شەرابی فێربوونی عەشقی یارم بخواردایەتەوە، تا بە یەگجاری گیانم بکردایە بە شاباشی ئەو.

(١) لەم شیعرەدا مەولەوی وەرامی قسەیەکی خاڵۆی کۆماسی ئەداتەوەکە لە قسەکەی دا بۆ مەولەوەی نوسیبووی گوایە لەو شاییەدا چەند نەوجوان خۆیان ئەکرد بـەقوربانیو شاباش. مەولەوی ئەڵیٚ: خاڵۆکـەم، گـیان بـەخت کـردن ئـیشی نـەونەمامان نـیە، ئـیشی مەعدوومییە لە خۆشەویستیدا گیانی خۆی بکا بە شاباش. لە هەندیٚ نوسخەدا نیوەی دووهەمی ئەم شیعرە بەم جۆرەیە:
گیان دادەن پەی تۆ پەی مەعدووم ئامان     دادەن: دان.

[٤]

(٢) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لەکاتی کۆچ کردنی جافەکانا بۆ کویٚستان، وتووە.

(٣) واتە: دەنگی ئـەو کـەژاوانـە دیٚت کـە ئـەوەندە جـوانـن نـازاران پـیٚـیان ئـەنازن، وە سەرەتای تەڵمیتی یارە قسە خۆشەکان دیاری داوە. تەڵمیت: ئەو جیٚگەو بانەیەکە بەسەر پشتی وڵاخەوە تەخت ئەکریٚو لە سەری دائەنیشن.

(٤) دما: دوا. واتە: بە هۆی کۆچ کردنی یارانەوە دەنگی هـاوارو رۆ رۆی ئـەو دڵدارانـە دیٚت کە بەختیان وەك بەختی مەجنوون رەشە، وە ناڵەی وەك ناڵەی فەرهاد سەختی ئەو کەسانە بەر گویٚ ئەکەویٚ کە گرفتاری زامی سەخت بوون.

چـــون شـیّویـا لانـــەی دڵان پـــڕ داخـــان
جۆق جۆق سیاماڵ شین پەی لەیلاخان[١]

ســـــەرعێڵ عـــــەرزم هـــــەن لا بکـــــەرەوە
خـــێڵخـــانەی دڵان هـــا لە بـــەرەوە[٢]

مـــاڵاش ســــەرجـــەم وە دەرد ئـــەوگارەن
هـــەر دو هــــەوارگــەش مــافەتە دارەن[٣]

دەوڵەتــــــمەندەنی لا بـــــدەر چـــــەنەش
مـــاڵاتو حـــەشام وێت مـــەدەر وەنـــەش[٤]

کـــۆچ خـــێرت بـــۆ ئـــیمساڵ چـــون ســاڵان
تـــا لای ئـــێڵ بـــەگـــی ئـــێڵ نـــەوهاڵان[٥]

وەخـــتێ چـــون ســـاڵان وە دەروون ئـــاوەرد
پـــووشانەی دڵان لەوەڕیـــای ئـــەو هـــەرد[٦]

---

(١) شیّویا: تێك‌چوو. جۆق جۆق: پۆل پۆل. شین: ڕۆیشتن. واتە: ئەم ڕۆ ڕۆو ناڵە ناڵە بە هۆی ئەوەوەیەکە هێلانەی دڵدارە داخ لە دڵەکان رووخاو دەواری رەشی دۆستان کەوتە رێ بۆ کوێستان.
(٢) لێرەوە مەولەوی رووی قسەی ئەکاتە سەرعێڵی کۆچ کردووەکانو ئامۆژگاری ئەکا. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دواوە پێکەوە دێ.
(٣) ئەوگار: گرفتار. مافەتە: دەردێکە ئەکەوێتە ناو حەیوان.
(٤) چەنەش: لێی. حەشام: قەڕەباڵغ. وەنەش: پیایا. واتە: کاکەی سەرعێڵ قسەیەکم هەیە ئەمەوێ عەرزتی بکەم، لابکەرەوەو گوێم بۆ شل کە، یار کە جێگار هۆزی دڵانە لە پێشەوەیە، مەڕوماڵاتەکەشی کەکۆمەڵی دڵدارەکانیەتی، هەموو گرفتاری دەرد بوون، وە دەورو بەری ناوچەکەی دەردەدارە، چونکە هەرکەس نزیکی بکەوێتەوە بە دەردی خۆشەویستی گرفتاری ئەکا، تۆیش مەڕوماڵاتێکی زۆرت هەیە ئاگات لێ بێ خۆتی لێ‌لادەو ئەو مەڕوماڵاتەت مەدە بە قەڵبەی ناوچەکەی ئەودا.
(٥) ئێل بەگی: گەورەی عەشرەت: مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٦) پووشانە: مافی پووش کە حەیوان خواردوویەتی، خاوەن شوێن لە خاوەن حەیوانی ئەسێنێ. لەوەڕیا: لەوەڕان.

پـرسان کـۆن؟ چـێشـەن؟ پـووشانەش نـامان
چـــون تـــاڵای بـــەردان جـــواو دەر ئـــامان(١)

نـــە دیـــدەی شـــادی دیـــدەنش خـــار بـــی
جـــە ئـــاشنایيش تـــاقەت بـــێزار بـــی(٢)

گـــێج مـــەدا ســـەبوون شـــارەزوور دڵ
ســـیروان هـــووناو دەروونش گـــوڵ گـــوڵ(٣)

واژاوش مـــەویەرد نـــە دەمـــاخ دەم دەم
تـــاف مـــەوەست ســـەراو چـــەرخ زەڵم چـــەم(٤)

---

(١) کۆن: لەکوێیە. واتە: کوچی خێرت بێ ئەمسالیش چون سالان برۆ تا ئەگـەیتە لای سەرۆکی عەشرەتی نازارە تازە پێ گەیشتووەکان، کـە گـەیشتیتە لای وەك سـالان بـیری کردەوەو داوای پووشانەی ئەو دلانەی کرد کە لە هەرێمی یارا لەوەڕاون، وە باسی منی کردو وتی کوا بۆچی ئەمساڵ پووشانەی نەهاتووە، دەسم دامێنت تۆ لە جیاتی من وەك یەکێك ماڵی تالان کرابێ وەرامی بدەرەوەو پێی بڵێ... واتەکـەی لە شـیعرەکـانی لەمـەو پاش‌دا باس کراوە.

(٢) واتە: بـڵێ حـاڵی ئـەوەندە خـراپ بـوو چـاوپێ کـەوتنی وەك دڕك وابـوو لە چـاوی شادمانی‌دا، وە لە توانای «توانا» دا نەبوو ئاشنایەتی لەگەڵ بکا.

(٣) سەبوون: بایەکی گەرمە لەوانەیە لە هەرکەس بدا بیپڕووکێنێ. مەعنای ئەم شـیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.

(٤) واژاو: ئاوی زیادی سەرکردوو. چەرخ: چەم، بۆیە وای پـێ ئـەڵێن چـونکە بـە ڕێگـا ڕۆیشتنیا گەلێك پێچ ئەخوا. زەڵم: چەمێکـە سـەرچاوەکـەی لە دێی زەڵمـەوە لە بـناری شارەزوور داوێنی ملەی مڵەخورد لە نزیکی خورماڵەوە. سەراو: سەراوی سوبحان ئاغا، کانیاوو ئەستێڵێکە لە نزیکی سەیدسادقەوە لە شارەزوور. واتە: هەناسەی گەرمی دڵێ کە وەك بای سەبوونی شارەزوور بەتینە، گێژی ئەخوارد، وە خوێناوی دەروونی کە ئەوەندەی ئاوی سیروان زۆرە، هاتبوەکوڵ، وە ئەو خوێناوەی دەروونی تاو بە تاو لە زۆری‌یـاندا لە لووتیەوە سەری ئەکرد ئاوی وەك چەمی زەڵم تافگەی ئەبەست بۆ سەراوی سوبحان ئاغا. مـەولەوی لەم دوو شـیعرەی‌دا ورەدەکـاری‌یەکـی جـوانـی کـردووەکـە «سـیروان»و «زەڵم»«سەراو»و «شارەزوور»ی کۆ کردووەتەوە، لە لایەکەوە لەبەر ئەوەکە ئەم سێ ئاوە لە شارەزوورن، وە لە لایەکی‌ترەوە لەبەر ئەوەکە شارەزوور ڕێگای گوزەری جافەکان بووە.

عەدەمش نە پووش هەستی مەکەرد ساف
منمانا چون خەس هەستیش نە رووی تاف(۱)

هەوای هاژەی تاف بەردەبێ هۆشم
بەڵام ئەی چەند بەیت ئاما نە گۆشم:(۲)

ئای بەختم توغیان وێران ماڵیشەن
گەرمەسێر دڵ سیا ساڵیشەن(۳)

کۆز سۆچیای دەروون پڕ دەرد
ماڵات شادیم یەکسەر قڕان کەرد(۴)

کزەی رەشەبای هەناسان سەرد
سیاماڵ عەیش تەختە تەختە کەرد(۵)

هاوماڵان یاوان بە وارگەی جاران
من بێ بارەبەر مەندەی هەواران(۶)

---

(۱) خەس: پووش‌و پەڵاش. واتە: تاڤگەی ئاوی چاوی بە جۆرێك نابووتی کردبوو، نەبوونی کردبوو بە ئەسڵ، وە لە پووشی بوونی پاك کردبووەوە، ئیتر بوونی وەك پووش‌و پەڵاش بە سەر ئاوی تاڤگەوە ئەهات‌و ئەچوو.
(۲) ئاما: ئەهاتە. واتە: هەوای هاژەی تاڤگەی ئاوی چاوی هۆشی لا نەهێشتبووم، هەر ئەوەندە بوو گوێم لەم چەند شیعرەوە بوو لە لەشی وەك پووشیەوە بە سەر ئاوی تاڤگەوە. شیعرەکان ئەمانەی پاشەوەن.
(۳) گەرمەسێر: گەرمیان. سیاساڵی: ساڵی نەهاتی‌و بێ‌بارانی.
(۴) کۆز: جێگای کارو بەرخ. واتە: دەروونی پڕ دەردم وەك کۆزی سووتاوی لێ‌هاتووە، شادی‌و خۆشیم لانەماوەو وەك مەڕوماڵات قڕانی کردووە.
(۵) واتە: کزەی رەشەبای هەناسەی ساردم دەواری ژیانمی تێك‌داو تەختەکانی لە یەك کردەوە.
(۶) یاوان: گەیشتوون. مەندە: ماوەو پاشکەتوو. واتە: هاوماڵەکانم هەموو گەیشتنە هەوارگەی کوێستانی پێشوویان، من نەبێ لەبەر بێ بارەبەری لە جێی خۆما ماومەتەوە.

جـەورەکـەی سـەرئێڵ خـەم بـێ شـومارەن
خێڵخانەم بـەرپێچ تـا خـێڵ ئـەو خـوارەن[١]

[۵]

## نەتیجەی پاك دین[٢]

نـەتیجەی پـاك دیـن شـێخ سـازانـی
خـاس وەتـەن نـە دڵ مـەعدووم سـازانـی[٣]

پـەرسام «حَسْبَ الأَمْـر» گـوزەشتەی ئـەحواڵ
جـواو دا ڕێزەی شـیشەی قـەدیم سـاڵ[۴]

زەرفـێ بـیم نـە تـۆی وەخت شـامەوە
چـون سـتارەی سـوبح مـەدرەوشامەوە[۵]

---

(١) بەرپێچ: پێچراوە. واتە: جەوری ستەمی سەر عێڵی خەمو خەفەت لە ژمارە نایەت، لە بەر ئەوە من ناتوانم بڕۆم بۆ کوێستان وە دەوارم بە پێچراوەیی لە جێی خۆیا ماوە تا خێڵ تێتە خوارو ئەگەڕێتەوە بۆ گەرمیان.

[۵]

(٢) مەولەوی بەم قەسیدەیە قسە لەگەڵ شێخ مومنی سازانی ئەکاکە پارچە شووشەیەکی دابوە دەستی، وە داوای لێ کردبوو بزانێ سەرگوزەشتەی چیەو بۆی بگێڕێتەوە.
(٣) سازان: دێیەکە لە قەراغی چەمی سیروان لە ڕوژهەڵاتی عەبابەیلێوە لە قەزای هەڵەبجە. سازانی: دروستت کردووە. واتە: ئەی نەوەی ئایینپاکی پیری سازان، تۆ بە هۆی خووڕەوشتی بەرزتەوە زۆر باش لە ناو دڵما جێگەت بۆ خۆت دروست کردووە.
(۴) ڕێزە: وردە. واتە: بەپێی فەرموودەکەت سەرگوزەشتەی ئەو پارچە شووشەکۆنەم پرسی لە خۆی، ئەویش وەرامی دامەوەو وتی. وتەکەی لە شیعرەکانی پاشەوەدا باس کراوە.
(۵) شام: ئێواران. ستارە: ئەستێرە. واتە: پیاڵەیەك بووم ئەوەندە جوانو بریقەدار بووم لەکاتی ئێوارانداکە دنیا تاریك ئەبوو وەك ئەستێرەی بەرەبەیان ئەدرەوشامەوە.

پــەی گــوڵاو پــاشیو نــەشئەی بــەزم کــەی
گــا پــڕ گــوڵاو بــیم، گــا ســەرشار مــەی[۱]

گـــا وە ســـــەر رەفـــەی زەڕیـــن تـــاقەوە
گـــا وە دەس ســـاقی ســـیمین ســـاقەوە[۲]

گــا نــە ســەر پــەنجەی بــانووی بــێ نــیقاب
چــون ســوەیل رەونــەق پــەنجەی ئــافتاب[۳]

نـــە بـــەزم شـــیرین خـــوسرەوان دەور
مامام نــە گــەردش هــەر ســاتێ ســەد تــەور[۴]

گـــــوڵاو مـــــەپاشام وە رووی یـــــاراندا
بـــادە مـــەبەخشام وە مـــەی خـــواراندا[۵]

گــا گــەردەن نــە دەس نــازك ئــەندامــان
گــا دەس نــە گــەردەن ژەرەژ خــەرامــان[۶]

---

(۱) گوڵاو پاش: گوڵاو پرژاندن. کەی: کەیخەسرەو، مەبەس پادشاهانو گەورەگەورانە. واتە: لەکۆڕی بەزمی پادشاهانا جارجار پڕ ئەبووم لە گوڵاو، گوڵاویان تیا هەڵئەپژاندم، وە جارجار پڕ ئەبووم لە شەرابو تیامیانا ئەخواردەوە.
(۲) زەڕین تاق: تاقی زێڕین. سمین ساق: ساق وەك زیو سپیو جوان.
(۳) بانوو: خانم. نیقاب: سەرپۆش. سوەیل: ئەستێرەیەکی پایزەی سپییە بەر لە رۆژ هەڵدێ. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(۴) مامام: ئەهاتمە.
(۵) مەپاشام: ئـەمپرژانـد. مـەبەخشام: ئـەمبەخشی. واتـە: جـاروبار لەکـۆڕی شـادمانی پادشاهانا بە سەر پەنجەی خانمانی چارشێو لاداوەوە ئەگەڕام و گوڵاوم ئەپرژاند بە رووی دۆســتاناو شــەرابــم دابــەش ئــەکــرد بــەسەر مــەیخۆرەکــانا. لەکــۆکــردنەوەی «شیرین»«خەسرەو» دا بە عیلمی بەدیع هونەری «تەوریە» هەیە.
(۶) ژەرەژ: کەو. خەرامان: لەنجەولار. واتە: جارجار ملم بە دەستی ناسك ئـەندامـانەوە بوو، جارجاریش دەستم لە ملی ئەو جوانانەدا ئەبوو کە وەك کەو بە لەنـجەولار ئـەڕۆن. مەبەسی لەوەیەکاتێك کە ئەینێن بە دەمیانەوە ملەکەی ئەکەوێتە عاستی ملیان.

گـــاهێ روو وە رووی لەیـــلێ ئـــەندازان
گـــاهێ لەب وە لەب شـــای شـــیرین رازان(١)

هـــەستیم بـــێ شـــومار مـــەستیم وە کـۆ بـی
تـــوغیانم چـــون تـــاف جـــوانـی تـۆ بـی(٢)

جـــە رووی نـــادانـــی ئـەو بـەزمو ئـەو جـەم
وە جـــاویدانـــم مـــنمانا وە چـــەم(٣)

فـــەڵەك شـــی وە قـــین جـــەورو ســـتەمدا
ئـــەو بـەزمو ئـەو زەوق گشت دا وە هـەمدا(٤)

مـــنیچ وەی تـــەرزە وە ســـەد پـــارە کـــەرد
هـــەر پـــارە پـــەرێم ســـەد پـــەژارە کـــەرد(٥)

مـــەعدوومی عـــامەن بـــەڵاو دەردو بـــیم
ئـــەوەڵ قـــاروورەی شکســـتە مـــن بـــیم(٦)

---

(١) واتە: جارجار بە دەستی ئەوانە ئەبووم کە لە جوانی‌دا لەیلیان ناوەتە لاوە یان فڕەیان داوەتە بەر پێ، وە رووبە روویان رائەگیرام، جارجاریش لێوم بە لێوی شای قسە خۆشانەوە ئەبوو.
(٢) واتە: بوونم لە ئەندازە بە دەرو مەستیم کۆمەڵ بوو، وە خۆ لێبایی بـوونم ئـەوەندە زۆر بوو وەك تافی جوانی تۆ وابوو.
(٣) جاویدان: هەرگیز نەبڕاوە. منمانا: ئەنواند. واتە: لەبەر تێنەگەیشتنی خۆم ئەو بەزمو ئاهەنگو کۆمەڵەم وائەهاتە بەر چاو کە هەرگیز دوایی نایەت.
(٤) واتە: گەردوون لێم‌چوو بە قیناو ئەو هەموو بەزمو ئاهەنگەی تێك دا.
(٥) پارە: پارچە. پەرێم: بۆم. واتە: مـنی بـەم‌جۆرەکـرد بـە سـەد پـارچـەوە، وە بـۆ هـەر پارچەیەکم سەد خەمو مەینەتی دروست کرد.
(٦) قاروورە: کاسەی شووشە. واتە: هەی مەعدوومی! دەردو بەڵا نەك هەر من، بەڵکـو هەموو کەسی گرتووەتەوە، وە من یەکەمین شووشەیەك نیم شکابم. ئەمە ئـیشارەتە بـۆ مەسەلەی مەشهووری عەرەب «لیسَتْ اَوّلُ قارُورَةٍ کُسِرَتْ فِی الْاِسلامِ».

هــۆشــیار بــەر مـیوەی مـەستی غـەفڵەتـەن
غـــەفڵەت سـەرمایەی هـەزار خـەجڵەتـەن[١]

هــاکــا دەست چــەرخ هــەم ســتێزە کــەرد
چون مـن شـیشەی تـۆیـچ رێزە رێزە کـەرد[٢]

[٦]

## نەهاتو نەهات[٣]

نـــە هــاتو نــەهات دڵ مــاتەن ئــیمشەو
ئــەڵبـەت شـنۆی شـەو بـەراتـەن ئـیمشەو[٤]

ســـیاهەی دەفـــتەر مـــیرزای ئـــەزەلەن
زیـــادیو نـــوقسان رزقو ئـــەجەلەن[٥]

---

(١) واتە: وشیار بەرەوە ئەنجامی مەستی بێ ئاگایی‌یەو بێ ئاگاییش سەرچاوەی هەزاران جۆر خەجاڵەتی‌یە.

(٢) ستیزە: رقەبەرە. واتە: هەر ئەوەندەت زانی دەستی گەردوون لەگەڵ تۆیش کەوتە رقەبەرە، وە وەك منی وردو خاش کرد، شووشەی تۆیشی والێ کرد.

[٦]

(٣) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە شەوی بەرات «١٥ی شەعبان»ا وتووە.

(٤) هاتو نەهات: وشەیەکە لەکاتێکا بەکار ئەهێنرێ کە ئینسان چاوەڕوانی دەرکەوتنی کەسێك بێ و ئەو کەسە دیار نەبێ. واتە: دڵم ئەمشەو ماتە چاوەڕوانی دەرکەوتنی دۆستە، وادیارە بای شەوی بەراتە ئەدا لێم بۆیە دڵ وا چاوەڕوانی دۆست ئەکا. مەشهورە لە شەوی بەراتا رزقو رۆزیو مەرگو ژیانی هەرکەس لە دەفتەری قەزاو قەدەری خۆیا دیاری ئەکا. مەولەویش لەم شیعرانەدا ئیشارە بۆ ئەوە ئەکا.

(٥) میرزا: نووسەر، مەبەس لە میرزای ئەزەل خوایەکە لە ئەزەلا چارەنووسی هەموو کەسێکی لە دەفتەری قەزاو قەدەری خۆیا نووسیوە. واتە: ئەمشەو شەوی سیاهەگرتنەوەی زیادو کەم کردنی رزقو رۆزیو ژیانو مەرگە لە لایەن خواوە.

ئەو هاوە بەرات بێ ئەندازەوە
ئێد وە تەعلیقەی عومر تازەوە[١]

کەسێ قووتش نوقڵ راز یاوەرەن
یەکێ زیندەگیش وەسڵ دڵبەرەن[٢]

هانا هام دەردان چێش مەکەردێ پێم
من دیام نە رووی تەقسیم نامەی وێم[٣]

ژار دووری دۆس ئازیزەن نۆشم
نمەیۆ رازان شیرین نە گۆشم[٤]

یانێ جە شوومی بەخت سیای من
ئیمشەو لەرزان توولْ توولْ تاڵای من[٥]

وەڵگ زیندەگیم ها وە هەواوە
دیمادیمشەن وە بای فەناوە

ئەلوەدای تەئریخ کامەرانیمەن
نیشانەی ئاخر زیندەگانیمەن[٦]

---

(١) تەعلیقە: هەڵواسراو. واتە: یەکێك بەراتی بێ‌ئەندازەی بە دەستەوەیەو یەکێکی‌تر سەر لە نوێ عومری بۆ نوسراوەتەوەو فەرمانەکەی کردووەتە ملی.
(٢) واتە: یەکێك قسە وەك نوقڵ شیرینی یاران خۆراکیەتی‌و یەکێکی‌تر بە وەسڵی یار ئەژی.
(٣) دیام: روانیم. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٤) نمەیۆ: نایەت. واتە: دەخیلتانم ئەی هاودەردەکانم چیم لێ ئەکەن، من سەیری دەفتەری چارەنووسی خۆمم کرد بزانم خوا چی بۆ داناوم لە م شەوی بەراتەدا، سەیرم کرد ئەبێ ژاری دووری دۆست بنۆشم‌و قسەی خۆشم بەر گوێ نەکەوێ.
(٥) توولْ «ی یەکەم»: لق. توولْ «ی دووەم»: نەمام. تاڵا «طالع»، بەخت. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٦) وەڵگ: گەڵا. دیمادیم: دیوەودیو. واتە: مەبەسم ئەوەیە بە هۆی شوومی چارەی

یـــاران ویـــەردن نـــۆبـــەمەن دەی دەی
ئـیسە وەكـارەن سـاقی نـەشئەی مـەی[١]

سا دەی تـای دوگـمەی یـەخەی دڵ پـەسەند
ئازاد كـەر چـون دڵ بـێ دەردان جـە بـەند[٢]

پـــەشێو كـــەر لانـــەی دڵان جـــە ســـەردا
گـۆشـــەی عـــەرەقچین بـاوەر وە بـەردا[٣]

مـــایل بـــۆ كـــەمێ ئـەو ئـەو گـۆشـەی چـەم
گۆشەی چەم ئەو جام، جام ئـەو ئـەهل خـەم

دەورت گــــەرد جـــەور دەوران دا وە بـــاد
ناز واچـۆ بـنۆش، غـەمزەكـەت نـۆش بـاد[٤]

---

☞

رەشمەوە لق و پۆپی درەختی بەختم كەوتووەتە لەرە، وە گەڵای ژیانم بە ئاسمانەوە بـای لەناوچوون ئەمدیوو ئەودیوی پێ ئەكـا، وەكـەوتوومەتە مـاڵاوایـی كـردن لە بـەختیاری و نیشانەی مەرگم دیاری داوە.

(١) ویەردن: بەسەرچوون. مـەولەوی لێرەوە بـە ئـوسووڵەكـەی خـۆی پـەنا ئـەباتە بـەر سـاقی و مـەی، وە ئـەڵێ: هـاورێیـان هـەموو مـردن و سـەرە هـاتووەتە سـەر مـنیش، كەواتەكاكەی مەیگێڕ ئێستەكاتی خۆیەتی پیاڵەیەك شەرابم بدەرێ.

(٢) تا: تاڵ. واتە: ئەو تاڵە دەزووەی كە ئاڵاوە لە قۆپچەی سـوخمەكـەی سـەر یـەخەی دڵگرتووەكەت، بیكەرەوە، وە وەك دڵی ئازادی لە وانە دەردیان نیە لە بەندی ئازادكە.

(٣) لانەی دڵان: مەبەس لە زوڵفەكە هێلانەی دڵی عاشقانە. عەرەقچین: كـڵاو. بـاوەر: بێنە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوە پێكەوە دێ.

(٤) واچۆ: بڵێ. بنۆش: بنۆشە. واتە: زوڵفەكانت لە سەرەوە تێك بدەو كڵاوەكـەت بـێنـە پێشەوەو كەمێك لاری كەرەوە بۆ لای گۆشەی چاوت، گوشەی چاویشت لار كەرەوە بۆ لای پیاڵەی شەراب و پـیاڵەكـەش لار كـەرەوە بـۆ لای لێوی ئـەو دڵدارانـەی كـە خـەمی عەشقیان لە دڵایە تا ئەم هەڵسووڕانەت بە پیاڵەی شەرابەوە گەردو تۆزی جەوری زەمانە بدا بە با، بە جۆرێ كە نازت بڵێ بینۆشەو غەمزەكەشت بڵێ نۆشی گیانت بێ.

تــا فــوارەی وشك لوولەی پــێشـــەی ڕێش
هەر یەك پرشەی زووخ هورشانۆ پەی وێش(١)

وە شـــــنۆی نــــەشئەی مــــەستیم وانـــۆوە
یــەك ئـەمجار جـە دەس هـەستیم سـانۆوە(٢)

[٧]

## نمانای بەهەشت(٣)

نـــــمانای بـــــەهەشت پــێشـــانی نـــووری
ئـــــــازیز وەی ســــــفتەی دۆزەخ دووری(٤)

دووریت عـــــەزابـــێ ســـاز دابـــێ پـــەرێم
عـــــەزابـــێوتـــەر دا، ئـــاماو لوات پـــێم(٥)

ئـــای هـــەنی جـەی دەرد كـێ دەرمـان سـازۆ
وە هـــەمسایە ســـەگ كـــام دەرمـــاڵ نـازۆ(٦)

---

(١) پێشە: ئێسقان. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێكەوە دێ.

(٢) وانۆوە: بخوێنێتەوە. سانۆوە: بسەنێتەوە. واتە: بۆ ئەوە فوارەی وشك بـووی لوولەی ئێسقانە بریندارەكانم، هەریەكە لە عاستی خۆیا پرژێ زووخ فرێ بداتە دەرەوە، وە بە شنەی ئەو پرژ هەڵدانە بڕیاری مەستیم بخوێنێتەوەو بۆ یەكجاری لە دەستی بوون رزگارم بكا.

[٧]

(٣) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی پاش گەڕانەوەی شێخی «بهاءالدین» وتووەكە چووبوو بۆ دیدەنی.

(٤) نـمامانا: نـیشانتدا. پێشـانی: نـاوچاو. نووری: نـوورانـی. واتـە: ئـازیز نـاوچاوی نوورانیتت پیشاندا بەم سووتاوی دۆزەخی دووری‌یە.

(٥) واتـە: دووریت عـەزابـێكـی بـۆ سـازدابـووم، ئـێستاش هـاتن و گـەڕانـەوەكـەت عەزابێكی‌تری بۆ سازدام.

(٦) جەی: لەم. هەمسایە: دراوسێ. نازۆ: بنازێ. واتە: ئای ئیتر كێ دەرمانی ئەم دەردی دووركەوتنەوەیەتم بۆ ساز بكا، وە من ئولفەت بەكێی‌ترەوە بگرم؟ دیارە ناتوانم ئولفەت بەكەسی‌ترەوە بگرم، چونكە سەگی هیچ دەرماڵێ نانازێ بە دراوسێ.

چـــەم وە گــــەرد رای کـــێ رۆشـــنا بـــۆ
لەب وە یـــاگـــە پـــای کـــێ ئـــاشنا بـــۆ(١)

رۆی وەســـڵت ئـــەر ســـەد زەروور نـــەفامەن
مـــزانـــام فـــەڵەك چـــەپ گـــەردش نـــامەن(٢)

فـــــەڵەك داد جـــە دەرد بـــێ دەواکـــەی تـــۆ
مـــوغەننی فـــەریاد ئـــەو نـــەواکـــەی تـــۆ(٣)

بـــوڵەنـــد کـــەر مـــەقام «دڵســـۆز» وە راســـی
تـــەنزیلەش فـــەرد گـــەل خـــاڵۆی کـــۆمـــاسی:(٤)

رۆی وەســـڵت هـــەر بـــیم ئـــەی رووە پـــێم بـــێ
جـــەو بـــۆنـــە هـــەررۆ رۆرۆ خـــدێم بـــێ(٥)

ئـــــیسە هـــــا فـــــەڵەك نـــیشان دادەن پـــێم
ئـــاخ تـــرسیاگـــەکـــەی گـــیر ئـــاوەردە وێم(٦)

---

(١) لەب: لێو. یاگە: جێگە. واتە: لەمەو پاش تۆزی ڕێگای کێ ببێ بەکـلەو چـاوم روون بکاتەوە، وە لێوم ژێر پێی کێ ماچ بکاو شارەزای ببێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «یاگە» نووسراوە «خاك».

(٢) زەروور: پیاوی ناچارو ناعیلاج. مزانام: ئەمزانی. واتە: هەرچەند پیاوی داماوو ناچار عەقڵی لە جێی خۆیا نیەو هیچ نافامێ، بەڵام من هەر کە بە تۆ گەیشتم ئەمزانی گەردوون ناوی چەپگەردەو هەمیشە بە ئارەزووی دڵ نابێ.

(٣) ئەو: لە. مەعنای نیوەی دووهەمی ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشیەوە.

(٤) دڵسۆز: ئاوازێکی کۆنی کوردی‌یە. تـەنزیلە: وشـەی دوعـا، لێرەدا مـەبەسی بـەیتی گۆرانی‌یە. واتە: کاکەی گۆرانی بێژ هاوار بۆ ئاوازە خۆشەکەت، تۆخوا دەنگی لێ هەڵبڕەو نقامی دڵسۆزمان بۆ بڵێ بە شیعری خاڵۆی کۆماسی‌یەوە. شیعرەکانی خاڵۆ ئەم سیانەن کە لە پاش ئەم شیعرە دێن.

(٥) بیم: ترس. واتە: ئەو رۆژەی پێت‌گەیشتم ترسی ئەمرۆم لە دڵا بوو، لە بەر ئەوە خۆم دابووە هاوارو رۆرۆ.

(٦) واتە: وا ئێستا فەڵەك ئەوەی پیشان دام کە لێی ئەترسام، ئای هاوار بۆ منی ترساوی گیر خواردوو.

ئـــەمجار کـــێ تـــاقەت دووری تـــۆ دارۆ
دەك بـــــەرق غـــەزەب وە جـــەسەم وارۆ[١]

[٨]

## ئەی گەهوارەی[٢]

ئـــەی گـــەهوارەی دەور تـــای دەسـرازە خـەم
تاکەی سەر ئەنگوشت غەفڵەت نە تۆی دەم[٣]

بـــازیت پـــێ وەردەن هـــەر یـــەك وە لایـــێ
ســـــــەدای دایـــــەنان وە لایـــــەلایێ[٤]

هـــای نـــە فـــەرقش هـــەن ئـــەو سـەداو تـەئسیر
تـــا ئـــەو لاونـــاو ئـــەو مـــەزەو ئـەو شـیر[٥]

---

(١) دارۆ: هەیەتی. ئەم شیعرە لە قەسیدەیەکی تریشا رابوورد، بەڵام لەوێ ئیشارەتمان نەکردبوو بۆ ئەوەکە هی خاڵۆی کۆماسی‌یە.

[٨]

(٢) وەك لە سەر نوسخەکەی مەلا خالیدی رەبانی نووسراوە، مەولەوی ئەم قەسەیدەیەی بە بۆنەی مردنی دایکیەوە وتووە، بەڵام هیچ نیشانەی ئەوەی پێوە نیەکە بۆ لاواندنەوە بێ، وە لە هێنایە یادی قەبرو قیامەت بەولاوە رازێکی‌تری تیا دەرناکەوێ.
(٣) گەهوارە: بێشکە. دەسرازە: ئەو پەتەی منالّی پێ توند ئەکەن لە بێشکەدا. ئەنگوشت: پەنجە. مەولەوی لەم قەسیدەیەدا روو ئەکاتە نەفسی خۆی‌و ئەڵێ: تاکەی لە بێشکەی زەمانەدا کە تاڵی دەسرازەکەی لە خەم‌و خەفەت هۆنراوەتەوە، سەرپەنجەی بێ‌ئاگایی ئەبەی بە دەمتا وەك منالّی ساوا؟
(٤) بازی: یاری. دایەن: ئەو ئافرەتەی کە راگیری ئەکەن بۆ شیر بە منالّ دانو بەخێو کردنی. لایەلایە: وشەیەکە دایك بە نقامێکی تایبەتی‌یەوە ئەیڵێ بۆ خەوتاندنی منالّ. واتە: دەنگی لایەلایەی دایەنەکان هەریەکێ لە لایەکەوە هەڵت ئەخەڵەتێنێ. مەبەس لە دایەن نەفس‌و شەیتانە.
(٥) های: وشەی وریا کردنەوەیە. لاونا: لاواندنەوە. واتە: دەنگی ئەو لایەلایە لە سەری ئینسانا ئەمێنێتەوەو کاری خۆی ئەکا تا ئەمرێ‌و لاواندنەوەی ناو قەبر ئەبیسێ‌و مەزەو شیری ئەوێ ئەچێژێ.

هـەر تـفلێ بـێ شك نـەی بێشك خـەفتەن
جـەی دایـە بـڕیـان بـەو دایـە جـفتەن[۱]

وەس خـاکـبازی کـەر بـێدار بـەر ئـامان
بـڕیـانەوەی تـۆیـچ سـەروەختش ئـامان[۲]

هـا وە قـەفاوە یـەند شـی بـە وێدا
چـەم بـێ بـینایی مـدیۆ وە رێدا[۳]

قـەزا وە قـومار نـە پـای بـاختمەن
قـامەت حـەڵقـە بـەست وەخت تـاختمەن[۴]

موتریب، سازەکەت ئـۆف چ وەش تـەرز بـێ
ئەمجاریش وەك دەنگ مەجلیس هەر بەرز بێ[۵]

تـا کـوورەی زاریـم بـڵێسـە سـانۆ
داخ لوای وێم جـە دڵ نـەمانۆ

داد نـەمەدۆ داد شـین، مـالوومەن لێم
دمـای وێم پـەرێم هـیچکەس وێنـەی وێم[۶]

---

(۱) واتە: بێ گومان هەر منالێك لە بێشکەی گەردوونا خەوتبێ لە دایکی ژیان ئەبڕێتەوەو ئەنرێ بە بەری دایکی قەبرەوە.

(۲) خاکبازی: یاری کردن بە خۆڵ. واتە: بەس یاری بکە بە خۆڵ، دەخیلتم وریا بەرەوە، وەختی بڕانەوەی تۆیش هاتووە لە مەمکی ژیان.

(۳) واتە: وریا بەرەوە ئەوەندە پشتت کۆم بووەتەوە لەبەر پیری، کە ئەڕوانی بە ڕێگادا چاوت هیچ نابینێ. مەولەوی لە شیعرەکانی لەمەوە دواوە لە قسە لەگەڵ خۆ کردنەوە دێتە سەر قسە بە دەمی خۆوەکردن.

(۴) باخت: دۆڕاندن. تاخت: تاڵان کردن. واتە: قەزاو قەدەر وەك قومارچی خۆی ئامادە کردووە پێم بدۆڕێنێ، وە باڵای راستم چەمیوەتەوەو وەختی تاڵانکرانی سامانی ژیانمە.

(۵) مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(۶) واتە: کاکەی ئاهەنگگێڕ! ئۆف ئاوازی سازەکەت چەند خۆش بوو، دەسا با

☜

[٩]

## نازك تەدارەك

نـــــازك تـــەدارەك فـــەسڵ وەهـــاران
شـــیرین ئـارایش هــەردەو كـۆسـاران[١]

گوڵ چـون رووی ئازیز نـەزاكـەت پۆشـان
وەفراوان چون سەیل دیدەی مـن جـۆشـان[٢]

مـــدیان گـــوڵاڵان نـــە پـای دەربـەندان
ئـەو یـەكـتەر وێنـەی ئـارەزوومەندان[٣]

چ خـــاس خـــاس شـــنیۆ نـــە ئـێوارانْدا
سـەوزە وە رووی خـاك جـەرگەی یـارانْدا[٤]

---

☞

ئەمجاریش وەك دەنگی كۆڕی ئاهەنگی یاران بەرز بێتەوە، بەڵكو كوورەی گریانو زاریم بڵێسە بسێنێو داخی مەرگی خۆمم لە دڵا نەمێنێ، چونكە لێم ئاشكرایە پاش خۆم شینو گریانی كەس بە سەرما وەك هی خۆم كەڵكی نابێ بۆم.

[٩]

(١) تەدارەك: خۆ رێكخستن. ئارایش: خۆ رازاندنەوە. واتە: نامەخوا فەسڵی بەهار چەند ناسكەو جوان خۆی رێكخستووە، وە هەردو كوێستانەكان چەند شیرین خۆیان رازاندووەتەوە. لە شیعرەكانی پاشەوەدا چەند وێنەیەكی جوانی ئەم خۆرێكخستنو خۆ رازاندنەوەیە باس ئەكا.

(٢) واتە: گوڵ وەك رووی یار بەرگی ناسكی پۆشیوە، وە بەفراو وەك لافاوی چاوی من هاتووەتە جۆش.

(٣) مدیان: ئەڕوانن. واتە: گوڵاڵەی داوێنی دەربەندەكان وەك یارو دڵدار تەماشای یەكتر ئەكەن.

(٤) شنیۆ: ئەشنێ. واتە: ئای گیای سەوزی سەر خاكی قەبری كۆمەڵی یاران بە ئێوارانا چەند جوان ئەشنێتەوە.

بــوین رەعشــەی وەجــد دڵەی پــاکشــان
عــەیان نــە شــنیای ســەوزەی خــاکشــان(۱)

جــەی گــۆشــەی خــاستەر نـیەن مـەسکەنێ
ســاقی گــیان ئــامان خــومار ئــەشکەنێ(۲)

هــــۆریزە، ســــوبحەن، دڵ تــازە خــاوەن
شــنۆی پــای کــاوەن، گــۆشــەی ســەراوەن(۳)

ســـەوزەی خـــاك پـــاك یـــاران هـــام فـــەرد
فــرەمان وە فــەرش بــەزم ویمــان کــەرد(۴)

کەو سەوزەی ئـێمـەیچ نـە کـام هـەردێ بـۆ؟
وە فـەرش مـەجلیس کـام هـام فـەردێ بـۆ(۵)

---

(۱) بوین: سەیرکە. رەعشە: لەرە. وەجد خۆشەویستی. عەیان: ئـاشکرا. واتـە: سـەیرکە دڵەلەرزەی دڵداری خاوێنیان بە ئاشکرا لە شنەی سەوزایی سەر قەبرەکانا دیارە.
(۲) خومار ئەشکەن: سەرخۆشی لابەر. واتـە: کـاکـەی مـەیگێڕ دەخـیلتم شـوێـنم لەم شوێنە باش‌تر نابێ پیاڵەیەك شەرابی بیرکردنەوەم بدەرێ چاری دەردی بێ‌ئاگایی خۆمی پێ‌بکەم. مەولەوی لەم شیعرەدا تەعبیری زۆر وردی بەکار هێناوەکە شەرابی بە دەرمانی هۆش کردنەوە داناوە، وە مەبەستی لە بێ‌هۆشی گوێ نەدانە بە پاش مردن.
(۳) هورێزە: هەڵسە. واتە: کاکەی مەیگێڕ، هەستە دڵ تازە لە خەو هەڵساوە، بەرەبەیانی زەوق‌و شادی‌یەتی، داوێنی شاخەکان شنەیان دێت‌و شوێنەکەمان گوێی ئاوە، با ماوەیەك بە خۆشی رابوێرین.
(۴) فرە: زۆر: مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(۵) کەو: ئاخۆ. واتە: ئێمە زۆر جار سەوزایی سەر خاکی پاکی گۆڕی دۆستانمان کرد بە فەرش بۆ ئاهەنگ‌و رابواردنی خۆمان‌و لە سەری دانیشتین، ئاخۆ سەوزایی سەر گـۆڕی ئێمەیش لەکام هەردا بێت‌و ببێ بە فەرشی ئاهەنگی کام دۆست‌و برادەر؟

## [١٠]

## نەتیجەی پاکان(١)

نـــەتیجەی پـــاکـــان، نـــەتیجەی پـــاکـــان
شـــێخ خـــاس‌خەیاڵ نـــەتیجەی پـــاکـــان(٢)

فـــەرەح بـــەخش حـــاڵ خـــاتر غـــەمناکـــان
دەرمـــان زامـــان خـــەڵتـــان نـــە خـــاکـــان(٣)

مـــەعدووم ئـــانا هـــا جـــە گـــیان تـــەواسـان
کـــەیلەن جـــە خـــەیاڵ خـــاڵ خـــاڵ‌خـــاسان(٤)

گـــرمەی کـــوورەی دڵ ســـەد هـــەزار تـــەرزەن
گـــرمەی بـــڵێســـەش نـــە عـــاڵەم بـــەرزەن

تـــۆ پـــەی چـــێش ئـــامان ئیمانت هـــەردەن
ئـــەسپاب فـــــەوتت ئـــــامادە کـــەردەن(٥)

وەی دەمـــــەی نـــەفەس بـــەد حـــاڵی‌یـــەوە
وەی دڵەی پـــــارەی زوخـــــاڵی‌یـــــەوە(٦)

---

[١٠]

(١) مەولەوی بەم قەسیدەیە قسە لەگەڵ شێخ حەسەنی سازانی ﷺ ئەکاکە یەکێك بووە لە پیاوانی خوا.

(٢) واتە: ئەی شێخێ کە نەوەی پیاوانی پاك رەوشت‌و پاك باوەڕی وە بیرو نیازت چاکە...

(٣) واتە: ئەی خۆش‌کەری دڵی دڵ خـەفەتباران، وە ئـەی دەرمـانی زامـی ئـەوانـەی لە خوێناوا ئەتلێنەوە.

(٤) ئانا: ئەوەتە. تەواسان: وەرز بووە.

(٥) واتە: تۆ بۆچی ئیمانت لا نەماوە لە خوا ناترسی‌و هۆی لەنـاو بـردنی مـەعدوومیت فەراهەم کردووە؟

(٦) دەمە: ئەو با ساردەیەکە زستانان لە سـەر لووتکـەکـێوەکـان بـەرز ئـەبێتـەوەو وردە پرووشی بەفر لەگەڵ خۆی هەڵئەگرێ‌و ئەیدا بە رووی رێبواراو زۆر جار رەقی ئەکاتەوە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.

کــــوورەی دەروونت وە جــۆش ئـاوەردەن
دووکەڵ جـە گـۆشـەی فـەڵەك سـەرکەردەن[١]

پــەی کــێ ئــەی جــەستەی وێت مـەتاونی
زامــەکــەی مــەعدووم هــەم مــەکـاونی[٢]

مـــن ئـێش پـــڕ نــێش دەروونــم وەســەن
بۆ خـەلاسم کـەر حـەسەن هـەی حـەسەن![٣]

## [١١]

### نەسیم دووری[٤]

نــەسیم دووی دەروون چـون هـەردە جـاران
ئــــیمجار دەر نــە کــاخ دەمــاخ یــاران[٥]

واچـــە دیـم وە چــەم دێوانــەکــەی تــۆ
رووش کەردەن نـە رووی ئـاسانەکـەی تـۆ[٦]

---

(١) واتە: لەگەڵ ئەوەشا مەعدوومی بە هۆی بەدحاڵی‌یەوە هەناسەی سارد هەڵئەکێشـێ و دڵی پارچە بووەو رەش بووەتەوە، تۆ تەنووری دەروونـی خـۆتت داخسـتووەو دووکـەڵ سەری کردووە لێی و هەموو ئاسمانی گرتووەتەوە.

(٢) مەتاونی: ئەتوێنیتەوە. مەکـاونی: ئـەکـلێنیتەوە. واتـە: ئـەم لاشـەی خـۆتـە بـۆ کـێ ئەتوێنیتەوەو زامی مەعدوومیشی پێ ئەکلێنیتەوە؟

(٣) وەس: بەس. واتە: حەسەن، من زامی پڕ ئێش و ئازاری دەروونـی خـۆمـم بـەسە، دەردی خۆیشتی مەکە بە سەر بار، وەرە رزگارم کە.

[١١]

(٤) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەرامی نامەیەکی شێخی «بهاءالدین»دا ﷺ نووسیوە.

(٥) واتە: ئەی بای نەسیم ئەمجاریش وەك جارەکـانی‌تر بـڕۆ دووکـەڵی دەروونـم بـدە لەکۆشکی بەرزی دەماخی دۆست، با تێ‌بگات ئێستا ئاگری دەروونم چەند بە تاوە.

(٦) واتە: پێی بڵێ بە چاوی خۆم دۆستە شێت بووەکەتم دی رووی کردبوو بەردەرگای تۆو ئەی‌وت: واتەکەی لە شیعرەکانی پاشەوەیدا دێ.

نـــــامەی ئـــایرین دڵســـــۆزیت یـــــاوا
بـــڵێســـەم وە سـای گـەردوون سـەر سـاوا(١)

ســــۆچـــنا جــەستەی زامـــەتان خـــەستە
لابـــەرد تــۆی دەروون دڵەی دەرد گــەستە(٢)

وەشـــیو شـــادیو زەوق پـــەی ئـێمـە نـیەن
جــە دەســـمان رشـــتەی راحـــەتی شـیەن(٣)

دوژمـــــنی فــــەڵەك پـــێمـــان قــەدیمەن
چـــەنیمان مـــەینەت قـــەدیم نـــەدیمەن(٤)

مـــــەست بــــادەی کـــەف رۆزگـــارانـیم
بـــێ هـــۆش هـــیجران قـــەدیم یـــارانـیم(٥)

نــە دڵ ئـــەو دڵەن، نـــە هـۆش ئـەو هـۆشـەن
نە فام ئەو فـامەن، نـە گـۆش ئـەو گـۆشـەن(٦)

هـــەر کـــاتێ زانـــای فـــەڵەك نـــەردێ شـەند
وێنـەی هـام جـامان، جـامان وە جـا مـەند(٧)

---

(١) واتە: نامە ئاگرینە پڕ لە دڵسۆزییەکەت گەیشت، وە ئاگری خۆشەویستیمی بەتین‌تر کردو زوبانەی بڵێسەی دەروونم خۆی دا لە ئاسمان.
(٢) واتە: لەشی گرفتاری زەحمەتمی سووتاندوو توێکی دڵی دەرد گەستوومی داماڵی.
(٣) واتە: خۆشیو شادی بۆ ئێمە نیە، ئێمە سەرەدەزووی رەحەتیشمان لە دەس دەرچووە.
(٤) واتە: ئێمە لە مێژە دوژمنی گەردوونینو هاودەنگی دەردو مەینەتین.
(٥) واتە: سەرخۆشی شەرابی دەستی رۆزگارین لەبەر دووری دۆستی کۆن هۆشمان لا نەماوە.
(٦) واتە: هیچمان وەك ئەوسا نەماوە، نە دڵمـان وەك جـاران شـادە، وە نـە وەك جـاران هۆشمان لە خۆمانە، وە نە وەك ئەوسا تێ‌ئەگەینو گوێمان لە قسەو رازی دۆست ئەبێ.
(٧) واتە: هەر ئەوەندەت زانی گەردوون نەردێکی بۆ لەناوبردنی ئـێمـەیش هـەڵدا، وە ئێمەیش وەك هاوڕێیان جێو شوێنمان بە چۆڵی مایەوە.

## [۱۲]

## نامەکەت یاوا[۱]

نـــامەکـــەت یـــاوا کـــۆسـم کـــەفتەوە
دڵەی ئـــــاهیرین دا وە نـــــــەفتەوە

تـــاکـــەی تــۆ بـــەو زام، مـــن وەی دەردەوە
تــۆ بـــەو کـــاوەوە، مـــن بـــەی هـــەردەوە[۲]

تـــەشریف بـــاوەرە جـــەرگەمان جـــەم بــۆ
بەڵ وەی جـەم خـەمێ جـە لامـان کـەم بـۆ[۳]

بـــێســـارانـــییەن نـــە تـــۆی فـــەرد مـــن:
«خـــەم چـــەنی خـەمان زوو مبۆ ســاکـن»[۴]

هـــەناسەی ســـەردم نـــە دڵ خـــێزاوە
خـــێڵخـــانەی کـــەیفم هـــەوار بـــێزاوە[۵]

وەیشـــوومەی مـــەینەت تـــەم ئـــەنگێزاوە
وەڵگـــەکـــەی شـــادی ســـەر تـــەڵ ڕێزاوە[۶]

---

[۱۲]

(۱) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەڵامی نامەی شێخ عەزیزی جانەوەرەیی برادەریا نوسیوەکە لەکوێستان بووە، داوای گەڕانەوەی لێ ئەکا بۆ گەرمیان.

(۲) واتە: تاکەی تۆ گرفتاری زامی دووریو من گیرۆدەی دەردی ئیشتیاق بم، وە تۆ لەکوێستان بیتو من لە گەرمیان.

(۳) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری دوایی پێکەوە دێ.

(۴) واتە: وەرە با کۆمەڵمان یەك بگرێتەوە بەڵکو خەمو خەفەتی دڵمان کەمکاتەوە، بە دەلیلی ئەو قسەیەی مەلا موستەفای بێسارانی کە خستومەتە ناو شیعری خۆم وە ئەڵێ ئەگەر خەمباران بکەونە یەك خەمەکانیان سووك ئەبێ

(۵) خێزاوە: بەرز بووەوە. بێزاوە: گواستیەوە. واتە: هەناسەی سارد لە دڵم بەرز بووەوەو شادیم بارگەو بنەی پێچایەوە.

(۶) وەیشوومە: بای سەخت. ئەنگێزاوە: هەڵی ساندەوە. ڕێزاوە: داوەرییەوە. واتە: بای سەختی مەینەت تەمی هەڵکردو گەڵای سەرچڵی خۆشیم داوەری.

جــۆی چــەمەی شــەوقم هــەم یــەخ کــەردەوە
مــەزرەعەی هــەستیم شــەڵتــە بــەردەوە(١)

نــەشئەی وەخت ســەخت ئــامای پــاییزەن
یــا شــنۆی دووری بــاڵای ئــازیزەن(٢)

[١٣]

## نامەی عەنبەر بۆت(٣)

نــامەی عــەنبەر بــۆت بــاد سـوبح ئــاوەرد
عــەترش زامــەکــەی کــۆنــەم تــازە کــەرد(٤)

مــوتاڵەعــەم کــەرد وە دەم دەردەوە
جــەفاکــەی وەریــن جــە یــاد بــەردەوە(٥)

مــەفهووم بــی تــەحریر وەش تــەقریرەکــەش
مەعلووم بی جە لای خەستەی تــیرەکــەش(٦)

---

(١) یەخ: سەهۆڵ. شەڵتە: ئەو وشکە سەرمایەی ئەدا لەکشتو کاڵو ئەی فەوتێنێ. واتە: جۆگەی سەرچاوەی چاوم بوو بە سەهۆڵو شەڵتە دای لەکشتو کاڵی ژینمو فەوتاندی.

(٢) واتە: نازانم ئەمە نیشانەی کاتی سەختی هاتنی پایزە، یان شنەی دووری باڵای شێخ عەزیزە وام لێ ئەکا؟

[١٣]

(٣) مەولەوی جارێکیان نەخۆش ئەکەوێ، شێخی «بهاءالدین»یش رحمه الله نامەیەکی هەواڵپرسی بۆ ئەنێرێ، ئەمیش لەوەراما ئەم پارچە شیعرەی بۆ ئەنووسێ.

(٤) واتە: بای بەیانی نامەبۆن خۆشەکەتی بۆ هێنام، وە بۆنی ئەو نامەیەت زامی کۆنەمی تازەکردەوە.

(٥) وەرین: پێشوو. واتە: نامەکەتم بە دەم دەردەوە خوێندەوە، ئەوەندەی دڵشاد کردم ئێشو ئازاری کۆنی لە یادم بردەوە.

(٦) واتە: منی گرفتاری تیری ئەو، حاڵی بووم لەو شتانەی لە نامەکەیا نووسراوبوونو روون کرابوونەوە.

فــــیدای خــامەت بــام وە یــادم کــەردەن
یـــادم نـــمەشی تــا وە رۆی مــەردەن[١]

بــەڵام جــە دووریت شــای ســاحیب شــەرتان
دوود دڵ وە چـــەرخ هـــەفتەمین یــاوان[٢]

دووریت چون ئـەڵمـاس نـیشتەن نـە جـەرگم
هـــا وەخــتەن بــەیۆ وادەکــەی مــەرگم[٣]

داخ بـــاڵاکـــەت بـــەروون وە گـــڵکــۆ
وە هــامباڵای وێم خــاکـم وە ســەر بــۆ[۴]

••••••━━●━━••••••

[١۴]

## ناوەری وە دڵ[۵]

نـــــاوەری وە دڵ مــــاوەروو نـــە دڵ:
مـــن جـــە مـــەیل تــۆ لادێ بــوو غــافڵ[۶]

---

(١) خامە: قەڵم. نمەشي: ناچی. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٢) واتە: بە قوربانی قەڵەمەکەت بم کە منی هێناوەتەوە یاد، من تا ئەمرم تۆم لە بیر ناچێ، بەڵام لە تاو دووریت دووکەڵی دڵم گەیوەتە ئاسمانی حەوتەم.
(٣) بەیۆ: بێت. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(۴) گڵکۆ: قەبر. واتە: ئازیزەکەم وەك ئەڵماس چۆن شووشە لەت ئـەکـا، دووریت بـەو جۆرە نیشتووەتە سەر جگەرمو لەت لەتی کردووە، ئەوەندەی نەماوە تۆم وادەی مردنم دابێتو بە بەرزی باڵام خاك بنیشێتە سەرم.

[١۴]

(۵) وا دیارە مەولەوی بەم قەسیدەیە قسە لەگەڵ شێخی «ضیاءالدین»ﷺ ئەکاکە هەندێ کەس وایان تێگەیاندبێ گوایە مەولەوی ساردە لەگەڵیاو ئەمیش بەم قەسیدەیە پاکانە بۆ خۆی بکا.
(۶) ناوەری: نەهێنی. ماوەروو: ئەهێنم. لادێ: تاوێك. واتە: ئازیزەکەم نەکەی ئەوە بێنێ بە دڵتاکەمن ئێستا ئەیهێنم بە دڵماکە ئەوەتە من تاوێك لە خۆشەویستی تۆ بێئاگابم.

وە دیـــدەی مـــەخموور شـــیرین تـــەرز تـــۆ
وە نـــەشئەی شـــێوەی بـــاڵای بـــەرز تـــۆ[1]

نـە شـێخ، نـە مـەڵلا، نـە قـازی رووی شـەرع
نـــە ســـۆفـــی‌و عـــابید ئـــەهل تـەقواو وەرع

نـــیەن داخ تـــۆش نـــەبۆ نـــە تـــۆی دڵ
مـــوشکوڵەن ئـــازیز جـەمین پـەڕەی گـوڵ[2]

وە تـــیر تـــانەی رەقـــیب دڵ ســـەنگ
بـینایی دیـــدەم خـــاتر مـــەکـــەر تـــەنگ[3]

ئـــاریٚ واجـــبەن تـــانەی بـــەدکاران
پـــەی گـــەرمی بـــازاڕ عـــەشق دڵداران[4]

نســـیو هـــەرکەس مـــوبتەلای یـــارەن
زۆلانـــەی زەنـــجیر، قـــەتڵ ســـێدارەن[5]

---

(١) مەخموور: مەست. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری دوایی پێکەوە دێ.
(٢) واتە: قەسەم بە چاوە مەستە جوانەکانت‌و بە لەنجەولارەی باڵای بەرزت هیچ شێخ‌و مەلاو قازی‌و خواپەرەستێك نیە داخی عەشقی تۆی لە دڵا نەبێ، وە زۆر زەحمەتە شتی وا روو بدا.
(٣) رەقیب: بەدکار. واتە: بینایی دیدەم دڵی خۆت تەنگ مەکە بە تیری تانەی بەدکاران کە منت بە بێ‌وەفا لە لا ئەدەنە قەڵەم.
(٤) ئاریٚ: بەڵێ. واتە: چونکە دیارە تانەی بەدکار پێویستە بۆ گەرمی بازاڕی دڵداری.
(٥) زۆلانە: ئەڵقەی گیرکراو لە ئەڵقەی‌تر. سێدار: سێدارە. واتە: هەرکەس گرفتاری دەردی خۆشەویستی بێ ئەبێ ئەڵقەی زەنجیری زوڵفی یارو سێدارەی باڵای بەشی بێ، ئیتر چۆن لە تانووتی بەدکاران ئەترسێ.

## [١٥]

### نەوباوەی خەیاڵ(١)

نـــەوباوەی خـــەیاڵ «مـــەحرووم» دانـــا
رەدیـــف لەتـــیف زەریـــف «خـــانا»(٢)

---

**[١٥]**

(١) وەختی خۆی «خانای قوبادی» کە شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە دوو شیعری وتووە، پاش ئـەویش شـاعیرێکـی‌تر کـە نـاوبانگی «مـەحرووم» بـووە هـاتووە بـە چـوار شیعر بەربەرەکانێی دوو شیعرەکەی خانای کردووە، وە ئەو چوار شیعرەی خۆی ناردووە بـۆ مەولەوی تا بەراوردیان بکا لەگەڵ دوو شیعرەکەی خـاناو بـڕیـار بـدا کـامیان بـەرزترن. مەولەویش بەم شەش شیعرە وەرامی داوەتەوەو شیعرەکانی ئەوی لە هینەکانی خانا بـە بەرزتر داناوە. جارێ با شێعرەکانی خاناو مەحرووم پیشان بدەین. ئەمە دوو شیعرەکەی خانا:

بـەرق سـەیف نـاز ئـەبرۆ خـەمینان   عەکس ماوی خاڵ خورشید جـەمینان
ئـەر بگـنۆ وەکـۆی قـوللەی قـەزاڵە   مەکەرۆش وە بووڵ سفتەی سەد ساڵە

واتە: ئەگەر بێتوو تیشکی شیری نازی یارانی برۆکەوانو عەکسی خـاڵی ئـاوی جـوانـە ناوچاو وەك ڕۆژەکان، بدا لە قوللەی کێوی قەزاڵە، ئەیسووتێنێ وەك خۆڵەکەوەی سـەد ساڵ لەمەوبەری لێ ئەکا.

بـــەرق بـــرقەی نـاز عـیشوە فـرۆشـــان   جـەخماخەی لەنـجەی تـەلا نـەگـۆشـان
بـــزیسکەی نـــیگای دیـــدە شـــابازان   بـــریقەی غـــەمزەی شـــەکـەرین رازان
ئەر بگنۆ وە سەنگ جای تـەجەللای نـوور   مەکەرۆش وەگەرد چوون سورمەی کۆی توور
«مەعدووم»، راس «خانا» سۆزان عەشق بێ   کەی وێنەی «مەحرووم» هەر عەشقش مەشق بێ

واتە: ئەگەر بێتو شەوق دانـەوەی چـارشێوی نـازارە نـاز فـرۆشـەکـانو چـەخماخەی لەنجەولاری گوارە زێڕینەکانو تیشکی چاوی یارە چاوبازەکانو بریقەی ئیشارەتی شیرین گوفتارەکان، لە جیاتی نووری خوا بدا لە بەرد، وەك بەردە سووتاوەکانی کێوی توور ئەی‌کا بە خۆڵ. مەعدووم، راستە خانا سووتاوی عەشق بووە، بەڵام کەی هەمیشە وەك من هەر مەشقی عەشقی کردووە.

(٢) نەوباوە: تازە پەیدابوو. رەدیف: هاوچەشن. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بـەشیعری پاشەوەیەوە.

یـــاوا وە دیـــدەی کـــەم بـــینام ســـاوا
جـــە نـــەو بـــینایی پـــەی دیـــدەم یـــاوا[١]

پـــەیڕەوی «خــــانا»ت یـــاد ئـــاوەردەبێ
ئەو ئـەسڵو وێت فـەرع حـەساو کـەردەبێ[٢]

لاکـــــین زادەی تـــــەبع بـــــۆ عـــەنبەرینت
دەس ڕێســـەکـــەی فکـــر بـــیکر شـیرینت[٣]

پـــەسەندیدەی فـــام عـــــەقڵ دانـــا بـــێ
خاستەر جـە خـەیاڵ خـاسەی «خـانا» بـێ[٤]

زیـــــادە پـــــەی فـــەرع وە ســـەر ئـــەسڵەدا
خاسەی واتەی تـۆن جـەی سـەر فـەسڵەدا[٥]

---

(١) واتــە: ئــەو شـیعرانــەی کــە بــەرهەمی نـوێی خـەیاڵی «مـەحرووم»ی زانـان، کـە هاوچەشنێکی ناسكو جوانی خانای قوبادییە، پێم گـەیشتن‌و سـوینمن بـە چـاوەکـزو کوێرەکانما، سەرلەنوێ ڕۆشنایی‌یان پێ گەیشتەوە.
(٢) واتە: شوێن‌کەوتنی خانای قوبادیت هێنابوە خـەیاڵی خـۆت، وە ئـەوت کـردبوو بـە ساقو خۆتت کردبوو بە لقی ئەو.
(٣) زادە: پەیدا بوو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.
(٤) واتە: بەڵام ئەو شیعرانەکە لە زەوقی بۆن‌خۆشی تۆ کەوتبوونەوە، وە بە دەستی بیری بە خەیاڵی کەسا نەهاتووی تۆ ڕێسرابوون، لای عەقڵو فامی ئینسانی زانا پەسەندو دڵگیر بوون‌و لە خەیاڵە تایبەتی‌یەکەی خانا جوان‌تر بوون.
(٥) واتە: سەرکەوتنی لق بە سەر ساقا لەم چەرخەدا بە تەنها بۆ تـۆ هـەڵکـەوتووەو بـۆ کەسی‌تر نەلواوە.

## [۱۶]

### نە نەی‌خانەی تەن[۱]

نـــە نـــەی‌خانەی تـــەن ئـــایر هـــۆرێزان
بزیسکەی چەخماخ کام شەش‌خان خـێزان[۲]

کـــام دوودەن رووی دڵ بـــاز هـــەم پـۆشـاوە
کـــام هــوونەن دەروون دیســـان نـۆشـاوە[۳]

مـــەسرەف خـــەزانـــەی دەرد پـــەنهانی
خـــەم هـــۆشت بـــەردەن مـــەر نـــمەزانـی[۴]

شـــەرارەی تـــفەنگ بـــەخت چـــارەی تـــۆن
دوودی هـــوون زام جگـــەر پـــارەی تـــۆن[۵]

جـــەستەت ســـــۆچـــنا دڵ هـــانە تـــەمدا
نە دەروون جام جـام هـوون دان وە هـەمدا[۶]

---

### [۱۶]

(۱) مەولەوی ئەم قەسیدەشی بە زوبانی مەحموودی یاروەیسەوە وتووە لە لاواندنەوەی «عبدالرّحمان»ی کوڕیا، کە تا ئێستا چەند قەسیدەی‌تریشمان لە لاواندنەوەی‌دا نووسی‌یەوە.

(۲) نەخانە: خانووی قامیش، زنج. شەش‌خان: جۆرە تـفەنگێکـی کـۆنـە. خـێزان: بـەرز بووەتەوە. واتە: ئاگر بەربووەتە زنجی لەشم، نازانم پزیسکەی چەخماخەی کام تفەنگی شەش‌خانە بەرز بووەتەوە ئەم ئاگرەی تێ‌بەرداوە؟

(۳) دوود: دووکەڵ. باز: دیسان. واتە: نازانم کام دووکەڵ بوو بەرز بووەوەو رووی دڵمی داپۆشی‌یەوە، وەکام خوێن بوو دیسانەوە دەروونم نۆشی‌یەوە؟. وشەی «دوود»و «هوون» ئیشارەتن بۆ دووکەڵی ئاگری تفەنگەکەو خوێنی کوڕەکوژراوەکە.

(۴) مەسرەف: خەزانەدار، مەبەس مەحموودی یاروەیسە، وە ئـیشارەتیشە بـۆ ئـەوەکـە خەزانەداری مەحموود پاشای جاف بووە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پـاشەوەی پێکەوە دێ.

(۵) چارە: ناوچاو. دوودی هوون: خوێنی وەك دووکەڵ رەش.

(۶) واتە: ئەی خەزانـەداری دەردو مـەینەتی نـهێنـی، ئـەوە خـەمو خـەفەت هـۆشـی لا

کــوورەی دڵ گــەرمەی جــۆش ســەختشەن
پـــەی فــێنکــی دڵ شــیوەن وەخــتشەن(١)

# [١٧]

## نەمەندەن خەیاڵ(٢)

نـــــەمەندەن خـــــەیاڵ فـــــەردان کــەردەنم
فــەرد هــابی وە تــەوق شــی نـە گـەردەنم(٣)

ئــەر فـەڵەك گـەردش نـەدا نـە رووی بـەخت
نـەوستاش ئـەو گـێج گـەردەلوول سـەخت(٤)

ئـــارەزووی دیـــدار یـــارانــم کــەردەن
هـــەوای ســـــەیرانـــم وە دڵ ئـــاوەردەن

---

☞

نـەهێشـتووی، بـۆچـی نـازانـی بـڵێسـەی تـفەنگی بـەختو نـاوچاوی خـۆتـە لەشـی سووتاندووی‌و تەمی کردووە بە سەر دڵتا، وە خوێنی رەشی زامی جەرگی لەت‌لەت بووتە جام‌جام خوێنی لە دەرووتا داوە بەیەکاو پێی نۆشاندووە.

(١) واتە: بە هۆی ئـەم ئـاگـرو دووکـەڵو خـوێنـەوەکوورەی دڵم لە گـەرمەی جـۆشـی سەختیایەتی، وە ئێستا کاتی شیوەن کردنە بۆ ئەوەی دڵم فێنك بێتەوە. لە نوسخەی «سید طاهری هاشمی» دا لە پاش ئەم شیعرە دێتە سەر شیعرەکانی رۆرۆ، کە سەرەتاکەیان ئەمەیە:
پەردەی سەبووریم درِیا رۆڵەرۆ
بەڵام ئێمە ئەو شیعرانەمان لەریزی پارچەیەکی ترا بڵاو کردەوە لە تیپی «بێ» داکە ئەویش هەر بۆ لاواندنەوەی «عبدالرّحمان»دا وترابوو، چونکە لە چەند نوسخەی‌تردا بەو جۆرە بوو.

[١٧]

(٢) مەولەوی ئەم چەند شیعرەی بۆ دۆستێکی ناردووەکە گلەیی لێ کردووە بۆچی نامەی دیار نیەو چەند شیعرێکیان بو نانێرێ.

(٣) شی: چوو. واتە: تاقەتی شیعر دانانم نەماوەو شیعر بوو بە تەوق‌و چووە گەردنم.

(٤) نەوستاش: نەی‌خستمە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

بگـــێڵوون چـــەنی هـــامفەردان وە شـــاد
وە ســەر بــەرزاندا خــەم بــدەوون وە بــاد(١)

وەر کـــوشتاش جــە داخ نــەدیەنی یــاران
چەندجار کوشتانێش، ئێدیش چون جـاران(٢)

[١٨]

## نە ئاهینگەرێ(٣)

نـــە ئـــاهینگەرێ، نـــە ئـــاهینگەرێ
ئـــارۆ راگـــەم کـــەفت نـــە ئـــاهینگەرێ(٤)

دیـــم کـــە نـــیشتە بـــێ کـــان گـــەوهەرێ
پـــادەم مـــەدەمنا زوڵف عـــەنبەرێ(٥)

فـــیدات بـــام ئـــۆســـای پـــادەمە دەمـــەن
دەست وە دەم بـــۆ، دەم بـــدەر وە مـــەن(٦)

---

(١) بگێڵوون: بگەڕێم. بدەو: بدەم. واتە: ئـەگـەر فـەڵەك رووی بـەختم تـۆزاوی نـەكـاو نەمخاتە گێژی گەردەلوولی سەختەوە، نیازم هـەیە سـەرێ لە دۆسـتان بـدەمو بـە تـەمام سەیرانێك بكەم لەگەڵ هاورێیاندا بە خۆشی بگەڕێمو بە شاخەكانا خەم بدەم بە با.
(٢) كوشتاش: كوشتمی. نەدیەن: نەدیتن. واتە: خۆ ئەگەر كوشتیشمی لە داخی نەبینینی یاران، ئەوە ئیتر بڵێم چی، تا ئێستا چەند جار كوشتوومی، با ئەمجاریش وەك جارەكانی پێشوو بێ.

[١٨]

(٣) مەولەوی لەم چەند شیعرەیا هەستی خۆی ئەگێڕێتەوە بەرامبەر شاگرد ئاسنگەرێكی جوان.
(٤) ئاهینگەر: ئاسنگەر. واتە: ئەمرۆ رێم كەوتە لای ئاسنگەرێك.
(٥) پادەم: ئەو هەمانە پڕ لە فووەیەكـە ئـەیدەمێـنـن بـۆ ئـاگـر خـۆش كـردن. مـەدەمنا: ئەیدەماند. واتە: دیم جوانێكی زوڵف عەنبەرینێ وەك كانی گەوهەر پێ دەمەی ئەدەماند.
(٦) مەولەوی لێرەدا رووی قسەی ئەكاتە شاگردەكەو پێی ئەڵێ: وەستای هەمانە دەمین با دەستت بە هەمانەكەوە بێ بیدەمێنی، دەمیشت بدە بە من با ماچێكی بكەم.

هـــەی مـــوسڵمـــانان ئـــینە چ دەردەن
دەمـــە دەمـــانش دەم دەمـــین کـــەردەن(١)

دەمـــەو کـــوورەو نـــار هـــەر سێ بـــین نـــوورە
نـــۆبـــەی مـــەعدوومەن وزاش نـــە کـــوورە(٢)

[١٩]

## نەواتم عەرعەر(٣)

نـــــەواتـــــم عـــــەرعەر ســـــەهەند پـــــەروەردە
بـــــاخەونان داخ وە تـــــــۆی گـــــڵ بـــــەردە(٤)

خـــــــــودنومایی لای بـــــــــاڵا نـــــــەمامان
وێت لادەر ئـــــامان، پـــــەرێ تـــــۆ نـــــامان(٥)

دیت شـــــــنۆی غـــــیرەت دیـــــدەکـــــەم خـــــێزا
وەڵگـــــەکـــــەی ســـــەر شـــــاخ زیـــــندەگـــــیم رێزا(٦)

(١) دەمین: خوێناوی. واتە: موسوڵمانینە ئەمە چ دەردێکە تووشی من هـاتووە، هـەمانە دەماندنی ئەو جوانە دەممی خوێناوی کردووە.

(٢) نوورە: قسڵی سووتاو. وزاش: بیخەنە. واتە: هەمانەکەو کوورەی ئاگرەکەو ئاگرەکەی ناوی، هەموو لە بەر جوانی ئەو شاگردە وەك قسڵی سووتاویان لێ هاتووە، هەر من ماوم نۆبەی منیش هاتووە بمخەنە ناو کوورەکەوەو بمسووتێنن.

[١٩]

(٣) جارێکیان جوانێکی باڵابەرز لای چنارێکا رائەوەستێ، لەوکاتەدا بایەك هەڵئـەکـاو هەندێ گەڵای لێ ئەخاتە خوار. مەولەویش بەم بۆنەیەوە ئەم چەند شیعرە ئەڵێت.

(٤) سەهەند: سێبەر. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٥) خودنمایی: خۆنواندن. واتە: ئەی چنارێ لە سێبەردا پەروەردە بوو کە باخەوانان بە داختەوە مردوون، پێم نەوتی خۆنواندن لە بـەرامبـەر جـوانـی بـاڵا وەك نـەمامان بـۆ تـۆ نەهاتووە، دەخیلتم خۆت لادە.

(٦) خێزا: بەرز بووەوە. رێزا: داوەراند. واتە: دیت چۆن بای غیرەتی یارەکەم هەڵی کردو گەڵای سەرچڵی ژیانتی داوەراند.

خاس بی دەرگـای خـەم پـەی وێت کـەردەوە
دوولەتـــیمان بـــۆ هـــەرچـیت بـــەردەوە(١)

## [٢٠]

## نەوای ناڵەی دڵ(٢)

نـــەوای نـــاڵەی دڵ وێنـــەی ســـەدای نـــەی
پـــیاڵەی زوخـــاو مـــەنۆشـــوو چـون مـەی(٣)

کـــەواو پـارچـەی جـەرگ سـینەی بـرێشـتاو
رەحمت بۆ یـە نـەی، یـە مـەی، یـە کـەواو(٤)

هـــەر ئـــەساسێ هـــەن جـــە لام جـــەم بـیەن
گـــەرمی کـــزەی بـەزم هـیچش کـەم نـیەن(٥)

تەسدیعت کێشـان، سـاحیب شـەرتو شـۆن
چ ئـــــیحتیاجێ وەی کـــــەواو تـــــۆن؟(٦)

---

(١) واتە: باش بوو دەرگای خەمت لە خۆت کردەوە، هەرچیت دەسکەوت دووکـەرت بێ لە نێونمانا.

**[٢٠]**

(٢) مەولەوی ئەم چەند شیعرەی بۆ دۆستێکی نووسیوەکە هەندێ کەبابی بۆ ناردبوو
(٣) لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «چـون مـەی» نـووسراوە «پـەی پـەی» مـەعنای ئـەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٤) کەواو: کەباب. برشتاو: برژاو. واتە: ئەو شتانەی کە هۆی خۆشیو رابواردنن بریتین لە ئاوازو مەیو کەباب، من ناڵەی دڵم وەك ئاوازی شمشاڵ وایەو لە جیاتی شـەرابیش پیاڵەی زوخاو ئەنۆشمو پارچەی جەرگی ناو سینەی برژاویشم کەبابمە. دەسا میهرەبانیت ببێ لە گەڵم ئەمە ئاوازو مەیو کەباب.
(٥) واتە: هەموو هۆیەکی رابواردنم لایەو هیچم کەم نیە بۆ گەرمی کۆڕی رابواردن.
(٦) واتە: ئەی دۆستی بە وەفا، زەحمەتت کێشاوەکەبابت بۆ ناردووم، من کەی پێویستم بەکەبابی تۆیە تا بۆم بنێری.

**[٢١]**

## نامەى بێ مەيليم(١)

نـامەى بـێ مـەيليم خـامەت رەقـەم كـەرد
دووديـم جـە ديـدەى فـەڵەك ئـاو ئـاوەرد(٢)

مـنو بـێ مـەيلى، چـون واچـى شـەو رۆن
مـەيلت نـە دڵدا، دڵ هـەر جـە لاى تـۆن(٣)

بـێچـارە وە تـاى زوڵفت گـير بـيەن
هـا نـە پـاى تـەڵدا جـواوش نـيەن(٤)

**[٢٢]**

## نە تەن يادەكەى

نـە تـەن يـادەكـەى ئـەو سيمين گـەردەن
خـەيليێوەن هـەر گـيان خـزمەتش كـەردەن(٥)

---

**[٢١]**

(١) مەولەوى بەم سێ شيعرە وەرامى گلەيى دۆستێك ئەداتەوەكە بۆى نووسيبوو گوايە بىوەفايە لەگەڵى.

(٢) واتە: قەڵەمەكەت باسى بێمەيلى منى نووسيبوو، منيش ئـەوەندە خـەفەتبار بـووم هەناسەى وەك دووكەڵ رەشم ئاوى لە چاوى گەردوون هێناو كرديە گريان.

(٣) واتە: توهمەتى بێوەفايى دانە پاڵ من وەك ئەوەيە بە شەو بڵێى رۆژە. تۆ مـەيلت لە دڵمايەو دڵم هەر لاى تۆيە.

(٤) واتە: دڵەى بەدبەختم بەسراوە بە داوێنـى زوڵفـى تـۆوەو لە سـەر تـەلى تـەلگرافـى زوڵفت گيرى خواردووەو چاوەڕوانى وەرامێكە لە تۆوە، وە ناتوانێ بێتەوە بۆ لاى من. ئەم شيعرەمان لە تيپى «بێ» دا بە تەنها نووسى چونكە لە نوسخەكۆنەكەى خۆمانا بە تـەنها نووسرابوو، كـەچى ديـمانەوە سێهـەمى ئـەم سـێ شـيعرەشە، لەبـەر ئـەوە ديسـانەوە نووسيمانەوە، وەلامان وايە ئەمەيان راستە.

**[٢٢]**

(٥) مەعناى هەردوو شيعرەكە پێكەوە دێ.

بــــەڵام نــەی حــەسرەت دووی جــیایی‌دا
گـــــــومانم کـــــەفتەن وە تــــەنیایی‌دا[١]

[٢٣]

## نزوول کێشا

نــزوول کــێشــا دەس بــەختم نــە رای بــەد
پــای ئــەدەب نــە ڕای عــەدەد کــەردم رەد[٢]

نـــــاگـــــا وە فـــــریب پشت پـــــا دا لێم
مــن وست وە گــێجــاو قــەڵەندەری وێم[٣]

[٢٤]

## نە نازك خەیاڵ[٤]

نــــە نــــازك خــەیاڵ ئــیسە، نــە مــونشیم
پــەردەی مــابەین بـیم، ویـەردم، مـن شـیم[٥]

---

(١) واتە: دەمێکە هەر گیانم خزمەتی یادی ئەو گەردن زیوینەی کردبوو لە لەشما، بەڵام لە داخی دووکەڵی جیابوونەوەی گیانما لە لەشم، وابـزانـم تـەنیا کـەوتووەو کـەس نـیە خزمەتی بکا.

[٢٣]

(٢) نزوول: کزی. واتە: بەدبەختی دەستی بەختمی بە ڕێگای خراپەدا راکێشـا، وە پـێی ئەدەبم لە ڕێگای ژمارە لای دا. مەبەسی ئەوەیەکردەوەی بێ‌ئەدبانەم لە ژمارە دەرچوو.
(٣) فریب: فریو، هەڵخەڵەتاندن. قەلەندەری: بەرەڵلایی‌و بێ‌سـەرو شـوێنـی. واتـە: لە ناکاو هەڵی‌خەڵەتاندم‌و پاش‌قولێکی دام‌و فرێی دامە گێژاوی بەرەڵلایی‌و بێ‌سەروشوێنی.

[٢٤]

(٤) مەولەوی ئەم دوو شیعرەی بـۆ دۆسـتێك نـووسیوەکـە داوای نـامەیەك یـا پـارچـە هەڵبەستێکی لێ کردووە بۆ لای «پیر» کە قسەی مەولەوی رەوا بووە لای تا ئیشێکی بـۆ بکا، ئەمیش داخوازی‌یەکەی ئەو دۆستە نایەنێتەدی‌و بەم دوو شیعرە بیانووی بۆ دێنێتەوە.
(٥) مونشی: نووسەر. واتە: نە خەیاڵی ناسکم هەیە تا شیعر بـڵێم، وە نـە نـووسەرم تـا

تــەن وە دڵ، دڵ جـــان، جـان بـی وە جـانان
مــەندەن وە جــیلوەی جـەرگەی جـوانـان[١]

[٢٥]

## نە تۆی حەڵقەی

نە تـۆی حـەڵقـەی زوڵف دڵەی شـێت و وێت
شــەرتش کــەرد هــەنی دڵ نـەدەرۆ پـێت[٢]

وەخـــــتێ شـــۆڵەی رووت نـــاگـــا دا دیـــار
ئەو قسـەی شـەو بــێ، ئـێد شـۆڵەی نـەهار[٣]

☞

نامەت بۆ بنووسم. من جاران بەیەك گەیینی پیرو مورید بووم ئەمتوانی کارو باریان بۆ راپەڕێنم، بەڵام ئێستا فەوتاوم و بەسەرچووم.

(١) واتە: لەشم بووە بە دڵ و دڵیشم بووە بە گیان و گیانیشم لە دۆستانا تواوەتەوە، ئێستا ماوەتەوە سەر دەرکەوتن و خۆ نواندنی کۆڕی جوانان کە بتوانن بە خاترداری خۆیان شتێ بکەن.

[٢٥]

(٢) واتە: دڵەی شێت و وێتم کە گرفتاری داوێنی زوڵفت بوو، لە ناو داوەکەدا بڕیاری دا جارێکی تر مەیلت نەداتێ.

(٣) شۆڵە: «شعلە»، تیشك. نەهار: رۆژ. واتە: کەچی کاتێ کـە لە نـاکـاو تـیشکی رووت دەرکەوت بڕیارەکەی دڵم بوو بـە قسـەی شـەوو تـیشکی رووت بـوو بـە تـیشکی رۆژ، مەشهووریشە «کلامُ اللّیلِ یمحوهُ النّهارُ» یەعنی کە رۆژ بووەوە هەرچی قسە، شەو کراوە هەمووی هەڵئەوەشێنێتەوە.

[٢٦]

### نور ئەفشانیش...

نـــوور ئـــەفشانیش کـــەرد وە دەشتو دەردا
مـــــــدرا وەراوەر وە راگــــــــوزەردا[١]

وات نـــما وەخـــتەن شـــای جـــەمین جـامان
واتـــــم بـــــەڵێ خـــۆر وە قـــیبلە ئـــامان[٢]

•••••••——●——•••••••

[٢٧]

### نە رۆ ئارامەن[٣]

نـــــە رۆ ئـــــارامـــەن، نـــە شـــەو خـــاوەمەن
چـــون چـــەم گـــل کـــەران گـــلاراوەمـــەن[٤]

---

[٢٦]

(١) نوور ئەفشانی: نوور وەشاندن. مدرا: راوەستا. وەراوەر: بەرامبەر. واتە: یـار تـیشکی خۆی بڵاو کردەوە بە دەشتو دەرداو لە سەر رێما بەرامبەر راوەستا.

(٢) نما: نوێژ. واتە: شای ناوچاو جوانان وتی: وەختی نوێژە، منیش وتـم: بـەڵێ راسـتە چونکە خۆر کەوتووەتە لای قیبلەو وەختی نوێژی نیوەڕۆیە. مەبەس لە خۆرەکـە رووی یارەکە لە بەرامبەریا راوەستاوە.

بەم موناسەبەتەوە جوانە ئەمە بگێرینەوەکە: جارێکیان شێخی «ضیاءالدین»رحمه الله لە بیارە پاش هەتاوکەوتن ئەچێتە سەر جێگای شێخ سەلیمی سنەیی سەیر ئەکا هێشتا هەڵنەساوە لە خەو، هەڵی ئەسێنێو پێی ئەڵێ:

آفتابت بر سر آمد برنمی‌خیزی هنوز؟

واتە: خۆر هاتە سەر سەرت هێشتا هەڵناسی لە خەو؟ شێخ سەلیمیش لە وەراما ئەڵێ:

بی‌تو روزم شب بود، چون آمدی گشت روز

واتە: بێ تۆ رۆژم شەو بوو، کە تۆ هاتی بوو بە رۆژ.

[٢٧]

(٤) واتە: نە بە رۆژ ئەحەسێمەوە نە شەو خەوم لێ ئەکەوێ، هەمیشە وەك چاوئێشـەدار گلاراوم پێ کەوتووەو دێمو دەچم.

## [١]

### وە خیلافەوەن(١)

وە خـــــیلافەوەن یـــــاران ســـــەرمەس
تـــەقازای زاتـــی تـــەبعم هـــەرچـی هـەس(٢)

جـــــەزبەی ئـــــاهینم دەمـــاخ دان پـــەرداخ
مـــیقناتیز تـــۆی جـــام کـــەردەن وە یـاتاخ(٣)

کـــــارەبا نـــــە دەور کـــــام مـــــدەرۆ دەور
نـــە دەورەی مـــوورەی کـــارەبا کـــا تـەور(٤)

ئـــــەر گـــــێروو وەکـــام کـــافوورم کـــەمکەم
ئـــــاو قـــــەفاڵ وێش مـــــەپێکـــۆ دەردەم(٥)

---

## [١]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەڵامی نامەیەکی شێخی «سراج‌الدین»ﷺ وتووەکـە گلەیی تیاکردبوو لەمەولەوی کە بێ‌وەفایە لەگەڵی‌و خەبەری ناپرسێ.

(٢) تقازا: خواست. تەبع: «طبیعت»، سروشت. واتە: ئەی یارە سەرخۆشەکانم، هەرچی خواست‌و ئارەزووی سروشتمە هەمووی بە پێچـەوانـەی ئـەوەیەکـە ئـەبوو وابـوایـە. لە شیعرەکانی پاشەوەدا ئەم پێچەوانەیی‌یە روون ئەکاتەوە.

(٣) جەزبە: راکێشان. ئاهین: ئاسن. واتە: یاسای سروشت وایە میقناتیز ئاسن رابکێشێ بۆ لای خۆی، کەچی ئێستا لەشی وەك ئاسنی من خۆی ئـامادەکـردووە بـۆ راکـێشـانی میقناتیزو میقناتیزیش ناو شووشەی کردووە بە جێگای خۆی تا ئەو نەتوانێ رایکێشێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «ئاهینم» نووسراوە «ئاسنم».

(٤) کام: لەشی وەك کام. مدەرۆ: ئەدا. موورە: مووروو. واتە: یاسای سروشت وایەکارەبا پووش هەڵبگرێ، کەچی ئێستا بە دەوری لەشی وەك کا باریك‌بووی منا خـول ئـەخوا، وەك چۆن لە راستی‌داکا بە دەوری مووروی کارەبادا خول ئەخوا.

(٥) کام: بە فارسی واتە دەم. کافوور: مادەیەکی ساردەکەسێك خوێنـی لووتـی بـەربێ ئەیخەنە سەر تەوێڵی بۆ ئەوەی خوێنەکەی بوەستێتەوە. قەفاڵ: دەمارێکە لە پشت ملەوە لەکاتی تەوژمی خوێنا کەڵەشاخی لێ ئەگرن. مەپێکۆ: بەرئەبێ. دەردەم: کـوتوویڕ. واتـە:

«أَنـــفِيه» كـــەی گـــەرد رای دەردم هـــەوا
مـــەكـــەرۆ دەمـــاخ ئـــەفلاتوون دەوا[(١)]

گـــەرمیم تـــاف ســـاف وە ســـەر ئـــەندەردا
بـــەستەن وە رووی تـــاش نـــیمە كـــەمەردا[(٢)]

---

☜

ئەگەر تۆزێك كافوور بگرم بـە دەمـمەوە ئـەوەندە گـەرم ئـەبێ گـورج خـوێنـی دەمـاری پشتملی بەرئەبێ. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «كەمكەم» نووسراوە: «وەكەم».

(١) «انفیه»: بڕنووتی. واتە: تۆز بچێ بە لووتی هـەركەسێكـا لەوانـەیە نـەخۆشـی بـخا، كەچی تـۆزی ڕێگـەی دەردی مـن هـەوا وەك بـڕنـووتی ئـەیكا بـە لووتـی ئـەفلاتوونی حەكیمەوەو دەرمانی پێ ئەكا.

(٢) سەرئەندەر: لە سەرەوە بۆ خوار. تاش: بەردی زلی لاشانی شاخەكان. نیمەكـەمەر: ناوقەد. واتە: جۆشی گەرمای دڵم ئەبوو وشكم كاتەوەو بمسووتێنێ، كەچی تافی ئـاوی سافی لە چاوەكانمەوە دەركرد بۆ خوار، وە ئەو ئاوە گەرمەی وەك سەهۆڵ مەیاند بە تاشە بەردی ناوقەدمەوە.

لە هەندێ نوسخەدا لە پاش ئەم شیعرە، شیعرێك وە لە هەندێكیترا ئـەو شـیعرەو دوو شیعریتر هەیە. بەڵام هەرچی ورد بووینەوە پەیوەندێكمان نەدۆزیەوە ئەو سێ شیعرە ببەستینەوە بەم شوێنەوە، وە نەمان زانی ئاخۆ شیعری قەسیدەیەكیترن كەوتوونەتە ئێرە، یان هەر شیعری ئێرەنو لێیان فەتاوە بۆیە پەیوەندەكەیان نازانرێ. لەبەر ئەوە نەمان خستە ئەسڵی كتێبەكە، وە هەر لێرەدا نووسیمانەوە. ئەمەش ئەو سێ شیعرەیە:

چـــون هـــەرس دیـــدەم وە نـــاكـــامەوە     شـــــــــەفتەم ئـــــازیز لواو ئـــامەوە
ئەوەڵ سـەدای نـەی مـەرگەكـەم ئـارۆ     وەی دووەم نـــەفەس فـــەردایـــی دارۆ
هەوای سازگار فەسڵی مەینەت وەخت     ماوەرۆ دەمدەم شادەی سەبرو جەخت

ناكا: كوتوپڕ. ئامەوە: ئاماوە، هاتەوە. ئارۆ: ئەهێنێ. دارۆ: هەیەتی. ماوەر: ئەهێنێ. شادە: شەهادەت، شایەتی. سەبر: پژمەی یەكەم كە مەشهوورە نیشانەی شەڕە. جەخت: پژمەی دووەم كە نیشانەی خەیرە. واتە: وەك چۆن فرمێسكی چاوم لە ناكاو ئـەڕژێ، هـەروەها كوتوپڕ بیستم ئازیز ڕۆیشتو هاتەوە. ڕۆیشتنەكەی ئاوازەی یەكەم فووی قیامەتیدا لە گوێم كە هەمووكەسێك پێی ئەمرێ، هاتنەوەشی وەك ئاوازەی فووی دووەم بووكە مردوو زیندوو ئەكاتەوە. هەوای ساردو سازگاری وەرزی مەینەت تاوتاو نـیشانەی نـاخۆشـیو

☜

ئــازیز یــەقین عــەکس وەش نــامەکــەی تــۆن
ســـایەکـــەی ســـیفەت کـــەلامەکـــەی تـــۆن[1]

نازوون وەی مەزهەر، هــای هــای‌یە چــێشــەن
نــەشئەی ئــەو سیفەت زاتــی تــو پــێشــەن[2]

جـــــە نـــامای جـــواو، جـــە بـــێ وەفـــاییم
هـــەرچـــیت فـــەرماوان راســـەن، بـــیناییم[3]

ئـــــەر وەفـــام مـــەبی پـــەی تـــۆ مـــەمەردم
خـــەیر مـــەبڕیـــابێ پـــەنجەی پـــای فـــەردم[4]

---

☞

خۆشی پیشان ئەدا، جارێك ئەم‌پژمێنێ، یەك پژمەیش نیشانەی شەڕەکە دوورکەوتنەوەی دۆستە. وەك ئەڵێن «سەبری هێنا» جارێکی‌تریش ئەم‌پژمێنێ، پژمەی دووهەمیش نیشانەی خێرەکە گەڕانەوەی دۆستە. وەك ئەڵێن «کردی بە جەخت». لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «ئارۆ» نووسراوە «ئازۆ» واتە ئارەزوو ئەکا، وە لە جیاتی «دارۆ» نووسراوە «وازۆ» واتە: ئەیەوێ.

(١) سایە: سێبەر. واتە: ئازیز، بێ‌گومان ئەم‌گۆڕانی سروشتەکە لە منا رووی داوە لە ئەنجامی هاتنی نامە خۆشەکەی تۆوەیە، وە سێبەری سیفەتی گوفتاری تۆیەکە چون ئەگەر خۆت حازر بی وەزعم ئەگۆڕی، بە نامە ناردنیش ئەتوانی وام لێ‌بکەی.

(٢) نازوون: بنازم. مەزهەر: دەرکەوتن. یە: ئەمە. پێشەن: پێ‌یەتی. واتە: حەقمە بنازم بەم دەرکەوتنانەی بەرەکەتی تۆ. ئەمە چ حاڵێکە رووی‌داوە لە من، شنەی سیفەتی زاتی‌یەکانی تۆی پێوەیەو ئێستا من هەندێ لەو سیفەتانەی تۆم تیا پەیدا بووە.

(٣) ناما: نەهات. واتە: بینایی چاوم هەرچیت فەرمووە لەبارەی وەرام نەنووسینەوەی من و بێ‌وەفاییمەوە هەمووی راستە.

(٤) مەمەردم: ئەمردم. مەبڕیابێ: نەبڕابوو. واتە: ئەگەر وەفام بوایە ئەمردم بۆت، یان خۆ پەنجەی پێی شیعرم نەبڕابوو تا چەند شیعرێکت بۆ بنووسم. لە نوسخەیەکی‌ترا لە جیاتی «مەبڕیابێ» نووسراوە «مەمەڕیابێ». واتە: نەشکابوو.

ئــــازیزم نــــامه پــێچ مــدۆ چــون مــار
خــامەی چــەم یــەکــێ، ئــەسرینان هــەزار[١]

وێش دان نــە ســەر کــەف کــووپەی سیایی
پــەی شــەکــوای عــەرزەی دەرد جیایی[٢]

وەخــــوا نــە دووریت کــۆتــاییش ئــاوەرد
نــە گــیان ئــیختیار مــاوای بــەدەن کــەرد[٣]

بــــەڵام یــادەکــەت نــاستەنش وێم پــێم
وێم بەرکەرد، نیشتەن وێش جە یاگــەی وێم[٤]

ئــەجزای تــەن یــەکســەر جــە شــادمانی
نــــمەیۆش وە خــاو ســەد زیــندەگــانی[٥]

هەر جــزوێم پــەی وێش یــەند سەرشار بــیەن
ئــەی جــزوم جــەی جــزو خــەبەردار نــیەن[٦]

---

(١) واتە: ئازیزەکەم، کاغەز لە ئیشتیاقی هاتندا بـۆ لات وەك مـار پێچ ئـەخوا، قـەڵەمـە قامیشی چەمیش هەرچەند یەکێك بێ، خۆ جۆگەلەی فرمێسکی چاوم کە وەك قەڵەم رێك بە رووما ئەرژێتە خوار، هەزار قەڵەمی لێ پێکهاتووە.
(٢) واتـە: کـووپەی خـوێنـی جـەرگیشم وەك شـووشە مـەرەکـەبی رەش هـەڵچـووەو گەیشتووەتە لێوار، بۆ ئەوەی عەرزو حاڵی شکاتی دووریتی پێ بنووسرێ.
(٣) واتە: نە دووریت دوایی هات، وە نە گیانم لە لەشما ئۆقرەی ئەگرت، ئەی ئیتر بۆچی نامەت بۆ نەنووسم... وەرامی ئەم پرسیارە لە شیعرەکانی پاشەوە دا روون ئەکاتەوە.
(٤) واتە: ئەو هەموو هۆیانە هەبوون بۆ نامە نووسین، بەڵام یـادت نـەیهێشـتبووم لای خۆم وە دەری کردبووم لە لەشمو جێگەکەمی گرتبووەوە.
(٥) نمەیۆ: نایەتە. خاو: خەو. واتە: بە هۆی ئەوەوەکە یادی تۆ هـاتە لەشـمو جـێگـامی گرتەوە، ئەندامەکانی لەشم لە خۆشی‌یاندا ژنیانیشیان بیر ناکەوێتەوە.
(٦) واتە: هەر ئەندامێکی لەشم ئەوەندە سەرخۆش بووە هیچ کامیان ئاگای لەوی‌تریان نیە.

نـــە دڵ یـــاد راز ســـەفحەی نـامەشەن
نـە ســەرپەنجە هۆش گـرتەی خـامەشەن[١]

یــەند نــە تــۆی زەلکــاو دەوات پــڕ وەی
مــدران مــونتەزر وەڵگ ئــاوەردەن نــەی[٢]

نــەی مــدۆ سـەدای دڵان پـێ خـەستە
وەڵگ مـــارۆشــەوە بـەستە وە بـەستە[٣]

ئـــیسە یـــادتەن ســـزای خـــیتابەن
ئـــەر ســـزا وە نـــاز، وەر وە عـیتابەن[٤]

نــە نــە، سـفتەی هـیجر خـاڵ ئـاڵاتـم
دۆزەخــــی دۆزەخ دوری بـــاڵاتـــم[٥]

بـویەر جـە مـەنەیم شـای نـەو نـەمامان
مـەردەن پـەی گـرۆی دۆزەخـی نـامان[٦]

---

(١) راز: قسە. گرتە: گرتن. واتە: لەبەر سەرخۆشی نە دڵ ئەوەی لە یادە قسە بنووسێ لە سەر رووی قاقەز، وە نە سەرپەنجەیشم هۆش‌و فامی قەڵەم گرتنی هەیە.
(٢) مدران: وەستاوە. وەڵگ: گەڵا. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوە پێکەوە دێ.
(٣) مدۆ: ئەدا. مارۆشەوە: ئەیهێنێتەوە. واتە: قەڵەمی قامیش ئەوەندە لە ناو زەلکاوی شووشەی مەرەکەبی پڕ لە مەینەتا ماوەتەوەو چاوەڕوانیی نووسینی کردووە، سەوز بووەو گەڵای کردووە، ئێستا قەڵەمەکەم ئاوازەیەکی لێوەدێت سەد دڵ لە بیستنی نەخۆش ئەکەوێت، گەڵاکەشی بەستە بە بەستە ئەو ئاوازەی بۆ ئەسێنێتەوە.
(٤) سزا: شایان. واتە: مادەم گیانم لە لەشما نەماوەو یادی تۆ لەشی داگیر کردووم، هەر یادەکەت خۆی لایقی ئەوەیە قسەی لەگەڵ بکەی، جا ئیتر قسەکەت لە رووی نازەوە بێ یا لە رووی لۆمەکردنەوە.
(٥) سفتە: سووتاو. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەیدا دێ.
(٦) مەنەیم: مانەوەم. مەولەوی لێرەدا دەس لە بیانووەکەی پێشەوەی هەڵئەگرێ‌و بیانوێکیتر دێنێتەوە بۆ نامە نە نووسین وە ئەڵێ: ئازیزەکەم، نە... نە... ئەم عوزرانەم کە

## [۲]

### وادەی سفیدی(۱)

وادەی ســــفیدی شکــــۆفـــەی پــــیرین
شکــۆفــەی بــاخچەی پــیری دڵگــیرین(۲)

شکـــــۆفـــەی بــاخچەی پــیری ســفیدەن
ســەرمایەی مــیوەی عــیرفان هــەر ئـێدەن(۳)

نــە بــاخچەی ســونبوڵ تــار مــووی تــاردا
ســـپی شکـــــۆفـــــەی پــیریم دیــار دا(۴)

بـــــــاقەی زوێری‌و زاری‌و دڵگــــــــیریم
پــەی‌پەی زیــاد کــەرد پــەژارەی پــیریم(۵)

---

☞

هێنایەوە پێویست نین چونکە من سووتاو دووری خاڵی باڵای رەنگارەنگەکەی تۆم‌و نیشتەجێی دۆزەخی دووری باڵاتم، ببورە لێم کە ماوم‌و ئەژیم، مانەکەم لەبەر ئەوەیەکە ئەهلی دۆزەخ نامرن.

[۲]

(۱) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی پیربوونی خۆیەوە وتووە.
(۲) سفیدی: سپیەتی. شکۆفە: گۆپکەی درەخت کە تازە پشکووتبێ. واتە: کاتی سپی بوونی موو گۆپکەی پشکووتووی داری پیری‌یە، وە ئەو گۆپکە پشکووتووەی باخچەی پیری‌یە مایەی دڵگیری‌و خەفەتباری‌یە.
(۳) واتە: گۆپکەی پشکووتووی باخچەی پیری کە بریتی‌یە لە مووە سپی‌یەکان، وە هەر ئەوەش سەرمایەی میوەی تێگەیشتنە، چونکە هەرکەس سەرو ریشی سپی بێ بیر لە دوا رۆژ ئەکاتەوەو خواناسی‌و خۆی ئامادە ئەکا بۆ قەبرو قیامەت.
(۴) سونبوڵ: گوڵ. تار «ی یەکەم»: تاڵ. تار «ی دووەم»: تاریك. واتە: لە باخە گوڵی تاڵە مووە رەشەکانما گۆپکەی پشکووتووی سپی دیاری داکە نیشانەی پیریمە.
(۵) بــاقە: چــەپك: واتــە: خــەم‌و خــەفەتی پیریم پــەی دەر پــەی چــەپکەی عــاجزی‌و خەفەتباریمی زیاد کرد.

ئــاخر رۆی وەهــار نــەوجوانــیمەن
ئــەوەڵ رۆی پــایز زیــندەگــانیمەن[١]

هــەناسەم چــون بــای خــەزان مــەخێزۆ
پــەیپەی بــەرگ شــاخ شــادیم مەڕێزۆ[٢]

خــەدەنگ بــاڵام چــەمان کــەمان وەرد
راست وە نــیشانەی فــەنا روو ئــاوەرد[٣]

کــەمکەم پــیری خــەم وە قــامەت مــدۆ
دەمدەم وەعــدەی رۆی قــیامەت مــدۆ[٤]

پــیری یــەکسەر زۆر جە زانــووم سەندەن
ســەر وە گــەردندا هــەر وە زۆر مەندەن[٥]

ســاقی، پــام بــەستەی زەنــجیر پــیرین
دەســم دامــانت وادەی دەس گــیرین[٦]

چــابوك بــەو رەفــتار بــێ درەنگــەوە
خــەرامــان بــەو نــاز بــاڵای شــەنگەوە[٧]

---

(١) واتە: ئەمڕۆ دوا رۆژی بە هاری جوانیو یەکەم رۆژی پایزی ژیانمە.
(٢) مەخێزۆ: هەڵ ئەسێ. مەڕێزۆ: دائەوەرێنێ. واتە: هەناسەم وەك بای پایز دێتو پەی دەر پەی گەڵای لقی شادیم دائەوەرێنێ.
(٣) چەمان: چەمیوەتەوە. واتە: باڵام کە وەك تیر راست بوو، چەمیوەتەوە وەك کەوانی لێ هاتووەو راست رووی کردووەتە نیشانەی مردن. ئەوەتەکە تیر ئاراستەی نیشانێك ئەکرێ وەك کەوان دائەکەوێو ئەدا لە نیشانەکە.
(٤) واتە: پیری وردە وردە باڵام ئەچەمێنێتەوەو پەی دەر پەی وەعدەی قیامەتم ئەداتێ.
(٥) زانوو: ئەژنۆ. واتە: پیری بە تەواوی هێزی لە ئەژنۆم بڕیوەو هەر بە زۆر سەر ماوە بە ملمەوە.
(٦) بەستە: بەسراو. مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.
(٧) چابووك: چوستو چالاك. رەفتار: رۆیشتن. بێ درەنگ: بێ دواکەوتن. خەرامان: لەنجەولار.

جـامت جـەم ئـاسا لەبڕێز کـەر جـە مـەی
پـێم نـۆش کـەر وە یـاد بـەزم ئـارای کـەی(۱)

مـــەستی وە پـــیران جـــوانـــی مـــدۆ
هـــێز دووبـــارەی زرانـــی مـــدۆ(۲)

پـێمدەر تـا پـەیپەی پـێوە هـەی کـەروون
رای سەخت سارای مەحشەر تەی کـەروون(۳)

زرنگـەی گـۆش وێم پـێم مـاچۆ وە تـاو:
گـاهێ خـەبەردار، گـاهێ سـەر حـەساو(۴)

مـن پـەمەی غـەفڵەت کـەڕ کـەردەن گـۆشـم
هـیچ وەکـەس نـیەن نـە گـۆش نـە هـۆشـم(۵)

---

(۱) جەم ئاسا: وەك جەمشید. ئەم وشەی «جەم»ە بۆ گەیاندنی هیچ مەعنایەك نەهێنراوە جگە لە هاوجووتی لەگەڵ «جام» چونکە «جامی جەم» بەناوبانگە، هەرچەند مـەعنای «جام»ەکەی ئێرەو «جام»ەکەی ئەوێ جیان لە یەك. لەبڕێز: لە لێوارەکەی بڕژێ. کەی: کەیخەسرەوی شای ئێران، مەبەس گەورە گەورانە.

(۲) زرانی: ئەژنۆ: واتە: کاکەی مەیگێڕ پێم بە زەنجیری پیری بـەسراوەتـەوە، دەخـیلتم وەختی ئەوەیە بگەیتە فریام، گورجوگۆڵ بەو بە هەڵەداوان بە لەنجەولار وەرە پیاڵەیەکم بۆ پڕکە لە شەرابو بە یادی کۆڕی ئاهەنگی گەورە گەوران دەرخواردمی دە، چونکە مەستی پیران جوان ئەکاتەوەو دووبارە هێز ئەداتەوە بەر ئەژنۆیان.

(۳) پێوە: بە دەمیەوە. هـەی: هـۆرە. واتـە: شـەرابـم بـدەرێ تـا پـەی دەر پـەی بـە دەم خوادنەوەوە دەس کەم بە هۆرەکردنو رێگای سەختی دەشتی مەحشەر ببڕم.

(۴) واتە: گوێم ئەزرنگێتەوەو واتێ ئەگەم ئەو زرنگانەوەیە بە دەنگی بەرز ئەقیرێنـێ بـە سـەرماو جـارێك پێم ئـەڵێ «وریـابە» سبەی ئـەمریو جـارێکـیتر پێم ئـەڵێ کـاتی «سەرژماردن»ی ئەو کردەوانەتەکە پێش خۆت ئامادەت کردوون بۆ دوا رۆژت.

(۵) پەمە: لۆکە. واتە: بەڵام من پارچە لۆکەی بێئاگایی گوێی کەڕ کردووم، وە نە گوێم لە قسەی کەسەو نە هۆشم لای کەسە.

نــەی گــوزەرگای تــەنگ بــازار چــەپ گــەرد
هــەر کــاتێ زانــای ئــەجەل سـمکۆ کـەرد[۱]

مــوتریب بــەو نــەغمەی «شــانازی»تــەوە
یــا بــەو پــەردەی پـاك «حـیجازی»تـەوە[۲]

بــوڵەنــد کــەر دڵســوز سـەدای دڵ تـەنگی
بــەڵکەم بـێدار بـوو جـەی خـاو سـەنگی[۳]

هــای غـەفڵەت تـاکـەی هـام سـەفەر ویـەرد
بــێدار بــەر جــە خــاو کـاروان ویــەرد[۴]

---

(۱) سـمکۆ: سـمکوڵ، پـێ بـە زەویـدا کـوتان. واتـە: لەم رێ گـوزەرە تـەنگەی بـازاڕی چەرخی کەچ‌ڕەفتارا هەر ئەوەندەت زانی ئەجەل پێی کوتا بە زەوی‌داو هاتە سەرم.

(۲) شانازی: نقامێکی کۆنە. حیجازی: نیقامێکی کۆنی ترە. مەعنای ئەم شـیعرە لەگـەڵ شیعری پاشەوەی‌دا دێ.

(۳) واتە: کاکەی ئاهەنگ‌گێڕ لە سەر ئـاوازی نـقامی «شـانازی» یـان «حـیجازی» دەنگ هەڵبڕەو نقامێکی خەفەتبارمان بۆ بڵێ بە جۆرێ کە گڕ بەر بداتە دڵی ئینسان، بەڵکو لەم خەوی قورسی بێ‌ئاگایی‌یە بێدار ببمەوە.

(۴) ویەرد: تێپەڕی لەم شیعرەدا مەولەوی رووی قسەی ئەکاتە خۆی‌و ئەڵێ: تـا کـەی وابێ‌ئاگای، هاوسەفەرەکانت هەموو مردن‌و بەسەرچوون، لە خەو هەڵسە درەنگە‌کاروان بەجێی هێشتی.

## [۳]

## وەش ئامای[۱]

وەش ئامای هـەی پـەیك لای قـەبیلەی لەیـل
جـــەیب دڵ وە عـــەتر مـەیل لەیـلێ کـەیل[۲]

وەخـــتێ دووی دەردان مـەویەرد نـە هـەردان
جـــــە کـــوورەی ئـــایر دەرد بـــێ دەردان[۳]

نـــــــامەی وێرانـــــەی دڵان پــــێ ئـــاوا
جـــــە نــاکـــام یـــاوا، بــەڵام کـــام یـــاوا[۴]

هـــای وە فـــەرق دیـــن زامـــداران تـــاج دای
شـــــەریعەت مـــــەیل لەیـــلێ رەواج دای[۵]

---

## [۳]

(۱) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەرامی نامەیەکی شێخ «تاج‌الدین»ی کوڕی حـاجی شێخ «عبدالرّحمانی» کوڕی شێخی «سراج‌الدین»ﺍﻟﺮﺣﻤﻪ وتووەکە لە هەولێرەوە نووسیبووی بۆ مـەلەوی کـە لەو دەمـەدا لە تـەوێڵە بـووە، وە بـاسی تـەئسیری بـەرەکـەتی شـێخی «بهاءالدین»ی مامی تیاکردبوو، وە نووسیبووی ئەگەر بۆم رێ کەوێ دێم بۆ زیارەتی تا لە نزیکەوەکەڵکی لێ وەرگرم.

(۲) پەیك: فروستادە. جەیب: بەرۆك. واتە: بەخێر بێیت ئـەی فـروستادەی لای هـۆزی لەیلەوە هاتوو، کە بەرۆکی دڵو دەروونت پڕە لە بۆنی خۆشی خۆشەویستی یار.

(۳) دوو: دووکـەڵ. مـەویەرد: تێ ئـەپەڕی. مـەعنای ئـەم شـیعرە بـەسراوە بـە شـیعری پاشەوەیەوە.

(۴) یاوا «ی یەکەم»: گەیشت. یاوا «ی دووەم»: گەیشتن. واتە: کاتێك کە دووکەڵی دەردوو مەینەت لە ئاگردانی هەرگیز دەرد لێ‌دەرنەدراوەوە ـ کە دڵی دۆستە خەفەتبارەکانە ـ بەرز بووەوە بۆ سەر بەرزاییەکان، نامەکەت کە ماڵی وێرانی دڵمان ئاوا ئەکاتەوە، لە نـاکـاو گەیشتە دەستم، بەڵام چۆن گەیشتنێك؟!

(۵) فەرق: تەوقەسەر. واتە: بەو نامەیەت تاجت نایە سەر تەوقەسەری دیـنی ئـەوانـەی گـرفتاری زامـی عـەشقن، وە رەواجت دا بـە شـەریعەتی خـۆشـەویستی یـار کـە شـێخ «بهاءالدین»ە.

قــات بــی جــە کــەسرەت یــاران هــامدەم
گەرد کـۆی دڵبـەر خـەبەر بـەر پـەی چـەم(١)

مــەخموور کــەر دەروون جــە بـادەی بـاقی
یــــانێ نــەی جــواو خــاتیمەی ســاقی(٢)

بــــەڵێ چـــون لەزەت تـــیر نـــازاران
نــام نــەدان ئــەو دڵ بــازیت شــوماران(٣)

نــازوون وەو غــیرەت چ خـاس پـێت زانـان
مــاشەڵات وە حــاڵ یــاران پــێ وانــان(٤)

هــــەوای کــــۆتــایی نــاڵەی وێت بــیەن
وە تـــیرێ هـــەنی ئــاگــاهیت نــیەن(٥)

---

(١) کەسرەت: «کثرت»، زۆری. واتە: کاکەی فروستادە خەبەر بدە بە چاو کە بـە هـۆی کۆبوونەوەی دۆستانەوە بۆ گوێ‌گرتن لە نامەکەی شێخ، تۆزی بـەردرگای یـار هـەموو برایەوەو نەما تا چاو لە جیاتی کلە بەکاری بێنێ.

(٢) مەخموور: مەست. بـادە: مـەی. واتـە: دڵو دەروونت سـەرخـۆش بکـە بـە پـیاڵەی شەرابی نەبڕاوەکە ئـەم وەرامـەیە لە دواوەرامـە لە مـنەوە بـیبەی بـۆ شـێخ «تـاج‌الدیـن». جوملەی «خاتیمەی ساقی» ئیشارەتە بۆ ئەوەکـاتێ کـە مـەی‌گێڕ دواپـیاڵەی هـێنا ئـەوە وائەگەیەنی کە ئاهەنگ‌کێڕەکان ئیتر بڵاوەی لێ‌بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان، کە واتە ئەم جوملەیە ئیشارەتە بۆ ئەوەکە داوا لە فروستادەکە ئەکا زوو بگەڕێتەوە. وەرامەکەی مەولەوی ئەوەتە لە شیعرەکانی پاشەوەدا وتراوە.

(٣) بازی: گاڵتە. شماران: ژماردووە. واتە: لەمەوبەر لەبەر ئـەوەکـە تـامی تـیری نـازاران نەگەیشتبوە دڵت، ئیشی دڵداریت بە گاڵتە ئەهاتە بەرچاو، بەڵام ئێستا کە تووشی هـاتی باوەڕت کرد.

(٤) ماشەڵا: «ماشاءالله»، وشەیەکە لەکاتی سەرسوڕمانا بەکار ئەهێنرێ. واتە: بـنازم بـە غیرەتی یار بەرامبەر بەوەکە بە باشی پێی زانیت‌و کارێکی لێ‌کردی سەرت سوڕ بمێنێ لە حاڵی دۆستان.

(٥) هەنی: ئیتر. واتە: بە هۆی کورتی ناڵەی خۆت‌و خۆنەگرتنتەوە بووەکە بە تەنیا تیرێ لە هۆشی خۆت چووی‌و ئاگات لە خۆت نەماوە.

دڵ نـــاڵان بـــیەن نـــاڵان پـەی تـیرەن
تـــیر سـەرمایەی گـیان ئـاڵەم پـیرەن(١)

کـــۆتـــایی نـــیەن دۆس وە نـــاڵەی دڵ
چون وەردۆ جـە گـیان دەس دڵەی خـەجڵ(٢)

نیشان ئەو بـۆ دڵ نـە جـای خـەدەنگ هـوون
پەی «وضو» حەوز حـەوز بـدۆ وە بـیروون(٣)

حـەوزێ حـەنەفی خـاس پـێش رەزا بـۆ
نـەك جـەی شـەرعەدا نـمات قـەزا بـۆ(٤)

چـــون تـــازە زامـی هـۆشت ویـەردەن
وێت ئـــاسا خـەیاڵ ئـازیزت کـەردەن(٥)

---

(١) ناڵا «ی یەکەم»: ناڵەکەر. ناڵان «ی دووەم» ناڵین. واتە: ئێستا کە هۆشت هاتووەتەوە بە بەرتاو کەوتوویتە ناڵەناڵ، بۆ تیر ئەناڵێنی لە دەستی ئەو دۆستەوەکە سەرمایەی گیانی عالەمەکە پیرە.

(٢) وەردۆ: بەردا. واتە: دۆست هەرگیز دریغی ناکا لە ناڵەی دڵو تیری پێوە ئەنێ، هەر بەو مەرجەکە ئەو دڵە شەرمەسارە دەس‌بەردار ببێ لە گیانی خۆیو لە خۆی ببورێ. کەواتە هەرکاتێ تیری دۆست کەم بێ خەتای ئەو نیە، هی ئەوەیە دڵ بەڕاستی ئارەزووی تیر ناکا.

(٣) بدۆ: بدا. بیروون: دەرەوە. واتە: نیشانەی ئەوەکە دڵی عاشق دەس‌بەردار بوویێ لە گیانی خۆی، ئەوەتە تیری دولبەر بە جۆرێك کاری لێ کردبێ لە جێگەی تیرەکەوە ئەوەندە خوێن هەڵقوڵیبێ بوویێ بە حەوزو عاشقەکەی خۆی دەس‌نوێژی لێ بگرێ.

(٤) حەنەفی: ئەوانەی لەسەر پەیڕەوی ئیمام «ابوحنیفه» ئەڕۆن بە رێوە. نما: نوێژ. واتە: ئەبێ حەوزەکە ئەوەندە قووڵ بێ حەنەفی‌یەکان پێی رازی بن وە لایان وانەبێ هەر دەس‌نوێژێکی پێ‌بگیرێ بەتاڵەو ئەبێ نوێژەکە بە قەزا بگێڕێتەوە. شایانی باسە بە پێی پەیڕوی ئەبوحەنیفە درووست نیە لە ئاوی ئەستاو دەس‌نوێژ بگیرێ ئەگەر چاڵاوەکە دە گەز پانو دە گەز قووڵ نەبێ بە گەزی قۆڵ.

(٥) لێرەوە مەولەوی وەرامی ئەو قسەی شێخ «تاج‌الدین» ئەداتەوەکە وتبووی ئەگەر پێم بکرێ دێم بۆ زیارەتی مامم. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

ئـەو جـە کـۆن، دووریو نـزیکی جە کـۆن
دووریو نـــزیکی وەســـف مـــنو تـــۆن[١]

مــەنزڵش نــیەن ئــەو قــەوس ئــەو خــەدەنگ
کێ پەرساش یەکێو سەد هەزار فـەرسەنگ[٢]

یـــەکــێوەن هــەروەخت نــیشان ئــامادەن
کــێشــاو بــەرشییەو ئــەو نــیشان دادەن[٣]

ســاقی زیـــادەی مـــەی زۆر ئــاوەردەن
سـڕ سـەر بـەردەن وەرنـە سـەر بـەردەن[٤]

تـــەنگە زەرفـــەنان هـــیلاکـم مـەکـەر
ویسـعەت مـەشرەبی، یـا جـام نـیمپەڕ دەر[٥]

---

(١) واتە: تۆ لەبەر ئەوەکە تازە دڵداریو بەم زووانە بریندار کراویو هۆشت لا نەماوە خۆت ئاسایی یادی مامت ئەکەیت، ئەگینا ئەو لەکوێو دووریو نزیکی لەکوێ؟ بۆ پیاوی خوا دووریو نزیکی کەی هەیە؟ دووریو نزیکی بۆ منو تۆیە.

(٢) فرسەنگ: فرسەق: واتە: ئەو تیروکەوانی مەعنەوی ئازیزە ماواو مەنزڵێکی تایبەتی نیە، هەرکەس پرسیاری لێ کردی لە وەرامیا بڵێ فرسەقێكو سەد هەزار فرسەق بۆ ئەو وەك یەك وایە.

(٣) کـێشـا: کـێشـانە دواوەی کـەوان. بـەرشییە: دەرچـوو. واتـە: هـەر ئـەوەندە نـیشان ئامادەکرابێ بۆ لێدان، ئەوکەوان راکێشانو تیر دەرچوونو نیشان پێکانی یەك شتەو لە یەك کاتا تەواو ئەبێ.

(٤) سڕ: هەست. لێرەوە مەولەوی بە عادەتەکەی خۆی رووی قسە ئەکاتەوە ساقی... مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەیدا دێ.

(٥) تەنگەزەرف: بێسەبر. ویسعەت مەشرەبی: دڵفراوانی. واتە: کاکـەی مـەیگێڕ ئـەم هەموو قسەیەکەکردم هی ئەوە بوو زۆری شەرابەکەت عـەقڵو هـەستی نـەهێشـتبووم، هەرچەند هێشتا سەری نەبردوومو نەی کوشتووم. لەبـەر ئـەوە سـەبرو تـوانـام نـەماوە ئەزیەتم مەدە، یا تۆزێ دڵم فراوانکە، یا پیاڵەکەم تا نیوە بۆ تێکە تا بتوانم خۆم راگرم.

## [٤]

### وادەی سەفەرەن(١)

وادەی سـەفەرەن، هـای نـەسیم ئـامان
وە لای ئـازیزا بـویەر چـوون جـاران(٢)

تـەقریر کـەر ئـەوەڵ بـەو زوان حـاڵ
سـەلام و دۆعـای ئـەو دوڕدانـەی لاڵ(٣)

دووەم جـە حـاڵات پـەشێوی حـاڵم
جـە شـۆری بـەخت و وێرانـی مـاڵم(٤)

جـە بـێ قـەراری، جـە دەس دووری
جـە بـێ ئـارامـی، جـە نـا سـەبووری

جـە سـۆزەی شـەرار نـائیرەی هـیجران
جـە نـاسۆری زام تـیرەکـەی مـوژگان(٥)

جـە قـرچـەی قـاوەی جـەرگ جـەفاکـێش
جـە وەلوەلەی دەرد دەروون پـڕ ئـێش(٦)

جـە کـزەی هـوناو نـە چـەم سـەرکەردەم
جـە سـەنگینی بـار قـامەت خـەم وەردەم(٧)

---

## [٤]

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ شێخ عەزیزی جانەوەرەیی برادەری نووسیوە.

(٢) ئازیز: مەبەس شێخ عەزیزە. بویەر: تێپەڕە.

(٣) تەقریرکەر: عەرزکە. دوڕدانە: دانەی مرواری. لاڵ: لەعل.

(٤) شۆری: شوومی.

(٥) شەرار: شەرارە، بڵێسە. نائیرە: ئاگر. موژگان: برژانگ.

(٦) قاوەی جەرگ: جەرگم کە قرچەی دێ وەك قاوە لەکاتی برژانـدناو وەلوەلە: هـاوارو فوغان.

(٧) چەم: چاو. سەنگینی: قورسی. خەم وەردە: چەمیوە.

جــە بــێ خــاوی شــەو ئــەلوەدای سـەحەر
جــە نــاڵەی ئـەعزا، جـە سـۆزەی جگـەر[١]

جـــە هــاوار تــەن، جــە ئــەلوەدای گــیان
جـــە یـــاوای فـەڵەك نـاڵەی «اَلْأَمــان»[٢]

یـــەكیەك بــە حــوزوور ئــەو رۆح رەوان
عــــەرز کــــەر وە ســــەد شــــیرینی زوان

واچــــە یــــەند زوخــاو دەروونش وەردەن
ئــــەسپاب مــــەردەن ئــاماده کــەردەن[٣]

بــــــەڵ یــــاوۆ وە لام تـــەبیب دەردم
مـــەرهەم دۆ نــە رووی زامــان سـەردم[۴]

جەو مەعجوون ئـەجزای لوتـفو مـەیل ویش
دەوا دۆ پــەی زام خـەستەکـەی دڵ رێش[٥]

## [٥]

### وەهارەن، سەیرەن[۶]

وەهــــارەن، ســــەیرەن، ســەوزەی دیــاران
نم کەوت نـە دیـدەش چـون شـەو بێداران[٧]

---

(١) بێ خاوی: بێ خەوی. ئەلوەدا: ماڵاوایی، مەبەس هاوارو گریانە.
(٢) یاوای فەڵەك: بە ئاسمان گەیشتن. (٣) وەردەن خواردووە.
(۴) بەڵ: بەڵکو. یاوۆ: بگات. دۆ: بدات. (٥) مەعجوون: شێلراو، مەڵهەم.

[٥]

(۶) مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی لە سەرچاوەی «زەڵم» وتووەکاتێك کە بـەهار لەگـەڵ هەندێ دۆستو برادەریا چووە بۆ ئەوێ بۆ سەیران.
(٧) واتە: بەهارە، وەختی تەماشایە، سەوزەگیای دەشتو کێوەکـان ئـاونگ نیشتووەتە سەرچاویان، وەك پیاوانی خواکە شەو ناخەونو بیر لە خوا ئەکەنەوەو فرمێسك لە چاویانا ئەدەرەوشێتەوە.

پـــەی دڵەی مـــانیای دەروون مـــەلالان
ســـایە بـــەستەوە خـــەیمەی گـــوڵاڵان[١]

بـۆی یـەخەی سـەحەر پـەی دەمـاخ دڵ
مـــانۆ وە نـــەسیم جـیّب جـەمینگوڵ[٢]

چـون دێوانـەی شـۆر ئـازیز نـە سـەردا
شـەتاو سـەر هـۆر گـرت وە دەشتو دەردا[٣]

تـــولانی چـــون هـــیجر خـــاتر پـــڕ دەردان
رەوان وێنـــەی وەسـڵ گـەردن بـێ گـەردان[٤]

هـــای جـە شـنۆی وەش رۆح ئـەفزای کـاوان
ئـــای جـە شـاخەی تـاف سـاف سـەراوان[٥]

نـــەك چـون تـاف چـەم پـڕ ئـەسرین چـەرخ
«بارَكَ اللّه» چـەرخ، هـەی ئـافەرین چـەرخ[٦]

چـــەنی جـــە هـــەستی وێت تـــەواســـاییت
چەنی جـۆش عـەشق مـەجنوون ئـاساییت[٧]

---

(١) مانیا: ماندوو. واتە: خێوەتی گوڵاڵەکان سێبەریان کردووە بۆ دڵی ماندووی دڵ پڕ لە خەفەتەکان.

(٢) مانۆ: ئەشوبهێ. جێب: سنگو بەرەك. واتە: بۆنی بەرەبەیان لە هەوای سنگو بەرەکی نازاران ئەچێ لە خۆش کردنی دەماخی دڵدا.

(٣) شۆر: عەشق. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٤) تولانی: درێژ. واتە: لافاوی بەهار سەری خۆی هەڵگرتووەو رێگای دەشتو دەری گرتووەتەبەر وەك دڵدارێك کە عەشقی یار شێتی کردبێ وە درێژە وەك دووری یار لە دڵی عاشقی دەردەدارا، وە سافو مەنگە وەك گەیشتن بە یاری گەردن بێ گەرد.

(٥) وەش: خۆش. شاخە: هارە. مەعنای ئەم شیعرەو دوو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٦) چەرخ: پێشان چەمی زەڵم پێیشیان وتووە چەرخ.

(٧) هەستی: بوون. تەواسایی: بێزار بوون. واتە: ماشەڵڵا لە شنەی خۆشی بە گیان دەری

بدیە چۆن هۆردان وە نامو نەنگدا
بێ پەروا مدۆ وێش وە رووی سەنگدا(١)

های ساقی هەڵای سەرمایەی خامی
نمەدۆم وە دەس رای نێکنامی(٢)

باوەرە وەش‌وەش سا دەی هەی پەی کەی
تاف قەڵوەزەی ساف شیشەی مەی(٣)

مەوجش بنچینەم بدۆ وە هەمدا
هەستیم دۆ وە بەرد هەرد عەدەمدا(٤)

---

☞

سەرشاخەکانو لە هاڕەی تافی سافو ڕەوانی ئاوەکان کە لە بەرزەوە دێنە خوار، بەڵام نەك وەك هاڕەی تافی چەمی پڕ لە فرمێسکی زەڵم کە هیچ چەمێکی پیا ناگاتەوە. ئەمجا روو ئەکاتە زەڵمو پێی ئەڵێ: ماشەڵڵات لێ بێ هەی چەمی زەڵم وە لە بێزار بوونت لە وجوودی خۆتو لە جۆشی عەشقی مەجنوون ئاساییت.

(١) هۆران: هەڵی داوە. مدۆ: ئەدا. واتە: سەیری کە چۆن عەیبەی ناوەتەلاوەو لە ناوو ناتۆرە ناترسێو بێ پەروا خۆی ئەدا بەو تاشو بەردانەدا.

(٢) هەڵای: هێشتا. نیکنامی: ناوبانگی باشی. مەعنای ئەم شیعرە لە گەڵ هی دوو شیعرەکەی پاشەوەی دا دێ. (٣) باوەرە: بێنە. قەڵوەزە: قەڵبەزە، تاڤگە.

(٤) دۆ: بدا. مەولەوی لێرەوە بە عادەتەکەی خۆی هاوار ئەباتەوە بەر مەیگێڕو پێی ئەڵێ هێشتا سەرمایەی تێ نەگیشتنو بێ سەلیقەیی نامداتە دەستی ڕێگای ناوبانگی باشی، کەواتە تۆ خۆت بۆ کەی هەڵگرتووە زووکە لە تاڤگەی سافی شووشەی مەیەوە تافی مەی بەردەرەوە، با شەپۆلی بنچینەی بوونم تێكو مەکان بداو بمدا بە تاشو بەردی شاخی نەبوونی دا.

## [٦]

### وەفای چەرخ چەپ[١]

وەفـــای چـــەرخ چـــەپ، راس بـــێ تـــانو پـــۆن
جـــەفا بـــێ پـــایان، دەرد ســـەر بـــێ شـــۆن[٢]

بـــــەدی نـــــیکی‌یەن، نـــــیکی بـــــەدنامی
فـــــاما شـــێتـــی‌یەن، شـــێتـــی پـــڕفـــامی[٣]

ســـــارای هـــــیدایـــەت تـــاریك مـــوینوون
رای نـــەجات یـــەکـجار بـــاریك مـــوینوون[٤]

نـــــاڵەم نـــەی ئـــاسا ئـــاڵەم گـــرت نـــە وەر
شـیشەی مـەی پـەمەت نـە گـۆش بـەراوەر[٥]

جـــــە تـــــۆ قـــــەهقەهە، جـــە پـــیاڵە مـــەی
جـــە سـاقی هـا دەی، جـە ئـێمـە بـا بـەی[٦]

---

[٦]

(١) مەولەوی لەم قەسیدەیەدا گلەیی لە وەزعی زەمانە ئەکا.

(٢) بـێ‌شـۆ: لەرادەبـەدەر. واتـە: وەفـای گـەردوون چـەپەو، راست تـانو پـۆی نـیەو، ناڕەحەتی دوایی نایەتو دەردی سەر لە ئەندازە بەدەرە.

(٣) بەدی: خراپە. نیکی: چاکە. فاما: تێ‌گەیشتن.

(٤) سارا: «صحراء»، دەشت. ئەم شیعرە لە قەسیدەیەکی تریشا هەبوو.

(٥) پەمە: لۆکە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٦) قەهقەهە: قاقای پێکەنین، مەبەس مرقەی دەمی شووشەیەکاتێك کە شـەرابـی لێ دائەکرێ. با بەی: بابێت. واتە: ناڵەم وەك شمشاڵ عالەمی گرتووەتەبەر، کەواتە تۆ بۆچی گوێت لێ‌نیە ئەی شووشەی مەی تا بە فریام بگەی. دەسا لۆکە لە گوێت دەرکەو برژێرە ناو پیاڵە با گوێم لە قاقای دارژانەکەت بێو پیاڵەش پڕ ببێ لێتو مـەی‌گێڕ پـێم‌بـڵێ فـەرموو بگرەو منیش بڵێم بابێت.

مـەڵڵا جـە کـەسرەت لەوحش بـۆ سـادە
مـــەنسوخ نـــەزانـــۆ حـــەڵاڵی بـادە[١]

زاهـید مـایەی هـۆش هـیچ نـەمانۆ پـێش
پەشێو بـۆ تـەقواش چـون مـێزەرەی وێش[٢]

مـــن نـــەوون وە تـــەنگ نـــەفامی‌یەوە
وێم بــــدەون وە دەس بـــەدنامی‌یەوە[٣]

دێوانـــــان ئـــاسا بـــجۆشـــوونەوە
بـــەڵاگـــەل چـــون مـــەی بـنۆشـــوونەوە[٤]

شـــەرارەی مـــەستی مـــەی بـــەرشۆم نـــە دڵ
وەو چـــــراخــــەوە یـــاوون وە مـــەنزڵ[٥]

---

(١) کەسرەت: زۆری. مەنسووخ: ئەو ئایەتەیەکە حوکمەکەی هەڵوەشابێتەوە. واتە: با بێ بە قەرەباڵغێکی‌وا لە بەر زۆری خەڵکەکە مەلا هیچی لەبەر نەمێنێ‌و نە زانێ ئایەتی حەڵاڵی مەی هەڵوەشاوەتەوە. لەسەرەتای ئیسلاما مەی خواردنەوە حەرام نەبوە.

(٢) تەقوا: لە خوا ترسان. واتە: لە خوا ترسەکانیش تێ‌گەیشتنیان لانەمێنێ‌و لە خوا نەترسانەکەیان وەك مێزەرەکەی سەریان تێك‌چێ.

(٣) نەوون: نەبم. بدەون: بدەم. واتە: خۆیشم بە تەنگی نەفامی‌یەوە ئەمێنم‌و خۆم بدەمە دەستی بەدناوی.

(٤) بجۆشوونەوە: بێمە جۆش. واتە: وەك دێوانەکان بێمە جۆش‌و وەك مەی دەردو بەڵا نۆش بکەم.

(٥) چراخ: چرا. واتە: بڵێسەی مەستی لە دڵمەوە بەرز بێتەوەو لە بەر رووناکی ئەو چرایە شتی تاریکی ژیانما رێ دەرکەم‌و بگەمە جێ.

خـــوسووس شــەرارەی خــورشید دووری
مــاران گــاز کـەردەن زەخـم مـەهجووری[١]

مـــەر لابـــەرۆ ژار وە دارووی ویســـاڵ
یــا وە مــەرهەم ســێڵ زام کــەرۆ پــاماڵ[٢]

وەرنـــە ئـــارەزووی ژیـــان مـــەحاڵەن
خـــەیاڵ حـــەیات فکـــرێ بـــەتاڵەن[٣]

[٦]

## هەرچەنی ناکاو[٤]

هـــەرچـــەنی نـــاکـــاو دەمـــاخم تـــەم بـــی
ســـیاهەور دوود نـــەکـــەللەم جـــەم بـــی[٥]

بـــەرقو بـــرووسکەو تـــەم داش وە هـــەمدا
پـــلووسکەی ســـێلاو ئـــامام وە چـــەمدا[٦]

---

☞

لێداوم‌و زەهری ماری دووری دەرخوارددداوم، بە تیرەکە سەرتاپای لەشمی کون کون کردووەو بە زەهرەکەی جەرگ‌و دڵمی دافڕەقاندووە.

(١) واتە: بەتایبەتی بڵێسەی خۆری دووری خۆرانگازی بە زامەکانی لەشم کردووە.

(٢) داروو: دەرمان. سێڵ: سێلاو. مەعنای ئەم شیعرەش لەگەڵ شیعری پاشەوەی‌دا دێ.

(٣) واتە: مەگەر یار بە دەرمانی وەسڵ ژاری مارەکەی دەرکا لە لەشم، وە بە مەڵهەم لافاوی زووخ‌و کیمی زامەکانم نەهێڵی، ئەگینا مەحاڵە جارێکی‌تر بە تەمای ژیان بم، وە شتێکی هیچ‌و پووچ ئەبێ بیری لێ بکەمەوە.

[٦]

(٤) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆ خاڵۆی کۆماسی ناردووە.

(٥) مەعنای ئەم شیعرەو سێ شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٦) بەرق: برووسکە. مەبەسی لەو تیشکانەیە لە چاوی ئینسانەوە دەرئەچێ لەکاتی پژمەی زۆر توندا.

خــــاشاك هــــەستیم لافـــاو بــــەردەوە
دەروون پــــــێچش داو دڵ ویــــەردەوە[١]

زانـــام هــــەمدیسان دڵ كــۆس نــۆشــەن
گـــــەردەلوولشەن ئـــارەزووی تــۆشــەن[٢]

جــــۆشش وەردەبــێ چــار وێم نــەكــەرد
وە هــەرحــاڵ نــە بــەین شــەرتێمـان ویـەرد[٣]

نــــەك چـــــەنی خــــەیاڵ قــیبلەم بســازی
دەخــیل تــەن خــەستەن وە جـیاش نـازی[٤]

سەر هــەردەو سـەرهەرد، مـەنزڵ ئـەو مـەنزڵ
دڵ ئــەو شــۆن تــۆ، مــن ئـــەو شـۆن دڵ[٥]

دیــم بــەد عـــەهدێش كـەرد هـەوا سـەندەوە
تــەن حـــەسرەتمەند بــی جـیا مـەندەوە[٦]

---

(١) خاشاك: پلوپووش. ویەرد: بووردەوە.
(٢) واتە: هەر لە ناكـاوا تـەم دەمـاخمی داگـرتو هـەوری رەشـی دووكـەڵ لەكـەللەما كۆبووەوە، دەسم كرد بە پژمەو هووڕو چاوم تیشكی لێبووەوەو بەر چاوم تاریك بوو، وە فرمێسك بە خوڕ بە چاوما هاتە خوارو پلوپووشی لەشمی بردو دەروونم پێچی پیاهاتو دڵم بووردەوە «یەعنی: بوورایەوە»، زانیم ئەوە هی ئەوەیەكە دیسانە دڵم كۆستی كەوتووەو كەوتووەتە گەردەلوولو ئارەزووی تۆیەتی.
(٣) واتە: دڵم هاتبووە جۆشو منیش هەرچیمكرد چارم پێنەكـرا، نـاچار رێ كـەوتینو مەرجێكمان بۆ یەكتر كرد.
(٤) نەك: نەكەی. بسازی: رێك كەوی. نازی: نەهێڵی. واتە: پێموت لەگەڵت دێم بۆ لای لەیل بەڵام بەو شەرتە نەكەی لەگەڵ یادی دۆستا رێك كەویو بڕۆیو لەشـی خـەستەم بەجێ بێڵی.
(٥) شۆن: شوێن. واتە: بەپێی ئەم شـەرتەكـەوتینە رێ لەم هـەردەوە بـۆ ئـەو هـەرد لەم مەنزڵەوە بۆ ئەو مەنزڵ، دڵ كەوتبوە دوای تۆو منیش كەوتبوومە دوای ئەو.
(٦) بەدعەهدی: بێپەیمانی. هەوا سەندەوە. فری. واتـە: كـەچی دیـم بـە پـێچـەوانـەی گفتەكەی خۆی جوولایەوەو دایە شەقەی باڵو لەشمی خەفەتبار كردو بەجێی هێشت.

جـــه بــێ شــەرتی دڵ زامــەتم ســەختەن
وێت یـــاونەوه هــای نــەسیم وەخـــتەن[١]

رەحــمێ کـــەر وه حــاڵ خـــەمان هــەرزاندا
تــەشریف بــەر بــدیه وه ســەر بــەرزاندا[٢]

هــەر جــایێ چــون بــەخت دوور نــەوهاڵان
ســـیا بـــۆ تـــاریك جـــه ســیاماڵان[٣]

گـــێج دوود ئـــاخ هـــەواش پــڕ کـــەردەن
ئــانه یــاتاخگەی خـــاڵۆی هــام فــەردەن[٤]

گـــا گـــێج ســـــەرسام نـــــه گـــەرداوەدا
گــا خـــەفتەن نــه تـۆی خـەفەت خـاوەدا[٥]

جه نـەشئەی گـەرمی هـەوای کـوورەی مـەیل
جای تـینیش کـەمکەم جـه نـم بـیەن کـەیل[٦]

---

(١) یاونه: بگەیەنه. لێرەوه مەولەوی رووی قسەی ئەکاته بای نەسیم و پێی ئەڵێ: بە هۆی بێوەفایی دڵمەوه دەردم زۆر گرانه، وەختیەتی بگەرە فریام.

(٢) واته: بەزەییت بێتەوه بە حاڵی منی خەم و خەفەت زۆرداو تەشریف ببە بڕوانە بە هەموو بەرزاییەکا.

(٣) سیا: رەش. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بەشیعری پاشەوەیەوە.

(٤) واته: هەرچییەك رەش بێ وەك بەختی عاشقانی دوور لە یـار، وە بـە هـۆی زۆری دەوارەوه تاریك هەڵگەڕابێ، وە گێژەڵووکەی دووکەڵی ئاخ هەڵکێشان ئـاسمانی ئـەوێی داگرتبێ، ئەوه جێگای خـاڵۆی کـۆمـاسییه. لە هـەندێ نـوسخەدا لە جیاتی «خـاڵۆی هامفەردم» نووسراوه «گەردەن بێ گەردم».

(٥) گا: گاه، جارێك. خەفتەن: نوستووه. واتـه: خـاڵۆیش وەزعـی وایـه جـارجـار گـێژو سەرسامه لە ناو گەرداوی عەشقا، جارجاریش خەوی خەفەتی لێ کەوتووه.

(٦) جای تینی: جێی تینوویەتی کەوتن، چاڵایـی لامـل. واتـه: لەبـەر نـەشئەی گـەرمای هەوای تەنوری ئارەزووی دۆست، لاملی کەمکەم ئارەقی کردووه. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «نەشئەی» نووسراوه «تەشنەی» واته: لەبەر تینوویەتی... تاد.

وێت ئـاسا وە نـەرم وێت نـە رووی نـم دەر
بـەو شـنۆی فـێنك دڵش بـێدار کـەر[١]

بەڵام شـنیای تـای سـەر سورمەی بـێ گـەرد
ئـازار نـەدۆ هـیچ وە سـای گـەردەن زەرد[٢]

مـەپەرسۆ، سـێڵاو ئـەسرینان تـاوتاو
بـڕێز وە روودا، ئـێدش دەر جـواو[٣]

سـفتەکـەی سـەرسام تـەن نـاتەوانـا
دیـم خـەستەن کـەفتەن هـەر ئـێد موانـا:[٤]

یـە سـەختی زامـەت، یـە دەرد مـوشکوڵ
یـە دووری خـاڵۆم، یـە بـێ شـەرتی دڵ[٥]

---

(١) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٢) شنیا: شنە. واتە: ئەی نەسیم خۆت ئاسا بە نەرمی خۆت بدە لە رووی ئارەقەکەی لاملیو بەو شنە فێنکەکە پەیدا ئەبێ لە خۆ دانت لە ئارەقەکە، دڵی خەبەر کەرەوە، بەڵام ئاگات لێبێ خۆ لێدانەکەت وابێ جووڵانەوەی ریشووی سوورمە بێ گەردەکەی سەری ئازار نەگەیەنێ بەگەردنی زەردی. مەبەسی ئەوەیە ریشووی سەرووپێچەکەی نەلەرێنیتەوە.

(٣) بڕێز: بڕێژە. مەعنای ئەم شیعرەیش لەگەڵ شیعری پاشەوەیدا دێ.

(٤) سفتە: سووتاو. موانا: ئەخوێندەوە. واتە: کە خەبەرت کردەوە دیارە پرسیارت لێ ئەکا، تۆیش تاوتاو لافاوی فرمێسك لە چاوتەوە بڕێژەو لە وەراما پێی بڵێ: سووتاوە سەرسامە لەش هێز لێبڕاوەکەتم دی کەوتبوو هەر ئەمەی ئەوت. وتەکەی لە دوو شیعری پاشەوەدا دێ.

(٥) یە: ئەمە. واتە: ئەی وت هەی هاوار ئەوە لە لایەکەوە سەختی دەردو مەینەت... لە لایەکی تریشەوە ئەوە دەردی چارەنەکراو... ئەوە دووری خاڵۆم... ئەوە بێ قەوڵی دڵ. نازانم چی بکەم لە تاو ئەم هەموو دەردو ئازارە. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «خاڵۆم» نووسراوە «ئازیز».

ئـــەجەل نـــیم رەمـــەق بـــاقی‌یەن ســـا دەی
جـــــەودما بـــــەختان مـــــەوینانت پـــەی[١]

[٧]

## هەوای زمستان[٢]

هـــــــەوای زمســـــتان خـــــەمان بــــەتاڵەن
وەرو هــــــەرد دەرد دەروون خـــاڵ‌خـــاڵەن[٣]

هـــاژەی تـــاف ســـاف شـــەتاوگەی شـــادی
ســـوب مـــەیۆ نـــە گـــۆش هـۆش ئـازادی[٤]

بـــۆی شـــنۆی شـنیای تـای چـنوور شـەوق
مـــــدۆ نـــــە دەمـــاخ پـــڕ پـــەرداخ زەوق[٥]

کـــەیفم دا وەش‌وەش دەســـتە وەســـتەی گـــوڵ
نـــە گـــۆشـــەی کـــڵاو، نـــە پـــای دەشت دڵ[٦]

---

(١) مەوینانت پەی: نابینم بۆت. واتە: دەسا ئەی ئەجەل نیوەگیانێکم تیا ماوە تا فرسەتە وەرە سەرم گیانم بکێشە، ئەگینا جارێکی‌تر هەلی وات بۆ هەڵناکەوێ‌و بەختێ نابینم بۆت. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «پەی» هەر «دەی» دووبارەکراوەتەوە، بەم پێیە مەعنای «مەینانت» ناتبینێ ئەبێ.

[٧]

(٢) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەرامی نامەیەکی شێخ عەزیزی جانەوەرەیی برادەریا نووسیوەکە لە بەهارا بۆی نووسیبوو.

(٣) زمستان: زستان. واتە: هەوای زستانی خەم بەتاڵ بووتەوەو بەفری هەردی دەردی دەروون پەڵەپەڵە بووە.

(٤) واتە: بەیانیان هاژەی تاڤگەی سافی شادمانی دێتە گوێی تێ‌گەیشتنی ئازادی. مەبەس لە ئازادی رزگار بوونە لە سەرمای زستان.

(٥) واتە: بۆنی شنەی چڵی چنووری ئیشتیاق ئەدا لە لووتی پڕ نیشاتی زەوقم.

(٦) وەستە: بەسراو. کڵاو: لووتکەی بەرز. واتە: چەپکە گوڵی بەسراوی سووچی

نـــیشانەی نـــەوزۆز وادەی وەهـــارەن
یـــا نـــەشئەی ئـــامای نـــامەی نـــیگارەن[١]

یـــانێ: ئـــازیزم یـــە نـــامەی تـــۆ بـــۆ
یە رەشحەی حەیات سـەر خـامەی تـۆ بـۆ[٢]

ئـــەی ئـــەسرین گـــەرم تـــاوتاوە راســـەن
ئـەی دڵەی پـەی مـن هـوو‌ناوە راسـەن[٣]

بـــیەن ئـــەی وەفـــا، وەی ئـیستیغناییت
ئـەی گـەرمی مـۆبـەت، وەی ئـاشناییت[٤]

تـــاقییەن یـــاران، یـــا خـــاوم دیـەن
جـــە بـــەدبەختی وێم یـــاوەرم نـــیەن[٥]

---

☞

لووتکەی شاخەکانو داوێنی دەشتەکان پەیدەرپەی کـەیفم زیـاد ئـەکـا. ئـەش‌توانـرێ مەعنای شیعرەکە بەم جۆرە لێبدرێتەوە: چەپکە گوڵ بە بەینی کڵاوو پێچـەدا کـراوو لە عاستی دڵا لە باخەڵا دانراو، پەیدەپەی کەیفم زیاد ئەکا.

(١) نیگار: وێنە، مەبەس لە دۆستە. واتە: نازانم ئەمە نیشانەی نەورۆزو وادەی بەهارە، یا نەشئەی هاتنی نامەی دۆستە؟

(٢) واتە: مەبەسم ئەوەیە بشـێ ئـەمەی بـۆم هـاتووە نـامەی تـۆبـێو ئـەو مـەرەکـەبەی پێی‌نووسراوە ئاوی حەیاتی سەرنووکی قەڵەمی تۆبێ؟

(٣) واتە: بشێ راست بێ تۆ تاوتاو لە بەر دووری مـن فـرمێسك بـرێژیو دڵت بـۆ مـن بووبێ بە خوێناو؟

(٤) بیەن: بووە واتە: بووە ئەوەندە بە وەفا بێ نامەی وام بۆ بنووسێ، کەچی لەو لاشەوە ئەوەندەکەمتەرخەم بێ لەگەڵم؟ مەعنای نیوەی دووهەمی ئـەم شـیعرە لەگـەڵ شـیعری دوایی‌دا دێ.

(٥) تاقییەن: تەحقیقە. واتە: برادەرینە ئاخۆ ئەم گەرمی خۆشەویستیو ئـەم ئـاشنایی‌یە راستە یاخەوم دیوە؟ من لە تاو بەدبەختی خۆم باوەڕم نیە راست بێ.

روخساریٚ، وەختیٚ مەسقەڵ مدا ویٚش
وە شنۆی پاریٚز خەیاڵ مەبی ریٚش[١]

ئەسرین جەرگش دەن وە سەر نیٚشەدا
چە نیٚش دڵ ئامان، ئامان پیٚشەدا[٢]

ئەو دڵەی ویٚنەی پەڕەی گوڵ بیٚ گەرد
هەی خەم، هەی نامەرد، چەنیت مەلوول کەرد[٣]

ئەوسا ئیستیغناو قین وە هەم ماوەرد
ئینسان بیٚ پەروا گیان تەسلیم مەکەرد[٤]

ئیسە بۆ ئەی تاو هەرس چون سەیلە
ئەی ئیلتیفاتەو ئەی وەفاو مەیلە[٥]

(١) مەسقەڵ: «مصقل»، ئەوەی ژەنگی پیٚ لائەبەن. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوە.
(٢) ئەسرین: فرمیٚسك دەن: بدەن. واتە: ئەو روخسارەی ئازیزە وەختیٚ کە خۆی جوان ئەکرد ئەوەندە ناسك ئەبوو ئەگەر خەیاڵ بە پاریٚز بەلایا بڕۆشتایە ئەو بە شنەی رۆیشتنەکەی بریندار ئەبوو، ئیتر نازانم فرمیٚسکی چاوی ـ یا خۆ جەرگی بدە بە سەر نووکی نەشتەرا ـ چۆن دڵی هاتووە پیایا دابڕژیٚتە خوارەوە؟ لە هەندیٚ نوسخەدا لە جیاتی «روخساری» نووسراوە «روخسارش» وە لە جیاتی «ویٚش» نووسراوە «لیٚش» وە لە جیاتی «جەرگش» نووسراوە «جەرگت»و لە جیاتی «چەنیش» نووسراوە «چەنیت». بەم پیٚیە زەمیری «ش» ئەگەڕیٚتەوە بۆ دۆست وە زەمیری «ت» ئەگەڕیٚتەوە بۆ ئەسرین.
(٣) واتە: ئەی خەم! ئەی نامەرد چۆن دڵی ئازیزت خەفەتبار کرد کە وەك پەڕەی گوڵ بیٚ گەردە؟
(٤) وەهەم ماوەرد: تیٚکەڵی ئەکرد. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەیدا دیٚ.
(٥) بۆ: بڵیٚی ببیٚ. واتە: ئەوسا ئازیز بیٚباکیو قینی تیٚکەڵ یەك ئەکرد، ئینسان لە ترسانا بیٚپەروا گیانی ئەدا بە دەستەوە، ئیٚستا بشیٚ راست بیٚ فرمیٚسك وەك لافاو بە تاو بڕژیٚ لە چاوەکانیو ئەوەندە وەفاو مەیلی بیٚو ئاگای لای دڵدار بیٚ.

ئـــەی دڵەی نـــازك خـــەستەی خـــەمانە
گـــۆش دەرو بـــژنەو، ئـــەمجار بـــمانە(١)

•••••••—●—•••••••

**[٨]**

## هەی‌هوو.. های چەندەن(٢)

هـــەی‌هوو..هـــای چـــەندەن نـــامان خـــەبەرێ
تـــای تـــاقەت بـــڕیـــان، نـــەسیم ســـەفەرێ(٣)

تـــا وە ســـــەربەرزان هـــــەرد لەیـــلاخان
وە خـــزمەت ســـەرئیڵ بـــڵەنـــد دەمـــاخان(٤)

تـــام ئـــەی زام ســـەخت جـــە تـــاڵی وارا
وە نــــەرم ئـــار وە لەفـــز شـــیرین ویـــارا(٥)

---

(١) بژنەو: ببیسە. بمانە: بمێنە. واتە: ئەی دڵە ناسکەکەم کە چەند وەختە گرفتاری دەردی خەم‌و خەفەتی، وەرە گوێ بگرە بۆ ئەم قسە تازانەی دۆست‌و گیانت دەرنەچێ‌و نەمری!

**[٨]**

(٢) مەولەوی ئەم غەزەڵەشی بۆ شێخ عەزیزی جانەوەرەیی نووسیوە

(٣) نامان: نەهاتووە. بڕیان: پچڕاوە. واتە: ئەی هوو دەمێکە هیچ خەبەرێکی دۆستم بۆ نەهاتووە، تاڵی سەبرو بووردەباریم پچڕاوە، دەخیلتم بای نەسیم بکەوەرە رێ.

(٤) لەیلاخ: ناوچەیەکە لە هەرێمی سنە، وە بە هەموو کوێستانێکیش ئەڵێن. واتە: بڕۆ تا ئەگەیتە بەرزایی‌یەکانی شاخەکوێستانی‌یەکان‌و ئەگەیتە خزمەتی سەرگەورەی دەماخ بەرزەکان.

(٥) وارا: باریو. ئار: بێنە. ویارا: تێ‌پەڕیوو. واتە: بە گفتێکی شیرینی واکە بچێ بە دڵا، وە بە شێوەیەکی نەرم ناوی لە نەگبەتی‌یەوە باریوی منێ لا ببە. ئەم بارینی ناوە ئیشارەتە بۆ ئەوەکە مەشهوورە «اَلْاَسْماءُ تَنْزِلُ مِنَ السَّماءِ» بە مەعنا: ناو لە ئاسمانەوە ئەباریێ‌و نیشانەی پاشەرۆژی خاوەنەکەیەتی. مەبەسی ئەوەیە من هەر لە ئەزەلاناوێکی وا بووە بە چارەنووسم کە نیشانەی ئەم بەدبەختی‌یەم بێ.

واچــــه دیـم مــەویەرد ســاتێ وه ســاڵێ
مـــوارا هـــەر دەم حــــاڵێ وه حــــاڵێ(١)

گـا مـەویەرد نـه سـەر هـوون چـەمەی چـەم
تەکـرار مـەکـەرد فـەرد دێوانـەکـەی شـەم:(٢)

ســـــەیر ســــەربەرزان لەیــلاخان کــەردی
ئەی شەم حەیفت کەرد من جه یـاد بـەردی(٣)

گـــــا مــــەوات دووریت درێغش نــەکـــەرد
گـــەرمای گـــەرمیان کـــۆتــاییش نــاوەرد(٤)

بــــەڵام ئــــەلحەق دڵ وه فـــریام یـــاوا
هــای یــانەی ســـەردی هــەناسەش ئـاوا(٥)

شــــــەوان هــــامڕازەن، روان هــــاومالّەن
«قَـــلْبُ الْأَسَـــد»م قــــەوس ســـارالّەن(٦)

---

(١) مەویەرد: بەسەری ئەبرد. موارا: ئەیگۆڕییەوە. واتە: چاوم پێ کەوت سەعاتێکی به ساڵێ به سەردا تێ ئەپەڕی، وه هەر تاوێ وەزعێکی ئەگۆڕی به وەزعێکی تر.

(٢) دێوانەکەی شەم: «وەلی دێوانە»ی شاعیری نەخوێندەوار که عاشقی «شــەم» بـووه. مەعنای ئەم شیعره بەسراوه به شیعری پاشەوه.

(٣) واتــه: تـاوێك بـەسەر خـوێنـی له سـەرچاوەی چـاوەوه هـەڵقـوڵـیوا تـێ ئـەپەڕێو شیعرەکەی وەلی دێوانەی ئەخوێندەوەکه ئەڵێ ئەی شەم بۆ خۆت سەیری بەرزاییەکانی کوێستانت کرد، زۆر حەیفت کرد منت له یادی خۆت بردەوه.

(٤) مەوات: نەیوت. واتە: تاوێکیش ئەیوت دووریت هیچ درێغی لێ نەکردم، وه چی له دەست هات کردی، گەرمای گەرمیانیش هەر دوایی نەهات.

(٥) واتە: بەڵام خوا حەقە دڵم گەیشتە فریام، یاخوا ماڵی ساردی هەناسەی ئاوا بێ.

(٦) قلب الاسد: ناو جەرگەی مانگی «ئەسەد» که ناوەڕاستی مـانگی هـاوینه. قـەوس: ئاخر مانگی پایز. ساراڵ: ناوچەیەکی کوێستانییه ئەکەوێتە رۆژاوای خوارووی سنه. واتە: هەناسەی ساردی دڵ به شەوو به رۆژ لەگەڵمه، وه ناوەراستی هاوینی لێ کردووم به ئاخر مانگی پایز له ساراڵ که دیاره چەند سارد ئەبێ.

گــا مــەوات ئــازیز ئــای جــە ئــەوگاریم
ئـــای «سُــبْحانَ اللە» جــە ئـینتیزاریـــم[١]

مـــوژدەم بـــەڵ بـــەیۆ نـــاگـــا جـــە دەردا
نـــــیگام وراســـــتەن وە راگـــــوزەردا[٢]

دڵ وە تــــــــەمامی نـــــیەن نـــــە جـــــادا
خــــەریکەن نــە بـــەین خـــۆف‌و رجـــادا[٣]

داخـــــــۆم بــــە وەســــڵێ لاونـــــیمەوە
یـــــا هـــــەر وە هـــــیجران تـــــاونیمەوە[٤]

یــــە کــــزەی دەروون گــــرفتاری ئـــــەو
یــــە حـــــاڵەت دەرد ئـــــینتیزاری ئــــەو[٥]

تــەفسیلش وە ســوّز حــاڵی کــەردم پــێت
هـــــەنی تــــۆ زانـــی چـــەنی رەحـــم وێت[٦]

---

(١) ئەوگاری: گرفتاری. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.
(٢) بەیۆ: بێت. وراستەن: دووریوە. واتە: تاوێکیش ئەی‌وت ئای ئازیز چـەند گـرفتارم... ئای پەنا بە خوا چەند چاوەڕوانیم کرد... چاوم دووریوە بە ڕێگەکەدا بەڵکو یەکێك بێت مژدەی خۆشی لێ‌وەرگرم.
(٣) مەعنای ئەم شیعرەش بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.
(٤) لاونیمەوە: بملاونیتەوە. تاونیمەوە: بمتوێنیتەوە. واتە: دڵم بە تەواوی لە جێی خـۆیـا نیە وە خەریك ماوە لە نێوانی ترس‌و هیوادا، نازانم ئاخۆ بە وەسڵی خۆت دڵم ئەدەیتەوە، یا هەر وەك جاران بە ئاگری دووری ئەمتوێنیتەوە؟
(٥) مەعنای ئـەم شـیعرەش لەگـەڵ شـیعری پـاشەوەی‌دا دێ. لە هـەندێ نـوسخەدا لە جیاتی «دەرد ئینتیزاری ئەو» نووسراوە «سەخت دڵ ئەوگاری ئەو».
(٦) زانی: ئەزانی. واتە: بڵێ ئەوەکزەی دەروونی بە هۆی گرفتاری بوونیەوە بە عـەشقی دۆست، ئەوەش دەردی چاوەڕوانی کردنی بۆ خەبەرو مژدەیەك لێ‌یەوە... وا بە سۆزەوە بە درێژی حاڵیم کردی لێی، ئیتر خۆت ئەزانی، ماوەتە سەر رەحمی خۆت. لە هـەندێ نوسخەدا لە جیاتی «تەفسیلش وە سۆز» نووسراوە «تەفسیلا دەستوور» ئەم دوو شیعرەی دوایی پاشماوەی ئەو قسانە بوون کە مەولەوی بە نەسیمی وت بە شێخ عەزیزی بڵێ.

## [٩]

## هەرچەند هجرانت

هــەرچــەند هــیجرانت یـەند زۆر ئـاوەردەن
عەزرائـیل جـە رەنـج سـەر ئـازاد کـەردەن[١]

بـــەڵام دەردێوتـــەر جــا گــرتەن نــە دڵ
نەك چون ئـیفتەر دەرد دڵ پـێش مـدۆ چـڵ[٢]

داخۆم جە تـەنخوای دووی سفتەکـەی وێت
چێش بـۆ وە سـەیوان شـەو تـا رۆ پـەرێت[٣]

جــیاتی مــــوژەی ســـفتەی بـاڵاکـەت
چــێش بـۆ وە جـاڕووی گـەرد پـاڵاکـەت[٤]

پـــا چـــون مــەنیای، دیــدەم نــە دیــدەم
ئــازار بــی پــەرێش مــوژەی نـم دیـدەم[٥]

دەك عــومرم چـون وەسـڵ بـاڵات تـەمام بـۆ
چــێو بــێ ئــازار بـۆ بشـۆ پـێش کـام بـۆ[٦]

---

[٩]

(١) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٢) ئیفتەر: تر. واتە: هەرچەند دووری تۆ ئەوەندە زۆری بۆ هێناوم پێویست بەوە نەماوە عیزرائیل خۆی ئازار بدا بێت بۆ گیان کێشانم، بەڵام دەردێکی‌تر لە دڵما جێگیر بووە دڵم چڵ ئەدا پێ‌یەوە، وە لە هیچ دەردێکی‌تر ناچێ.

(٣) سەیوان: سێبەر. واتە: دەردەکەم ئەوەتە بیر لەوە ئەکەمەوە ئاخۆم کە مردم لە جیاتی دووکەڵی لەشم کە بۆ تۆ سووتاوە چی بە شەوو رۆژ سێبەرت بۆ بکات؟

(٤) جاڕوو: گسك. واتە: لە جیاتی برژانگەکانی منی سووتاوی باڵات چی گسکی تۆزی کەوشەکەت بدا؟

(٥) منیا: ئەت‌نا. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٦) چێو: شت. بشۆپێش: بچێ‌پیایا. واتە: چاوەکەم کاتێك کە پێ ناسکەکانت نەنایە

ڕوویێ چون سەر چەم نازش مـەوج مـەوەرد
جە سای دیـای چـەم دڵ مـەگـرتش گـەرد[١]

هـــەی ڕۆ ســـا ئـیسە چـەنی مـەویارۆ
چـێش بـۆ گـەرد نـەدۆو نـیگاش بـدارۆ[٢]

ئـاخ مـەیل تـازەن پـاسە کـەردەن پـێت
وەرنـــە کـــزەی دڵ ســا نـەشنەفتەبێت[٣]

مـنت شـی جـە ویـر خـاست کـەرد دیـدەم
بە وێت خـاتر شـاد خـاست کـەرد دیـدەم[٤]

ســا هــەر ســۆزەی جـۆش ئـاه سـەرد مـن
هـەر کـوورەی پـڕ تـاو گـەرم دەرد مـن[٥]

هــەر وەفـــای دەمدەم ئـــاشنایی ئــەو
هـەر ئـەو عـەهدو شـەرت ڕووبـەڕایـی ئەو[٦]

---

☞

سەرچاوم، برژانگە تەڕەکانم ئازاریان پێیان ئەگەیاند، دەك عومرم نەمێنێ وەك وەسڵی باڵات نیە، پاش مردنی من ئەبێ چی بێ بە سەریا بڕۆیت‌و ئازار بە پێت نـەگـەیەنێ؟ لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «بشۆیێش» نووسراوە «بشیۆیێش» بە مەعنای لایق بێ بۆی.

(١) دیا: ڕوانین. مەعنای ئەم شیعرەش بەسراوە بە شیعری پاشەوە.

(٢) مەویارۆ ڕائەبوێرێ. واتە: ڕوویەك کە ئەوەندە ناسك بوو نـازی کـە وەك سـەرچاوە شەپۆلی ئەدا، ئەگەر بە چاوی دڵیش سەیرم بکردایە گەردی ئەگرت. ئێستا قوڕ بە سەرم ئەبێ چۆن ڕابوێری پاش مردنی من، وەچی بێ ئەگەر تەماشای بکاگەردیشی پێ نەگرێ‌و ڕاگیریشی‌کاو نەی‌توێنێتەوە!

(٣) پاسە: وەها. وەرنە: ئەگینا. نەشنەفتەبێت: نەت‌بیستبوو. واتە: ئاخ ئازیزەکەم مـەیلی دۆستی تازەیە وای لێ‌کردووی موبالاتت نەماوە، ئەگینا بۆچی گوێت لەکزەی دڵی من نەبووە؟

(٤) شی: چوو. واتە: ئازیز چاکت کرد منت لە یاد چوو، وە دڵت بە خۆت خۆش کرد.

(٥) مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٦) ڕووبەڕایی: ڕووبەڕوو. واتە: دۆستی تازەت گرت‌و منت لە یاد چوو، جا توخوا هەر

☜

هـای رەحـمەت ئـەو قـەبر سـەودایـی کـامڵ
سـەرمەشق مـەینەت «بـێسـاران» مـەنزڵ:[١]

یـانە وێرانـی هـەر وە مـن ئـامان
مـەتاوو گـرتەی کـەسێوی دامـان[٢]

[١٠]

## هامن، ها، من‌وار[٣]

هامن، هـا، مـن‌وار، گـەرمیش جـۆش ئـاوەرد
فـەزای نـەزم بـەزم نـەوگوڵاڵان بـەرد[٤]

بـووڵ وە یـانەی جـەم نـەو گـوڵاڵان شـەند
چـەمەن بـێ نـەوای نـاڵەی بـوڵبـوڵ مـەند[٥]

---

☞

سۆزەی جۆشی هەناسەی ساردی من‌و کوورەی گەرم‌و بەتاوی دەردم، وە هـەر وەفـای تاوتاوو ئاشنایی‌و لە رووداگفت‌دان‌و لە پاشا پشت لێ‌هەڵ‌کردنی دۆستە تازەکەت. هەر خوایان یەکەو بەراورد ناکرێن بەیەك.

(١) سەودایی: دڵدار. مەعنای ئەم شیعرەش بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٢) کەسێوی: کەسێك. واتە: رەحمەت لە گۆڕی دڵداری راستەقینەو سەرمەشقی دەردو مەینەت مەلا موستەفای بێسارانی کە وتوویەتی: ماڵ وێرانی هەر بۆ من هاتووە، ناتوانم داوێنی کەس بگرم‌و گلەیی لێ‌بکەم. مەبەس ئەوەیە هەر خۆم بەختم رەشە بۆیە یاریش منی لە یاد ئەچێ‌و دۆستی تازە ئەگرێ.

[١٠]

(٣) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بە بۆنەی داهاتنی هاوینەوە وتووە.

(٤) هامن: هاوین. من‌وار: وەك من. فەزا: دەشتایی. واتە: ئائەوەتە گـەرمای هـاوین وەك کوورەی دڵی من هاتە جۆش‌و مەیدانی ئاهەنگی رێك‌و پێکی گوڵاڵەکانی فەوتاند.

(٥) بووڵ: خۆڵەمێش. شەند: وەشاندی. مەند: مایەوە. واتە: خۆڵەمێشی وەشاند بە سەر ماڵی تێکڕای گوڵاڵە تازەکانا، وە مێرگەکان بێ ئاوازەی ناڵەی بولبول مانەوە. مەبەسی لە خۆڵەمێش ئەوەتە گژوگیا وشك ئەبێ‌و سپی هەڵئەگەڕێ‌و وەك خۆڵەمێش ورد ئەبێ.

تـــای بـــەڕزاەی شـــەنگ نـە ســای مـوغاران
شــــێونـــــا چـــون زوڵف تــەعزیە داران[١]

هـــا، کـــاوان، کـــاوان دڵ چـــون دڵ ڕێشـــان
هــەڕ دان وە سـەردا هـەردان پـەی وێشـان[٢]

دوریت ئــــایر وست وە یــــانەکــەی مــن
یــانیٚ یــانەی دڵ وێرانــەکــەی مــن[٣]

هـــەوا ئـــایرین، ســــەروەخت ئـــایرین
دڵە ئــــایرین، بـــەدبەخت ئـــایرین[٤]

وەی گشت ئـــایرەوە خـــەیاڵم خـــامەن
بـــەختم نـــاپوختەن فـــامم نـــەفامەن[٥]

وەی بـــڵێســـــەوە گـــــەردێم بـــاقی‌یەن
وادەی ئـــایرین بـــادەی ســـاقی‌یەن[٦]

---

(١) شەنگ: جوان. موغار: ئەشکەوت. شێویا: تێك‌دا. واتە: هاوین تاڵی بەڕەزای جوانی لە سێبەری ئەشکەوتەکانا تێك‌دا وەك ئافرەتانی عازیەتی‌دار کە قژی خۆیان ئەڕنن‌و زوڵفیان تێك ئەدەن.

(٢) کاوان «ی یەکەم»: بەرزایی‌یەکان. کاوان «ی دووەم»: قڵەشاندوویە. هەڕ: قوڕ. واتە: بەرزایی‌یەکان وەك دڵبرینداران دڵیان لەت بووەو شاخەکان قوڕیان داوە بە سەریانا بۆ خۆیان. مەبەس لە دڵ لەت بوون ئەوەتە عەرز ئەقڵیشیٚ لە هاوینا، وە مەبەس لە قوڕ بەسەرا دان ئەوەتە گژوگیایان پێوە نەماوەو هەرخاکەکەیان دیارە.

(٣) وست: بەردایە. واتە: دووریت ئاگری بەردایە ماڵی دڵە وێرانەکەم.

(٤) سەروەخت: وەرز. واتە: چوار ئاگر دەوری داوم، ئاگری ئارەزووی دۆست‌و ئاگری وەرزی هاوین‌و ئاگری دڵم‌و ئاگری بەختی بەدم.

(٥) واتە: بە هۆی ئەم‌گشت ئاگرەوە بە تەمای هەرچی بم خەیاڵی خاو ئەکەم، وە بەختم نەپوختەو تیٚ‌گەیشتنم تیٚ‌نەگەیشتنە.

(٦) واتە: بە هۆی بڵێسەی ئەم هەموو ئاگرەوە سووتاوم‌و تەنها کەمێك تۆزم لیٚ‌ماوەتەوە، ئەنجا نۆبەی ئەوەیە مەی‌گێڕیش بە شەرابە ئاگرینەکەیەوە بێتە سەرم.

بـــەشق پـــیاڵەی مـــەست چـاوەکـەت
بـەو پـەشێوی چـین پـای کـڵاوەکـەت(١)
بـــا بـەی مـەی بـەڵکـم ئـایر مـەستی
سـۆچـنۆ یـەکسـەر خـاشاك هـەستی(٢)

[١١]

## هەی نیزام نە زام(٣)

هــەی "نـیزام" نــە زام نــامەت تــۆ لابـەرد
ئـای ئـای سـزاش داو قـیامەتش کـەرد(٤)

---

(١) بـەشق: بـە عـەشقی. مـەولەوی لە م شیعرەو شـیعری پـاشەوەیدا قسـەی لەگـەڵ مەیگیڕە. مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ.

(٢) بەی: بێت. سۆچنۆ: بسووتێنێ. واتە: ئازیز سوێندت ئەدەم بە عەشقی پیاڵەی شەرابی چاوە مەستەکانتو بە تێکچوویی زوڵفەکانت لە داوێنی سەروپێچەکـەتەوە، پـیاڵەیـەك شەرابم بدەرێ، بەڵکو ئاگری سەرخۆشی پلوپووشی بوونم بە یەکجاری بسـووتێنـێو رزگارم بکا. لە هەندێ نوسخەدا نیوەی یەکەمی شیعری دوهەم بەم جۆرە نووسراوە:
ساپێمدەر جامێ، بەڵ ئار مەستی بەڵ: بەڵکو. ئار: ئاگر.

[١١]

(٣) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە وەڵامی «مەلا نظام» ناوێکی برادەریا نووسیوەکـە ئـەم سێ شیعرەی خوارەوەی بۆ ناردبوو:

دڵەی دێوانـەم هـیممەتش واستەن ئـامان، هـائامان تـەن وەجـا ئـاستەن
چون کەفتەکاران دڵ ئـەو شـۆن تـۆن بەن وە تای رشتەی وێ وە هوون تۆن
تەن چون سیاسەنگ نـە هـەوارانـەن پـا شکسـتەی دەرد دمـای یـارانـەن

واتە: دەخیلتم دڵە شێتەکەم ماڵاوایی کردووە لێمو رۆیشتووە لەشمی بـەجێ‌هـێشتووە، ئێستا لام وایە وەك داماوە لێ‌کەوتووەکان کەوتووەتە دوای تۆو بەسراوە بە تاڵەبەنی خۆ بە خوێنا کردووی تۆوە، لەشیشم وەك بەردی رەشەوەبووی ئاگردانی کـۆچـەریـیەکـان لە هەوارگەکانا کەوتووە، وە بە دەردی دوای یاران کەوتن قاچی شکاوە. تکام وایە دڵەکەم بۆ بنێریتەوە با بێتەوە ناو لەشمو بحەسێمەوە.

(٤) تۆ: توێکڵ. واتە: ئەی مەلا «نظام»، نامەکەت پەترۆی سەر زامـەکـەمی هـەڵکـەندو کولاندیەوە، ئای ئازاری زامەکەمی داو قیامەتی بەرپا کرد.

چـەنی کـزەی گـەرم زایـەڵەی مـوشکوڵ
ئـیزهار کـەردەبێت پـەرێ ئـامای دڵ(١)

زۆر ئـاوەردەن پـێش نـاسۆر زامـان
گـۆیـا جـە لای تـۆ وە لای مـن ئـامان(٢)

مـزانـۆ هـەر کـەس جـە عـیرفان کـەیلەن
هـەر جـنسێ چـەنی جـنس وێش مـەیلەن(٣)

بێ دەرد ئـەو بـێ دەرد، خـەجڵ ئـەو خـەجڵ
گیان ئـارەزووش گـیان، دڵ تـەمەنناش دڵ(٤)

نـەدیەنم وە چـەم، ئـاگـاهیم نـیەن
دڵەکـەی مـنیچ خـەیلێن بـەرشیەن(٥)

ئـەو نـە ئـاخو داخ، ئـێد هـەناسەی سـەرد
ئـەو ئـالوودەی خـەم، ئـێد خـەریك دەرد(٦)

ئەو هووناو وە تاو، ئێد ئـەسرین چـون سـەیل
ئەو نـە واوەیـلا، ئـێد کـۆ لەیـل، کـۆ لەیـل(٧)

---

(١) ئاما: گەڕانەوە: مەعنای ئەم نیوە شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشیەوە.
(٢) واتە: لەگەڵ کزەی بە سۆزی هاواری ناڕەحەتا باسی گەڕانەوەی دڵت کردبوو گوایە زامی بە ناسۆر کەوتووی زۆری بۆ هێناوە، لەبەر ئەوە لە لای تۆوە هاتووە بۆ لای من.
(٣) واتە: هەر کەسێ تێگەیشتنی بێ ئەزانێ هەموو کەسێ ئارەزووی لە هاوچەشنی خۆیەتی.
(٤) خەجڵ: داماو.
(٥) نەدیەنم: نەمدیوە. بەرشیەن: دەرچووە.
(٦) واتە: دڵی تۆ ئاخ هەڵئەکێشێو دڵی من هەناسەی سارد. دڵی تۆ گرفتاری خەفەتەو دڵی من تووشی دەرد.
(٧) واتە: دڵی تۆ بە تاو خوێناوی لێ ئەچێو دڵی من لافاوی فرمێسك ئەڕێژێ. دڵی تۆ هاوارو فوغانیەتیو دڵی من هەر ئەپرسێ ئەوە لەیل چی بەسەرهات؟

مــــولاقاتشان کـــەو جـــە کـام هـــەردەن
کـــام وێرانـــەشان ئـــاوەدان کـــەردەن[١]

## [١٢]

## ها تەن ئەلوەدای

هـــا تـــەن ئـــەلوەدای زیـــندەگـــانیش کـەرد
قـــەدەم ڕەنـــجەکـــەر هـامفەردەکـەی فـــەرد[٢]

لابەر تەختەی سـەنگ ئـەڵحـەد سـەرای ڕێش
جەم کەر گەرد خاك جەستە خەستەی وێش[٣]

ئـــامێتـــەن وە بـــاد بـــاڵای تـــورك تـــەڕ
یـــانێ نـــمناکـــەن زوو مـــەبۆ وە هـــەڕ[٤]

درووس‌کـــەر نـــەو هـــەڕ شـــێوەی بـولبـولێ
بـــنیەش نـــە ســـەر شـاخ گـــوڵێ یـــا چـڵێ[٥]

(١) کەو: ئاخۆم. واتە: ئاخۆم لەکام شاخ و کێو یەکیان گرتبێتەوەو چ وێرانەیەکیان ئاوەدان کردبێتەوە.

[١٢]

(٢) ئەلوەدا: «الوداع»، ماڵاوایی. ڕەنجەکەر: ئەزیەت بدە. واتە: هاوڕێ تاقانەکەم، وا لەشم ماڵاوایی لە ژیان کردو مردم، زەحمەتی پێی خۆت بدەو وەرە بۆ سەر قەبرەکەم.
(٣) واتە: تەختە بەردی سەر ئەلحەدەکەی بـرا زامارەکـەت هـەڵبڕەو خـۆڵی لەشـی کۆکەرەوەکە نەخۆشی عەشقی خۆیەتی.
(٤) ئامێتە: تێکەڵ. تورك تەڕ: ناسك وەك نازارانی تورك. واتە: خۆڵی لەشم تێکەڵ بووە لەگەڵ یادی باڵای تەڕو پاراوی یار، لەبەر ئەوە نمدارەو ئەبێ بە قوڕ.
(٥) نەو: لەو. واتە: لەو قوڕە وێنەی بـولبولێك دروست کـەو لە سـەر گـوڵێك یـا چڵی درەختێك داینێ.

بـەڵکـم ئـەو سـەیاد جـە نـاکـاو جـارێ
بـویەرۆ پـەی گـەشت کـوشت شکـارێ(1)

نـــەچیرگای وێشـــەن وە پـارێز کـەمکەم
بـەڵەدەن، مـدیۆ، مـەکـەرۆش وە چـەم(2)

خـــــەدەنگێ هــــەنی هـــەوا دەرۆوە
پــــەرێ مــەرگێوتـەر ئـیحیام کـەرۆوە(3)

هەر سـاتێ سـەدجار بـەو تـیر نـەو تـەرکەش
زیـندەگـیو مـەردەن ئـامان وەشـەن وەش(4)

[١٣]

## های رەقیب ئەو شۆن(5)

های رەقیب ئەو شۆن دیـدەم هـیجرەت کـەرد
عـومر کـێ وەی رەنگ وە تـاڵی ویـەرد(6)

---

(١) بویەرۆ: تێپەڕێ. کوشت: کوژراو. شکار: راو. واتە: بەڵکـو ئـەو راوچـی‌یەی گـیانی دڵداران جاری لە جاران لە ناکاو تێپەڕێ بەو شوێنەدا کە وێنەی بولبولەکەی تیا دانراوە، بۆ گەڕان بە دوای نچیرێکی راوا. لە هەندێ نوسخەدا لە جیاتی «وە ناکاو» نووسراوە «وە ساڵێ» وە لە جیاتی «کوشت» نووسراوە «سەیرێ».

(٢) مدیۆ: ئەڕوانێ. مەکەرۆش وە چەم: بەدیی ئەکا. واتە: چونکە ئەو ناوچەیە نچیرگای خۆیەتی پارێز ئەکرێو وردە وردە دێتە پێشەوە خۆی شارەزایەو وێنەی بولبولەکە بەدی ئەکا.

(٣) هەوا دەرۆوە: فڕێداتەوە. واتـە: وەك پێشـان بـە تـیری عـەشقی خـۆی کـوشتمی ئەمجارەش تیرێکی‌ترم تێ‌ئەتەقێنێو زیندووم بکاتەوە بۆ مەرگێکی‌تر مـەبەسی ئـەوەیە تیری ئەو زیندوو ئەکوژێو مردوو زیندوو ئەکاتەوە.

(٤) تەرکەش: جێگای تیر. واتە: خۆشە ئینسان سەعاتێ سـەدجار زیـندوو بکـرێتـەوەو بکوژرێ بە تیری تیردانی ئەو یارە.

[١٣]

(٦) رەقیب: بەدکار. ئەوشۆن: بە دوای. واتە: ئازیزەکەم کۆچی کردو بەدکاریش بە دوایا رۆیی، ئەی هاوار عومری کێ بەم جۆرە بە هیچو پووچ چووەتە سەر!

عـــومرەنی ئـــازیز، هـــەر عـــادەت بـــیەن
کـــەس جـــە عـــومر وێش وەفـــاش نـــەدیەن(١)

بـــــەڵام ئـــاخر گـــیان شـــیرین دڵبـــەر
چـــــون مـــلی وە ســـەبر ئـــازارم مـــەدەر(٢)

وەر نـــــیەی وە تـــــەنگ ئـــەی بـــەدبەختەوە
گــــــــــل بـــــدۆ وە دەم زام ســــــەختەوە(٣)

چـــمان دڵ جـــمان چـــەنیت پـــەی ســـەفەر
زامــــــارەن کـــەفتەن پـــا وە پـــاییش کـــەر(٤)

[١٤]

## هەوای سەر ساراڵ(٥)

هەوای «سەر ساراڵ» وە خوسووس وەتەن بـۆ
ئـــەرچـی ســـەفای رۆح، راحـــەتی تـــەن بـۆ(٦)

---

(١) نەدیەن: نەدیوە. واتە: ئازیز لۆمەت ناکەم وا بەجێت هێشتم چونکە تۆ عومری منی، وە تائێستاش هەروا بووەکەس وەفای لە عومری خۆی نەدیوە.

(٢) ملی: ئەرۆی. واتە: دولبەرەکەم... گیانەشیرینەکەم کە هەر ئەڕۆی تۆزێ بە ئارام بڕۆ ئەزیەتم مەدە.

(٣) نـیەی: نـیت. مـەعنای ئـەم شیعرە بـەسراوە بـە شیعری پاشەوەیەوە. لە هـەندێ نوسخەدا نیوەی دووهەمی ئەم شیعرە بەم جۆرە نووسراوە:

گل بدۆم وە دەم گیان‌دای سەختەوە بدۆم: بدەم. گیان‌دا: گیان‌دان.

(٤) چمان: وائەزانم. جمان: جووڵاوە. پا وە پای: پێ بەپێ: واتە: ئـەگـەر بـە تـەنگ ئـەم بەدبەختەوە نیت بە دەم زامەوە بتلێتەوە، بە دەربەستی دڵمـەوە بـە، وا ئـەزانـم لەگـەڵتـا کەوتووەتە رێ، بە پێی ئەو بڕۆ چونکە زامارەو کەوتووە.

[١٤]

(٥) مەولەوی ئەم سێ شیعرەی بۆ «شێخ حسەینی هەزارکانی‌یانی» نووسیوە.

(٦) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە دوو شیعری پاشەوەیەوە. لە هەندێ نوسخەدا نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە بەم‌جۆرەیە:

هەرچەند ساراڵ خوسووس وەتەن بۆ

بـــەڵام دووری تـــۆ یـــەند زۆر ئـاوەردەن
دەردێ وە دەروون هـــام دەردان بـــەردەن

وە هــەرجــا تــەشریف تــۆ ئــەرزانــی‌یەن
هــەر دیــدە پــەی تـۆ «هـەزار کـانی»یـەن(١)

•••••••━━━●━━━•••••••

[١٥]

## هەرچەند وێم

هــــەرچــەند وێم زەدەی بــادەی فــیراقــم
وە دیـــن دیـــدەت خــەیلێ مــوشتاقم(٢)

بـــەڵام شـــیرنی جـــەلام تـــاڵی‌یــەن
جــات خــاڵی نـەبۆ جـاگـەت خـاڵی‌یـەن(٣)

ئـــەر وەســـڵەن دادم پـــەرێ فــیراقــەن
وەر هــیجرەن پـەی وەسـڵ تـاقەتم تـاقەن(٤)

---

(١) واتە: ناوچەی سـاراڵی سـەروو، بـا نیشتمانی تـایبەتیشت بێ‌و هـەواکـەی مـایەی خۆشی دڵ‌و رەحەتی گیانت بێ، وە نـەبێ پێویست بێ هـەر لەوێ دانیشی، چـونکە دووریت ئـەوەندە زۆری هـێنـاوە بـۆ دۆستان وە دەرەونـیانی بـە دەردێکـی وا بـردووە تەشریفت لە هەرکوێ دانیشێ لە خۆشی‌یانا چاوی هەر دۆستێکت ئەوەندەی هەزارکانی فرمێسکی شادمانی لێ ئەرژێ، یان وەك «هەزارکانی‌یان» بۆت ئەبێ بـە جـێگـەو مـاوا چونکە هێنانی وشەی «هەزارکانی» ئیشارەتە بۆ ناوی دێ‌کەی شێخ حسەین کە «هەزار کانی‌یان» بووە.

[١٥]

(٢) زەدە: پێکراو. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.
(٣) واتە: هەرچەند گرفتاری دەردی جیاییم‌و گـەلێك مـوشتاقی چـاوپێکـەوتنم، بـەڵام شیرینی گەیشتن بە تۆ بە تاڵی ئەزانم، وە جێگایشت خاڵی نەبێ هەر بە خاڵی ئەزانم.
(٤) واتە: چونکە ئەگەر لەگەڵتا بم هاوارو فوغان لە تاو ئەو رۆژە ئەکـەم کـە لێم جـوێ ئەبێتەوە، وە ئەگەر لێت دوور بم سەبرم لا نامێنێ‌و ئارەزووی وەسڵت ئەکەم.

## [١٦]

### هەقت بە دەسەن[١]

هـەقت بـە دەسـەن کـار بـەدەس ئـاسان
نەکـێشـانت جـەور مـوژەی خـاڵخـاسان[٢]

ئـەو دۆزەخ چـێشـەن عـەزابش جـە کـۆن
دۆزەخ هـەر دۆزەخ دووری بـاڵای تـۆن[٣]

## [١٧]

### هیچکەس نەواچۆ[٤]

هـیچکەس نـەواچـۆ وە فـەرهاد رەنـدەن
نەقش شـیرینش نـە رووی سـەنگ کـەندەن[٥]

---

**[١٦]**

(١) ئەم چوارینەو چوارینەی پاشەوەی لە نوسخە دەسنووسەکەی خۆما پێکەوە بوون وە بەشێك بوون لە پارچەی «گێج ئالانی» کە لە «تیپی گاف»دا لە ژێر ژمارە «٤»دا بڵاو کرایەوە، بەڵام دیم کە هیچ پەیوەندییان بە وێوە نییە، وە لە نێوانی خۆیشیانا لە یەك پارچە ناچن، لە بەر ئەوە وا لێرەدا هەرکامیانم بە سەربەخۆ بڵاو کردەوە. دیاریشەکە ئەمەیان پاشماوەی پارچەیەکە بەڵام نەمتوانی شوێنی راستەقینەی بدۆزینەوە.

(٢) نەکێشانت: نەتکێشاوە.

(٣) ئەو دۆزەخ: جەهەنەمی ئەو دنیا. جەکۆن: لەکوێیە.

**[١٧]**

(٤) ئەم چوارینەم بەو جۆرە بڵاو کردەوەکە لە سەردەمی فەقێیەتیدا لە خوا لێخۆشبوو مەلا سەید حەکیمی خانەقینیم بیستووەکە هەموو جارێ بە سۆزەو ئەیخوێندەوە. لە نوسخەی دەسنووسەکەی خۆشما هەیە، وە لە ئاخری پارچەی «گێج ئالانی»یەوەیە، بەڵام وەك لە پەراوێزی چوارینەی پێشوودا وتم، لەبەر بێپەیوەندی نێوانیان لێم جوێ کردەوە. لەو نوسخە دەسنووسەدا دوو جوملەی بە جۆرێکی تر لێرە ئیشارەتی بۆ ئەکەم.

(٥) رەند: زیرەك. کەندەن: هەڵکەندووە. لە نوسخە دەسنوسەکەی خۆشما لە جیاتی «هیچ کەس نەواچۆ» نووسراوە: «هەنی نە واچان» بەپێی ئەوە دیارە ئەبێ ئەم چوارینەش پاشماوەی پارچە شعرێك بێ.

دەك ڕێزان دەس بــا وەر جــە گــیان ســەندەن
کێ ئەڵماس نە ڕووی دیدەی وێش شەندەن[١]

[١٨]

## هاڵ بەدهاڵ

هــــاڵ بــــەدهاڵ، بــەدەن هــاڵی و هــەواڵە
یــانێ هــای چــون ســەنگ قــوڵڵەی قــەزاڵە[٢]

مــــــوارۆ واران خــــەمان پــــێشــــەدا
هــاڵای ســەدای دەنگ تــۆ هــا تــێشــەدا[٣]

---

(١) ڕێزان: داوەریو. شەندەن: وەشاندووە. واتە: کەس نەڵێ فەرهاد عاشقێکی زیرەك بووە چونکە توانیویەتی وێنەی شیرین لەسەر بەرد هەڵکەنێ، یاخوا بەر لەوە عیزرائیل گیانی بکێشێ، دەسی دارِزێ بۆ ئەو ئیشەکەکردوویەتی، تا ئێستەکێ ئەڵماسی داوە لە چاوی خۆی، ئەگەر ئەو زیرەك ئەبوو لەگەڵ شیرین ئەبوو بە یەك، وە وێنەکەی شیرینی بە شەخسی خۆی دائەناو بە ئەڵماس تێی‌بەرنەئەبوو. لە نووسخەی دەس‌نووسەکەما لە جیاتی «ڕێزان دەس با» نووسراوە «دەسش ڕێزۆ».

[١٨]

(٢) هاڵ: حاڵ. هاڵی: خاڵی. هەواڵە: چۆڵ و هۆڵ. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٣) موارۆ: ئەبارێ. هاڵای: هێشتا. واتە: حاڵم بەدحاڵەو لەشم چۆڵ و هۆڵە هێزی تیانەماوە، وە وەك بەردی سەر قوڵڵەی قەزاڵە بارانی خەمی لێ ئەبارێ، کەچی هێشتا دەنگ‌دانەوەی دەنگی تۆی لێ نەبڕاوە.

## [١٩]

### هیجرانت جە تەرح

هـــیجرانت جــە تــەرح بـــاد وەیشـــوومی
یــەکـــایەك ئــەوراق جــەسەی مــەعدوومی(١)

کـــــەرد وە فـــەرش رای گـــوزەرگای یـــاران
بەرد پــەی پــای هــەردان ســاراو کـۆســاران(٢)

## [٢٠]

### هەرچی دیت وە چەم

هــەرچـــی دیت وە چـــەم شـــی وە ســەفەردا
هـــــەرچــــی مـــوینی هـــا نـــە گـــوزەردا(٣)

کــــەس خـــــاڵی نـــــەبی وە هـــیچ نـــەفاما
ئەو پەی چێش ویەرد، ئێد پەی چێش ئـاما(٤)

[١٩]

(١) ئەوراق: جەمعی «ورق»ە بە مەعنا گەڵا. مەعنای ئـەم شـیعرە بـەسراوە بـە شـیعری پاشەوەیەوە.

(٢) بەرد: بردی. واتە: دووریت وەك بای توندی پایز یەکەیەکەی گەڵای لەشی مەولەوی وەراندو کردی بە فەرشی ڕێگای گوزەرکردنی یاران و گەیاندیە داوێنێ دەشت و شاخەکان.

[٢٠]

(٣) شی: چوو. موینی: ئەبینی. مەعنای هەردوو شیعرەکە پێکەوە دێ.

(٤) واتە: هەرکەست لەمەو پێش دیوە ئەم دنیایەی بە جێ‌هێشتووە، وە هەرچی ئێستا ببینی بەرێوەیە بەجێی بێڵی، کەسیش حاڵی نەبووەو تێ‌نەگەیشتووە ئەو بۆچی مردو ئەم بۆچی لە دایك بوو!

[٢١]

## هەر کاتێ(١)

هـــەر کـــاتێ زانـــای کـــام وە دانـــەوە
شـــەو شـــەیتان مـــاڵا وە خـــەرمانەوە(٢)

[٢٢]

## هەرچیت دابوو(٣)

هـــەر چـــیت دابـــوو پـــێم یـــەك‌یەك دامـــەوە
حـــــیساب حـــــەشرت وا وەلامـــــەوە(٤)

[٢٣]

## هەر یەند

هـــــەر یـــــەند دڵ لەبڕێز خـــەیاڵ خـــاڵەن
جـــە خـــەیاڵ خـــاڵ مـــاچی خـــاڵ‌خـــاڵەن(٥)

---

[٢١]

(١) مەولەوی لەم شیعرەدا ترسی خۆی لە نەفس‌و شەیتان پیشان ئەدا.

(٢) ماڵا: ماڵی‌یەوە. واتە: هەر ئەوەندەت زانی شەوێك شەیتان هاتە سەر خەرمانی کردەوەم کاو دانی هەموو ماشی‌یەوەو بردی.

[٢٢]

(٣) مەولەوی لەم شیعرەدا لەگەڵ خوای گەورە قسە ئەکا.

(٤) واتە: خوایە هەرچیت پێ‌دابووم یەکە یەکە هەمووم دایتەوە، هێشتا حیسابی ڕۆژی حەشرت بە سەرمەوەیە، مەبەسی لە پیر بوون‌و لێ‌کەوتن‌و مردنە.

[٢٣]

(٥) لەبڕێز: ئەوەی لێوارەکەی لێی بڕژێ. واتە: دڵم ئەوەندە پڕبووە لە خەیاڵی خاڵی یار، لە بەر زۆری خەیاڵ کردنەوە لە خاڵ، ئەڵێی نوختە نوختەی لەسەر پەیدا بووە.

## [١]
## یاد زوڵف لوول

یـــــاد زوڵف لوول شـــیرین نــــیگاران
خـــەیاڵ ئـــەبرۆی نـــازك نـــازاران(١)

ئــەو بــیەن وە چــین ســەفحەی پــێشانیم
ئــێد خــەم چــەمەکــەی بــاڵای کــەمانیم(٢)

فکـــر دانـــەی خــاڵ ژەرەژ خــەرامــان
ئــەندێشــەی بــاڵای نــەورەس نــەمامان(٣)

ئـــەو تــانەی دیــدەی ســۆمــا بــێزمــەن
ئــێد دانــەی ئــەسرین وە تــاو رێزمــەن(٤)

مــوتریب یــە کــەمان بــاڵای خــەم وەردەم
یــە تــار ئــەسرین خــەم کـۆك ئـاوەردەم(٥)

ســـا دەی تــەنخوای مــن وەی دەم دەردەوە
لێدەر نـــــەوایـــێ وەی چـــەند فـــەردەوە(٦)

---

[١]

(١) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٢) واتە: یادی زوڵفی لوولی یاران وەك وێنە جوان بووە بە لۆچ لە سەر تەختی تەوێڵم، وە خەیاڵ کردنەوە لە نازارە ناسکۆڵەکان بووە بە هۆی چەمینەوەی باڵام وەك کەوان.

(٣) ژەرەژ: کەو. ئەندیشە: بیر. مەعنای ئەم شیعرەش بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٤) سۆمابێز: ترووکایی لێبێزراو. رێز: دارژاو. واتە: بیرکردنەوە لە دانەی خاڵی جوانانی وەك کەو لەنجەولارکەر بووە بە تانەی سەرچاوی تروکایی لێبێزراوم، وە خەیاڵ کردنەوە لە باڵای نەمامە تازە پێگەیشتووەکان بووە بە فرمێسکی بەتاو دارژاوم. مەبەستی ئەوەیە فرمێسك لە چاوەکانیەوە رێك ئەرژێتە خوار وەك باڵای بەرزو قنجی یار.

(٥) یە: ئەمە. مەعنای ئەم شیعرەش بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٦) واتە: کاکەی ئاهەنگگێڕ وەزعم زۆر ناخۆشە، بگرە ئەوە باڵای چەمیوەم بیکە

یـا جـه گـوناى مـن کـەرەم ئـاوان‌تـەر
رەحـمەت جـه تـاوان مـن فـەراوان‌تـەر[١]

هـەر تـۆنـی وه تـاق دانـاو تـەوانـا
تـۆم هـەنی، هـەنی ئـەو کـێم بـۆ هـانا[٢]

خـەریك کـردەی وێمو فـەزڵ تـۆم
ئـێد مـستاونۆم، ئـەو مـلاونۆم[٣]

بـۆ بـێ عـەداڵەت فـەزڵت چـەنیم بـۆ
وەسـێمـەن خـەجڵەت خـزمەتەکـەی تـۆ[٤]

پـەردە جـه روخسـار کـەردەم لامـه بـەر
جـه لای هـامسەران رووسـیام مـەکـەر[٥]

---

☞

بەکەمان، ئەوەش فرمێسکی چۆڕاوگە بەستووم کە خەم کۆکی کردووە بیکە بە تار، وە لە جیاتی من لەم حاڵی بە دەرد گرفتار بوویمەدا ئاوازەیەکم بۆ لێدە بە دەم ئەم چەند شیعرەوەکە ئەمانەن لەمەوپاش دێن.

(١) ئاوان‌تەر: ئاوەدان‌تر، زۆرتر. مەعنای ئەم شیعرە بە سراوە بە شیعری پاشەوە.

(٢) هەنی «ی یەکەم»: هەیت. هەنی «ی دووەم»: ئیتر. هانا: هاوار. واتە: ئەی خوایەکە بەخشەندەگیت لە گوناهی من زۆرترە، تەنها تۆی زاناو خاوەن دەسەڵات، منیش هەر تۆ شك ئەبەم، لە تۆ بەولاوە پەنا بەرمە بەر کێ؟

(٣) واتە: لە نێوانی کردەوەی خۆمو فەزڵی تۆدا داماوم، ئەمیان ئەمتوێنێتەوە لە خەجاڵەتی‌داو ئەویان ئەملاوێنێتەوە تا نەترسم.

(٤) وەسێمەن: بەسمە. خەجڵەت: شەرمەزاری. مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری پاشەوەی‌دا دێ.

(٥) واتە: وەرە بە پێی داد لەگەڵم مەکە، چونکە ئەگەر وام لەگەڵ بکەی ئەبێ سزام بدەی لەبەر ئەوەکە تاوانبارم. بە پێی لوتفی خۆت لە گەڵم بجوڵێرەوە، ئەوەندەم بەسەکە شەرمەزاری حوزوورت بووم، ئیتر پەردە لە رووی کردەوەم لامەدەو روو رەشی لای دۆستانم مەکە.

یـەند بـەرۆم خـەجڵەت کـەردەم بـە وێدا
سـەراپـام تـفڵێ دەس مـارۆ پـێدا[(١)]

چـون فکـر فـەزڵت پـەردە نـەوازۆ
جـوانـیم پـیری ئـاوات مـەوازۆ[(٢)]

[٢]

## یا شێخ هەڕگاوان[(٣)]

یـا شـێخ، هـەڕگـاوان مـەیلەکـەی لەیـلێ
سەر بـە سـەر وە گـیان هـەرزانـەن خـەیلێ[(٤)]

جـۆش کـورەی مـەیل دڵ سـتانییەن
دەواش هـەوای فـەرد زمـستانییەن[(٥)]

---

(١) بەرۆم: ئەمبا. مارۆ: دێنێ. واتە: شەرمەزای کردەوەم ئەوەندە ئەمباتەوە بە قاوغی خۆماو بچووکم ئەکاتەوە، منالێك ئەتوانێ دەس بێنێ بە سەراپای لەشما.

(٢) نەوازۆ: نەیەوێ. موازۆ: ئەخوازێ. واتە: کاتێك کە نیازی لوتفت دەرکەوێو پەردە نەدا بە رووی خۆیا لە عاستی من، پیریم ئاواتی زەمانی جوانی ئەخوازێو ئەڵێ مادەم خوا بەخشەندەیە خۆزگە هەرگیز زەمانی لاوییەتی دوایی نەهاتایە.

[٢]

(٣) مەولەوی جارێکیان لە خانەقای تەوێڵە میوان بووەو لە باڵەخانەکەی سەرچەمەکە دابەزیوە ـ کە دیوەخانی شێخی «بهاءالدین»ﷺ بووە ـ کات زستانو دنیا تەڕوتووشی بووەو ژوورەکەی مەولەوی دڵۆپەی کردووە. مەلەویش بەم چەند شیعرە داوای لە شێخ کردووەکە بان گوشێك بنێرێ بانی ژوورەکە بگێڕێ.

(٤) هەڕگاوان: قوڕاوەکان. واتە: یاشێخ قوڕاوێك کە بە هۆی مەیلی لەیلێوە بپرژێ لە گیانی دڵدار، ئەوەندە بە نرخە ئەگەر سەر بە سەر بیگۆڕێتەوە بە گیانی خۆی هێشتا بە هەرزان دەسی کەوتووە، کەواتە من لە دڵۆپەکردنی ژوورەکەم زویر نیم، وە هەر کردوومە بە بیانوو بۆ ناردنی ئەم چەند شیعرە.

(٥) دڵستانی: دڵسەندن. واتە: ئێستا کاتی جۆش سەندنی کوورەی خۆشەویستییە، کە دڵ لە ئینسان ئەسێنێ، وە ئەو کەفوکوڵە بە هەوای شیعری باسی زستان کردوو دائەمرێتەوە.

ئـــۆســـای بـــلووربەند پــەنجەرەی کـــاوان
ئـــــاینە ســـــازیش وست ئــەو شــەتاوان[١]

وەرویێ بــەرد ئـــەو بــەست گــرد گــوزەرگایێ
دووی ئـــــــازیزشەن دڵ ئـــــاهەڕایــــێ[٢]

هـــــای نـــــە، دڵ لواو ئــاماش پــەی نــیەن
مەکـیانەش پـەی چـێش نـەسیم کـۆ شیەن[٣]

نـەسیم پـەنجەی پـات ئـەر سـەردی کـێشـان
بـــدارەش نـــە تـــۆی دڵ دەروون رێشـــان[٤]

شۆن هەن نەی سەروەخت. سازان پەی دەلیـل
جە هەر سـەر بـەرزێ هـەرس دیـدەم مـیل[٥]

---

(١) وست: خستە. واتە: وەستا شووشە تێخەری پەنجەرەی شاخەکـان دەسـی کـرد بـە ئاوێنە دامەزراندن بە سەر چەمەکانیشا. مەبەسی ئەوەیە ئەو خوایەی کە چۆڕاوگەی ئاوی سەرشاخو ئەشکەوتەکانی کرد بە سەهۆڵ، چەمەکانیشی مەیاند.
(٢) وەرویێ: بەفر. بەردئەوبەست: بردیە بەست، دایپۆشی. ئاهەڕا: ئەو ڕێگایەی کە بە زەحمەت پێیبووترێ ڕێگا. واتە: بەفر ڕێگاو بانەکانی هەموو داپۆشیوە، دڵ ئەگەر تاقە ڕێگایەکی ببێ بۆ لای یار بیتییە لە دووکەڵی هەناسەی کە هەڵی ئەکێشێ لە تاو دووری ئەو.
(٣) مەکیانەش: مەیئێرە. کۆ شیەن: بۆکوێ چووە. لێرەوە مەولەوی ئەکەوێتە قسە لەگەڵ خۆیو ئەڵێ نەکەی دڵ بنێری، چونکە دڵ هاتو چۆی بۆ نیە، ئەی نەسیم بۆکوێ چووە ئەو بانگکە بینێرە.
(٤) بدارەش: بیخەرە. واتە: نەسیم، ئەگەر پەنجەی پێت سەرمای بووە بیخەرە نـاو دڵی دەروون بریندارانەوە باگەرمی بێتەوە. مەولەوی لێرەدا وردەکارییەکی جوانی کردووەکە نەسیمی شوبهاندووە بە ئینسان کە بە سەر بەفرا بڕوا پێی سەرمای ئەبێ، نەسیمیش کە بە سەر بەفرا بوەزێ دیوی سەر بەفرەکەی هەوای ساردی بەفرەکە وەرئەگرێ.
(٥) شۆن: شوێن. سازان: دروست کـردووە. مـیل: ئـەو دارە لەسـەر ڕێگـای بـێنیشانە دایئەچەقێنن بۆ ئەوەی ڕێبوار ڕێ ون نەکا. واتە: ئەگەر لەوە ئەترسی ڕێگات لێون ببێ،
بقیة

بشـــۆ چــون یــاوای وەی دوی ســـەردەوە
بـــێ پـــرسا بــناڵ وەی دوو فــەردەوە:(١)

بـــاڵاخــانەی چـــەم دیــوانــەکــەی تــۆ
بــانەناو وە گـــڵ ئـــاسانەکـــەی تــۆ(٢)

تکـــەش عــاجز کــەرد خـــەیاڵت تـێش‌دا
ئـــازیز بـــۆ جـارێ پـا بــنیە پـێش‌دا(٣)

مەترسە، چونکە ڕێگاکەی نیشانەی هەیە. لەم زستانەدا فرمێسکی چاوەکانم لە هەموو بەرزایی‌یەکا نیشانەیەکی داناوە بۆ ڕێ بەدیی کردن.

(١) بشۆ: بچێ. یاوای: گەیشتن. پرسا: پرس. بناڵ: بناڵێنە. واتە: بڕۆ بۆ لای دۆست، کە گەیشتیتە لای بە دەم هەناسەی ساردەوە بناڵێنەو ئەم دوو شیعرە بڵێ: دوو شیعرەکە ئەوانەی پاش ئەم شیعرەن.

(٢) بانەناو: سواغ‌دراو. مەعنای هەردوو شیعرەکە پێکەوە دێ.

(٣) تکە: دڵۆپە. بنیە: بنێ. واتە: باڵەخانەی سەرچەم کە دیوەخانی تۆیەو بانەکەی بە خاکی بەردەرگاتان سواغ دراوە، کەوتووەتە دڵۆپەکردن، وە بە هۆی ئەوەوە ناتوانین لە سەر ئوسوولی تەریقەتی نەقشبەندی خەیاڵ لە تۆ بکەینەوە تیایاو «رابطە»ت بکەین، جارێك تەشریف بێنەو پێ‌یەکی پیا بنێ با دڵۆپە نەکاو بتوانین خەریکی بیرکردنەوەکەمان بین. ئەمە مەعنا دیاری‌یەکەیەتی، بەڵام مەولەوی مەعنایەکی لەمە ورد تریشی مەبەست بووەکە ئەوەتە باڵەخانەی چاوی دڵدارەکەت کە دڵی دیوەخانی خۆتەو هەمیشە تۆی تیایت، وە بانەکەی بە خاکی بەردەرگاکەت سواق دراوە ـ مەبەسی لەوەیە گوایە هەمو جارێ پێی ئەنایە سەر چاوی ـ تك تك فرمێسکی لێ ئەڕژێ، لەبەر ئەوە وێنەت لە ناو چاوما عاجز بووە ـ چونکەکە چاو ئاو بکا وێنەی هیچ بە ساقی وەرناگرێ ـ سا ئازیز پێ ناسکەکانت بنێ بە سەر چاوەکانما با دامرکێن‌و فرمێسك نەڕێژن.

لە هەندێ نوسخەدا شیعری یەکەم لەم دوو شیعرە بەم جۆرەیە:

باڵەخانەی چەم دڵ دێوانـەکـەت     بانەناو وە خاك سەر ئاسانەکـەت

واتە: باڵەخانەی سەرچەم کە هی دۆستە دڵ بۆ شێت ووەکەتە. وە بەپێی مەعنای دووەم باڵەخانەی چاوی ئەو دۆستەکە دڵی شێت بووە بۆت... تاد.

**[٣]**

## یاران بەرشیەن(١)

یـــاران بـــەرشیەن جـــە زێد وە زامـــن
گــرد تــەفرەقە بــین چــون خــەیاڵ مــن(٢)

گـــــەرد کـــــوچشان ئـــانا دیـــارەن
دەك لێڵاویت بـــۆ چـــۆنت قـــەرارەن(٣)

ســـەنگی بـــار هـــۆش، پـــێش بـــار فـــامت
دەوار شـــــــادی، چـــــیخ ئـــــارامت(٤)

لوان چـــەنی کـــۆچ خـــاڵۆکـــەی هـــامفەرد
ئێستە بـار وستەن نـە هـەوارگـەی هـەرد(٥)

تـــۆ چـــێش مـەکـەری کـەم هـۆش کـەم فـام
پـــەرێ عـــەیب‌وعار مـــەندەنی جـــە لام(٦)

---

**[٣]**

(١) مەولەوی ئەم قەسیدەیەی لە پاش مردنی ئەحمەد بەگی کۆماسی وتووە، وە قسە لەگەڵ خۆی ئەکا تیایا.

(٢) زێد: جێگای لە دایك بوون، دنیا. واتە: دۆستان هەموو مردن‌و گۆڕ گرتنیە باوەش‌و بوو بە زامنیان، وە وەك خەیاڵە پەرێشانەکەی من پرژو بڵاو بوون.

(٣) واتە: تۆزی بارو کۆچیان دیارە، ئەی تۆ چۆن خۆت گرتووەو نەرۆیشتووی بە دوایانا، دەك کوێراییت دایەت.

(٤) سەنگی‌بار: باری قورس کەکاروانچی لەکاروانا ئەی‌خەنە دواوە. پێش‌بار. شت‌و مەکی سووك‌و هەرزان بەهاکە ئەی‌خەنە پێشی کاروانەوە. مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

(٥) لوان: رۆیشتووە. واتە: باری قورس‌و سووکی هۆشو فامت‌و، دەوارو چیخی شادی‌و ئارامیت لەگەڵ کۆچ‌و باری خاڵۆدا رۆیشتون‌و ئێستا لە هەوارگەی دەردو مەینەتا باریان خستووە.

(٦) مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە.

سـا چـەنی ئـەڕواح یـاوە وە یـاران
بـا تـەن بـۆ وە سـەنگ مـەندەی هـەواران(١)

[٤]

## یاوا پێم نامەی(٢)

یـاوا پـێم نـامەی شـیرین خـیتامەت
دەك دەك نـەڕێزۆ سـەرپەنجەی خـامەت(٣)

سـیای سـورمەی خـەت نـە دیـدەم شـانا
بـادرەوشەی وەرەق خـەمان رفـانا(٤)

مـەرهەم بـی پـەی زام ئـەفعییان گـەستەم
دەوابـی پـەی دەرد جـەستەکـەی خـەستەم(٥)

---

(١) چەنی: لەگەڵ. یاوە: بگە. واتە: ئەی تێنەگەیشتوو، تۆ بە تەنیا چی ئـەکـەی وا لێرە ماوی؟ هەر بۆ عەیبو عار ماویتەوە لام، هەڵسە لەگەڵ گیانما بکەوەرە رێو بگەرەوە بە دۆستان، چش با لەش رەش بووەوەکەم لێرە بەجێ بمێنێ وەکو بەردی ژێر مەنجەڵ کە لە هەوارەکانا ئەمێنێتەوە.

[٤]

(٢) مەولەوی ئەم چەند شیعرەی بۆ شێخی «بهاءالدین» نووسیوەکە نامەیەکـی بـۆ ناردبوو، وە تیایدای باس کردبوو کە شێخ «ضیاءالدین» برای لە ئێرانەوە گەڕاوەتەوە.
(٣) نەڕێزۆ: دانەوەرێ. واتە: نامە ئاخر خۆشـەکـەتم پـێ گـەیشت، یـاخوا هـەرگیز ئـەو سەرپەنجانەت دانەرزێن کە قەڵەمەکەیان گرتبوو بە دەستەوە. وشەی «شیرین خیتامەت» ئیشارەتە بۆ ئایەتی ﴿خِتَامُهُ مِسْكٌ﴾.
(٤) شانا: وەشاندم. بادرەوشە: باوەشێن. رفانا: راوی‌نا. واتە: مەرەکەبە رەشـەکـەیم وەك کلە وەشاند بە چاوما، کاغەزەکەش لە جیاتی باوەشێن خەمی لێ دوور خستمەوە.
(٥) ئەفعی: مار. واتە: نامەکەت بووبە مەڵهەمی زامی ماران گـەستەمو دەرمـانی دەردی لەشی بیمارم.

تــەسکین دا وە ئــێش نــێشــەکـەی دووری
وە دڵەی ســـۆچــیای نــار مــەهجووری(١)

مــــەگــەر خــوداوەنــد کــەرەم کــەردەوە
تـــەفرەقەی یـــاران جـــەم ئـاوەردەوە(٢)

[٥]

## یار وەفادار(٣)

یـــار وەفـــادار شـــەرت‌وبەین بـــێ شــۆ
چــون نــوور دیــدەی مــەعدوومی مەبۆ(٤)

وەختێ بــەندەی وێش بــێ حـاڵ وە چـەم دی
ئـــەسرین وە چــەمدا رێزاو پــەشێو بـــی(٥)

---

(١) واتە: ئێش‌و ئازاری نووکی تیژی دووریتی داسوکناندو ئیسراحەتی دا بە دڵم کـە بـە ئاگری دووری سووتاوە.

(٢) واتە: چونکە خوا لوتفی کردو دۆستانی لە یەك‌بووی یەك‌خستەوە.

[٥]

(٣) مەولەوی ئەم دوو شیعرەی بە بۆنەی کوێر بوونیەوە وتووە.

(٤) بێ شۆ: بێ ئەندازە. مەعنای هەردوو شیعرەکە پێکەوە دێ.

(٥) واتە: یاری بە وەفاو گفت‌و پەیمان لە ئەندازە بە دەر راست وەك رووناکی چاوی من ئەبێ، کە منی خوڵامی خۆی دی حاڵم پەرێشانە، فرمێسکی بە چاوی خـۆی‌دا رژانـدو تێك‌چوو. مەبەسی ئەوەیە چاوی بۆ بەشداری بوون لە ناڕەحەتی حاڵیا کوێر بووە.

## [٦]
## یاران، دڵداران

یـــــــاران، دڵداران نــــە تـــۆی دڵ داران
بــــێ یـــاد یـــــاران، یـــاران مـــەویاران[١]

## [٦]

(١) داران: ڕائەگرن. مەویاران: ڕانابوێرن. واتە: عاشقە دڵدارەکان یارەکانی خۆیان لەنـاو دڵیانا ڕائەگرن، چونکە دۆست بەبێ یادی دۆست ناتوانێ بژی.



دڵـه، ڕاگـەکـەت خـەیلێ تـاریکـەن
سـارای هـیدایەت تـاریک مـەوینوون
چـۆڵـه چراوێ پـەرێ وێت سـاز دەر
ئـەر گونا ڕای ڕاس بـەردەنی جـەویر
بەڵ لەو دیوان دا دێوانەی سـەرشێت
بارێ ئـەر غـەفڵەت دام تەندەن نەڕێت
یاد ئـەو سـەروەر وە دەروون باوەر
یە مـەنسووب تۆن ئینه کردەشـەن
ئـەو بە شـەرمـەوە مدیۆ بـە وەردا

پـردەکه سـەختـەن، خـەیلێ باریکـەن
ڕای نەجات یەکجار باریک مەوینوون
وە قەد تـوانای وێت باربـەندی کـەر
شۆن پای کـردار هام فـەردان هۆرگیر
خـەجاڵـەتی بـەزم یاران نـەیۆ پێت
نی یەنی وە تەنگ شەرمەسـاری وێت
ئەر واچان پەنەش نەو بەزم مەحشەر:
چەنی تـوانای سـەر هۆردە ردە شـەن
من مشیۆ کام خاک کـەروون وە سـەردا

ISBN 964-7638-54-X
9 789647 638548

سنندج ، پاساژعزتی
انتشارات کردستان
تلفن : ۲۲۶۵۳۸۲